# سەردەم

٦١
ساڵی یانزەهەم
زستانی
٢٠٠٩

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

خاوەنی ئیمتیاز:
شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر:
ڕەووف بێگەرد

سکرتێری نووسین:
شوان ئەحمەد

دەستەی نووسین
ڕێبین هەردی

دەرهێنان و کاری کۆمپیوتەری
تاڤگە فائق

هەڵەچنی چاپ:
ساکار رەووف

بەرگ :
نەرمین مستەفا

-سەردەم گۆڤارێکی وەرزییە، تایبەتە بە نوسین و وەرگێڕانی کولتوری بیانی لەبواری فەلسەفە و ڕەخنە و زانستە مرۆییەکان و داهێنانی ئەدەبی و ئیستاتیکیدا.

-داوا لەو بەڕێزانە دەکەین کە بابەت بۆ سەردەم ئامادەدەکەن، هاوپێچ ناوی تەواوی نووسەر، وەرگێڕ، سەرچاوەو زانیارییەکانی تایبەت بەچاپ و بڵاوکردنەوە، لەگەڵ کۆپییەك لەدەقی ئەسڵیی بابەتی وەرگێڕدراو بنێرن.

-ئەو بەڕێزانەی بە نوسین و ئامادەکردن بەشداری دەکەن پێویستە هەموو مەرجە ئەکادیمیەکان، لە بابەتی میتۆد و سەرچاوەو ئەمانەتی نوسینەوە، پێڕەوبکەن.

-باشتروایە بابەتەکان بە کۆمپیوتەر تایپ کرابن، هاوپێچ لەگەڵ سی-دی و دەقی چاپکراوی بابەتەکەو ئەدرێس و ناونیشانی ئەلیکترۆنی نوسەر یان وەرگێڕدا.

-ئەو بەڕێزانەی لە ئینتەرنێتەوە بابەت وەردەگێڕن پێویستە هاوپێچ ناونیشانی تەواوی سایت و لینك و رۆژی بڵاوکردنەوەی سەرچاوە ئەلیکترۆنیەکە بنێرن.

-بەرهەمەکان گەر بڵاوبکرێنەوە، یان نا، نادرێنەوە بە خاوەنەکانیان.

-پەیوەندییەکان لە ڕێگای سەرنووسەرەوە ئەنجام دەدرێن.

# ناوەڕۆکی:

## سەردەم - ژمارە ٦١

### فیکر و فەلسەفە



### ئەدەب



### گفتوگۆ



### فایلی ژمارە:

## چەمکی مێژوو

## وێستگەکانی سەردەم



---


**ناونیشان:**

**سلێمانی - شەقامی سالم**
**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**
**تەلەفۆن: سەرنووسەر ٠٧٤٨٠١٣٦٦٥٩**

**دەزگای سەردەم ٣١٢٩٦٠٩**


**نرخی (١٢٥٠) دینار**


**بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە**
Tel _ Fax: 00447543129839
ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە رێی سندوقی پۆستی
ژمارە (615/ 14665 و 616/ 14665) تاران

**لە رێگەی (ئیمەیل)ەوە:**
govarysardam@yahoo.com

www.serdam.org

# لیۆتارد

**ڤالتەر ڕێزە - شێفەر**
**لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال**

## دەروازە:

یورگن هابەرماس ساڵی ١٩٨٤ نووسیی: «گەر من تەنها بیر لە دیاگنۆزە کۆمەڵایەتی-تیۆرییەکانی سەردەم بکەمەوە، ئەوا دەبینم کە لەماوەی یەک تا دوو دەیەی رابوردوودا لە پاریسەوە زۆرتر لە هەر جێیەکی دی پاڵهێزی بەبەرهەم دەرچوون»[١].

ئەو پاڵهێزە کە ژۆن-فرەنسوا لیۆتارد نای و خۆیشی بەڕێیەوە لە ئاستێکی نێونەتەوەییدا ناسرا، هێنانی تێگەی «پۆستمۆدێرن» بوو بۆ نێو دانوستاندنە فەلسەفییەکان. لیۆتارد ئەم کارەی ساڵی ١٩٧٩ لە نووسینی «La Condition postmoderne» (زانینی پۆستمۆدێرن)دا ئەنجام دا، پاشان لە ساڵانی دواییدا تێگەکەی بەسەر شێوەسازی و کایەی دیکەی هونەردا بەکارهێنا، دواتر لە ئیشە سەرەکییەکەیدا بەناونیشانی «Le Differend» (جیاوازی /Der Widerstreit)، یەکێک لە بناغەکانی فەلسەفەکەی خۆی خستە بەردەست کە بریتی بوو لە فەلسەفەی جیاڕایی و لە کانتەوە سەرچاوەی گرت. ڤۆلفگانگ ڤێلش کە یەکێکە لە نوێنەرانی چالاکی هزری پۆستمۆدێرن، بەم چەشنە لیۆتارد دەنرخێنێت: «لیۆتارد نووسەرەکەی پۆستمۆدێرنیزمێکی فەلسەفییە. هیچ کەس وەک ئەو ئەوها زوو، ئەوها پوخت و ئەوها بەڕوونی، گۆڕانی نەدا بە فەلسەفەی پۆستمۆدێرن»[٢].

ئێمە دەتوانین بە چەند وشەیەکی کەم، بەم چەشنە کۆنسێپتەکەی لیۆتارد

دیـــاری بکەین: مۆرکـــی مۆدێرنە (=نوێســـەردەم) بریتییە لە هزرێکی هەمەکی کـــە لەنێو خۆیدا ســـیماکانی زەبرگەراییەکی پڕمەترســـیی هەڵگرتووە و دەبێت لەبەر هۆی جیاواز وەک نشوستیهێناو ببینرێـــت، بەڵام ئەمڕۆ هەمەلایەنێتییەکی هەڵوێســـت و نوێســـەرەتای هزریانەی جیاواز جێی ئەم هزرە هەمەکییە دەگرێتەوە. بێگومان پێشـــتر ئاڤۆنگاردەکانی هونەری سەدەی بیستەم، ئەم جۆرە نوێســـەرەتا بنەماییەیان تاقیکردۆتەوە و ئێســـتاش گەرەکە ببێت بە پنتـــی لێوەدەرچوون. کەواتە تێگەی پۆســـتمۆدێرنە لای لیۆتارد، مۆدێرنەی ئێســـتێتیکی بەدەر ناکات، بەڵام دیاریکردنێکی بەم چەشنەی تێگەکە هێندە ئاسان شیاوی تێگەیشتن نییە، چونکە بەئاشکرا لە تێگەیشتنی سپۆنتانی پێشـــگری «پۆســـت» وەک «پاش» یان وەک «ئەنتی» لا دەدات. زۆر خوێنەری لیۆتارد کێشەیان لەتەک ئەمەدا هەیە.

جگە لەمە دەنگە ســـاردەکەی نووسینی «زانینی پۆسمۆدێرن»، زۆر رەخنەگر و خوێنەری بەرەو ئـــەو دەرەنجامە چەوتە برد کە گوایە لیۆتارد مەزنێتی بە تەکنۆلۆژییە نوێکانی کۆمپیوتەر و بانکی داتاکان دەدات و لەتەکیاندا یەکدەگرێتەوە، کەواتە ئەوە ســـەرلەنوێ چەپێکی کۆنە کە خیانەتکارانە بۆ بەرەکەی دی هەڵاتووە.

## 1-*ژیاننامەی لیۆتارد*:

ژۆن-فرەنســـوا لیۆتارد ١٩٢٤ لە ڤێرســـای هاتە جیهانەوە. ئەو لە ســـۆربۆن فەلسەفەی خوێندو ســـەرەتا لەژێر کاریگەریی فێنۆمێنۆلۆژیی هوسەرلدا بوو. لیۆتارد ئەو دەمە داڕشتنێکی زۆر کورت و رۆشنی بە ناونیشانی «فێنۆمێنۆلۆژی» (La Phenomenologie) نووسی کە ئەمڕۆش لە زانکۆکانی فەرەنسادا وەک یەکێک لە چاکترین نووسینەکان لەبارەی فێنۆمێنۆلۆژی پێشنیار دەکرێت.

لیۆتـــارد ماوەیەکی کورت پێـــش جەنگی جەزائیر، لە نێـــوان ٥٢-١٩٥٠ وەک وانەبێژێکی گەنج لە کۆنســـتانتین / جەزائیر کاری کرد، پاشـــان بوو بە فێرکاری ئامادەیی — بە هەمان شـــێوەی ژۆن پۆل ســـارتر لە ســـییەکاندا. ئەزموونەکانی جەزائیر لیۆتاردیان رووەو هەڵوێستی سیاسی بزواند و بوو بە مارکسیســـتێکی نادۆگماتیست، بەڵام چالاکییەکەی ئەو سەرەتا لە سەندیکای CGT بوو کە شـــەقڵێکی کۆمونیستیی پێدرابوو. لیۆتارد ساڵی ١٩٥٤ بوو بە ئەندامی گرووپە چەپە توندڕەوەکەی دەوری گۆڤاری «سۆسیالیزم یان بەربەرێتی» (Socialisme ou Barbarie) کە لە فەرەنسا لە نێوان ١٩٤٩ و ١٩٦٦ دەردەچوو. دامەزرێنەران و شـــەقڵپێدەرانی ئـــەم گرووپە بریتی بوون لە کۆرنێلیوس کاســـتۆرادیس و کلود لێفۆر. گۆڤاری «سۆســـیالیزم یان بەربەرێتی» هاوکات دژ بە ســـتالینیزم و سیســـتەمی سەرمایەداری بوو، بەڵام هەروەها هەڵوێســـتێکی رەخنەیی بەرانبەر بە ترۆتسکیست و جەرەیانەکانی ماویزم وەرگرتبوو. ئەم گرووپە نزیکەی شەست ئەندامی هەبوو.

لیۆتارد لە نێوان ساڵانی ١٩٥٥ و ١٩٦٣ تەنها سیازدە تێکستی لەم گۆڤارەدا بڵاوکردەوە، هەندێکی ئەم تێکســـتانە لەژێر نهێنیناوی فرانسوا لابۆردا بوون و هەموویان یەک دانەی لێدەربچێت، لەتەک کێشـــەی جەزائیردا خەریک بوون. دەتوانین بڵێین، ئەو پسپۆری جەزائیر بوو. ئەم گرووپە بچووکە لە پەنجاکان و شەســـتەکاندا، واتا کاتێک KPF (پارتی کۆمونیســـتی فەرەنســـی) بەســـەر چەپی

فەرەنســـیدا سەروەر بوو و سۆسیالیستەکان هەڵوێستێکی نادیاریان سەبارەت بە جەنگی کۆلۆنیالی جەزائیر هەبوو، شـــتێکی زۆر نائاســـیی بوو: گرووپێک بوو کە نەیدەویســـت لە هەڵەکانی چەپی فەرەنســـیدا بەشـــداری بکات، بەڵام لیۆتارد گـــەڤ دەکات کە نابێت ئەفســـانەیەک بە دەوری ئەم گرووپەدا بهۆنرێتەوە.

لە ســـاڵی ١٩٥٩ بەدوواوە دانوستاندنێکی پرنسیپی لەنێو گروپەکەدا هاتە ئاراوە کە لە کۆتاییدا بوو بە پاڵهێزی دابەشـــبوون و هەڵوەشاندنەوەی. کاستۆرادیس گومانی هەبوو کە مەردوم بتوانێت بە تێگەکانی مارکسیزم بەگونجاوی لە کۆمەڵگەی ئەو سەردەمە تێبگات، یان بناغەی پراکسیسێکی رەخنەیی برێژێت. کاســـتۆرادیس لە نووسینی «مارکســـیزم و تیۆریی شۆڕشگێڕی»دا رەخنەیەکی بناغەیی مارکســـیزمی خستە بەردەم، بەڵام بەشـــێکی دیکەی گرووپەکە نەیدەویست دەستبەرداری ئیدێـــی جیاوازی (Le Differend /der Widerstreit) ببێت. ئەم بەشـــەی گرووپەکە ســـاڵی ١٩٦٤ گۆڤاری «دەســـەڵاتی کرێکاران» (Pouvoir ouvrier)ی دامەزراند، بەڵام ناوکەکەی دیکەی گروپەکە لە دەوری کاستۆرادیس مایەوە و هەتا وەستاندنی دەرچوونی گۆڤارەکە لە ساڵی ١٩٦٦ هەر بەردەوام بوو لەسەر دەرکردنی «سۆسیالیزم یان بەربەرێتی».

گەرچی لیۆتارد مەیلی بۆ ئیدێکانی کاســـتۆرادیس هەبـــوو، بەڵام چووە پاڵ گرووپەکەی دی کە زیاتر گرووپێکی ترادیســـیۆنی بوو، هۆی ئەم هەڵوێستەی دەگەڕێتەوە بۆ هاورێیەتییەکەی لەتەک مێژووناس پیا ســـویریدا نەک بۆ هۆی سیاســـی. لیۆتارد ســـاڵی ١٩٦٦ لەو گرووپە چووە دەرەوە. «کۆتایی بە قۆناغێکی ژیانم هات، من لە خزمەتی شـــۆڕش تەســـریح بووم دەســـتم دایە شـــتێکی دیکە، من خۆمم رزگار کرد»[٣]. بەدووی ئەمەدا چەند ســـاڵێکی خۆپەرچاندنی تەنگژاوی بۆ لیۆتارد سەرەتایان گرت. ئەو تەنها کاتی یاخیبوونەکەی ١٩٦٨ جارێکی دی بۆ ماوەیەکی کورت چالاک بووەوە: لە «بزووتنەوەی ٢٢ی مارس»ی دانیال کۆهن-بێندیتدا، بەڵام ســـەرباری ئەمە کێشـــەکەی لیۆتارد هێشتا هەر دانەمرکابووەوە: «ئایا چۆن مەردوم ئەمڕۆ لەمەڕ سیاسەت هەڵوێست بنوێنێت؟».

لیۆتارد ســـاڵی ١٩٧١ بە نووسینی «گوتار، فیگۆر» (Discourse, figure) هابیلیتاسیۆنی کرد و ســـەرەتا لە زانکۆی نانتێر، پاشان لە پاریس (VIII Vincennes لە Saint-Denis) کاری وانەبێژیی دەکرد. ئەو یەکێک بوو لە دامەزرێنەران و بۆ ماوەیەکیش بەڕێوەبەری «College international de philosophie» بوو. لیۆتارد هاوینی ١٩٨٧ خانەنشین بوو.

## 2- زانینی پۆستمۆدێرن:

«زانینی پۆســـتمۆدێرن» تەنها نووسینێکی بۆنەیی لیۆتارد بوو «لەبارەی زانینەوە (Wissen)، لە کۆمەڵگە زۆر پێشـــکەوتووەکاندا». ئەو دیراســـەکەی ســـاڵی ١٩٧٩ وەک راسپاردەی ئەنجومەنی زانکۆی حکومەتی (Quebec) نووسی.

تێگەی «پۆســـتمۆدێرن»، لەو شـــێوەیەدا کە لیۆتارد تێیدەگات، نیشانەیە بۆ «دۆخی کولتوور دوای ئەو گۆڕینانە کە دەســـتوورگەلی گەمەکانی زانســـت و ئەدەب و هونەرەکان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمەوە ئەنجامیان داون»[٤]. بۆیە بۆ تێگەیشتن لە تێکستەکە سوودمەند دەبێت گەر مەردوم

روو نەکاتە بەکارهێنانی واژەکە لە تەلارســـازیدا، بەڵکو «پۆستمۆدێرن» وەک «پاش-نوێسەردەم» وەربگێڕێت.

لیۆتارد راڤەی ئەم گۆڕینانە پەیوەند بە ئەوەوە دەکات کە ئەو ناوی دەنێت «تەنگژەی چیرۆکەکان» (crise des recits). زانســـت هەر لە ســـەرەتاوە پەیوەندییەکی رەخنەیی لەتەک چیرۆکەکاندا هەیە، بەڵام گەر زانست داواکاری بۆ گۆتنی شتێکی «راست» بەرز بکاتەوە، ئەوا دەبێت بە هەر شێوەیەک بێت رەوایەتی بە رێســـاکانی گەمەکەی خۆی بدات، زانســـت دەبێت لەسەر زەمینەی میتا-گوتارێک وەستابێت. گەر ئەم میتا-گوتارە بگەڕێتەوە بۆ چیرۆکێکی مەزن، بۆ نموونە بگەڕێتەوە بۆ ئازادکردنی سەبژێکتی ئاوەزمەند یان سەبژێکتی کارکەر، یان بگەڕێتەوە بۆ ئاوەڵابوونی ئیدێ، ئەوا لیۆتارد ئەو میتا گوتارە ناو دەنێت مۆدێرن، بەڵام پۆستمۆدێرن بە پێچەوانەوە، گەر بە ئەوپەڕی سادەیی ببێژین، بریتییە لە گومان (سکێپسیس) لەم چیرۆکە مەزنانەی رۆشنگەری یان فەلسەفەی مێژوو.

## مێتۆدەکەی لیۆتارد، گەمە زمانییەکان:

لیۆتارد لە رووی مێتۆدەوە پابەندە بە ڤیتگنشـــتاینی درەنگ/ کۆتایی(°) و پراگماتیکی زمانەوە. مـــەردوم جیاوازی لە نێوان چەند گەمەیەکی زمانیدا دەکات (بۆ نموونە گێڕانەوە، گفتدان، فەرماندان و هتد)، بەڵام رێســـاکانی گەمە زمانییەکان لەنێو ئەوان خۆیاندا نین، بەڵکو بەرێی گرێبەســـتێکی دەرەکی یان نێوەکییەوە لە نێوان گەمەڤاناندا دادەمەزرێن. هیچ گەمەیەک بەبێ رێسا نابێت، کەواتە دەتوانین ببێژین گەر هەڵمەتێکی گەمە یان گۆزارەیەک بە رێساکان نەگونجێت، ئەوا دەبێت بکرێتە دەرەوە.

بـــەڵام لیۆتارد لە پنتێکدا لە ڤیتگنشـــتاین تێپەڕ دەگات: زمـــان وەک زۆرانێک دەبینێت کە لە مەغزای گەمەکاندا ســـەرهەڵدەدات. زمان ئاڕاستەیەکی رووەو بردنەوە وەرگرتووە نەک رووەو هاوڕایی و راســـتی. بێگومـــان مەرج نییە مـــەردوم گەمە بکات تەنها بۆ ئەوەی گەمەکـــە بباتەوە، بەڵام ئەم هەوڵـــەی بردنەوە بە هـــەر حاڵ لەگۆڕێدایە، چونکە بردنەوە ئەو ئامانجەیە کە لە لایەن رێســـاکانی گەمـــەوە دانراوە. مەردومیش تەنها لەنێو ئەم رێســـایانەدا هەوڵی بۆ دەدات و دەبێت لە مەغزایەکی تایبەتیـــدا هـــەر هەوڵی بۆ بدات، جا گـــەر ئەو تەنها گەمە بکات تاکو لە گەمەدا بەشـــداری بکات. هەروەهـــا شـــادیبینین لە دەربڕینی مەجازیانەی نوێ، لە هەڵمەتی نوێـــی گەمە، کەمێک بەندە بە ســـەرکەوتنەوە بەسەر دژبەرەکەدا، جا گەر ئەم دژبەرە تەنها پراکسیسی سەقامگیربووی زمان بێت. مەردوم بەدروســـتی لـــە لیۆتارد تێناگات، گەر رەچاوی ئەم جیاکارییـــە وردانە نەکات کە لە کایەی مێتۆدیدا هەن.

## سروشتی باندی سۆسیال، روانگەی پۆستمۆدێرن:

مـــەردوم دەتوانێـــت بیر لـــە کۆمەڵگە بکاتەوە وەک ســـەرجەمێکی کارا، وەک چـــۆن بۆ نموونە تیۆریی سیســـتەم (Systemtheorie) دەیکات، یان وەک دووبەشـــبوویەک و لەژێر رکێفی پرنسیپی

گومانلێکردندا، وەک چۆن جەرەیانە مارکسیسـتییە رەخنەییـەکان (فێرگەی فرانکفورت، گرووپی «سۆسیالیزم یان بەربەرێتی») دەیکەن. ئەمە شێوازێکی مۆدێرنی هزرە، بەڵام روانگەی پۆستمۆدێرن جیاوازە. لەنێو ئەم شێوازەی تێگەیشتندا پەیوەندیی سۆسیال تەنها گەمەیەکی زمانییە، ئەمەش بە هەمان شـێوەی گەمە زمانییەکان کە هەتا رادەیەک مینیمومێک لە پەیوەندیگەل پێکدەهێنن و ئەو پەیوەندییانەش بۆ مانەوەی کۆمەڵگە پێویستن.

لیۆتارد لایەنگری تیۆرییەکی مانیپولاسیۆن نییە. لەلای ئەو هەر بەشدارێکی (شەریکێکی) زمانی بەشداریکەرێکە لە گەمەیەکی زمانییانەی هاڤرکێیدا: ئەو بەشدارە بە شێوەیەکی گەمەڤانانە هەڵمەت و دژەهەڵمەت دەهێنێت، بەڵام بەتایبەتی ئەو جۆرە هەڵمەتانە دەهێنێت کە چاوەڕواننەکراون. بۆیە تیۆرییەکی پەتیی کۆمونیکاسـیۆن کورتهێنە، بە پێچەوانەوە تیۆرییەکی گەمە پێویستە کە لەنێو پرێمیسـەکانیدا هاڤرکێ لە خۆ بگرێت. بەڵام مـەردوم دەتوانێت لاریی لەمە هەبێت و ببێژێت: خۆ رووداگەی سۆسیال هێندە بزۆک نییە، بەڵکو نەخۆشییەکی درێژخایەنی بیرۆکراتی سستی کردووە. دامەزراوەکان بەو رێیەوە دەتوانن رێ لە گەمە زمانییەکان بگرن، کاتێک ئەوان سـنوورێک بۆ ئەوە دادەنێـن کە مەردوم بۆی نەبێت چی ببێژێت، بەڵام ئەو سـنوورانە کە دامەزراوەکان دایان دەنێن، تەنها دەرهاویشتەیەکی کاتین، هەروەک بڵێین ئەو سنوورانە ئەوەن کە لە گەمە زمانییە جیاوازەکاندا لە مەترسیدایە، ئەوەن کە بریتییە لە دانراوەکە[٦] (der Einsatz / enjeu)، ئەو سنوورانە بگۆڕن.

## ناڕەوایەتیپێدان:

لیۆتارد جیاوازی لـە نێوان دوو چیرۆکی مەزنی رەوایەتیدان لە مۆدێرنەدا دەکات (وەک گۆتمان، لێرە «مۆدێرنە» هاوواتایە بە رۆشنگەری کۆی سەدەی نۆزدەیەم):

١- مەبەست و رەوایەتیدانی زانین (Wissen)، بریتین لە ئازادکردنی مرۆڤ (رۆشنگەری، کانت؛ ئەمرۆ کۆنسەپتەکانی خۆبەڕێوەبردن)

٢- زانین ئاوەڵابوونی ئیدێیەکە، سەبژێکتی زانین گەل نییە، بەڵکو هۆشی مەزنییە (هومبۆلت، هێگل).

لیۆتـارد جەخت دەکات کە ئەم چیرۆکە مەزنانە چیدی جێی متمانە نین. بە تێگەیشـتنی ئەو شـرۆڤەی هۆکارەکان هەمیشە هیوابڕە، بۆیە خێرا هۆکارە دەرەکییەکان وەلاوە دەنێت و روو دەکاتە هـۆکارە ناخەکییەکان. هەر ئەوەندە کە مەردوم رێسـاکانی گەمەی زانسـتی ئەمپیری بەرەنگاری چیرۆکە مەزنەکانی رەوایەتیدان بکاتەوە، ئیتر زانسـت وەک ئیدیۆلۆژی یان وەک ئامرازی دەسەڵات، وەک پابەند بە زانینی پێشزانستییەوە، دەردەکەوێت.

مۆدێلی مەزنەیی رەوایەتیدان بەو رێیەوە دەخزێتە نێو تەنگژەوە، کاتێک داواکارییە زانستییەکە کە بۆ راسـتی بەرزکراوەتەوە، بەسـەر خودی ئەم داواکارییەدا بەکاردەهێنرێت. ئاوەڵابوونی ئیدێ، ژیانـی هۆش، یەک مەغزا بە سـەرجەمی تاکە توێژینـەوەکان دەدات، چونکە هەموویان بەرێی ئەم پێشبینییەی ژیانی هۆشەوە لەنێو گۆڕانێکی سەرجەمیدا رێکدەخرێن. بەڵام گەر هاتوو بەئاگابوونێک سەبارەت بەوە سەرهەڵبدات کە خودی ژیانی هۆش تەنها مێژوویەکە بەپاڵ فرە مێژووی دیکەوە، ئەوا

ئیتر هەرەمی مەزنەیی ناســـینەکان (Erkenntnisse /مەعریفەکان) نامێنێت و جێ چۆڵ دەکات بۆ «تۆڕێکی توێژینەوەگەلی ناخەکی، هەروەک بڵێین تۆڕێکی «تەخت»، کە ســـنوورەکانیان (هێندی توێژینـــەوەکان — و) بەردەوام پاڵ بە یەکترییەوە دەنێن. «کۆلێژ»ە کۆنەکان دابەش دەبن بەســـەر چەندین جۆری ئەنســـتیتوت و دامەزراوی منحەبەخشـــدا (Stiftung)، زانکـــۆکان کە کارایییەکەیان رەوایەتیدانـــی مەزەنییـــە، خودی ئـــەو کارایییەیان دەدۆڕێنـــن»[٧]. زانکۆ کە پابەند بـــە تێڕوانینی هومبۆلتەوە دامەزراوە، کارایییەکەی دەدۆڕێنێت، دەچێتە خزمەتی دانەوەی زانینی چەسپێندراو، ئینجا لەبریـــی توێژەر، پرۆفیســـۆر بەرهەمدەهێنێتەوە — ئەمە بەپوختی ئـــەو دۆخەیە کە نیتچە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم رەخنەی لێدەگرت.

مۆدێلی ئازادیخوازی رەوایەتیدان دادەوەشێت، چونکە بەئاگابوونێک سەبارەت بەوە سەرهەڵدەدات کە نەشـــیاوە مەردوم لە راڤەی زانستییەوە بە گۆزارەی پێوەردانەر بگات. کانت ئاوەز دابەش دەکات بەســـەر گەمەی زمانیانەی تیۆری و پراکتیکیدا (مۆرالیدا)، بەڵام ئەم دابەشکردنە دەبێت بە پاڵهێز بۆ ســـەرهەڵدانی تێڕوانینێکی ئەوتۆ کە زانســـت توانای بۆ چەســـپاندنی گەمەی پراکتیکی نییە، هەروەها ناتوانێت گەمەی ئێســـتێتیکیش رێکبخات — ئاخر زیاتر لە دوو گەمەی زمانی هەن، بەڵێ تەنانەت ژمارەیەکی دیارینەکراوی گەمەی زمانی بە رێســـای جیاوازەوە هەن. بەمەش ئیتر زانســـت ناتوانێت رێساکانی خۆی روونبکاتەوە . بۆ سەرجەمی ئەم گەمە زمانییانە هیچ مێتازمانێکی گشتگیر لەگۆڕێـــدا نییـــە . لیۆتارد، بزوێنراو لە لایەن تیۆریی گەمەی ڤیتگنشـــتاینەوە، لـــە روونکردنەوەی توانستە جیاوازەکانی ئاوەزەوە بەم سەرەنجامە دەگات.

بەم پێیە ئیتر ســـەردەمی چیرۆکەکان بەســـەر چووە، تەنانەت پرســـەی چیرۆکە دۆڕاوەکانیش کۆتایـــی پێهێندرا، ئەویش بەو رەشـــبینییە کـــە نەوەکەی ڤییەنای لە ســـەردەمی پەڕینەوەدا بەرەو ســـەدەی بیســـتەم تەنی بوو. مەبەســـتی لیۆتارد بریتییە لـــە رۆبێرت موزیـــل، کارل کراوز، هوگۆ فۆن هۆفمانســـتال، ئارنۆلف لۆز، ئارنۆلد شـــوێنبێرگ، هێرمان برۆخ، بەڵام هەروەها ئێرنست ماخ و ڤیتگنشتاینی گەنج / سەرەتا.

## توێژینەوە و رەوایەتیدان پێی بەرێی پێرفۆرماتیڤێتییەوە:

ئایا ئەمرۆ، دوای کۆتاییهاتنی چیرۆکە مەزنەکان، چۆن دەشـــێت رەوایەتی بە توێژینەوە بدرێت؟ مێتازمان کە لۆگیکییەکان بۆ راڤەی زمانێکی گۆڕانپێدراو (ئەکسیۆماتیک) بەکاری دەهێنن، بریتییە لە زمانی سروشـــتی یان زمانی رۆژانە . ئەم زمانە گشـــتگیرە (یونیڤێرســـێلە)، بەڵام بەدەر نییە لە دژبێژی، چونکە دەرفەت بە چێکردنی پارادۆکس دەدات. مەردوم دەتوانێت لەمەوە بدەرئەنجامێنێت کە کۆیەتییەکی (پلورالێتییەکی) سیســـتەمگەلی شێوەکی / فۆرمال و ئەکسیۆمایی هەیە و هەموویان لەنێو مێتازمانێکی ناســـەقامگیری گشتگیردا شـــیاوی راڤەکردنن. ڕوویەکی دیکەی گرنگ ئەمەیە: گەیشتن بە راســـتی (Wahrheitsfindung)، بەرێی سەلماندنی ئێکسپێریمێنتییانەوە، تەکنیکیزە دەکرێت. «کەواتە نەشیاوە بەبێ پارە سەلماندن و راستاندنی گۆزارە و راستی هەبن. گەمە زانستییە زمانییەکان دەبن بە گەمەی دەوڵەمەندەکان، لێرەشدا دەوڵەمەندترین کەس گەورەترین چانسی هەیە لەسەر هەق بێت»[٨].

خودی زانست دەبێت بە هێزێکی بەبەرهەم، بەڵام ئەمڕۆش پاشبەندکردنی زانین بە پێشکەوتنی نوێکارییە تەکنۆلۆژییەکانەوە راســـتەوخۆ نییە. ئەوە گوتاری دەسەڵاتە، ئەوە پێرفۆرماتیڤێتییە کە حوکم دەدات. دەوڵەت و فیرما واز لە چیرۆکە ئیدیالیستییەکانی یان هومانیستییەکانی رەوایەتیدان دەهێنـــن. ئاخر «مەردوم زانا و تەکنیکی و دەزگا ناکڕێت تاکو ئەزموونی راســـتی بکات، بەڵکو بۆ ئەوەی پەرە بە دەسەڵات بدات»[٩].

بەڵام ئایا گوتاری دەســـەڵات دەتوانێت رەوایەتیدان بهێنێتە گۆڕێ؟ ســـەرەتا ئاوها دەنوێنێت کە هەروەک جیاوازیی نێوان زەبر/دەســـەڵات (Gewalt) و ماف (Recht)، واتا نێوان ئەوە کە دەسەڵاتی هەیە و ئەوە کە راستە، ئاستەنگێک لە بەردەم ئەو رەوایەتیدانەدا زیت بکاتەوە. ئەمانە بە واژەکانی تیۆریی گەمەی زمانی، بریتین لە گەمەی لەیەکجیاکراوە: راست / هەڵە (گەمەی دێنۆتاتیڤ)، بەداد / بێداد (گەمەی پرێسکریپتیڤ)، ئەنجامهێنی / ئەنجامنەهێنی (گەمەی تەکنیکی).

بەڵام ســـەنگی مەحەکی تەکنیکیانە کە بەچڕی خزێنراوەتە نێو زانینی زانســـتییەوە، لە لایەنی خۆیەوە بێکاریگەری نامێنێتەوە لەســـەر سەنگی مەحەکی راستی. دەشـــێت رەوایەتیدانێک بەڕێی رووداوانگـــەی دراوەوە (واقیئـــەوە) هەبێت. فەرمان یان یاســـا وەک بەداد دادەنرێـــن، چونکە مەردوم پابەند پێیانەوە هەڵویســـت وەردەگرێت. مەردوم ئاســـانتر دەتوانێت لەسەر هەق بێت، گەر ریالێتی «بەڵگـــەکان» بهێنێتە ئـــاراوە و مەردومیش بەڕێی تەکنیکەوە بەســـەر ریالێتیدا ســـەروەر بێت. ئەمە رەوایەتیدانە بەڕێی دەســـەڵاتەوە. زانســـت و ماف بەڕێی توانستی بەدیهێنان و ئەنجامهێنی و پێرفۆرماتیڤێتییەوە، ئەمانیش خۆیان بە پێچەوانەوە بەڕێی زانست و مافەوە، رەوایەتییان پێدەدرێت — ئەمە لەوە دەچێت خولگەرێسایەک (Regelkreis) دروست بکات. پارەکانی توێژینەوە لەو کایانەدا خەرج دەکرێن کە دەتوانن بەگوێرەی بنەما ماتماتیکییەکان رۆڵ بۆ گونجاندنی سیســـتەم بگێڕن، کایەکانی دیکە بەدەرن لە لێشاوی پارە یان بۆ پیربوون جێهێڵراون.

## زانستی پۆستمۆدێرن، وەک لێتوێژینەوەی ناسەقامگیرییەکان:

سەرجەمی ئەمە لەسەر زەمینەی «فەلسەفە»ی پۆزەتیڤیستیانەی ئەنجامهێنی دامەزراوە، بەڵام ئەم فەلســـەفەیە جێی گومانە. لە هەقیقەتدا پراگماتیکی زانینی پۆستمۆدێرن بەگوێرەی کریتێری دیکە کارایە، نەک بەگوێرەی کریتێری پێرفۆرماتیڤێتی / ئەنجامهێنی. کشـــانی زانســـت بەتایبەتی بەڕێی پێچەوانەکە (ی ئەنجامهێنییەوە — و) دەهێنرێتە گۆڕێ: کارکردن لە بەڵگەدا واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنێت کە مەردوم بۆ نموونەی پێچەوانە، بۆ ئەوە کە نەشـــیاوی تێگەیشتنە، بۆ پارادۆکسیۆن بگەڕێـــت. ئەنجامهێنی بۆ خاتری خـــۆی تەقەلای بۆ نادرێت، بەڵکـــو ئەنجامهێنی خۆی دێتە پاڵ مەسەلەکە، هەر ئەوەندەی پارەدەران لە کۆتاییدا گرنگی بە مەسەلەکە بدەن.

لـــە حاڵەتی هەمـــوو هیپۆتێزێکی نـــوێ و گۆزارەیەکی نوێ و تێڕوانینێکی نوێـــدا، بەزەروری پرسیاری رەوایەتی سەرهەڵدەدات، بەڵام ئەوە خودی زانستە کە ئەم پرسیارە دەکات نەک فەلسەفە. مەردوم نابێت پێشبینیی زانست بکات وەک زانستی پۆزەتیڤیستی و دازنێنراو بۆ سەر ئاستی نیمچە زانین. ئەوە گوتارە لەبارەی رێساکانی زانست کە سەر بە زانستی پۆستمۆدێرنە. نەمانی رەوایەتی لە

کۆتایی ســەدەی نۆزدەیەمدا، تەنها روداوێکی لاوەکی بوو کە بەدوویدا زانین توانی خۆی بەیاریدەی گوتارەوە لەبارەی گۆزارە وەک یاسا چواندووەکان چاکبکاتەوە.

بیردۆزەکەی گوێدل بریتییە لــە پارادیگمایەکی ئەم دۆخگۆڕییە کرۆکییە، بەمەش زەروورەیەک بۆ راســتکردنەوەی تێگەی سیستەم ســەرهەڵدەدات. ئاخر کۆمەڵگە وەک سیستەمێکی سەقامگیر کارا نییە کە ئیتر بتوانێت حسابی ئاوتپوت (خروج) پابەند بە ئینپوتەوە (دخول) بکات. بەڕاستی تەنها دورگەگەلی دێتەرمینیزم هەن کە خۆیان لەنێو دژبەرییەکی کارەساتاویدا دەبیننەوە، ئەمەش دژبەرییەکە کە لە راســتیدا رێســای گشــتی پێکدەهێنێت. زانستی پۆســتمۆدێرن نازنجیرەییە، کارەساتاوییە، پارادۆکسە، هەروەها نەشیاوە لە مەغزای کلاسیکیانەدا. ئەو مۆدێلەی رەوایەتیدان کە بۆ ئەمە دەگونجێت، مۆدێلی چاکترین پێرفۆمانس نییە، بەڵکو مۆدێلی جیاوازییە وەک پارالۆگی.

لەم جێیــەدا هەندێک روونکردنــەوە بۆ تێگــەی «پارالۆگی» پێویســتن. «پارالۆگی» نزیکە لــە تێگەی «پارالۆگیزم» (چەوتــە دەرئەنجام). بێگومان دەتوانین ببێژیــن کە تێگەکە رووبەکی تایبەتیی پارالۆگیزم لە خۆ دەگرێت: گەر کۆیەتییەکی سیســتەمگەلی فۆرمال و ئەکسیۆمایی وەک پێشــمەرج دانرابن، ئەوا دەشــێت ئەوە کە لە پەیوەندییەکی زانیندا وەک پارالۆگیزم یان پارادۆکس دادەنرا، کتومت لەنێو یەکێکی دیکەی ئەم سیستەمانەدا هێزی قەنائەتپێهێنانی هەبێت و کۆمەڵی پسپۆرانیش پێی رەزامەند بن. لە هزری لیۆتارددا سەرسیستەم نییە.

بەڵام ئێمە لێرەش بەندین بە جیاکارییەکی وردەوە. لیۆتارد داوا ناکات: چەوتە دەرئەنجام ببەنەوە، بەڵکو دەبێژێت: تەرکیز بخەنە ســەر پارالۆگییەکان، چونکە لــە کۆڕیدۆرەکانی نێو گەمە جیاوازە زمانییەکاندا، یان وەک چۆن ئەو درەنگتر دەبێژێت: لە نێوان ژانرەکانی دیسکورزدا، دەردەکەون. گەر هیــچ گوتارێک نەبێت، ئەوا لێرە تێمەکەی فەلســەفە، واتا هزرین، بەپوختی خۆی لە کایەی نێوان سیســتەمە رێکخراوەکاندا دەبینێتەوە. «فەلســەفە گوتارێکە و رێساکەشی بریتییە لە دۆزینەوەی رێساکەی خۆی (و هینی گوتارەکانی دیکەش)»[10].

بێگومان لێرەدا نابێت بە هیچ شێوەیەک کێشەیەک بچووکبکرێتەوە: واتای «پارالۆگی» بەگوێرەی فەرهەنــگ بەتــەواوی بریتییە لە «پێچەوانەی ئاوەز، دژ بە ئــاوەز». بەڵام گەر مەردوم ئەم تێگەیە لە لای لیۆتارد بخوێنێتەوە، ئەوا گەرەکە هەتا رادەی شــیان بیر لە ســەرچەمی پانتاییەکەی واتای «پارا» بکاتەوە: «لەلا، لەپاڵ، بەدرێژایی، بەســەر ئەوەشــەوە / جگە، دژ، لادەر». ئەو پرســیارە کە داخۆ رەوایەتیدان بەڕێی پارالۆگییەوە هەبێت، بابەتی دوایەمین بەشــە لە نووســیدنی «زانیدنی پۆستمۆدێرن»دا.

## رەوایەتیدان بەڕێی پارالۆگییەوە:

ئایــا رەوایەتیدانێــک تەنیــا بەڕێــی پارالۆگییەوە هەیە؟ سیســتەم لە پێنــاوی چاکترکردنی ئەنجامهێنییەکەی خۆیدا نوێکاری (ئینۆڤاســیۆن) بەگەردەخات، بەڵام پارالۆگی بناغەییترە، سەر بــە هێنانەئارای خودی زانینــە. مەردوم گەرەکە جەخت لە جیاوازی بــکات نەک لە هاوڕایی. ئاخر هەمیشە یەکێک دێت و رێکخستنی پارادیگمایەکی زانین تێکدەدات. دەسەڵاتێک هەیە کە هەمیشە لەنوێوە توانســتی روونکردنەوە ناســەقامگیر دەکات و نۆرمی نوێی تێگەیشتن بەیان دەکات. بەڵام

ئەم پرۆســـەیە بێ ڕێســـا نییە (چینگەلی کارەسات هەن) کە بێگومان هەمیشە تەنها بەلۆکالّ نەک بەگشتی دیاریکراوە. هەر بۆیە ئاکامی «داهێنان» لە سەرەتاوە دیار نییە.

بۆیە تیۆریی سیســـتەم (Systemtheorie) بە ســـتراتیژییە خۆییەکانییەوە کە بۆ ڕەوایەتیدان بەگەڕیـــان دەخات، هیچ بناغەیەکی لەنێو پرۆســـەی زانســـتیانەی توێژینەوەدا نییە. زانســـت بەم چەشـــنە کارا نابێت، هەروەها ناشـــێت بەم چەشـــنە راڤـــەی کۆمەڵگە بکرێـــت. بێگومان تیۆریی سیســـتەم ســـوودمەندیی خۆی هەیە، چونکە «داوای هۆشـــمەندانی روون و ویستی سڕ دەکات»، بەڵام تیۆریی سیســـتەم بەهای خۆی هەیە: ئەو هیچ قەوارەیەکی بگۆڕی (ڤاریابلی) ســـەربەخۆ لە تەکنۆلۆژییە نوێکان ناناسێت. لێرەوەیە کە وەک سەرەنجام فیزی خاوەن قەراران و کوێرێتییەکەیان دەکەوێتەوە. ئەم فیزە واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنێت کە خاوەن قەراران لەتەک سیســـتەمی سۆسیالدا، واتا لەتەک ئەوەدا کە مەردوم وەک هەمەکێتی لێی تێدەگات، یەکدەگرنەوە، بەڵام ئەم یەکگرتنەوەیە (ئیدێنتیفیکاســـیۆنە) لە زانســـتدا مەحاڵە. مەردوم ناتوانێت لە زانســـتدا هەر لە سەرەتاوە بڕیار بدات کە داخۆ ئاڕاســـتەیەکی توێژینەوە یان تەقەلای توێژەرێـــک ئەنجامهێن دەبێت. گەر دامەزراوە زانستییەکان کەمترین رادەی رەزامەندی (Mindestkonsens) بۆ هەڵمەتێکی نوێی گەمە رەفز بکەن (یـــان هیچ نەبێت لایەنی کـــەم گوێی لێبگرن)، ئەمەش بەو هۆیەوە کە گوایە ئەو هەڵمەتی گەمەیە رێســـاکان تێکدەدات، ئەوا لێرەدا لەسەر هەمان شـــێوەی ئەو سیستەمە کە لوومان راڤەی کردووە، هەڵوێســـتێکی تێروریســـتیان وەرگرتووە. تێرۆر بریتییە لە رەفزکردنی یان هەڕەشـــەی رەفزکردنی هاوگەمەڤانێـــک لە گەمە زمانییەکەدا. فیزی خاوەن قەراران کە لە پرنســـیپدا هیچ هاوتایەکی لەنێو پرۆسەی زانستییانەی توێژینەوەدا نییە، ڕۆ دەچێت بۆ سەر ئاستی نواندنی ئەم تێرۆرە.

زانســـت بەتایبەتی دژەمۆدێلە بۆ سیستەمی ســـەقامگیر. هەر ئەوەندەی گۆزارەیەک جیاوازییەک بە شـــتی ناســـراو لەخۆبگرێت، یان هەر ئەوەندەی گۆزارەکە بەڕێی ئەرگومێنت و دژەئەرگومێنتەوە قابیلی دانوســـتاندن یان شـــیاوی ســـەلماندن بێت، ئیتر دەبێت بچەســـپێنرێت. گۆزارەکە مۆدێلە بۆ «سیســـتەمێکی کـــراوە» و لە نێویدا هیچ مێتازمانێک نییە. بەمـــەش ئیتر یەکگرتنەوە لەتەک سیســـتەمدا و لە کۆتایشدا تێرۆر یاســـاغ کراون. بەڵام گەر هاتوو هێشتا هەر یەکگرتنەوەیەکی بەم چەشـــنە لە پراکسیســـی توێژینەوەدا هەبێت، ئەوا ئەم جۆرە یەکگرتنەوەیە ســـەر بە پراگماتیکی سۆســـیۆ-ئیکۆنۆمییە نەک پراگماتیکی زانســـتی. تاکە رەوایەتیدانێک کە لە کۆتاییدا لە پرۆســـەی توێژینەوەدا هەیە، بریتییە لە هێنانەئارای ئیدێگەل یان گۆزارەگەلی نوێ.

پراگماتیکی سۆســـیال زۆر ئالۆزترە لە پراگماتیکی زانســـتی. بەڵام ئایا سەباری ئەم راستییە، دەشـــێت ئەو ئیدێیانەی سەرەوە بەســـەر ئەمیشـــدا بەکاربهێنرێن؟ کەواتە ئایا بەهەمان شێوە، لە سیاسەتدا رەوایەتیدانێک بەڕێی پارالۆگییەوە هەیە؟

بە هەر حاڵ، ســـەنگی مەحەکی پێرفۆرماتیڤێتی سیونییە (ســـاخیرە)، هەروەها دوو تێڕوانین لـــەدژی هەوڵەکـــەی هابەرماس بۆ هاوڕاییەکی (کۆنسێنســـێکی) گشـــتگیر لەگۆڕێدان: نەشـــیاوە ســـەرجەم ئاخافەران لەسەر رێساکان رێکبکەون، یان لەسەر مێتارێنومایەک رێکبکەون کە بەگشتی چواندنی بۆ سەرجەم گەمە زمانییەکان هەبێت، چونکە ئەم گەمە زمانییانە هەمەچەشنەن و رێسای هەمەلایەنییـــان هەیە. هابەرماس هاوڕایی وەک ئامانج دادەنێت، بەڵام لیۆتارد لەدژی ئەمە دەبێژێت،

کە هاوڕایی تەنها دۆخێکی دانوستاندنە نەک ئامانجی دانوستاندن. بە پێچەوانەوە پارالۆگی ئامانجە. هابەرماس بۆ ئەوەی بتوانێت لەدژی تیۆریی سیستەم ئەرگومێنت بهێنێتەوە، ئەوا ناچارە بگەڕێتەوە بۆ ئەم ئیدێیە: مرۆڤایەتی وەک ســەبژێکتی گەردوونی، تەقەلا بــۆ ئازادبوونە نێوکۆییەکەی خۆی دەدات، ئەمەش بەڕێی ڕێســای ئەو هەڵمەتانەی گەمەوە دەکات کە لەنێو گەمە زمانییەکاندا ڕێیان پێدراوە. گوتار دوایەمین ئاستەنگ بۆ تیۆریی سیستەمی سەقامگیر پێکدەهێنێت. لیۆتارد دەبێژێت، «مەســەلەکە»ی هابەرماس «چاکە، بەڵام ئەرگومێنتەکانی ئاوها نین». هاوڕایی بەهایەکی کۆنبووە و جێی گومانە، مەردوم پێویســتە بە پێچەوانەوە هەوڵ بدات بە ئیدێ و پراکسیسێکی دادپەروەری بگات.

یەکەم هەنگاو بۆ ئەمە بریتییە لە داننان بە فرەشــێوەیی گەمە زمانییەکان — بەڵام تێرۆر (بە پێچەوانــەوە — و) یەکفۆرمییەکــەی خۆی قبووڵ دەکات و دەیەوێت بیســەپێنێت. دووەم هەنگاو: تەنها هاوڕاییەکی لۆکاڵ ســەبارەت بە ڕێســاگەل هەیە، واتا تەنها هاوگەمەڤانانی هەنووکەیی بەو هاوڕاییە دەگەن، بەڵام ئەم هاوڕاییە شیاوی هەڵوەشاندنەوەیە. هاوشێوەی ئەمە، لە کایەی سۆسیالدا گرێبەســتی کاتی جێی دامەزراوی بەردەوام دەگرێتەوە. ئەمە بەڕاستی ئەمڕۆ «لە مەسەلە پیشەیی و سۆزمەندەکان، سێکســوێل و کولتوورییەکان، خێزانی و نێونەتەوەییەکان و هەروەها لە مەسەلە سیاســییەکاندا» دەبینرێت[11]. ئەم گۆڕانە دوواتایییە هاوکات ڕۆڵێکی بچووک بۆ ســەقامگیربوونی سیســتەم دەگێڕێت: سیســتەم نەرمتر و هەزرانتر و هتد دەبێت. کەواتە مەسەلەکە ئەوە نییە کە پێشنیارگەلی ئەلتەرناتیڤێکی «پەتی» بۆ سیستەم بکرێن، مەردوم دەبێت بە پێچەوانەوە خۆشحاڵ بێت بەوە کە سیستەم مەیلەکە بۆ گرێبەستی کاتی قبووڵ دەکات.

ئینفۆرماتیزەکــردن (ئەم واژەیە لە فەرەنســا بــۆ کۆمپیوتەریزەکــردن بەکاردەهێنرێت)، لێرە کاریگەریی خۆی دەنوێنێت: یان دەتوانێت ببێت بە ئامرازی خەونپێوەبینراوی کۆنترۆڵکردن و ئاژوتنی سیســتەمی بازار، ئامرازێــک کە ئیتر خودی خۆی بۆ زانین (Wissen) پــەرەی پێدەدرێت و خۆی بەڕەهایی لەژێر ڕکێفی پرنسیپی پێرفۆرماتیڤێتی / ئەنجامهێنیدا دەبینێتەوە، یان کۆمپیوتەریزەکردن خزمەتی ئەو گروپانە دەکات کە دانوســتاندن لەبارەی مێتادیسکریپســیۆنەکان ئەنجام دەدەن، ئەم خزمەتەشیان بەوە دەکات، کە ئینفۆرماسیۆنیان پێدەدات بۆ ئەوەی شارەزا بە حاڵەتەکە بڕیار بدەن. لە پرنسیپدا ئەو هێڵە زۆر ئاسانە کە مەردوم گەرەکە شوێنی بکەوێت، تاکو لە کۆتاییدا ئاڕاستەی کۆمپیوتەریزەکردن لە مەغزای خزمەتکارییەکەیدا ئاوەژوو بکاتەوە: «پێویســتە دەرفەتی وەرگرتنی خەزێنەکان و بانکەکانی داتا بۆ ناوەندی گشــتی ئاوەڵا بکرێت»[12]. بەم شــێوەیە ئیتر دەشــێت خۆزگە بۆ دادپەروەری و بۆ نەناسراو (das Unbekannte) وەک یەک ڕێزیان لێبگیرێت، «زەخیرەی زانیارییەکان کە زەخیرەی زمانە لە گۆزارەی شیاودا، نەشیاوی خاڵیبوونەوەیە»[13].

لێرەدا گەرەکە جەخت لەو ئیدێیە بکەین کە کایەی سۆســیال بە پێچەوانەی زانستەوە کە تێیدا هاوڕاییەکی مینیمال شــیاوە، واتا لە پرنسیپدا شیاوە کە سەرەتا گوێ لە هەموو ئیدێیەک بگیرێت زۆر ئاڵۆزە، زۆر نەســازە. لە کایەی سۆســیالدا پابەند بە هەر حاڵەتێکەوە، تەنها نیمچە هاوڕایی شیاوە، بەڵام کۆمپیوتەریزەکردن یارمەتی دەدات کە ئەو نیمچە هاوڕاییە بەسەر کەرتە کایەی گرنگدا تەشەنەی پێبدرێت.

کەواتە نووسینی «زانینی پۆستمۆدێرن» دەچڕژێتە نێو پرسیارێکی کراوەوە سەبارەت بە تیۆرییەکی دادپەروەری، بەڵام لەبەر ئەوەی کتێبەکە زەمینەیەکی سۆسیۆلۆژیی زانین (Wissenssoziologie) و تیۆریی زانستی (Wissenschaftstheorie) هەیە، ئەوا لێرە لەسەر ئەم زەمینەیە، نەشیاوە ئەو پرسیارە وەڵام بدرێتەوە. بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بناغەیەکی زۆر وردتری فەلسەفی پێویستە کە لیۆتارد هەوڵ دەدات لە نووسینی «Le Differend» (جیاوازی)دا گۆڕانی پێبدات.

## 3-ئێکسکورز، بیردۆزی ناتەواوی (ناکامیلی) لای کورت گۆێدل و تیۆریی زانست لای لیۆتارد:

لیۆتارد لە بەشی سیازدەمینی «زانینی پۆستمۆدێرن»دا، هەوڵ دەدات لە گۆڕانی تەنگژاوییانەی دانوستاندنە بناغەییەکانی ماتماتیک و زانستە سروشتییەکانەوە، راستاندن بۆ کۆنسەپسیۆنەکەی خۆی کە لەدژی پێشبینیی یەکایەتییەکی هزر ئاڕاستەی داوە، بدۆزێتەوە. بەتایبەتی «بیردۆزی ناتەواوی»ی کورت گۆێدل سەر بە ئەلفوبێی نزیککەوتنەوەیە لە هزری پۆستمۆدێرنە.

گۆێدل ساڵی ١٩٣١ لە «گۆڤاری ماتماتیک و فیزیک»دا، ژمارە ٣٨، گۆتارێکی بڵاوکردەوە بە ناونیشانی: «لەبارەی ئەو بیردۆزانەی پرنسیپی ماتماتیک و سیستەمە هاوشێوەکانی کە لە رووی شێوەکییەوە نەشیاوی یەکالاکردنەوەن». بەکورتی ببێژین، گۆێدل لەم گۆتارەدا پیشانی دەدات: پرنسیپەکانی ئەریتمێتیک بۆیە ناتەوان، چونکە گۆزارەی ئەریتمێتییانەی ئەوتۆ هەن کە بۆ ژمارە ئاساییەکان راستن، بەڵام لەنێو خودی پرنسیپەکانەوە شیاوی سەلماندن نین. لەم روانگەیەوە نەشیاوە بەدەربوونی سیستەمێک لە دژبێژی بە دەسوێژەکانی خودی ئەو سیستەمە بسەلمێنرێت.

ئێمە دەتوانین ئەم ئیدێیە بگشتێنین، ئینجا دەتوانین ببێژین: مەردوم دەبێت لە بنەڕەتدا لە سیستەمێکی شێوەکی / فۆرمال تێپەر بکات و رووەو مێتازمانێک دەربچێت کە لە کۆتاییدا هەمیشە «زمانی سروشتی» یان «زمانی رۆژانە»یە. ئەم زمانە گشتگیرە / یونیڤێرسێلە، چونکە هەموو زمانەکانی دی بۆ خودی ئەم زمانە شیاوی وەرگێڕانن. بەڵام ئەم مێتازمانە کێشەیەکی کرۆکیی هەیە: دەرفەت بە چێکردنی پارادۆکس دەدات. کەواتە لە کۆتاییدا هیچ سیستەمێکی کامیل، بەدەر لە دژبێژی، بێنەسازی نییە، چونکە ئەو سیستەمە دەبێت هەمیشە لەنوێوە لەنێو زمانی نەسازی رۆژانەدا قاڵ بدرێت.

بێگومان ئەمە گۆڕانی زانست دادەڕمێنێت. سیستەمی رێسای زانستەکان لە هەبوونی زمانێکەوە سەرهەڵدەدات، زمانێک کە «رێساکانی کارایییەکەی شیاوی سەلماندن نین، بەڵام پسپۆران پابەند پێیانەوە هاوڕان»[١٤]. ئەم رێسایانە لایەنی کەم تا رادەیەک داواکارین، واتا پۆستولاتن، کە سەر بە گەمەی زمانیانەی راستی نین کە لە هەقیقەتدا بناغەی زانست دەڕێژێت، بەڵکو رێسای مۆرالین، رێسای رێنوماییین (پرێسکریپتیڤن). ئەم لێهزرینانە کە لە گۆێدل و هەروەها تا رادەیەک لە ئەلفرێد تارسکی-یەوە دەردەچن، هەرگیز ناشێت هێندە بە جیدی وەربگیرێن، بەڵام سەرباری ئەمە لێوەیان «وەلاوەنانێکی حاسمی ئیدێی ئاوەز» سەرهەڵدەدات، «لەبریی پرنسیپی مێتازمانێکی گشتگیر (...)، پرنسیپی کۆیەتیی سیستەمە فۆرمال و ئەکسیۆمایییەکان دادەنرێت»[١٥].

لیۆتارد نکۆڵی لە دوو شـــت دەکات: یەکایەتیی ئاوەز و یەکایەتیی زمان. هەندێک گەمەی زمانی هەن کە دەشێت لە خۆیاندا تەواو بەدەر بن لە نەسازی، بەڵام دوای بەکارهێنانی بیردۆزەکەی گۆێدل بەســـەریاندا وەک ناتەواو دەردەکەون، واتا بەناچاری بەندن بە مێتازمانێکی نەســـازەوە. بەڵام ئایا دەشێت ئەم کۆنسەپسیۆنە وەک رێژەگەراییەکی گەمەی زمانی ببینرێت؟ لە راستیدا ئەرگومێنتەکانی لیۆتارد ئاوها دەردەکەون کە هەر وەک رێژەیەتی بەو داواکارییە یەکرەهەندییانە بدات کە بۆ راســـتی بەرزکراونەتـــەوە، بەڵام هەڵوێســـتەکەی ئەو تەواو رێژەگەرایی نییە. ئەو خۆیشـــی داواکاری بۆ ئەم رێژەگەراییـــە بەرزناکاتـــەوە. رێژەگەراییەکی تا کۆتایی هزرێنراو خودی خـــۆی هەڵدەگرێت (نەفی دەکات)، چونکە دەربڕینی «هەموو شتێک رێژەییە» یان چواندنێکی رەهای هەیە، کەواتە بەپوختی پێچەوانـــەی ئەوەیە کە گەرەکـــە رابگەیەنرێت، یان تەنها بەرێژەیی دەربـــڕاوە، بەڵام لێرەدا دەبێت رێژەگەرا بیدرکێنێت کە دۆڕاندوویەتی، چونکە ئەوســـا هەندێک شت رێژەیی دەبن و هەندێکی دیکە ئاوهـــا نابن. بێگومان خـــودی رەخنەگرانی رێژەگەرایش لەمە زیاتریان نەگۆتـــووە. کەواتە هزرێکی رێژەگەرایی بەتەواوی ئاپۆریانەیە / بێچارەسەوە. بەڵام مەردوم دەتوانێت ببێژێت: باشە، لەبەر ئەوەی زمانی رۆژانە بەراســـتی دەرفەت بە ئاپۆری دەدات، ئەوا لیۆتارد هزری رێژەگەرایی بە شـــێوەیەکی زمانفەلســـەفی بناغەڕشتووە. ئەمە روونکردنەوەکی شیاوە بۆ هزری لیۆتارد کە پێدەچێت ئەوپەڕی رەوا بێـــت، چونکـــە لیۆتارد خۆی لەم پنتەدا هەندێک شـــت بەکراویی دەهێڵێتـــەوە و بۆ هەندێکی دیکەش تەنها ئاماژە دەدات.

بەڵام من پێشـــنیاری روونکردنەوەیەکی دیکە دەکەم: کاتێـــک دەگۆترێت زمانی رۆژانە هەروەها دەرفـــەت بە پارالۆگیزم و پارادۆکســـی دەدات، ئەوا ئەم دەربڕینە دەبێت هەر چۆنێک بێت پێشـــتر لەنێو خۆیەوە بونیادگەلی تایبەتمەندی لۆگیکیانەی وەک پێشمەرج دانابێت کە ئیتر پاشان دەشێت لـــە بەردەمیاندا ئیدێ و دەرەنجامگەل وەک پارادۆکـــس، وەک نالۆگیکی دەربکەون. هەروەها ئەوەش ئاشـــکرایە کە لیۆتارد خۆیشـــی جەخت لە چواندنی گشـــتیی لۆگیک دەکات بەبێ ئەوەی بەڕوونی سەبارەت بەم چواندنەی لۆگیک لێبهزرێت. ئاخر گەر کێشەکە بەم شێوەیە نەبێت، ئەوسا ئیتر ئەو بە هیچ شـــێوەیەک ناتوانێت لەبارەی پارالۆگی و پارادۆکس بدوێت. ئەوەش ئاشـــکرایە کە لایەنگریی پارالۆگی لە لایەن ئەو تایبەتمەندییەکی فەلسەفەکەیەتی.

هـــزری «مۆدێرن» هەتا بـــۆی بکرێت هـــەوڵ دەدات پارالۆگییەکان هەڵبووەشـــێنێتەوە، بەڵام هزری پۆســـتمۆدێرن ئاگامەندانە روویان تێـــدەکات. ئایا دەتوانین ببێژین کە لیۆتارد تەنانەت وەک شـــایانی هەوڵبۆدان دایان دەنێت؟ هەندێکی لێهزرینەکانی ئەو زرنگەیەکی بەم چەشـــنەیان هەیە. بە هەر حاڵ پارالۆگییەکان لەو مەغزایەدا شـــایانی هەوڵبۆدانن، کە ئەوان هەمیشـــە لەنوێوە هەوڵە تێرۆریســـتییەکانی یەکایەتیدان دەخەنە مەترســـییەوە و هەڕەشەی هەڵوەشـــاندنەوەیان لێدەکەن. لێرەدایە کە لە هزری ئەودا — لەپاڵ داواکاریی لۆگیکیدا- داواکارییەکی دووەمی شارراوە بۆ گشتێتی هەیە: نابێت هیچ گوتارێک بچەوســـێنرێتەوە، گەرەکە شێوەیەکی دادپەروەریی گوتار هەبێت. بەمە لێهزرینەکانـــی لیۆتارد داواکارییەکی مۆرالیش لـــە خۆ دەگرن — جا ئەو دادپەروەرییەی گوتار هەر شێوەیەکی هەبێت ...

## 4-سەرچاوەی تێگەو «وەڵامدانەوەی پرسیاری پۆستمۆدێرن چییە؟»:

بێرنارد بلیستێن: «بەڵام ئایا پۆستمۆدێنە چییە؟»
لیۆتارد: «من هەوڵ دەدەم تێبگەم ئەو چییە، بەڵام نایزانم».

تێگەی «پۆستمۆدێرن» زۆر بەدەگمەن نزیکەی لە ١٩٤٠ بەدوواوە لە ناوچەی زمانی ئینگلیزیدا دەبینرێت، بەڵام بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٦٠ بەدوواوە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پتر لە رەخنەی ئەدەبیدا بڵاودەبێتەوە. ئیدی هێندەی نەخایاند ئەم تێگەیە بەسەر رەخنەی هونەریدا و ئینجا ساڵی ١٩٧٥ لە لایەن چارلس جێنکس بەسەر تەلارسازیدا بەکارهێنرا.

ئەم تێگەیە لەبەر ریزێک هۆ ناڕوونە و واتای بگۆڕی هەیە:

یەکەم: پرسیار سەبارەت بەوە کە داخۆ ئێمە لە «پۆستمۆدێرن» چی تێبگەین، بەندە بە پێناسەی «مۆدێرنە»وە. مەردوم دەتوانێت پێناسەی پۆستمۆدێرن وەک پاش-نوێسەردەم بکات و سەرەتای نوێسەردەمیش نزیکەی بە ئاشکراکردنی ئەمەریکا و شۆڕشی کۆپەرنیکییانەی جیهانبینیی ئەوروپی دابنێت. مەردوم دەتوانێت، ئەمەش لە ئەدەبناسیدا نائاسایی نییە، بە رۆمانتیک سەرەتای مۆدێرنە بدات یان لەتەک بۆدلێردا («گوڵەکانی خراپە» ١٨٥٧)، یان، وەک چۆن لە تەلارسازیدا دەکرێت، بە خانووە چەندنهۆمییەکانی (Bauhaus) نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم.

دووەم: «پۆستمۆدێرن» لە زۆرترینی حاڵەتەکاندا نیشانەیە بۆ شتێک کە جارێ لە دروستبووندایە، هەر لەبەر ئەم هۆیە ناشێت تێگەکە بەپوختی دیاری بکرێت. ئاخر دوای هەر پنتکاتێکی دیاریکراو هێشتا هەر چەندین گۆڕانی نوێ شیاون. لەم روانگەیەوە گەر بۆ نموونە رەخنەیەکی هونەر بە دیاریکردنێکی چەسپێنەر هەستێت، ئەوا ئەو رەخنەیە بریتی دەبێت لە دۆگماتیزم.

سێیەم: تێگەی «پۆستمۆدێرن» دژبێژییەکی ناخەکیی سەیر لە خۆ دەگرێت. ئاخر «مۆدێرن» واتای نوێترین دەگەیەنێت. بەڵام گەر مەردوم ئەم تێگەیە بۆ نموونە وەک «باڕۆک» یان «ئێکسپرەسیۆنیزم» هیستۆریزە بکات، ئەوسا هەندێک زەبر لە تێگەیشتنێکی پێناسەیی-لۆگیکییانەی زمان دەکات. لە بنەڕەتدا دەبێت تێگەی «مۆدێرن» هەمیشە لەتەک سەردەمدا رەت ببێت، بەڵام گەر ئەمە ئاوها بێت، ئەوسا دەبێت «پۆستمۆدێرن» بە هیچ شێوەیەک نەبێت. ئاشکرایە کە نەشیاوە زمان لەسەر ئەم شێوازە بچەسپێندرێت، چونکە زمان مێژوویيانە گەشە دەکات، هەروەها زمان دەتوانێت بەرگەی دژبێژی بگرێت و ناڕوونییەکانی گۆڕانە نوێکانی مەغزا دەربڕێت. تێگەیشتنێکی لۆگیکی-پێناسەیی زمان، دەتوانێت تەنها زمانێکی تەکنیکییانەی دەستکرد بهێنێتە ئاراوە کە نەشیاوە دەرەقەتی دیاردەکان بدات.

ئەم بگۆڕییەی تێگەی «پۆستمۆدێرن» هۆیەکە بۆ ئەوە کە زۆر جار سۆزمەندانە رەفز بکرێت. چارلس جێنکس کە لایەنگرێکی چالاکی پۆستمۆدێرنەیە، هەوڵ دەدات ئەم رەخنەیە خاوبکاتەوە، هاوکات هەوڵ بۆ پێناسەیەکی روون و ئاشکرای ئەم تێگەیە دەدات. ئەم پێناسەیەی جێنکس

بەتوندی بەندە بە ڕەخنەیەکەوە لە مۆدێرنەی کلاسیکی لە تەلارسازیدا و پنتی دەرچوونەکشی ڕوانگەی بەکارهێنەرانە: «تەلارسازیی مۆدێرن چیدی جێی متمانە نەبوو، چونکە نە دەیتوانی لەیەکتێگەیشتنێکی ڕاستەقینە لەتەک دوایەمین بەکارهێنەرەکاندا بهێنێتە ئاراوە (...) و نە بۆی لوا پەیوەندییەکی ڕاستەقینە لەتەک شاری هەبوو و مێژووەکەیدا بهێنێتە گۆڕێ. من لەم دۆخەدا چارەسەرێکم بینی: پۆست-مۆدێرنە، واتا تەلارسازییەک کە بە شێوەیەکی پرۆفیسیۆنێل بناغەدرابوو «و» هاوکات میللی بوو کە تەکنیکی نوێ و مۆدێلی کۆنی پێکەوە دەگونجاند».

لە تەلارسازیدا گرنگیدانێکی کۆمەڵایەتی هەیە بە مەرگی مۆدێرنیزم. ئەم گرنگیدانە بریتییە لە سەرەنجامی:

-لەناوبردنی ناوشارەکان و ناڕەزایی پەرەسەندووی هاووڵاتیان بەم لەناوبردنە.

-کورتهێنانی هەوڵ لەوەدا کە تەنها بە چارەسەرێکی تەکنیکی ڕووبکرێتە کێشەگەلی کۆمەڵایەتی

-کەرەسەی هەرزان و خراپ.

-گەندەڵی و کۆڕپیدۆری ناڕێکخراو.

-نهۆمی زەمینیی بیناکان لە ژێرزەمین دەچێت.

-زمانی تەلارسازیی مۆدێرن بۆ زۆربەی ئەو کەسانە کە مامەڵەی لەتەکدا دەکەن، شیاوی تێگەیشتن نییە.

چارلس جێنکس هەوڵ دەدات تێگەی «پۆستمۆدێرن» وەک دژەتێگەیەک بسەپێنێت کە بە تەسکی و پۆزەتیڤ پێناسەکرابێت، ئەمەش بێگومان لەدژی تەلارسازییەکی فۆرمە نائاساییەکان (bizzar)، لەدژی ڕەنگە زەقەکان و توخمە دەرخراوەکانی های-تێک (بۆ نموونە سەنتەری پۆمپیدو لە پاریس). ئەم جۆرە بینایانە لە ڕوانگەی جێنکس «مۆدێرنی درەنگن» (spat/ دەمەو کۆتایین - و)، بریتین لە هەڵزناندنی مۆدێرنیزم. بۆ جێنکس هەموو جیابوونەوەیەک لە مۆدێرنیزمی باڵا پۆستمۆدێرن نییە. جێنکس دەیەوێت ڕوو بکاتە پچڕان لە «ترادیسیۆنی نوێ» و نوێترین، لێرەشدا مەبەستەکەی ئەوەیە کە کاتیگۆرییەکان تەواو نوێ پڕبکرێنەوە. هەر پابەند بەم تێڕوانینەوە زۆربەی ئەوە کە ئیهاب حەسەن، ژۆن بودریارد، فریدریک جەیمس و لیۆتارد ناوی دەنێن پۆستمۆدێرن، لە هەقیقەتدا بۆ جێنکس واتای «درەنگ / دەمەو کۆتایی» دەگەیەنێت.

جێنکس کۆنسەپسیۆنەکەی لیۆتارد بۆ پۆستمۆدێرنە سووک و ئاسان وەک بەهەڵەلێتێگەیشتن دادەنێت، ئەم بەهەڵەلێتێگەیشتنە لە ڕوانگەی ئەو بەڕێی هێزە ئیغراکەرەکەی پێشگری «پۆست»ـەوە، بەڕێی تێکەڵکردنی پۆستمۆدێرنیزم بە هەر هەرەنوێتریندێک، هاتۆتە ئاراوە. لەم ڕوانگەیەوە وەک جێنکس دەبێژێت، لیۆتارد دەگات بە پێشبینیی «ئاڤۆنگاردی هەمیشەیی» (بۆ ئەمە بڕوانە ئێستێتیکی لیۆتارد)، بە ئێکسپێریمێنتی بەردەوام، بە شۆڕشی بەردەوام لە هونەردا. کەواتە گەر لەم ڕوانگەیەی جێنکسەوە بڕوانین، ئەوا لیۆتارد پابەندە بە ئێستێتیکی نوێکارییەوە (ئینۆڤاسیۆنەوە) کە مۆرکێکی سەرەکیی مۆدێرنەیە، نەک ڕاوکردن بەدووی هەمیشە نوێدا بۆ بەرژەوەندیی ئەو فۆرمە جیاوازیکراوانە یەکالا بکاتەوە کە لەسەر چەندین پانتایی شیاوی تێگەیشتنن.

رەخنەکانی جێنکس گەرەکە زۆر بە جیدی وەربگیرێن، بەڵام داواکارییەکەی کە گوایە پێناسەیەکی «راستی» تێگەکە بەرانبەر بە پێناسە «هەڵە»کەی لیۆتارد دابنرێت شیاوی وەرگرتن نییە، چونکە ئەو داواکارییە سەرلەنوێ دۆگماتیزەکردنێک دەبێت. بەکارهێنانی تێگەی «پۆستمۆدێرن» لە لای لیۆتارد روو دەکاتە شتێکی تەواو جیاواز لەوە کە تێگەکەی جێنکس رووی تێدەکات، چونکە مەبەستی لیۆتارد بریتی نییە لە قۆناغێکی هەر مۆدێرنەیەک، جا هەر چۆنێک پێناسەی کرابێت، بەڵکو مەبەستی ئەو هاتنێکی رەخنەییە بۆ نێو خودی مۆدێرنە، ئەمەش بێگومان بە دەسوێژەکانی فەلسەفە، بەڵام هەروەها هاتنێکی رەخنەیی بۆ نێو هونەری ئاڤۆنگاردیستی کە گزییەکی لەڕادەبەدەر لە پەیوەندییە شیاوەکانی ریالێتی لە خۆ دەگرێت.

لەبەر ئەوەی تێگەی «پۆستمۆدێرن» لە راستیدا پێشبینیی قۆناغێکی مێژوویی بێدار دەکاتەوە، ئەوا لیۆتارد خۆی وای بۆ دەچێت کە ئەو تێگەیە «رەنگە بەڕاستی واژەیەکی نەگونجاو» بێت. لە روانگەی لیۆتارد خودی قۆناغاندن هێشتا هەر پێشبینییەکی «کلاسیکی» یان «مۆدێرن»ـە، بەڵام لەبریی ئەمە گەرەکە «پۆستمۆدێرن» نیشانە بێت بۆ دۆخێکی سۆزمەند یان زۆرتریش لەمە نیشانە بێت بۆ دۆخێکی هۆشەکی. کەواتە کێشەکەی لیۆتارد بریتییە لە تێگەیەکی ناکاتەکییانەی (نا-کرۆنۆلۆژییانەی) پۆستمۆدێرنە.

ژۆن-لوپ تێبۆ لە «Magazine litteraire»دا دەگێڕێتەوە کە لیۆتارد لە گفتوگۆیەکی نێوخۆییاندا بە متمانەوە لە لای درکاندوویەتی کە ئەو وشەی «پۆستمۆدێرن»ی تا رادەیەک لە بۆهاتنێکی زەوقمەندەوە فڕێداوەتە نێو دێباتەوە. لیۆتارد خۆی ساڵی ١٩٨٥ رایگەیاند ئەو وشەیەی بۆیە هەڵبژاردووە، چونکە وا دەردەکەوت کە مەردوم نەتوانێت خاوەنی هیچ پێتکی تایبەتی بێت و خۆی لە ئاڕاستەوەرگرتندا پێوە رابگرێت — ئاخر ئەو وشەیە دەبوو تەنها سیگنالێک بێت بۆ ئەوە کە شتێک، جا هەر شتێک بێت، لە مۆدێرنەدا کەوتۆتە نێو پرۆسەی داوەشانەوە.

بێگومان لیۆتارد دەیەوێت شتێکی تایبەتیمان پێڕابگەیەنێت و لێرەشدا تێگەی «پۆستمۆدێرن» تەواو رواڵەتییە بەو شتە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە ئەم تێگەیە شکۆفەیەکی سوورهێنەری کرد، هەر ئەمەش لیۆتاردی ناچار کرد کە هەمیشە لەنوێوە بەڕێی راستکردنەوە و وردکردنەوەوە لەتەک فێنۆمێنەکەدا خەریک ببێت و بەم شێوەیەش شەقڵی دا بە هزری ئەو.

لیۆتارد لە گۆتارێکی (زنجیرە-) کتێبی «پۆستمۆدێرنە بۆ منداڵان»دا، بەناونیشانی «تێبینی لەبارەی واتای «پۆست»»»، هاوکات لەتەک تەلارسازیی هەنووکەیی پۆستمۆدێرندا خەریک دەبێت. مۆرکی ئەم تەلارسازییە لە روانگەی لیۆتارد بریتییە لە ئەرکی پێکەوەلکاندنێکی چەسپ لە نێوان بیناکردن و ئیدێگەلی سۆسیالی پێشکەوتندا. بەڵام ئەمە بۆ لیۆتارد پڕکێشەیە، چونکە گەر لەم روانگەیەوە لە مەسەلەکە تێبگەین، ئەوسا پێشگری «پۆست» نیشانە دەبێت بۆ زنجیرەیەک کە وەک سەرەنجام لە شێوەیەکی برواهێنانەوە (Bekehrung) بە هزرێکی نوێ دەکەوێتەوە، ئەمەش بەتەواوی ئیدێیەکی مۆدێرنە. کێشەی ئەمە لەوەدایە کە مەردوم ئیتر ناچار دەکرێت رابوردوو لەبیرببباتەوە و بیچەوسێنێتەوە، بەڵام رابوردوو (...) هەمیشە لەنوێوە بەڕێی سیتات و چەندپاتکردنەوەوە ئاڕاستەبەخش دەبێتەوە.

ئیدێی پێشکەوتن و ئازادکردن (ئێمانسیپاسیۆن)، لە هەردوو سەدەی رابوردووی خوێناویدا

نشوســـتیی هێنا و لیۆتـــارد هەوڵ دەدات ئەم نشوســـتییە بەرێی ناوی خۆیـــی (Eigennamen)، ناوی جێ و ناوی کەســـانەوە پیشـــان بدات، بۆ نموونە ئاوسشڤیتس. بەڵام هەروەها چیدی مەردوم ناتوانێت گۆڕانی تەکنۆ-زانستەکان ناو بنێت پێشکەوتن، چونکە ئەو گۆڕانە لەنێو بزووتنی خۆیەوە بەردەوامـــی بە خۆی دەدات نەک لە پێداویســـتیی مرۆڤانەوە. لەوە دەچێت پەســـتانی هەمەتوێژی مۆدێرنە پێداویســـتییەکانی ئێمە بۆ ئاســـایش و شـــوناس و بەختیاری، بەکورتی ئەکزیستێنسی راســـتەوخۆمان وەک بوونەوەری کۆمەڵایەتیی زیندوو، بخزێنێتە ســـەر کەناری کۆمەڵگە. جگە لەمە پرۆژەی مۆدێرنە بۆیە نشوســـتیی هێنا، چونکە ئەو پرۆژەیە بۆ ســـەرجەم مرۆڤایەتی بیرکرابۆوە، کەچی لایەنی کەم نیوەی مرۆڤایەتیی خســـتە بەردەم پرســـیاری مانەوەی پەتی (مەبەستی لیۆتارد برسێتییە لە جیهانی سێ).

بـــەم پێیە ئەرکی ئێســـتا، گەڕانی رەخنەییە بـــەدووی ئەو پنتانـــەی لێوەدەرچووندا کە لەنێو خودی مۆدێرنەدا هەبوون. لیۆتارد دەیەوێت لەبریی پابەندبوون بە ئیدێی پێشـــکەوتن و ئازادییەوە، پابەندبوون بە ئیدێیەکی شرۆڤەوە دابنێت، لێرەشدا پسیکۆئانالیز وەک پێشنموونەی / سەروێنەی ئـــەم ئیدێیە وەردەگرێت — ئەمە بێگومان لە مەغزایەکی تـــەواو مەجازیدا، چونکە ئەو مێتۆدەکەی پسیکۆئانالیز وەرناگرێت. لیۆتارد دەیەوێت بە چەشنێک لە «پۆست»ی نێو وشەی «پۆستمۆدێرن» تێبـــگات کە ئیتر ئەو وشـــەیە واتای گەڕانـــەوە، واتای چەندپاتکردنەوە نەگەیەنێـــت، بەڵکو واتای پرۆسەیەکی «ئانا» (ana) لە مەغزای ئانالیز یان ئانامنێز و هتد بگەیەنێت، ئەمەش وەک کارکردنی کۆتاییهێنەر بە لەبیرچوونەوەی ســـەرچاوەیی. گەر ئەمە نەکرێت، ئەوسا ئێمە بەوە مەحکوم دەبین کـــە «نیـــۆرۆزە مۆدێرنەکان»، شـــیزۆفرێنی و پارانۆیای خۆرئاوایی چەندپـــات بکەینەوە. ئەمە لە تەلارسازیدا بریتی دەبێت لە رواڵەتگەرایی و سیتاتی پەتی و هتد.

پۆســـتمۆدێرنە لە روانگەی لیۆتارد دوای کۆتایی مۆدێرنیزم نایەت، بە پێچەوانەوە پۆستمۆدێرنە نیشـــانەیە بۆ دۆخی پێش زایینی مۆدێرنیزم. لیۆتارد ئەمە دژبێژانە دەردەبڕێت: «تەنها ئیشـــێک مۆدێرنە کە پێشتر پۆستمۆدێرن بووبێت».

ئێمە دەتوانین ئەم دژبێژییە بەم شێوەیە شرۆڤە بکەین: پۆستمۆدێرن بریتییە لە تاقیکردنەوەی ئاڤۆنگاردیســـتی لـــە ســـەردەمی ســـەرهەڵدانی خـــودی تاقیکردنەوەکـــەدا، ئەویـــش کاتێک دژی کۆنڤەنســـیۆنەکان، دژی هاوڕایی و چێژ دەوەســـتێتەوە. بەڵام مۆدێرن بە پێچەوانەوە هەوڵێکە تاکو سەرلەنوێ یەکایەتی و ریالیزم بخاتەوە، هەروەها رێکخراوگەل دابمەزرێنێت و ئاڤۆنگارد لەناوبەرێت — بێگومـــان هەوڵێکی بەم چەشـــنە ئـــەو کاتەش لە گۆڕێـــدا دەبێت، کاتێک ئەم جـــۆرە هەوڵانە لەژێر دروشـــمی «پۆستمۆدێرن»دا دەردەکەون. پۆســـتمۆدێرن بەئاگابوونێکە کە چاوەڕوانیی هیچ گونجاندنێک (Versohnung) لە نێوان گەمە جیاوازە زمانییەکاندا ناکات.

بـــەم پێیە هەموو بڕوابوونێک بە گونجاندن، بریتییە لە بەدئەندێشـــە (ئیللوزیۆن) و بە تێرۆر هەقەکەی دەدرێت. کۆنســـەپتەکەی لیۆتارد ئەمەیە: «جەنگ دژی هەمەکێتی. با شـــایەتی بۆ ئەوە بدەین کە نەشـــیاوی دارشـــتنە، با جیاوازییەکان چالاک بکەین، با شـــەرەفی نـــاو رزگار بکەین». ئـــەم دەربڕینە ســـۆزمەندە کۆتایی گۆتارەکەیەتی بە ناونیشـــانی «وەڵامدانەوەی پرســـیاری: ئایا پۆســـتمۆدێرن چییە؟». لێرەدا بە ئاشـــکرا لوغزێک بۆ ناونیشانی گۆتارەکەی کانت لە ساڵی ١٧٨٤،

واتا «وەڵامدانەوەی پرسیاری: ئایا رۆشنگەری چییە؟»»، لەگۆڕێدایە و بەمەش لیۆتارد داواکارییەکی پرۆگرامییانە رادەگەیەنێت. بەڵام لێرەدا گەرەکە مەردوم ئەو ئاماژە سنووردانەرانە بە جیددی وەربگرێت کە لیۆتارد لە گفتوگۆکەیدا لەتەک بێرنارد بلیســـتێندا دەیاندات: دانوستاندنی پۆستمۆدێرنە جارێ لە ســـەرەتادایە، چۆن ئەو دەمەش کە کانت تێکســـتەکەی نووسی، جارێ پرسیاری رۆشنگەری لە ســـەرەتادا بوو؛ بەڵام هەروەها: ئەو دانوستاندنەی پۆســـتمۆدێرنە کە جارێ لە سەرەتادایە، رۆژێک «کۆتایی پێدێت بەبێ ئەوەی تەواوکرابێت»[١٦].

لیۆتارد ساڵی ١٩٨٢، کاتی سەرهەڵدانی نووسینی «جیاوازی»، تێکستێکی بچووکی بۆ گۆڤاری بەیبیلۆن (Babylone) نووســـی: «تێبینیی خێرا لەســـەر پرسیاری پۆســـتمۆدێرنە». لیۆتارد بەم تێکســـتە هیچ داواکارییەکی تیۆرییانە بەرز ناکاتەوە، تێکستەکە بریتییە لە ئێسەیەک، یان تەنها هەوڵێکە و بەم رێیەشەوە دەتوانێت هەندێک پنتی پرکێشە روونتر تیژبکاتەوە: «»سەرمایەداری» یەکێکە لە ناوەکانی مۆدێرنە»، سەرمایەداری لە هەڵمەتی گشتگیری کشانیدا دەست بەسەر زمانیشدا دەگرێت و وەریدەگۆڕێت بۆ شمەکێکی بەبەرهەم (پرۆدوکتیڤ). زمان لەنێو کوانتی ئینفۆرماسیۆندا (زانیاریدا) وای لێدەکرێت کە شـــیاوی کۆنترۆلکردن بێت. بەڵام کە داخۆ لەم کارە چ ســـەرەنجامێک دەکەوێتەوە، ئەوە ئێمە تازە دەیبینین. جگە لەمە لیۆتارد تێگەی نامۆبوون وەک نەگونجاو دەبینێت بۆ تێگەیشتن لەو کێشانە کە لەو کارەوە وەک ئاکام کەوتوونەتەوە.

ئـــەم گۆڕانە بـــە هەر حاڵ ســـەرنجمان رووەو بونیادی زمان رادەکێشـــێت. کەشـــفە مەزنەکانی ئاڤۆنگارده زانســـتی و ئەدەبی و هونەرییەکان لەم ســـەدەیەدا پیشـــانی دەدەن کە زمان ئامرازێکی راگەیاندن (کۆمونیکاسیۆن) نییە، کە پێشبینیکردنی زمان وەک ئینفۆرماسیۆن بێمەغزایە، کە تەنها دورگەگەلی رســـتەگەل هەن و «ســـەر بە رێکخراوگەلی ناهاوتان کە ئیتر مەحاڵ دەبێت رستەیەکی نێو رێکخراوێک» بۆ رســـتەیەکی رێکخراوێکـــی دیکە وەربگێڕرێت. پۆســـتمۆدێرن گەڕانە بەدووی ناهاوســـەنگی لە نێوان رێکخراوگەلی رســـتەکاندا، گەڕانە بەدووی نەبوونی شیمانەی وەرگێڕانیان بۆ یەکتری. هەر لەم مەغزایەدا فرۆید، مارسێل دوکامپ، نییلس بۆر، گێرترودە شتاین، بەڵام هەروەها رابیلێ و شتێرنە پۆستمۆدێرنن: ئەوان جەخت لە پارادۆکسییەکان دەکەن کە نیشانەیەکی رۆشنی ئەم ناهاوسەنگییەن. مەردوم دەتوانێت هەندێک بەشی فەلسەفەی فەرەنسیی ساڵانی رابوردوو، بێگومان هەتا ئەو رادەیە کە جەخت لەم ناهاوسەنگییە دەکەن، بە هەمان شێوە ناو بنێت پۆستمۆدێرن:

–دێریدا: هەڵوەشاندنەوەی نووسین،

–فووکۆ: نارێکخراویی گوتار،

–سێرێس: پارادۆکسییە ناسینتیۆرییەکان،

–لێڤیناس: ئالتەریتێ، دەرکەوتنی ئەویدی،

–دێلوز: مەغزا سەرەنجامییەکان کە وەک ئاکام لە بەیەکگەیشتنە کۆچەرییەکانەوە دەکەونەوە.

"گەر مەردوم ئێستا بەم ناوەوە لەنێو سەری خۆیدا ئادۆرنۆ بخوێنێتەوە، بەتایبەتی تێکستەکانی وەک تیۆریی ئێســـتێتیکی، دیالێکتیکی نێگەتیڤ یـــان مینیما مۆرالیا، ئەوا دەرک دەکات کە هەتا چەنـــد ئادۆرنۆ ئەو دەمـــە لە هزرینیدا پۆســـتمۆدێرنەی بە بەرچاوەوە بوو، گەرچـــی ئەو زۆر جار بەرانبەری بێلایەن، جا گەر نەڵێین رەفزکەرانە، وەستابۆوە»[١٧].

لیۆتارد لێرەدا روانگەیەک دابین دەکات کە تێیدا رەخنەی سەرمایەداری، دەگوێزرێتەوە بۆ گەڕان بەدووی ناهاوسەنگی لە زماندا. ئەم تێڕوانینە کە سەرەتا وەک سوورهێنەر دەردەکەوێت، روونتر دەبێتەوە گەر مەردوم رەچاوی ئەوە بکات کە بۆ لیۆتارد پەیوەندیی کۆمەڵایەتی بریتییە لە زمان و «پارە لە لایەنی خۆیەوە تەنها روویەکی زمانە»[18]. کاتێک مارکس سەرمایەداریی وەک سیستەم دەبینێ، ئەوا لیۆتارد بە پێچەوانەوە هەوڵ دەدات وەک فیگوری زمان بیبینێت. لە پشت ئەمەوە چەندین رەهەندی تیۆریانەی جیاواز خۆیان دەبیننەوە، بەتایبەتی لێهزرینی کۆمەڵناسیانە سەبارەت بە وەرگۆڕینی کۆمەڵگەی ئیندوستری بۆ کۆمەڵگەی ئینفۆرماسیۆن (کۆمپیوتەریزەکراو — و).

لیۆتارد نە کۆمەڵناس و نە ئابووریناسە. تیۆرییەکانی دانیەل بێل و ئالان تورێن لەمەڕ کۆمەڵگەی پۆستئیندوستریەل، بۆ لیۆتارد تەنها فێنۆمێنی پاشخانین و بە هیچ شێوەیەک شرۆڤە و دانوستاندنی پنتەکانی دەرچوونیان ناکات. لیۆتارد لەبریی ئەوەی بۆ پشتەوەی ئەو تیۆرییانە بگەڕێتەوە، هەوڵ دەدات هەنگاوێک پتر بەرەو پێش بنێت و دەسوێژی رەخنەیەکی فەلسەفییانەی تێگەی ئینفۆرماسیۆن بەگەڕ بخات، تاکو بە فۆرمێکی تایبەتمەندی هزرینێک بگات کە زمانشرۆڤەیی بێت: زمان جیاواز و زیاترە لە ئینفۆرماسیۆن، هەر بۆیە ناشێت لە شێوەی لێشاوی هێڵئاسادا بگیرێت، بەڵکو توانستێکی بەرهەڵستی لە خۆ دەگرێت. لە خوارەوە هەندێک لەبارەی ئەمە دەدوێین.

## 5- "جیاوازی" – ئیشە سەرەکییە زمانشرۆڤەییەکەی لیۆتارد:

لە نووسینی «جیاوازی»دا کە سالی ١٩٨٣ بڵاو دەبێتەوە و لیۆتارد خۆی (لەسەر بەرگی چاپە فەرەنسییەکە) ناوی دەنێت «ئیشە سەرەکییە فەلسەفییەکەم»، تەنها لە سێ جێدا تێگەی «پۆستمۆدێرنە» دەردەکەوێت، بەڵام خێرا روون دەبێتەوە کە لیۆتارد هەوڵ بۆ بناغەڕشتنێکی زمانفەلسەفی دەدات و «وەک پۆستمۆدێرنەی شایانی گرنگیپێدان» دیاریی دەکات — شایانی گرنگیپێدان بە پێچەوانەی ئەمە-نوێ، ئەوە-نوێ، پۆست-سێسی، پۆست-سێلا.

نووسینی «جیاوازی» لە رووی فۆرمی دەرەکییەوە، کتێبێکی ئاسایی فەلسەفی نییە. کتێبەکە لە ٢٦٤ ئافۆریزم پێکدێت و هەر یەکەیان نزیکەی نیو لاپەڕە پڕدەکاتەوە، هەروەها چواردە «ئێکسکورز»ی تێدایە کە کەمێک وردتر تایپکراون و لە نێوان ئافۆریزمەکاندا دانراون؛ ئەم ئێکسکورزانە بریتین لە تێبینیی شرۆڤەییانەی خوێندنەوە (لێکتیور) بۆ نموونە بۆ پرۆتاگۆراس، پلاتۆن، ئەریستۆتێلیس، چوار جار کانت، هەروەها بۆ لێڤیناس، بۆ جاڕی مافەکانی مرۆڤ لە سالی ١٧٨٩ و چیرۆکەکانی کاشینوا هیندیانەکانی بەرازیل.

ئیدێ بناغەییەکەی کتێبەکە ئەمەیە: زمان (Die" Sprache,,[19]) یەکایەتی نییە، بەڵکو نایەکایەتییە (هێتەرۆگێنە). ئەوەی هەیە، جۆری جیاوازی گوتارە: زانین، فێرکاری، مافداری، لەخشتەبردن، رەوایەتیدان، لەرزاندن، کۆنترۆلکردن و هتد. «زمان» بەگشتی هەبوونی نییە (...). جۆرە جیاوازەکانی گوتار ناهاوسەنگن بە یەکتری، ئەمەش بە واتای هیچ رێسایەکی گشتیی بڕیار پابەند بە جۆرە جیاوازەکانی گوتارەوە نییە. دوای رووخانی چیرۆکە مەزنەکان دەزانین کە هیچ

بالادەســـەلاتێکی ناوبژیوانی دادوەری نییە. تاکە شـــتێک کە نەشـــیاوی گومانلێکردن بێت، ئەوەیە کـــە رســـتەگەل «روو دەدەن»؛ گەر مەردوم گومـــان لەمە بکات، ئەوا گومانکـــردن «روو دەدات». پرسیارەکە هەمیشە ئەمەیە: «ئایا روو دەدات؟»، ?«arrive-t-il». لیۆتارد لەم پنتەدا زۆر بەئاگایە کـــە هەڵگیراوی (مەحمولـــی) «هەقیقی-ـە» (ist wirklich) یان خودی «ـــە» (ist) نەداتە پاڵ رســـتەکان. مەردوم دەبێت بیبێژێت «کە» شـــتێک روو دەدات، بەلام کە داخۆ چی روو دەدات، ئەمە سەر بە جۆرێکی تایبەتیی گوتارە. لۆگیک لە «پێش چۆن»-ەوەیە «نەک لە پێش چی»یەوە.

کێشـــەکەی جیـــاوازی ئەمەیە: بەدووی رســـتەیەکدا دانەیەکی دیکە دێـــت (هەروەها نەپەیڤین وەک رســـتە دیاری دەکرێت)، رستەیەک لەتەک رســـتەکەی پاش خۆیدا پێکەوە گرێدەدرێن، ئەمەش بەگوێرەی سیســـتەمگەلی رێســـای رســـتە کە لەنێو ژانرێکی گوتاردا چواندیان هەیە، بەلام لێرەدا دەشـــێت کە مەردوم بـــە بەردەوامپێدانێکی تەواو جیاواز بگات، جا هـــەر بەردەوامپێدانێک بێت کە ئیتر پاشـــان ســـەر بە جۆرێکی دیکەی دیســـکورز دەبێت. مەردوم ناچارە گرێـــدان ئەنجام بدات، بێگومان نەک لەســـەر یەک تاکە شـــێواز. کاتێک مەردوم گرێدەدات، ئەوا بەم کارە هەمیشە بێدادانە هەڵوێســـت بەرانبەر بەو گرێدانە شـــیاوانە وەردەگرێت کە ئەو هەڵیـــان نابژێرێت. ئەمە بریتییە لە ناوکی «جیاوازی»یەک بە پێچەوانەی «جیاوازیی (ناکۆکیی- و) قەزائی» کە لەنێو ژانرێکی گوتاردا روو دەدات و بەگوێرەی رێساکانی ئەو ژانرە شیاوی هەڵبژاردنە. ناکۆکییەکی قەزائی لە پرنسیپەوە شـــیاوی بڕیاربەسەردادانە، بەلام «جیاوازی» شـــیاوی ئەوە نییە. هەر گوتارێک کە وەک دەگۆترێت فەزلـــی هەیە، یان هەر مێتاگوتارێک، هیچی دیکە نییە جگە لە گوتارێک بەپاڵ گوتارگەلی دیکەوە، بەلام ئایا لەنێو یان بەگوێرەی چ گوتارێک بڕیاردانێک ســـەبارەت بەوە دەشـــێت کە گوایە گوتارێک خۆی بەسەر یەکێکی دیکەوە دەبینێتەوە؟

پێویســـتیی بڕیاردان بۆ ئەوە کە داخۆ کێشـــەکە بریتی بێت لە جیاوازییـــەک یان ناکۆکییەکی قەزائی، خۆیشـــی لە کرۆکەوە کێشـــەیەکە. نموونەیەک: پارت (بێگومان پارتی پرۆلیتاری)، ناچارە دوو جـــۆر گوتـــار یەکبخات کە لە پرنســـیپەوە بە یـــەک ناگونجێن: لە لایەک چێنـــی کرێکاران کە وەک ئۆبژێکتـــی ئیدیالی (رەنگە هەروەها وەک ســـەبژێکتی) ئیدێی مرۆڤایەتیی کارکەری ئازادکراو دادەنرێت، بەلام لە لایەکی دی چینی رێئالی کرێکاران وەک بابەتی رستە کۆگنیتیڤەکان. کەواتە ئەوە پەڕینەوەیەکە لە لایەنێکی دێسکریپتیڤەوە بۆ لایەنی نۆرماتیڤ، واتا لە لایەنی راڤەکەرەوە بۆ لایەنی رێنومادانەر، بەلام تەنها کاتێک ئەم پەڕینەوەیە شـــیاو دەبێت، گەر پارت دەســـت بەسەر مۆنۆپۆلی ئەو جۆر و شـــێوازانەدا بگرێت کە بۆ رۆشنکردنەوەی روودانگەی (Wirklichkeit) مێژوویی-سیاسی گەرەکی ئەنجامدانن.

بەلام لێرەدا جیاوازییەک دەچەپێنرێت کە بەردەوام لەنێو کرۆکی بزووتنەوەی کرێکاراندا سەرلەنوێ سەرهەڵدەداتەوە، ئەمەش بەتایبەتی وەک خەریکبوونی چەندپاتکراوە لەتەک پرسیارەکانی رێکخستندا (ئەمە بەپوختی واتای مۆنۆپۆلی پارت و بەتایبەتی مۆنۆپۆلی ســـەرکردایەتی دەگەیەنێت). مەردوم هەوڵ دەدات ناکۆکییەکە لە شـــێوەی ناکۆکییەکی قەزائیدا بەربخات — لەم حاڵەتەشدا ئیتر بیرۆی سیاســـی وەک دادگا بڕیار دەدات. ئەو خۆی پارتە و هەمیشـــە لە بەرژەوەندیی ســـەنترالیزم، هێنی مۆنۆپۆل، بڕیار دەدات. بەلام لەبەر ئەوەی مەســـەلەکە لە بنەڕەتدا جیاوازییەکە (نەک ناکۆکییەکی

قەزائی — و)، ئەوا جیاوازییەکە بەرێی ئەو هەڵوێستەی پارتەوە تەنها بەرهەم دەهێنرێت، بەڵێ جیاوازییەکە خۆی لەسەر کەنارەکانی رێکخستن بەرهەمدەهێنێتەوە.

لە کۆتایی «زانینی پۆستمۆدێرن»دا وا دەردەکەوت کە هەروەک ناوکی کۆنسەپسیۆنی دادپەروەری لە لای لیۆتارد چواندندان بێت بە گەمە زمانییە جیاوازەکان. ئەو تەنانەت پێشتریش، لە نووسینی «Economie libidinale» («ئابووریناسیی خۆزگە»)دا، وازی لە جووتە تێگە دژبەرەکەی چاکە/ خراپە هێنابوو، ئەمەشی بۆ بەرژەوەندیی کۆنسەپتێکی کرۆکەکانی گۆزارە (die Intensitaten) کردبوو. ئەو جۆرە ئیدێیانە (هێنی چاکە / خراپە — و) لە کۆتاییدا شیاوی چەسپاندن نین — ئاخر کوا سەنگی مەحەک، گەر کرۆکگەلی جیاوازی گۆزارە بەردەوام بە یەکدا بکێشن؟

بۆیە لیۆتارد لە نووسینی «جیاوازی»دا، بەشی «بەرپرسیاری»، گۆڕان بە تیۆرییەکی بناغەیی دادپەروەری دەدات و ناوکە کرۆکییەکەی رێزگرتنە لە مافەکانی مرۆڤ. کەواتە ئەو هەڵوەشاندنەوەیەی جەختییەکان کە لیۆتارد ئەنجامی دەدات، لە بەردەم «مینیمومێکی جەختی»دا دەگیرسێتەوە. ئاخر ئەو گومانگەرا نییە کە گومان لە هەموو شتێک بکات و بەم رێیەشەوە لە کۆتاییدا هیچ تێڕوانینێک رانەگەیەنێت، بەڵام ئایا گومانکەرە گەردوونییەکان کە لە کۆتاییدا گەیشتن بە پنتێکی نەشیاوی گومانلێکردن، لەو پنتەوە سەرجەمی فەلسەفەکەی خۆیانیان هەڵنەبەست؟ بۆ دێکارت جەختیی «من گومان دەکەم کەواتە من هەم» کافی بوو. هەروەها کارل-ئۆتۆ ئەپڵ تەواو هاوشێوە دەهزرێت: کێ گومان بکات، دەبێت پرەمەغزایانە ئەرگومێنت بهێنێتەوە، لەمەشەوە ئیتر سەرجەمی باقییەکەی دی وەک ئاکام دەکەوێتەوە. بەڵام لیۆتارد چەند لەمپەرێکی دژی رەوتێکی بەو چەشنەی هزرین بینا کردووە و ئەو لەمپەرانە هەمیشە لەنوێوە لە رەوتی شرۆڤەی سەرهەڵدانی بەرپرسیاریی مۆرالیدا دەردەکەون.

لیۆتارد سەرەتا پیشانی دەدات کە چۆن مەردوم ترادیسیۆنیانە بیر لە ئێتیک دەکاتەوە. بەرپرسیاریگەل لەو مەغزایەدا هەن، کە مەردوم داوای هۆشرایەڵی بەرانبەر بە نۆرمێک دەکات، بەڵام لەبەر ئەوەی نەشیاوە نۆرمێک لە پەیوەندییە فاکتییەکانەوە (دراوەکانەوە)، نەشیاوە گەرەک (das Sollen) لە بوونەوە، بدەرئەنجامێنرێت، ئەوا مەردوم دەبێت چواندنەکەی کە نەشیاوی دەرئەنجامدندنە، واتا چواندنە بێقەید و مەرجەکەی، قبووڵ بکات. کەواتە جۆری ئێتیکییانەی گوتار بەرپرسیاری دەهێنێتە ئاراوە و بۆ خۆیشی تەنها رێ بە رێسای بەرپرسیاریی بێقەید و مەرج دەدات.

لیۆتارد هەوڵ دەدات بە شرۆڤەیەکی تێڕوانینەکەی کانت لەمەڕ «کاوسالێتی لە ئازادییەوە» (لە «رەخنەی ئاوەزی پراکتیکی»دا)، پیشانی بدات کە مەردوم ناتوانێت بەرپرسیاری بدەرئەنجامێنێت. کانت گۆتبووی، نەشیاوە مەردوم بتوانێت ئەو ریالێتییە ئۆبژێکتیڤییە کە یاسای مۆرالی هەیەتی، بە دەسوێژی ئاوەزی تیۆریانە یان مەزەنەیی، یان ئاوەزی ئەمپیریانە هاوکاریکراو، هەڵبهێنجێت، نەخێر، تەواو پێچەوانەکەی ئەمە شیاوە: مەردوم دەتوانێت لە خودی رستەی پرێسکریپتیڤ شێوەیەکی دراوی هەقیقی (فاکتوم) تێبگات و بەمەش وەک پنتی لێوەدەرچوون بۆ هەڵهێنجانێک (دێدوکسیۆنێک)، واتا بۆ هەڵهێنجانی ئازادی، وەریبگرێت. لیۆتارد لەمەوە دەگات بەم تێڕوانینە: «یاسا وەک نەشیاوی دەرئەنجاماندن دەمێنێتەوە. (...) مەردوم ناتوانێت (...) بدێژێت کە ئازادی شیمانە بۆ ئەزموونکردنی مۆرالێتی، بەرپرسیاری، دەرەخسێنێت. ئەم بەرپرسیارییە دراوی هەقیقی

(فاكتوم) نییه كه ئیتر مەردوم بتوانێت بیسەلمێنێت، بەڵكو تەنها هەستێكە، فاكتومێكی ئاوەزە، هێمایەكە»[٢٠].

ئەوە هزرۆكەی كانت بوو كه یاســای مۆرالی فاكتومێكی ئاوەزە و لەوە زیاتر شیاوی بناغەڕشتن نییه. بەڵام لیۆتارد هەنگاوێك پتر لەم هزرۆكەیەی كانت دەنێت: ئەو یاسایه هەستێكە، هێمایەكە. ناشـێت پەڕینـەوەكان /رایەڵەكان لە كایەی كۆگنیتیڤەوە بۆ كایەی پرێسـكریپتیڤ بریتی بن لە دەرئەنجاماندنـی تیۆریانـە، بەڵكو مەردوم دەبێـت لە جێیەكی دی بۆ ئـەو پەڕینەوانە بگەڕێت، واتـا لە توانسـتی بڕیاردا، لە هێزی بڕیاردا، كه كانت لە سـێیەمین رەخنەكەیـدا، واتا «رەخنەی توانسـتی بڕیار»، شرۆڤەی كردبوو. كانت رەخنەیەكی چوارەمی بەناوی «رەخنەی ئاوەزی سیاسی» نەنووسی.

بەڵام لیۆتارد سـەرباری ئەمە لە خۆی كانتییەكی رەخنەی سـێیەم و چوارەم تێدەگات. لیۆتارد دەبێژێت، مەردوم دەتوانێت لە مەغزایەكی تایبەتیدا نووسـینه سیاسـییەكانی كانت وەك چوارەم رەخنە دیاری بكات. دابەشـاندنی ئەم نووسینه سیاسیانە بەسەر تێكستی بچووكدا تەواو گونجاوە بە هەمەلایەنێتیی بابەتە سیاسـییەكە. كانت لە «رەخنەی توانستی بڕیار»دا هەندێك پەڕینەوەی ناتیۆریانە یان ناتێگەیی ی دیاری كرد: بۆ نموونە جوانی وەك سیمبۆلی چاكە — ئەمە پەڕینەوەیەكە لە كایەی ئێسـتێتیكییەوە بـۆ كایەی مۆرالی. یان: بەدئەندێشـە (ئیللوزیـۆن) نموونەیەكە بۆ پەڕینەوەیەكی نشوسـتیهێناو، كه سەرهەڵدەدات گەر ئێمە لە كایەی ئەوتۆدا ئەرگومێنت بهێنینەوە كه بۆیان هیچ بابەتێكی لێڕوانین لەنێو كات و راومدا / فەزادا نەبێت.

لیۆتارد هەوڵ نادات لیسـتێك بۆ شـیمانە هەمەلایەنییەكانی پەڕینەوە دابنێت، ئەو بەتایبەتی گرنگـی بە یەك پەڕینەوە دەدات كه لە نووسـینه سیاسـییەكانی كانتـدا بینیویەتییەوە: هێمای مێژوو. كانت ئەم واژەیە لە پەرەگرافی پێنجی «شـەڕی كۆلێژی فەلسـەفە لەتەك كۆلێژی یاسادا» بەكاردەهێنێـت. لێرەدا كێشـەكە رووی لەو پرسـیارە دەكرد كه «داخۆ رەگـەزی مرۆڤ بەردەوام بەرەو چاكتربوون پێشبكەوێت». بێگومان كانت لێرەدا هەموو شێوەیەكی «دیاریكردنی ئایندەیی» رەتكردەوە، ئاخر لەوە دەچوو كه سـەلماندنێكی راسـتەخۆ مەحاڵ بێت، ئەویش چونكە مەسەلەكە لێـرەدا رووی لە ئیدێ دەكرد، بەڵام ئایا چۆن گەرەكە ئەم پێشـكەوتنە بە شـێوەیەكی ئەمپیری، لەنێو لێڕوانیندا بڕاسـتێنرێت؟ ئاخر مەسـەلەكە رووی لە شتێك دەكرد كه جارێ لەگۆڕێدا نەبوو. كانــت هەوڵی دەدا پنتێكی چەسـپ / هێمایەك بۆ لێوەدەرچـوون، حاڵەتێكی دراو، بدۆزێتەوە كه نەدەبوو هۆكاری پێشـكەوتن بێت (ئاخر گەر ئەو هۆكارە وا بووایە، ئەوسـا ئەرگومێنتهێنانەوەكە خولگەییانە دەسووڕایەوە). كانت ئەم هێمایەی لەو هەژانەدا (ئێنتوسیازمەدا) دۆزییەوە كه شۆڕشی فەڕەنسی لەنێو لێڕوانەرەكانیدا، بۆ نموونە لە ئەڵمانیا، هێنایە ئاراوە. ئەم پەڕینەوەیە بەدەر نییه لە نادروسـتی. هەژان سۆزێكە، «هەڵچوونێكی بەهێزی هەسـتە و بۆیە كوێرە». كانت پابەند بە بەئاگابوونە رەخنەییەكەی خۆیەوە سـەبارەت بەم هەژانە گۆتی، كه «شایانی ئەوە نییه ئاوەز پێی هۆشسام بێت».

لیۆتارد لە «جیاوازی»دا دەنووسێت: هەژانی مێژوویی-سیاسی نزیكە لە گەوجێتییەوە، فێیەكی لە رێسـا دەرچووە و وەك ئەمـەش خاوەنی هیچ چواندنێكی ئێتیكی نییـە، چونكە ئێتیك داوای

ئازادبوون لە هەر شێوەیەکی هەڵچوونی / پاتۆسی بزوێنەر دەکات. ئێتیک تەنها ڕێ بەو هەڵچوونە پاسیڤە / بێسۆزە دەدات کە لەتەک بەرپرسیاریدا ڕەت دەبێت — ڕێز. بەڵام سەرباری ئەمە هەڵچوونی هەژاو لە بەربوونە کاتییەکەیدا چواندنی ئێتیکییانە لە خۆ دەگرێت، ئەو هەڵچوونە هەژاوە «هێما»یەکی وزەگەرایە (ئینێرگێتیکە)، گرژییەکی «خۆزگە»یە[٢١].

لیۆتارد ساڵی ١٩٨٦ نووسینی «LEnthousiasme» («هەژان»)ی بڵاوکردەوە (...). لەو برگەیەدا کە ئێمە ئێستا لە سەرەوە وەک سیتات لە نووسینی «جیاوازی»ەوە هێنامانەوە، ئیدیێ ناوکییەکانی ئەو سەبارەت بەم بابەتە تەواو پوختکراونەتەوە و بریتین لە: میانەگریی ڕەخنەیی-کانتی کە پەیوەست بەم سۆزەوە هەیە، هاوکات ئەو تێڕوانینە کە لێرە ئاماژە بە پەڕینەوەیەک لە جۆرێکی گوتارەوە بۆ جۆرێکی دیکە دەدرێت، بێگومان پەڕینەوەیەک کە بەراستی ڕوونادات، بەڵکو دەچێتە نێو «کۆڵانی داخراوی ناهاوسەنگییەکانەوە». بەڵام ساتە وزەگەراکە ئامادەیە (...).

ئێنتوسیازم / هەژان سەر بە هەستە مەزنەکانە، وەک ئەمەش «بێفۆرم و شێواو»ـە. مەترسییەکانی بەسەهووداچوون لە حاڵەتی ئەم سۆزەدا یەکجار گەورەن. لیۆتارد بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە لە بەدئەندێشەی سیاسی دەدوێت. کرۆکی ئەم بەدئەدێشەیە بەپوختی ئەوەیە کە گەر مەردوم وا بزانێت ئەم هێمایانە ریالێتین. چ کانت و چ لیۆتارد جەخت لەوە دەکەن ئەوان تەنها مەبەستیان لە هەژانی ئەو لێڕوانەرانەیە کە بە حاڵەتەکەوە نەگلاون، واتە ڕاستەوخۆ گرنگی بە حاڵەتەکە نادەن.

هەژان هەستێکی ئێستێتیکییە. تەنها گەر ئەم کۆنسەپتە ڕاستەوخۆ بەسەر سیاسەتدا بەکارنەهێنرێت، ئیتر دەرفەت دێتە ئاراوە تاکو ئەو چارەسەرە کە کانت بۆ ئەنتینۆمییەکەی بڕیاری چێژ دەیدۆزێتەوە، کارا ببێت، واتا: ئیتر مەردوم دەتوانێت لەبارەی بڕیارەکانی چێژ دێبات بکات، بەڵام ناتوانێت بە ئەرگومێنتی چواندووەوە بەتێری دانوستان بکات. هەژان بانگەواز بۆ کۆهەستێک (sensus communis لای کانت) دەکات کە وەک کۆهەست «نۆرمێکی دیارینەکراوە». ئەم دیارینەکراوییە گەرەنتی دەدات کە هیچ تێگەیەک چواندنی ڕەهای نەبێت و مەردومیش ئیتر ناچار بێت لەبارەی ڕێکبکەوێت، بەڵام بە پێچەوانەوە لەسەر ئاستی پەرچاندن توانستێکی تێگە، توانستێکی دارشتن هەیە. چارەسەری ئەنتینۆمییەکەی چێژ لای کانت بەم چەشنەیە: بڕیارەکانی چێژ بۆیە کارەکتەری گشتێتییان هەیە، چونکە ئەوان ڕوو دەکەنە سێنسێکی بەگشتی هەبوو کە دەشێت لە لای کەسانی دیکەش وەک پێشمەرج دابنرێت. کەواتە هاوبەشییەکە لە تاکە بڕیاردا نییە، بەڵکو خۆی لەسەر پانتایی پەرچاوەی توانستە کۆییەکە دەبینێتەوە. بەڵام ئەم کێشەیە تەنها ئیدێیەکە و هەرگیز ڕاستەوخۆ شیاوی دارشتن نییە.

"چارەسەرەکەی کانت ڕوو دەکاتە خودی ئەو هەستە کە ئەوان هەردووکیان بەزەرووره شئوری پێدەکەن، گەر وا نەبێت، ئەوسا ناتوانن نێویەکییانە لە ناتەباییەکەیان (Uneinigkeit) حاڵی ببن»[٢٢]. بۆ لیۆتارد ئەم چارەسەرەی ئەنتینۆمییەک هەنگاوێکە بۆ چارەسەرێکی شیاوی جیاوازییەک. کەسەکان زەمینەیەکی هاوبەشی پەرچاندن / لێهزرین دەدۆزنەوە و دەتوانن لەسەری نێویەکیانە لە ناتەباییەکە حاڵی ببن، بەڵام بە هیچ شێوەیەک ناتەباییەکە بەو ڕێیەوە ناڕەوێتەوە — ئاخر ڕەواندنەوە ئەو چەوتە دەرەنجامە دەبێت کە لیۆتارد دژایەتیکردنی دەکات بە ئامانجی سەرەکیی فەلسەفاندنەکەی.

ئیدێـــی حاڵیبوونی نێوکۆیی لە ناتەبایی هاوکات پیشـــانی دەدات کە لیۆتارد هێندە دوور نییە لە تیۆرییە سیاســـییەکانی پەیمان، بەڵام ئەو لە لایەنی خۆیەوە ســـوورە لەسەر ئەو تێڕوانینە کە جەختکردن لە هاوبەشـــێتیی چێژ هێشـــتا هەر «تەبابییەکی ئاوەزمەندانـــە» نییە. لیۆتارد تێگەی «تەبایی ئاوەزمەندانە» پابەند دەکات بە ئاستی حاڵەتەکەوە نەک بە بڕیاری پەرچاوەوە. حاڵیبوونە نێوکۆییەکە سەبارەت بە ناتەبایی هەر لەسەر ئاستی هەست دەمێنێتەوە.

مەبەستی لیۆتارد ئەوەیە کە جیاوازییەکە لەنێو حاڵەتی ساغنەکراوە و لەنێو گرژیدا بهێڵێتەوە. کەواتە هزری پەرچاوە بەڕاستی ناتوانێت ئەو جیاوازییە چارەسەر بکات، هزری پەرچاوە تەنها پێی دەکرێت جیاوازییەکە بە وشە دیاری بکات:

"جیاوازی بریتییە لە دۆخی ناســـەقامگیر و ســـاتی زمان، لەنێو ئەم دۆخەدا شتێک هێشتا هەر چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە پێویستە بکرێت بە رستە. ئەم دۆخە بێدەنگی وەک رستەیەکی نێگەتیڤ لە خۆ دەگرێت، بەڵام هەروەها روو دەکاتە رســـتەگەلی ئەوتۆ کە پرنســـیپیانە شیاون. ئەوە کە ئەم دۆخە پیشـــانی دەدات، وەک باوە ناو دەنرێت هەســـت. «مەردوم هیچ وشـــەیەکی پێنادۆزرێتەوە» و هتـــد. بێگومان گەر مـــەردوم بییەوێت رێنەدات ئەم جیاوازییە لە لایـــەن ناکۆکییەکی قەزائییەوە بخنکێنرێت و ئیدزارەکەی هەســـتیش بێســـوود بێت، ئەوا گەڕانێکی پڕتەقەلا پێویستە تاکو رێسا نوێکانی پێکهێنان و گرێدان بۆ رســـتەکان ببینرێنەوە و لە توانایاندا بێت شـــیمانەی دەربڕین بۆ ئەو جیاوازییە بڕەخســـێنن کە لەنێو هەستدا سەرهەڵدەدات. بۆ ئەدەبێک، بۆ فەلسەفەیەک، رەنگە تەنانەت بۆ سیاســـەتێکیش ئەوە گرنگ بێت کە جیاوازییەکـــە دەرببڕێت، ئەویش بەوە کە مەردوم شێوازە پەیڤینی (ئیدیۆمی) پێگونجاوی بۆ دەدۆزێتەوە»[٢٣].

گـــەر فەلســـەفەیەک لەمـــە زیاتری بوێـــت، ئەوا ئەو فەلســـەفەیە بەنـــدە بە بەدئەندێشـــە و چەوتەدەرئەنجامەوە. فەلســـەفەی مێژوو لە مەغزای هێگل یان مارکســـدا بـــۆ نموونە دەخزێتە ژێر رکێفی ئەو رواڵەتەوە کە هێماکانی مێژوو وەک هەقیقەت وەربگرێت.

سیاســـەت «جۆرێکی گوتار نییە، بەڵکو هەمەلایەنێتییەکەی گوتارە، بریتییە لە هەمەلایەنێتیی مەبەســـتەکان و بەتایبەتیش بریتییە لە پرســـیار ســـەبارەت بە پێکەوەگرێدان»[٢٤]. سیاســـەت لە شـــێوازێکی تایبەتیدا «هەڕەشـــەیە لە جیاوازی»[٢٥]. «جیاوازی لە سیاســـەتی (...) راوێژکارانەدا، لە سیاســـەتی دیمۆکراتییـــە مۆدێرنەکاندا، رەچاودەکرێت»[٢٦]، لێرەدا جـــۆری جودای گوتار رۆڵێک دەگێـــڕن لە: دۆزینەوەی حاڵەتە دراوەکان، شـــیمانەکانی کردار، گەیشـــتن بە قـــەرار، بڕیار، بناغە نۆرماتیڤـــەکان و هتد. سیاســـەتی مۆدێرن دەبێـــت بەردەوام جۆری هەمەچەشـــنەی گوتار پێکەوە بلکێنێت، — لێرەشـــدا زۆر دەشـــێت بەدئەندێشەی یەکایەتی سەرهەڵبدات و وا بکات کە مەردوم بۆ ماوەیەک جیاوازییەکەی لەبیربچێتەوە یان وا لە جیاوازییەکە بکات کە شـــیاوی تەحەمولکردن بێت، بەڵام بەگشتی لایەنی راوێژمەندی ئەوپەڕی لاواز و قرچەڵۆکە، بە پێچەوانەوە لایەنی نارڕاتیڤ، لایەنی گێڕانەوەی ئەفسانەیی و هەروەها فەلسەفەی مێژوو، چەسپیوترن، بەهێزترن، جەختترن. نارڕاتیڤ جۆرێکـــی گوتارە، راوێژمەندیش تەنها پێکهاتەیەکی ناچەســـپی ئەوە، «ئەمەش بەســـە بۆ ئەوەی رووداوە دراوەکە و جیاوازییەکەی نێوی شکۆفە پێبدرێن»[٢٧].

ئەمە بریتییە لە کرۆکی ئێتیکە سیاسییەکەی لیۆتارد. مەسەلەکەی ئەو لە بنەڕەتدا روو دەکاتە تیۆرییەکی لیبەرالانەی کۆگەرایـــی (پلورالیزم) کە دەیەوێت بەتایبەتی گەرەنتی بە جیاوازییەکانی گوتارەکان بدات، بەڵام لیۆتارد لەوە زیاتر پەرە بەم کۆنسەپتە تیۆریانەیە نادات، بەڵێ ئەو بەتایبەتی واز لە وەرگرتنی (رێسەپسیۆنی) ئەو تیۆرییە مۆدێرنانەی بەشداریکردن دەهێنێت کە لە لای ئێرنست فرێنـــکل و جۆن رۆلس دەبینرێن، پێدەچێت ئەم جۆرە تیۆرییە کۆنســـەرڤاتیڤانە بە لیۆتارد نامۆ بن.

## فەرهەنگۆک:

**ئافۆریزم:** جۆرێکی داڕشتنە کە پوخت و چڕ مەغزایەکی هزری دەردەبڕێت.

**ئانا:** (لە زمانی گریکیدا) پێشگرە و واتاکانی بریتین لە: «رووەو»، «سەرلەنوێ»، «بەگوێرەی»

**ئانالیز:** شرۆڤە

**ئانامنێز:** یادهێنانەوە (ئەم تێگە گریکییە لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ پلاتۆن: دەروون ئیدێکان کە پێش هاتنی بۆ نێو لەش لە ڤێهەیە سەرمەدییەکەیدا بینیونی، دەهێنێتەوە یادی خۆی).

**ئانۆنیومێتی:** نەناسراویی یان دیارینەکراویی شوناسی کەس، وەک بۆ نموونە لە حاڵەتی غەریبێتیدا

**بارۆک:** ستیلێکی هونەریی سەروەر بوو لە نێوان 1600 هەتا 1759 لە ئەوروپا

**بڕیـــار:** (Das Urteil / بـــە ئەرەبی «القچیە») تێگەیەکی بناغەیی لۆگیکە و لە بنەڕەتدا لە دادوەرییەوە وەرگیراوە. بڕیار دەربڕینێکە لەســـەر شـــتەکانی جیهانی دەرەوەی بێژەر، کە دەشێت بەپوختی، یان کەم و زۆر، ڕاست یان هەڵە بێت. بۆ نموونە: "سۆکرات کەچەڵە" یان "بازنە خولگەییە".

**بەئاگابوون:** بە ئەڵمانی: Bewusstsein، بە ئەرەبی: الوعی.

**پارادۆکس:** گۆزارەیەکی بە رواڵەت هاوکات راست و هەڵە.

**پارانۆیا:** نەخۆشییەکی پسیکۆلۆژیانەیە، بەواتای: دەردی راونان. بۆ نموونە دوو کەس پێکەوە پێدەکەنن، کەســـێکی ســـێیەمیش لە نزیکیانەوە وا دەزانێت کە ئەوان بە ئەو پێدەکەنن. ئەم کەســـەی ســـێیەم نەخۆشی پارانۆیای هەیە.

**پراکسیس:** بە ئەرەبی (عملی)

**پرێسکریپتیڤ:** رێنومایی

**پرێمیس:** پێشـــدانراو (فەرەزیات). بۆ نموونە لە سیلۆگیزمدا (زانســـتی پێوەر) دوو بڕیار وەک پێشدانراو / پرێمیـــس هەن کـــە نێوانە تێگەیەکیان هەیە و لێوەیان بڕیارێکی ســـێیەم / کۆنکلوزیـــۆن وەک دەرئەنجام دەردەکێشرێت: سۆکرات مرۆڤە، مرۆڤ بمرە، دەرئەنجام: سۆکرات بمرە.

**پسیکۆئانالیز:** شرۆڤەی ژیانی ناخەکی (پسیکۆ) کە زیگموند فرۆید گۆڕانی پێدا.

**پێرفۆرماتیڤێتـــی:** بریتییە لـــە تێگەیەکی تیۆریی کـــرداری ئاخافتـــن (Sprechakttheorie). مەردوم بەڕێـــی کرداری پێرفۆرماتیڤەوە ئاخافتن لە رووی کاراییە راگەیەنەرییەکەیەوە (کۆمونیگاتیڤ) ئەنجام دەدات: «فەرمانـــت پێـــدەدەم کە دەرگاکە دابخەیت» (دەربڕاوە بۆ فەرمانداندان بە شـــتێک)، یان: «ئیدنزارت دەکەم، وا

ئۆتۆمبێلەکـــە نزیکدەکەوێتەوە» (دەربڕراوە بۆ ئیذزارکردنی کەســێک). دەربڕینـــی پێرفۆرماتیڤ جیاوازە لە دەربڕینی کۆنســـتاتیڤ (چەسپیو). ئەمیان راستە یان هەڵەیە و پابەندە بە گۆتنی شتێکەوە، بەڵام دەربڕینی پێرفۆرماتیڤ نە راســـتە و نە هەڵەیە، مەبەســـتەکەی تەنها ئەوەیە کە شتێک بکرێت، ئەمەش لە گۆتنی پەتی تێپەڕ دەکات.

**پۆستئیندوســتریەل:** ئیندوستری بریتییە لە کۆی فابریکە دروستکەرەکانی شمەک، ئەم تێگەیە لە رووی سۆســـیۆلۆژییەوە واتا: «کۆمەڵگەی پاش-ئیندوســـتریانە»، کەواتە کۆمەڵگەیەکی ئیندوستریانە کە خۆی لە دۆخێکی نوێدا دەبینێتەوە.

**پێرفۆرمانس:** بەکارهێنانی زمان

**پێشــبڕیار:** لە لۆگیکدا بڕیـــار ( Das Urteil/ قضية) هەیە کە هەنگاوتەری بابەتەکە یان حاڵەتەکەیە و لە زەینەوە دەدرێت. بەڵام پێشبڕیار (قضية مسبقة) لە بۆچوونەوە بەبێ بناغە، کەواتە بەبێ ناسینی بابەتەکە یان حاڵەتەکە، دەردەبڕرێت.

**پەرەگراف:** برگە لە تێکستی یاساییدا

**ترادیسیۆن:** (بە ئەرەبی «تقليد»)، ئەوەیە کە لە ڕابوردووەوە گەیەنراوە و سەروەریی هەیە.

**دژبێژی:** تێگەیەکی کرۆکیی فەلســـەفەیە. مرۆڤ بۆ نموونە تێزێکی هەیە، پاشـــان لە ڕەوتی داڕشـــتندا بە دەربڕینی دیکە دژبێژیی تێزەکەی خۆی دەکات.

**دۆگماتیست:** دۆگم بیروباوەڕێکی چەسپێنراوە و لێدان لێی نەشیاوە. دۆگماتیست ئەو کەسەیە کە پەیڕەوی دۆگمەکان دەکات.

**دینۆتاتیڤ:** تەنها دیاریکردنی ناوەرۆکی تێگەیەک

**ریالێتی:** (واقيع)

**ژانر:** تەرز یان جۆر (بۆ نموونە لە ئەدەبدا)

**سپۆنتان:** (عفوی)

**سەبژێکت:** بکەری ئاگامەند کە بە هەڵبەستنی یان بیناکردنی زانست هەڵدەستێت.

**سەبژێکتیڤی:** کارێکی هزری کە تەواو لە خۆیەکی بکەرییانەوە ئەنجام بدرێت.

**سەنترالیزم:** (المركزيه)

**سێنس:** بریتییە لە تۆمارگریی فیزیۆلۆژیانە لەنێو مرۆڤ و ئاژەڵە پێشکەوتووەکاندا. سێنسەکان بریتین لە سێنسی بینین، بیستن، چێژتن، بۆنکردن، گرتن.

**ســیتات:** (اُقتباس) لە تەلارســـازیدا وەرگرتنی (ئیقتیباســـە) لە ئیشـــە کۆنەکانەوە و دانانی لەنێو پلانە تەلارسازییە نوێکەدا.

**شێوەکی:** فۆرمال

**شیزۆفرێنی:** نەخۆشییەکی پسیکۆلۆژیانەیە، کە تێیدا کەسێتی دووبەش بووە.

**فاکت:** دراوی هەقیقی (واقيع).

**فاساد:** رووی پێشەوەی بینا.

**فۆرمال:** شێوەکی.

**کاتیگۆری:** تێگەی بناغەیی، جۆر.

**کریتێر:** مۆرک، سەنگی مەحەک.

**کۆریدۆر:** (مەمەڕ).

**کۆگنیتیڤ:** زانینمەند.

**کۆنتێکست:** (سياق).

**کۆنسەپسیۆن:** پلانی تیۆرییانە، بناغەی پرۆژەی هزری یان هونەری.

**کۆنڤەنسیۆن:** پەیمان (معاهدە)، رێککەوتن. کۆنڤەنسیۆنی بە واتای: ترادیسیۆنی.

**مانیپولاسیۆن:** کۆنترۆلکردنی مرۆڤان بەبێ ئاگاداریی خۆیان.

**مێتادیسکریپسیۆن:** سەرراڤە (راڤە لەبارەی راڤە).

**مێتازمان:** زمانێکە کە مەردوم تێیدا دەربڕین لەبارەی زمانێکی دیکە، واتا ئۆبژێکتزمان، ئەنجام دەدات. بۆ روونکردنەوەی مێتازمان لە وشەوە سەرچاوە دەگرین کە دەشێت لە کۆنتێکستی جیاوازدا واتای دیکەی هەبێت، بۆ نموونە «رانیە شـــارێکی کوردیە»، هەروەها: «رانیە لە پێنج پیت پێکدێت». لە رستەی یەکەمدا مەبەست لە «رانیە» ئۆبژێکتێکی دەرەکییە، بەڵام لە رســـتەی دووەمدا مەبەست لە خودی «رانیە»یە. رانیە لە حاڵەتی یەکەمـــدا ئۆبژێکتزمانییانە بەکاردەهێنرێت، بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا مێتازمانیانە. ئۆبژێکتزمان لە کۆمەڵێک هێما پێکدێت و ئەو هێمایانە بابەتی ریال دیاری دەکەن. مەردوم لێرەدا هاوکات لە زمانێکی پەلە یەک دەدوێت. بـــەڵام مێتازمـــان پلەیەکی دووەمینی هەیە و مەردوم تێیدا لەبارەی ئۆبژێکتزمان دەدوێت. بۆ نموونە تێگەکانی «راست» یان «هەڵە» سەر بە مێتازمانن، چونکە رووەدکەنە وشەکانی یان رستەکانی ئۆبژێکتزمان.

بڕوانە: Thomas Zoglauer, Einfuhrung in die formale Logik fur Philosophen, Gottingen .2002, 12f

**مینیموم:** لایەنی کەم

**نۆرم:** پێوەر (معیار)

**نیـــۆرۆز:** تێکچوونێکی پســـیکۆلۆژیانەیە کە لە قۆناغی تایبەتیی منداڵیدا بەهـــۆی ناکۆکیی ناخەکییەوە دروست دەبێت (فرۆید).

**ئۆبژێکـــت:** بابەتی یان حاڵەتی یان کێشـــەی دانراو لە لایەن ســـەبژێکتی ئاگامەنـــدەوە. بە کوردی بابەت بەکاردەهێنرێت کە راست نییە، ئەویش چونکە مەرج نییە بابەتێک دانراوی (مەوزوعی) سەبژێکتێک بێت.

**ئۆبژێکتیڤی:** دیدی یان تێڕوانینی یان روانگەی فەزلدەر بە دانراوەکەی (واتا بە مەوزوعەکەی) سەبژێکت.

**ئۆنتۆلۆژی:** بوونناسی.

**هابیلیتاسیۆن:** پلەیەک لە دکتۆرا بەرزترە، لێکۆڵینەوەیەکە کە پاشان بە زانا پلەی پرۆفیسۆر دەدرێت.

**های-تێک:** تەکنۆلۆژیای باڵا، پێشکەوتووترین تەکنۆلۆژیا.

**هیپۆتێز:** گریمانەی زانســـتی کە جارێ سەلماندنی گەرەکە. دەسوێژێکی ناسینی زانستییە بۆ سەلماندنی شـــتە یاسادارەکان یان دراوێکی ریال، کە لەشێوەی گەڕانەوەدا بۆ ســـەرچاوەی دروستبوونیان خۆی دەنوێنێت. هیســـتۆریزەکردن: جەختکـــردن لـــە هەقیقەتی مێـــژوو، یان هەر دیاردەیـــەک یان دراوێک بەگوێـــرەی کرۆکە مێژووییەکەی دیاری بکرێت.

**هیندیانە:** (هندی سوور!)

**هەڵگیراو:** (مەحمول / پرێدیکات). بۆ نممونە: "سۆکرات مرۆڤە". لەم بڕیارەدا "سۆکرات" سەبژێکتە، بەڵام "مرۆڤ" هەڵگیراوی سەبژێکتە.

**یونیڤێرسال:** گشتی، گشتگیر، جیهانی، گەردوونی

**ئەریتمێتیک:** ئەو بەشەی ماتماتیکە کە لەتەک ژمارەدا خەریکدەبێت

**ئەکسیۆمایی:** راستیی چواندوو، بنەمایەک کە بەرەهایی وەک راست ئیئترافی پێکراوە.

**ئەنتینۆمی:** واتاکەی بەپوختی بریتییە لە پێکەوەنەگونجاویی یاســـاگەل. جۆرێکی تایبەتییە لە دژبێژییە لۆگیکییەکان. لەم حاڵەتەدا دەربڕینی بە یەک دژبەرمان هەن کە هەموویان بەچاکی لە هەمان رادەدا بناغەرێژراون یان (لە حاڵەتی سیستەمە فۆرمالەکاندا / شێوەکییەکاندا) سەلمێنراون. کانت ئەنتینۆمی ناودەنێت «ناتەبایی یاساکان».

**ئیندوستری:** کۆی فابریکە دروستکەرەکانی / بەرهەمهێنەرەکانی شمەک.

**ئێسەی:** گۆتار، فۆرمێکی کراوەی نووسینە بە پێچەوانەی نووسینی داخراوی سیستەمییانەوە.

**ئێکسپرەسیۆنیزم:** هونەری گۆزارشتگەرا (التعبیریە) لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە ئەوروپا

**ئێکسپیێریمێنت:** تەجروبەی زانستی یان هونەری یان ئەدەبی

**ئێکسکورز:** لادان لە بابەتێکی سەرەکی. لەم نووسینەدا لادانە لە بابەتە سەرەکییەکەی لیۆتارد رووەو گوێدل.

## پەراوێز:

1 ) J. Habermas, Untiefen der Rationalitätskritik, in: ders., Die Neue Unübersichtlichkeit. Kleine politische Schriften V, Frankfurt/M 1985, S. 137

2) Wolfgang Welsch, Die Philosophie der Mehrsprachigkeit, In: Die politische Meinung, 32 Jg., 1987, Nr. 231, S. 63

3) Lyotard, Pierre Souyri – Le marxisme n´a pas fini, S. 11-31

4) Lyotard, Das postmoderne Wissen, S. 13

٥) شێوازی توێژینەوەی ئەڵمانیدا لە لای زۆرینەی فەیلەسوفەکان جیاوازی دەکرێت لە نێوان سەرەتا / زوو (یان گەنج) و ناوەند (یان کامڵ) و کۆتاییدا (یان درەنگدا)، بۆ نموونە مارکسی سەرەتا / زوو و کامڵ و درەنگ/کۆتایی. ئەم جیاوازیکردنە هەروەها سەردەمەکانی یان ئێزگەکانی یان قۆناغەکانی شێوە هزرینێکیش دەگرێتەوە. بۆ نموونە: چەرخی نێڤینی سەرەتا (زوو)، باڵا و درەنگ (کۆتایی) — ک.ج.

٦ )دانراو بۆ نموونە لە گەمەی پۆکەر یان بیستویەکدا هەیە، کەواتە ئەوەیە کە بەکوردی ناو دەنرێت «حەوزەکە» — ک.ج.

7) Lyotard, Das postmoderne Wissen, S. 116 f.

8) Ebenda, S. 131

9) Ebenda, S. 135

10) Lyotard, In: Grabmal des Intellektuellen, S. 73

11) Lyotard, Das postmoderne Wissen, S. 191

12) Ebenda, S. 192

13) Ebenda, S. 193

14) Ebenda, S. 127

15) Ebenda, S. 128

16) Lyotard, Immaterialität und Postmoderne, S. 74

17) Lyotard, In: Grabmal des Intellektuellen, S. 87

18) Ebenda, S. 85

١٩)مەبەست لە زمان بە دیاریکراوییە، بە ئەرەبی «اللغە»، هەروەک بڵێین «زمانەکە» — ک.ج.

20) Lyotard, Der Widerstreit, S. 206
21) Ebenda, S. 275
22) Ebenda, S. 278
23) Ebenda, Aphorismus, S. 22
24) Ebenda, S. 230
25) Ebenda
26) Ebenda, S. 274
27) Ebenda, S. 250

## تێبینیی وەرگێڕ:

-دابەشـــاندنی ئەم نووســـینە وەرگێڕراوەی بەردەم جیاوازە لە دابەشاندنی نێو کتێبەکە، چونکە ئەو کتێبە لێکۆڵینەوەیەکی دەروازەییە لەتەک هزری لیۆتارددا، ئێمە هەندێک بەشی بەتایبەتی گرنگمان هەڵبژارد و دوای وەرگێڕانیان رێکخستنمان پێدانەوە، هاوکات لە هەندێک جێدا بابەتەکەمان کورتکردۆتەوە.

-بە چاکمان زانی کە لەم وەرگێڕانەدا هەندێک سەرچاوەی سیتاتەکان دیاریبکەین، چونکە رەنگە خوێنەر (ی نووسەر یان ئەکادیمی) بتوانێت بۆ توێژینەوە بەکاریان بهێنێت.

## سەرچاوە:

Walter Reese-Schafer: Loytard. Hamburg ١٩٩٥

# سەدەی دیموکراسی

فەرید زەکەریا
لە ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف

ئێمە ئیستا لە سەردەمی دیموکراسیدا دەژین. لەسەدەی ڕابردوودا سەرجەم وڵاتانی جیهان یەک ڕێڕەویان گرتبوەبەر. بۆ زۆربەی وڵاتانی جیهان، سەدەی ڕابردوو سەدەی سەرهەڵدانی دیموکراسی بوو. لە ساڵی ١٩٩٠دا تاکە وڵاتێک نەبوو بەم شێوەیەی ئەمڕۆ گرنگی بە دیموکراسی بدات. ئیستا حکومەت بە هەڵبژاردن پێکدەهێنن و هەموو هاوڵاتییەکی پێگەیشتوو دەتوانێت دەنگ بدات. ئەمڕۆ ١١٩ حکومەت لە سەرتاسەری جیهاندا کە دەکاتە ٦٢٪ی سەرجەم وڵاتانی جیهان بە هەڵبژاردن دروست بوون. سەردەمانێک لە زۆربەی وڵاتانی باکوری ئەتڵەنتیک مومارەسەی سیاسەتیان بە شێوەیەکی دیاریکراو دەکرد، کەچی ئەمڕۆ بونەتە ستانداردێک لە حکومەت، بەجۆرێک کە فۆرمێکی مرۆیی وەرگرتووە. ئیستا لە جیهاندا سیستەمی پادشایەتی بۆتە دیاردەیەکی سەیر، فاشیزم و کۆمۆنیزم بەتەواوی هەڵگری گومانن. لەم سەردەمەدا تەنانەت ئەو وڵاتە ئیسلامییانەی کە حکومەتێکی دینییان هەیە بە دەمارگرژییەکی کەمەوە دیموکراسی پەسەند دەکەن.

لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا دیموکراسی بە تاکە سەرچاوەیەکی زیندوی ڕەوایەتی بواری سیاسی دەناسرێت. دیکتاتۆرەکانی وەک حوسنی موبارەک لە میسر و ڕۆبەرد موگابی لە زیمبابۆی هەوڵ و کۆششێکی زۆر دەکەن بۆ ئەوەی هەڵبژاردنی نەتەوەیی ئەنجام بدەن، کە گومانی تێدا نییە ئەوان زۆر بە ئاسانی هەڵبژاردن لە وڵاتەکانیاندا دەبەنەوە. کاتێک دوژمنانی دیموکراسی بە زارەکی و

بێ کردەوە باس لە نەریتی دیموکراسی دەکەن ، تۆ دەزانی  کە ئەوان دەتوانن ئەو شەڕە ببەنەوە .

ئێمە لە سەردەمی دیموکراتیدا دەژین، ئەمەش دروست ئەو ساتەیە کە بیر و هۆشمان فراوانتر دەبێت. بە فۆرمی ڕیشەیی گریکەکان و تێڕوانینی ئەوان، «دیموکراسی» مانای «دەسەڵاتی خەڵک» دەگەیەنێت. لە هەموو شوێنێک ئێمە گەواهی ئەو ڕاستیەین کە دەسەڵات لە سەرەوە بۆ خوارەوە، واتە بۆ ناو جەماوەر لە گۆڕاندایە . من دەتوانم ئەمە ناوبنێم «بەدیموکراتیزەکردن»، هەرچەندە بە سیاسەتیشدا تێدەپەڕێت، بەڵام پرۆسەکە جیاوازە: پیرۆزی دەسەڵات ئیستا لە جیهاندا تێکشکاوە و بەرەو نەمان دەچێت، سیستەمە داخراوەکان ئیستا کرانەوەی بەرچاویان بەخۆوە بینیوە . سانسۆرەکان لەسەر «گشت»، لەسەر هەموان، بەشێوەیەکی کۆمەڵایەتی گۆڕانیان بەسەردا هاتووە . دیموکراسی توانی وا لە حکومەت بکات کە فۆرمێکی نوێ بە ژیان ببەخشێت.

با لەبارەی ڕەچاوکردنی دنیای ئابورییەوە بدوێم. جیهانی ئەمڕۆی کاپیتالیزم بەشێوەیەکی ڕاست و ڕوون تەنها پەیوەندی بە بەجیهانیبوون و زانیاری و تەکنەلۆژیاوە نییە –بەڵکو پەیوەندی بە «دیموکراسی»یەوە هەیە . لەماوەی نیو سەدەی ڕابردووی گەشەکردنی ئابووریدا کە بووە هۆی دەوڵەمەندبوونی سەدان ملیۆن کەس لە دنیای پیشەسازیدا، کارکردن و پاراستن و لێکۆڵینەوە لەم دیاردەیە فۆرمێکی گشتی وەردەگرێت. ئەمەش وایکرد کە بنەمای کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەکان گەشە بکات. هێزی ئابووری بۆ ماوەی زیاد لە سەدەیەک بوو لەلایەن چەندین گروپێکی بچوک و پیاوانی بازرگان و خاوەنی بانکەکان و بیرۆکراتەکانەوە وەگەڕ دەخران، لە ئەنجامدا هێزی ئابووری لەو سەردەمەدا تەواو دابەزی. ئەمڕۆ زۆرترین کۆمپانیا –لەڕاستیدا زۆرترین وڵات– چاوەڕێی پشتیوانی کەس ناکەن بۆ دەوڵەمەندبوون، بەڵکو زۆربەیان لە چینی مامناوەندن. ڕاستتر لەوە مایەی زۆربەی گروپە بەرهەمهێنە تایبەتەکان ئیستا بچوک بونەتەوە و بەهۆی بوونی خانەنشینی کریکارانەوە بچوکبوونەوە و ڕیوەڵەبوونی ئەو گروپانە بەئاسانی هەست پێدەکرێت.

بە هەمان شێوە کەلتوریش بە دیموکراتیزە کراوە . بێگومان سەردەمانێک وەک دەبینرا «کەلتوری باڵا» بەردەوام لە گەشەکردندابوو. بەڵام چانسی وەبەرهێنان ئاوابوونی بەخۆوە بینی. لەوەش زیاتر ژیان و کەلتوری کۆمەڵگەکان بە شێوەیەکی داخراو نامێنێتەوە، میوزیکە میللییەکان و باشترین جۆرەکانی فیلم و تەلەفزیۆنەکان فۆرمێکی جیهانیان وەرگرتووە . ئەم سێ بوارە بەردەوامی و پێکهاتەی سەردەمی مۆدێرن دەکەن و ئاوابوونی ئەو سەردەمەمان نیشان دەدات کە هەموو کەس لە کۆمەڵگەدا لەیەک دەچن.

شۆڕشی دیموکراسی لە کۆمەڵگەوە سەرچاوە دەگرێت و دەتوانێت پێناسەی ئێمە بۆ کەلتور بگۆڕێت. بۆنمونە ئیستا ناوبانگیش فۆرمێکی جیهانی وەرگرتووە، مادۆنای گۆرانیبێژ کە گۆرانی دەڵێت پرسیار لەسەر ئەوە نییە «کێ» گوێی لێدەگرێت، بەڵکو پرسیار لەسەر ئەوەیە کە «چەند» کەس گوێی لێدەگرێت لە سەرتاسەری جیهاندا. ئیستا «چەندایەتی» بووە بە «چۆنایەتی».

لەم گۆڕانە دراماتیکییانەدا چی بەرهەم دێت؟ لە هەر پێوەرێکی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانەوە چەندین پاڵنەر بۆ بەرهەمهێنانی شەپۆلی دراماتیکی –شۆڕشی تەکنەلۆژیا، گەشەکردنی سامانی چینی مامناوەند، هەرەس هێنانی ئەلتەرناتیڤی سیستەمەکان و ئەو ئایدۆلۆژیایانەی کە کۆمەڵگەیان بەڕیوەدەبرد بەتەواوی هەستپێدەکرێت. بۆ ئەو هەموو هۆکارە سیستەماتیکە گەورانە هۆکاری تر شک دەبەین: ئەمریکا –سەرهەڵدان و زاڵبوونی ئەمریکا– وڵاتێک هەم سیاسەت و هەم کەلتورەکەشی

بە قوڵی زاڵە، ئەو وڵاتەی هەڵگری سیاسەتی بەتیموکراتیزەکردنە و پێی وایە هەر دەبێت دیموکراسی بچەسپێت. هەرچۆنێک بێت هۆکارەکانی شەپۆلی دیموکراسی هەڵگری ئامانجی چاوەڕوانکراوە لە هەموو شوێنێک یاخود وڵاتێکدا. دەسەڵاتە تاکڕەوەکان هەرەس دەهێنن و دەسەڵاتی تاک فراوانبوونی بەخۆوە بینیوە و ئەو کۆمەڵگایانەی لەبەردەم گۆڕاندان لە پشتەوەی ئەم سیاسەتەوەن. لەڕاستیدا گرنگییەکە لەوەدایە کە چ ئاشکراییەک لە دنیای ئەمڕۆماندا بەدی دەکرێت کە دەرئەنجامەکەی فکری دیموکراسی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە.

هەروەها وەک ئەوەی ئێمە بینیمان و خوێندنەوەمان بۆی هەبوو کە لە ساڵانی (١٩٩٠)ەکاندا تەکنەلۆژیا و ڕاگەیاندن بەدیموکراتیزە دەکران. ئەمەش بەشێوەیەکی ڕێژەیی دیاردەیەکی نوێیە. لە ڕابردوودا تەکنەلۆژیا یارمەتی بەهێزکردنی بەسەنتەرکردن و دەسەڵاتە تاکڕەوەکانی دەدا. بۆ نمونە لە دواین شۆڕشی گەورەی ڕاگەیاندندا-لە ساڵی ١٩٢٠ەکاندا ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و سینەما و دەنگ گەورەکەر(مایک) گەشەیان کرد. تەکنەلۆژیا لەو سەردەمەدا ئەنجامێکی بەسەنتەرکردنی وەرگرتبوو. شۆڕشی تەکنەلۆژیا بواری بە تاک و گروپەکان بەخشی کە سود لە تەکنەلۆژیا وەربگرن و وەک هێزێک بەسەرجەم کۆمەڵگەدا بڵاوبۆوە. ئەمەش بووە یەکەم هەنگاو لە کودەتا و شۆڕش لە سەدەی بیستدا کە هەمیشە تەلەفزیۆن و ڕادیۆ کۆنترۆڵی سەرجەم دەوڵەتانی کردبوو. بە مانایەکی تر تەلەفزیۆن و ڕادیۆ لەو سەردەمەدا بۆ شۆڕش و کودەتای هێزەکان بەکاردەهات. بەڵام شۆڕشی ڕاگەیاندنی ئەمڕۆ دەتوانێ هەزاران کەلێن دروست بکات بۆ وەدەستکەوتنی هەواڵ بە جۆرێک کە بتوانێ لایەنە شاراوەکان ئاشکرا بکات و بە ئاسانی بە خەڵکی بگەیەنێت و کۆنترۆڵی ناوەند بکات و پەرجو(موستەحیل)ەکان تێک بشکێنێت. ئینتەرنێت ئەو پرۆسەیەیە کە دەتوانێ هەنگاوی گەورەتر بەرەو پێشەوە ببات و بوونی سیستەمێکی ڕاگەیاندن لەناوخۆیدا دروست بکات، هەروەکو تۆماس فریدمانی ستوونووس دەڵێت «سەرجەم خەڵک لە پەیوەندیدایە، بەڵام کەس لەژێر کۆنترۆڵدا نییە».

بەدیموکراتیزەکردنی تەکنەلۆژیا و ڕاگەیاندن مانای ئەوەیە کە زۆرترین کەس لە کۆمەڵگەدا بتوانن دەستیان بگاتە هەر شتێک کە مەبەستیانە. لەوانە وەدەست کەوتنی چەکی کۆمەڵکوژ. ئێمە ئێستا دەزانین کە ئوسامە بن لادن لە ساڵانی ١٩٩٠ەکاندا سەرگەرمی کارکردن بوو لەسەر پرۆگرامی ترسناکی چەکی بایەلۆژی.

بەڵام ترسناکترین شت ئەوەیە تەکنەلۆژیای زانستی و دامەزراوە دەستییەکانی ئەلقاعیدە لە کابوول چەکی کۆکوژی بەرهەم دەهات، هەرچەندە کارێکی نهێنی نەبوو بەڵکو تاقیگەیەکی حکومی بوو. گروپی ئەلقاعیدە دۆکومێنتەکانیان لەسەر ئینتەرنێت بڵاودەکردەوە. ئەمڕۆ گەر بتەوێت سەرچاوەی ئەو پەتایە و لیستی چەکە ژەهراوییەکان و میتۆدی چەکی کیمیاوی بزانیت، دەتوانیت زۆر بە ئاسانی لە ئینتەرنێتدا بیدۆزیتەوە. بەڵام بەدبەختییەکە لەوەشدایە کە ئینتەرنێت سەرچاوەیەکی کراوەیە و یارمەتییەکی خێرای ئەو کەسانە دەدات کە گەر بیانەوێ بۆمب دروست بکەن. ئەو توخمانە بە جیاواز لە ڕابردوو ئاسانن بۆ وەدەستکەوتن. زانیاری ئینتەرنێت لە دەساڵی ڕابردوودا بڵاوبوونەوەی بەخۆوە بینی. ئەمەش بە شێوەیەکە تەنانەت تەکنەلۆژیای ئەتۆمی ئێستا بەشێوەیەکی فراوان بوونی هەیە. ئەمە ڕاستییەکەیە. دوای هەموو ئەمانە پاش پەنجا ساڵ ئێستا دەزانین کە جیهان لە ڕادیۆی AM و تەلەفزیۆنی ڕەش و سپییەوە گۆڕانی بەرچاوی

بەخۆوە بینیوە. دەتوانین ئەمە ناوبنێین بەتوندوتیژیکردنی دیموکراسی، ئەمەش تەستەواژەیەکی بیرهێنەرەوەیە. بەتوندوتیژیکردنی دیموکراسی لە دنیای ئەمڕۆدا یەکێکە لە دیاردە ترسناکەکان (کە بەڕاستی ترسناکیشە). چەندین سەدەبوو دەوڵەت سیستەمێکی مۆنۆپۆڵکردن و دەسەڵاتێکی ڕەوای بەسەر کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا سەپاندبوو. ئەم نایەکسانیەی دەسەلات لە نێوان دەوڵەت و هاولاتیدا داخوازییەکی خولقاندبوو کە بەشێک لە پابەندبوونی شارستانیەتی مۆدێرنی بەیەکەوە سازدابوو. بەلام لە ماوەی چەند دەیەی ڕابردوودا دەسەلاتی دەوڵەت لاوازی بەخۆوە بینی، ئێستا گروپی بچوک لە خەڵک دەتوانن شتی تۆقێنەر بەرهەمبێنن، هەرچەندە تیرۆریزم یەکجار ترسناکە کە بەرەو دەسەلاتی حکومەت هەڵدەکشێت بەلام بە جیاواز لە ڕابردوو حکومەتە ناوەندەکان بە شێوازێکی تر لەبەردەم ئابڵوقەدان. مارکێتە گەورەکان و پیشەسازییە تاکەکەسییەکان و حکومەتە لۆکاڵەکان و ڕێکخراوە ناحکومییەکان دەسکەوتی گەورەیان بەدەستهێناوە، بەکورتی دەسەلاتی دەوڵەت لاواز بووە. زیادبوونی خەڵکانی نایاسایی و مادە بێهۆشکەرەکان و پارەو و چەک بەشێوەیەکی ئاسایی لە دنیادا بلاوبونەتەوە، کە ئەمەش گەواهی ئەو ڕاستیەیە کە دەسەلاتی دەوڵەت لاوازی بەخۆوە بینیوە. ئەم لاوازبوونەی دەسەلات بەردەوام دەبێت، چونکە ئێستا دەوڵەت پڕچەک بووە بە گۆڕانی تەکنەلۆژی و ئابووری و کۆمەلایەتی. لە دوای ١١ی سێپتەمبەرەوە دەوڵەت گەڕانەوەی بەخۆوە بینی و دەسەلاتی یاسایی نوێ بۆوە، بەمەش دەوڵەت ئارامی بەخۆوە دەبینێت. سەردەمی تیرۆر بەم شێوەیە فۆرمێکی پەشۆکان بەخۆوە دەبینێت لە نێوان هێزەکاندا، کە لەلایەکەوە دەسەلاتی دیموکراسی وەگەڕ دەخات و لەلایەکی ترەوە شەرعیەت بە دەوڵەت دەدات.

ئەگەر بەپێی باسکردن لەم کێشەیە بێت ئەوا بەو مانایە دێت کە دیموکراسی تەنها لایەنی خراپی هەیە. بەشێوەیەکی فراوان دیموکراسی دەرئەنجامی سەرنجڕاکێشی هەیە. کێ لە ئێمە ئارەزووی ئەوە دەکات کە کۆمەڵگە بگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێک کە هەڵبژاردن نەبێت و دەسەلاتی تاکەکەس لاواز بێت؟ بەلام وەک هەر گواستراوەیەکی فراوان دیموکراسی لایەنی تاریکی هەیە کە ئێستا ئێمە بە گرنگییەوە لەبارەیەوە دەدوێین. بۆ ئەمەش ڕەخنەی کاریگەر و وروژێنەر ئەوەیە کە تۆ «لەدەرەوەی هاوکاتی» و کاتەکان گۆڕانیان بەسەردا دێت، بەلام ئەمە بەمانای ئەوە دێت کە ئێمە هەرگیز تێڕوانینمان سەبارەت بە تێگەیشتن لە کاتەکان ناوەستێت. بێدەنگییەکی ترسناک لەمبارەیەوە هەست پێدەکرێت کە شێوەیەکی «ئەنتی دیموکراسی» لەخۆ دەگرێت. ئێمە هیچ ڕێگایەکی ترمان نییە بۆ تێگەیشتن تەنها ئەوە نەبێت کە «دیموکراسی» لە ژیانی ڕۆژانەماندا لە برەودایە. با ئێمە واز لەوە بێنین کە لە سایەی دیموکراسیدا هیچ کێشەیەک ناخولقێت، لەبەر ئەوە گەر ئێمە پەتایەکی کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووریمان بینی پێویستە لێرە و لەوێ سەرزەنشتەکانمان بگۆڕین، کێشەکان وەلاوە بنێین و وەلامەکان جێبهێڵین، بەلام هەرگیز دوودڵ نەبین بەرامبەر بەوەی کە دیموکراسی ئاڵوگۆڕێکی گەورەیە و کاریگەری لەسەر ناوەندەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووریمان هەیە.

**سەرچاوە:**

کتێبی «The Future of Freedom»

# شۆڕشی ئایاری ٦٨
## -ڕەگ و ڕیشەو ڕەهەندەکانی-

جۆن پۆڵ دۆلای
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

سەروەختی ئایاری ١٩٦٨، فەرەنسا وڵاتێکی کۆنی کشتوکاڵی بوو کە بە شێوەیەکی زۆر خێرا، بەرەو وڵاتێکی پیشەسازی دەچوو. هەروەها ئیمپراتۆریەتێکی کۆلۆنیالی کۆن بوو کە هێندە نەبوو بە حەسرەتەوە جەزائیری لەدەست دابوو، سەرەڕای ئەوەش سوپاکەی لە شکستی ساڵی ١٩٤٠ هەڵنەستابووەوە. دوو هێزی گەورە لە هەوڵی ئەوەدا بوون ئەو شکست و نوچدانانە لەبیر فەرەنسیەکان بەرنەوە، بۆ ئەم مەبەستەش هەریەکەیان لە هەوڵی دروستکردنی ئەفسانەیەکی قارەمانانەدا بوون بۆ قەرەبوکردنەوە: یەکەمیان شکۆدارکردنی نەتەوە لەلایەن دیگۆلیەکانەوە، دووەمیشیان گۆرانی گوتن بە باڵای داهاتودا لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە. هەرچەندە ئەو ئایدیۆلۆژیایانەی ستایشی هەوڵ و بەرخودان و سەرفرازیان دەکرد، توانیان دڵی نەوە تێکشکاوەکەی سەردەمی شەڕ بدەنەوە، بەڵام بۆ نەوەی دوای شەڕ مانایەکی ئەوتۆی نەبوو. ئەو نەوەیەی خواست و ویستی تری هەبوو، جیاواز لە ستایشکردن و شکۆبەخشین بە سستمی باوکسالاری.

وەک هەموو هەژان و ڕوداوێکی گەورەی مێژوویی، شۆڕشی ئایاری ٦٨ لە پڕێکدا ڕویدا، لەبەرئەوەی کەس چاوەڕێی شتێکی وای نەدەکرد، یان بە واتایەکی دی کەس مەزەندەی نەدەکرد ئەو ناڕەزاییە کۆمەڵایەتیە کەڵەکەبووە، دەرگا بە ڕووی ڕاپەڕینێکدا دەکاتەوە کە هۆکارەکانی لە ڕەتکردنەوەی سەرکوتکردن

بەهەموو جۆرەکانیەوە سەرچاوە دەگرێت، زیاد لەوەی خەباتکردن بێت لە دژی چەوساندنەوە.

کرێکاران و بەتایبەتیش گەنجان بەرلەوەی داوای هەقدەستی باشتر و هەلومەرجی گونجاوتری کار بکەن، لە دژی نۆرم و بەهاکانی کۆمەڵگە ڕاپەڕین. لەم هەلومەرجەشدا کرێکاران دەیانتوانی زیاتر لە خەباتی خوێندکاران حاڵی بن و هاوسۆز بن لەگەڵیاندا. کرێکاران دژی دەسەڵاتی ڕۆشنبیرە دەربارەکان و هێزەکانی ئاسایش بوون و ئەوانیش وەک لاوان، گیرۆدەی ئەو سستمە ئەخلاقیە بوون کە ئارەزووەکانی خەفە دەکردن و جۆرە سانسۆرێکی جنسی بەسەردا دەسەپاندن کە قابیلی قبوڵکردن نەبوو. لێرەوە سەیر نەبوو کە دروشم و بەیداخی سور، تێکەڵ بە بەیداخی ڕەش بێت کە بەیداخی شەڕ و گوزارشتە لە ئەنارشیستیەتێکی چێژبەخش، ئەو ئانارشیستیەش نە باوەڕی هەیە و نە یاسا و نە داوای کۆمەڵگەیەکی دی دەکات، بەڵکو خوازیاری زیاد لە کۆمەڵگەیەکە.

کرێکاران و خوێندکاران و بێکاران و هونەرمەندان و ژنانی ماڵ، هەر هەموویان دەڕژێنە سەر شەقامەکان. ئەمەش جگە لە سەرەتا شتێکی تر نییە.. با لەسەر خەبات و لەسەر شۆڕش بەردەوام بین و درێژە بدەین بە پشێوی و نائارامی. با سیاسەتمەدارە بەساڵاچووەکان (ڕاستڕەوەکان یان سۆسیالیستەکان) بێدەنگ بن، ئەمەش جگە لە سەرەتایەک و دەسپێکێکی نوێ شتێکی تر نییە.. دوا جار دەتوانین بە خواستی خۆمان هەموو شتێ تێک و پێکدەین و هەموو شتێ وێرانکەین و پاشان قسە بکەین، تا پێیان بڵێین: (چیتان پێنەکردین). ئەمە سەرەتایە و لێرە بە دواوە ناوەستین، لەبەرئەوەی ڕاوەستان مردنە و دۆڕاندنی گرەوەکەیە، مردنی (لۆفیگارۆ)یە لای ئەوان و مردنی (لیکیب)ە لای ئێمە.

ئەم چەپێندراوەی شۆڕش لە دوورەوە گەڕاپەوە. دژایەتیکردنی تۆتالیتاریزم کەم تا زۆر لە ئارەدا بووە، بەڵام لە ئایاری ٦٨ دەتەقێتەوەو خۆی بەیان دەکات. لە هەناوی بزاوتی مارکسیزم خۆشیدا ئاقارێکی ڕادیکالی لە دروستبووندا بوو، ڕاپەڕینەکانی بەرلینی ساڵی ١٩٥٣ و بەتایبەتیش هەنگاریا و پۆلەندا لە ئۆکتۆبەری ١٩٥٦، بوونە مایەی تاوسەندنی ئەو ئاقارە. لە فەرەنسا گۆڤاری (ئەرگومێنت) کە جیابووەکانی پارتی کۆمۆنستی فەرەنسی دەریاندەکرد، بووە مایەی ئەوەی لە سەرەتای شەستەکانەوە گەشەسەندن و پەل و پۆ هاویشتنی ئەو ئاقارە مسۆگەرتر بکات. «ئێدگارد مۆران» بووە دایناموی سەرەکی ئەم تەوژمە و لەگەڵ «هنری لۆڤیڤەر»دا دەستیان بە کارکردن کرد. هەردووکیان لە بەشی کۆمەڵناسی زانکۆی نانت وانە بێژبوون، ئەو زانکۆیەی بەهۆی کەسێکی وەک: «دانیال کوهین بندت»ەوە، دەبێتە ویردی سەرزمانی خەڵک. «دانیال کوهین» لەگەڵ هاوڕێکانیدا ڕۆژی ٢٢ی مارس کۆنترۆڵی زانکۆ دەکەن و دامەزراندنی بزوتنەوەی بەناوبانگی ٢٢ی مارس ڕادەگەیەنن، ئەمەش بڵێسەی ئەو ئاگرە بوو کە هەموو لایەکی گرتەوە.

سەرباری ئەوەش ئەو پشێوی و نائارامیەی لە زستانی ٦٧-٦٨ دا بەشی ناوخۆیی خوێندکارانی زانکۆکانی گرتەوە، بە بیانوی ئەوەی سەردانکردن لە شەودا قەدەغەیە، کاریگەری لەسەر خوێندکاران جێهێشت و بەرهەمی بیریارانی وەک «ولیەم ڕایش» و «ئەریک فرۆم» کە پشت ئەستور بوون بە نوسینەکانی «فرۆید» و «مارکس»، سەرچاوەیەکی فیکری گەورەی خوێندکارە چەپڕەوەکان بوو. ئەمانە لەلایەن چەپە دۆگماتیست و تەقلیدیەکانەوە دژایەتیی دەکران.

لەلایەکی ترەوەو لەو سەردەم و قۆناغەدا، «جۆرج لاباساد»ی ڕاوێژکاری فیدراسیۆنە

خوێندکاریەکان لە زانکۆی سۆربۆن، پسپۆڕ بوو لە لێکشیتاڵکردنی بونیادە بیرۆکراسیەکان، ئەو بونیادە بیرۆکراسیانەی پێشتر «فرۆید پێداگری دەکرد لەسەر ئەوەی کەم تا زۆر سەرجەمیان بەشدارن لە ملکەچ پێکردنی منداڵان بۆ باوکێکی ستەمکارو خاوەن دەسەڵات، دواتریش تەماهیکردن لەگەڵ کارەکتەری ئەو باوکەدا. هەروەها «جۆرج ئۆرێ» و «ڤلیکس گاتاری» لە چارەسەرگەی (cour – cheverny Bordede) سەرقاڵی بەرهەم هێنانی گوتارێکی تیۆری و ئەزمونێکی نوێ بوون، دەربارەی ئەوانەی گرفتی ئەقڵیان هەیە و گەیشتنە ئەوەی کە دەسەڵات لە خەمی قوتکردنەوەی کۆسپ و بەربەستی زیاتر و زۆرتردایە، لەپێناو پاراستنی ئەو سستمە پاتریاکیە دیسپۆتیزمیەدا. ئەم بەرە نوێیەی کاریان بۆ ئازادی دەکرد، هەوڵەکانیان لەگەڵ بەرهەمەکانی «میشێل فۆکۆ» لە (مێژووی دێوانەیی) و پزیشکەدەروونناسە ناڕازیەکانی بەریتانیای وەک «لانج» و «کۆپەر» کە زیاتر «سارتەر» بوو بووە سەرچاوەیان، بەتایبەت لە کتێبی (ڕەخنەی ئەقڵی دیالەکتیکی)دا، یەکیان دەگرتەوە.

ئەم هێرش و پەلامارە ئازادیخوازانەیە، لەودیو ئەو ستراتیژیەتە کۆنەی مارکسیزم — لینینیزمەوە دەستی پێکرد کە بڕوای بە خەباتی بەرەیی هەبوو، لە دژی دەسەڵاتی ناوەند کە مەبەست لێی دەوڵەت بوو.. بۆ هێرشکردنە سەر سوپا و دادگا و پۆلیس، هیچ شەرم و عەیبەیەکی تێدا نییە کە سەرەتا بە پەلاماردانی دەسەڵاتە بچوکەکانی خێزان و قوتابخانە و نەخۆشخانە دەست پێ بکەیت. بەرلەوەی شەڕ لەگەڵ هێزەکانی ئاسایشدا بکەیت، چاکتر وایە پۆلیسە نهێنیەکان لە مێشکی خۆتدا بکەیتە دەر.

وەک هەموو قۆناغێکی چارەنوسساز کە کۆن نایەوێت بمرێت و تازەش ناتوانێت لەدایک بێت، هونەرمەندان پێشبینی ئەو گۆڕانکاریانەیان دەکرد کە بەڕێوەیە. لە کۆتایی شەستەکاندا سینەماکارە ڕەخنەگرەکانی وەک «گۆدار و ڕاسنای و ڕیفات» و سینەمای نوێی ئەمریکای لاتین، ئاگری شۆڕش و یاخی بونیان خۆش دەکرد و تەبەنی هەناسە ڕادیکال و یاخی گەریەکانی سوریالیزمیان دەکرد. لەلایەکی ترەوە و یەکێکی دی لە نیشانەکانی ئەو سەردەم و ڕۆژگارە، گەڕانەوەی «بۆ نوال»ی دوژمنی سەرسەختیترادسیۆن و کۆنەخوازی بوو بۆ ئەوروپا، دوای مانەوەیەکی دوور و درێژ لە مەکسیک بەهۆی دژایەتیکردنی سەرسەختانەی لەگەڵ دەسەڵاتی «فرانکۆ»دا، بەمەش پردێکی پەیوەندی لەنێوان نەوەکاندا دروستکردەوەو هەموویان سەرباری جیاوازی نێوانیان لە ڕوی تەمەن و هەلومەرجی مێژووییەوە، سەرلەنوێ لە تورە بوون و ناڕازی بوونیاندا یەکیان گرتەوە. هاوکات «ئارچی چاپ» و «سۆنی ڕۆلینز» و «ئەلبێر ئیلەر» و نمونەکانیان وەک نەفرەت لێکراوێک، فویان بە سەکسفۆنەکانیاندا دەکرد، تا هاوار و فوغانی ڕەش پێستەکانی ناو گیتۆکانی (هارلم) و (واست)، بدەن بەگوێی جیهاندا. ئەمانە جۆش و خرۆشیان لە وشەکانی «مالکۆلم ئەیکس» وەردەگرت، بەتایبەت گۆرانی (اذولد ایها الولید). ئەم گۆرانیەی هەزاران جار دەوترایەوەو دەنگدانەوەشی گەیشتە پایتەختەکانی ئەوروپای وەک: (پاریس و بەرلین و لەندەن و ڕۆما)، ئەمە بووە مایەی دنەدانی ئەو گەنجانەی تینوی ئەوە بوون دنیای کۆن بڕوخێنن: (هاوڕێم ڕاکە، دنیای پیرو کەنفت بەدواتەوەیە). دوای ئەوە ساڵی ١٩٦٧ بەدوای یەکدا سێ بۆمب تەقینەوە، (کۆمەڵگەی وێنە) لە نوسینی «ڤای دی بۆر»، لەگەڵ (توێژینەوەیەک دەربارەی شێوازی هەڵسوکەوت، بەتایبەت بۆ نەوەی نوێ) لە نوسینی

«ڕاوڵ ڤلنجان»، لەگەڵ ڕۆژنامەی (لهوب) کە گەنجە تورەکانی شاریستراسبۆرگ بڵاویان دەکردەوە و باسی لە بەشمەینەتی خوێندکاران و گەنجان دەکرد، لە ڕووی سیاسی و ئابوری و دەرونی و جنسیەوە.

لەو قۆناغەدا ڕەخنەیەکی توند ئاڕاستەی کەپیتالیزم و بلۆکی سۆسیالستی دەکرا و گەنجان پێیان وابوو، ڕزگاربوون تەنها بە مانگرتنی سەرتاسەری دەبێت، دژ بە جیهانی شمەک و کاڵا، جیهانێک کە هەموو شتێکی تێدا دەکڕدرێت و دەفرۆشرێت. تەواوی ئایکۆنەکانی مۆدێرنە لە (ئۆتۆمۆبێل و سەلاجە و کاسێت و تەجیل و کتێب و گۆڤار و.. هتد)، بە بڕوای «جۆرج بیرێک»، نابێت بەرکاربهێندرێن، بەڵکو پێویستە بدزرێن و دەستبەجێش لەگەڵ دزینیاندا وردوخاش بکرێن.

لەگەڵ سەرەتای مانگی ئایاری ١٩٦٨، لەناوجەرگەی کۆمەڵگەی فەرەنسیدا، مەشخەڵەکان هەڵکران. ئەو گەشە و بەرەو پێشچونەی ویردی سەرزمانی ئایدیۆلۆژیستەکان بوو، جگە لە (مرۆڤی تاک ڕەهەند) هیچی دیکەی بەرهەم نەهێنا. ئەو مرۆڤەی «هربرت مارکۆزە» ڕەخنەی ئاڕاستە کرد. «مارکۆزە» یەکێکە لە ناوە دیارەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، ئەو قوتابخانە فیکریەی دوای هاتنە سەر حوکمی «هتلەر»، لە ئەڵەمانیاوە ڕوپانکردە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو لەوێ گیرسانەوە. لە وڵاتە دەوڵەمەند و پێشکەوتووەکاندا، دیکتاتۆریەتێکی نەرم و نیان شوێنی دیکتاتۆریەتی تۆقێنەرانەی فاشیزم و نازیزمی گرتەوە، لە جیهانی سێهەمیشدا دیکتاتۆریەتێکی توندوتیژ هاتە ئارا، ئەم دوو دیمەنەش تێکەڵ بەیەک بوون، واتە ژیان بوو بە سەرزەمینی قەیرانە کوشندەکان. وەک «مارکس» پێشبینی دەکرد، مرد و جڵەوی زیندووی دەکرد.

لێرەوە ئیتر سەروەختی وێرانکردن و تێکوپێکدانی ئەو دنیایە دەستی پێکرد، وەختی ئەوە هات خەڵکی بوێری بکەن و شۆڕش بەرپاکەن. ئەوە بوو ئایار هاتوو دیوارەکان گوڵیان گرت.

بەربەستەکان بشکێنن، چێژ لە ژیان ببینن.
بەبێ سەردەم و ڕۆژگارە مردووەکان، ژیان ئەزمون کەن.
بجوڵێ و ژیان بگۆڕە.

## سەرچاوە:

ئەم وتارە بۆ یەکەمجار بە زمانی فەرەنسی لەم سەرچاوەیەدا بڵاوکراوەتەوە:

Magazine Litteraire، ژمارە (٣٦٥) ئایاری ١٩٩٨، لاپەڕە (٦٠-٦٢).

دواتر لەلایەن «المنتصر الحملي»ەوە کراوەتە عەرەبی و لە سایتی (الاوان)دان بڵاوکراوەتەوە.

# دەستەبژێرەکان

د. مەلیك یەحیا سەڵاحی
لە فارسییەوە: کارزان محەمەد

## ١)چەمکی دەستەبژێر یاخود نوخبە:

نوخبە یاخود ئیلیت[١] لە وشـــەی لاتینی ئیلیگیرەوە[٢] بەمانای دەســـتەبژێر وەرگیراوە. بۆئەوەی مانای ئەم زاراوەیە باشتر ڕوون ببێتەوە، دەبێ بەشێوەیەکی پوخت بگەڕێینەوە بۆ پاشـــخانە مێژووییەکەی. لە زمانی باوی کۆندا، (ئیلیت) بـــە گروپێکی کەم کە پێگەیەکی تایبەتیان لەڕووی دابونەریت، پلەی ڕۆحانیو خۆشـــگوزەرانی کۆمەڵایەتییەوە بەدەســـتهێنابوو، لێکدەدرایەوەو لەمبارەیەشەوە مەبەســـت لە (بەهای دەســـتەبژێریتی) تەواوی ئەو ئیمتیازاتانە بوو کە چینی ســـەرکردەو فەرمانڕەواکان پێشترو لە دەستپێکی کۆمەڵگای سەرمایەداریدا لـێی بەهرەمەنـــد ببوون. هەروەکچۆن لـــە دیدی پلەو پایەوە لـــە کۆمەڵگادا خاوەنی باڵاترین پێگە بوونو سەرکردایەتی سیاسیش لەهەمان چیندا دادەنران. بەڵام لەم نێوانەدا، چەمکی ئەم زاراوەیە گۆڕاوەو بیرمەندانی سیاسی، (ئیلیت) بەشێوەیەکی بێلایەنانە هەڵدەسەنگێنن.

لەمڕۆدا چەقی قورســـایی باسکردن دەربارەی (ئیلیت)، ستراکتور، کارکردنی (دەستەبژێرە سیاســـییەکان)ە. دەسەڵاتیان لە سیســـتەمێکی کۆمەڵایەتیانەی دیموکراســـی لەســـەر بنەمـــای دەســـتور، وەک بەرهەمێکی دەســـەڵاتدارێتی و سەربەخۆیی میللی، لـێی دەنۆڕدرێتو پێناس دەکرێت.

لەمـــڕۆدا دەســـتەبژێرە سیاســـییەکان وەک گروپگەلێکـــی راســـپێردراو کە

هەڵبژێردراون‌و بەمشێوەیە بەجۆرێکی یاساییانە ڕەوایەتیان وەرگرتووەو بۆ ئەم کارە هەڵدەبژێردرێن، پێناس دەکرێت و لێکدەدرێتەوە.

هەڵبەتە دەبێ ئەوە لەبەرچاوبگیرێ کە لە پێناسـی دەسـتەبژێردا هەمیشە جەخت لەسەر ئەم بنەچەیـە دەکرێتەوە کە تەنها ئامرازی ناچارکردن بۆ پاراسـتنی گروپی دەسـتەبژێر بەس نییە، بەڵکو ئامرازە مەعنەوییەکانیش بۆ پتەوکردنی پێویسـتە، لەمبارەیەوە تیۆریزانانی نوێی زانسـتی سیاسەتیش هاوڕان[٣].

## ب) تیۆرە کلاسیکییەکانی دەستەبژێرەکان:

ئەگەر قوتابخانەی چیناییەتی مارکسیزم[٤] بەمۆدیلێکی ڕەخنەگرانە لەهەمبەر تیۆرەکانی لیبراڵیزمی بەکۆمەڵدا دابنێین، دەبێ (تیۆریزانانی دەسـتەبژێریتی) بە بناغەدانـەری مۆدیلی ڕەخنەگەرایی-پشـکداری[٥] دابنێین کە گروپە سیاسییە راستڕەوەکان لە لیبراڵە دێرینەکان‌و خانەدانەکانەوە بگرە تا ئایدیۆلۆژییە فاشیستییەکانیان بنیاتنا.

ئەمە ڕێکەوتێکی مێژوویی نەبوو کە تیۆری دەستەبژێرەکان لە وڵاتێکی وەک ئیتاڵیا بەپێشینەو ڕابردوویەکی درێژەوە دەبوایـە دابڕێژرێت و بخرێتەڕوو. هەلومەرج‌و بارودۆخەکانی ئیتاڵیا لەنێوان دوو جەنگی جیهانی‌و سیسـتەمی پارلەمانییە لاوازەکەیدا، بووە شـوێنێکی گونجاو بۆ تیۆریزانانی حکومەتی دەستەبژێرەکان.

ئەگەرچـی ئەمجۆرە تیرۆریزەکردنە بەبێ هیچ جۆرە دابەشـکردنێکی ڕێژەیی لەنێوان جۆرەکانی دەسـتەبژێرەکاندا دەخرایـەڕوو، بـەڵام بەهەرحاڵ کێشـەگەلێکی زۆری بۆ جۆرەکانـی حکومەتە پارلەمانتارییەکان هێنایەئارا.

ئەم کارە لەسـەرەتادا لەلایەن نوسەرێکی گومانگەراو بێ هیوا لەکارکردنی لیبراڵیزم واتا (گایتانۆ مۆسکا)[٦] وە ئامادەو چوارچێوەبەندی کرا. ئەو یەکێک بوو لە بنیاتنەرانی گرنگترین مۆدیلە سەرەتایی‌و کلاسیکییەکانی گروپە سیاسییەکانی باڵی ڕاستڕەو واتا لە لیبراڵە دێرینە ئەرستۆکراتەکانەوە بگرە تا ئایدیۆلۆژییە فاشیستییەکان[٧].

لێکۆڵەرە کۆمەڵناسـە مارکسیستەکان، بەتوندی چەمکی دەسـتەبژێرەکان ڕەت دەکەنەوە بەڵام بەجەختێکی زۆرترەوە چەمکی (خەڵک) لەبەرامبەر چەمکی (کادیری سەرکردایەتی)دا دادەنێن.

بەهەرحـاڵ بەکارهێنانی چەمکی دەسـتەبژێر لە تیۆرە سیاسـییەکاندا هەمیشـە لەگەڵ ئەم بنەچـە بڕواپێکـراوەدا جمک بووە کە دەبـێ حکومەت لەلایەن باشـترینەکانەوە بەڕێوەببرێت. بۆ نمونـە لەمبارەیەوە (ڤیلفیریدۆ پاریتۆ) جەختی لەسـەر حکومەتی عاقڵمەندان‌و کڵێسـاو ئایین بـە هەڵبژاردنی پیاوە ئایینیە پلەبەرزەکان و (تۆماس کارلایل)[٨] یش جەخت لەسـەر قارەمانەکان‌و سۆشیال داروینیستەکانیش جەخت لەسەر بەهێزترەکان دەکەنەوە.

### 1- گایتانۆ مۆسکا:

بەهەمانشێوەی کە وترا، یەکێک لە بەناوبانگترین ڕەخنەگران‌و نەیارانی شێلگیرانەی دیموکراسی، گایتانۆ مۆسکای کۆمەڵناس‌و زانای زانستی سیاسەتی ئیتاڵییە.

ناونیشـــانی ســـەرەکی گرنگترین کتێبەکانی گایتانۆ (ڕەگەزەکانی زانســـتی سیاســـەت)[9]ە کە لەساڵی (١٨٩٥)دا نوسیویەتی[10]و لە زمانەکانی تردا بە (چینی فەرمانڕەوا)و (چینە سیاسییەکان) وەرگێڕدراوە . بابەتی ســـەرەکی ئەم نامەیە، بەهەمانشـــێوەی کە لەناونیشانەکەیدا دەبینرێت، چینە سەرەکیو باوەکەی کۆمەڵگایە .

مۆسکا بڕوای وایە کە گشت کۆمەڵە مرۆییەکانو کۆمەڵگا سیاسییەکان، چ ئەوانەی بە پلەگەلێکی شارستانێتی گەیشتوون و بەپێشکەوتووترین کۆمەڵگا دەژمێردرێن و یاخود کۆمەڵگا پاشکەوتووەکان، سەرجەمیان لەدوو چین پێکهاتوون: چینی فەرمانڕەواو ئەو چینەی کە فەرمانڕوایی دەکرێن. چینی یەکەم لەڕوانگەی بڕو ژمارەوە بەشێوەیەکی گشتی کەمن بەڵام دەسەڵاتی سیاسیان لەبەردەستدایەو لەتەواوی مافەکان (خۆشگوزەرانی، ڕێزو دەسەڵاتو...) بەهرەمەندن، لەکاتێکدا چینی دووەم لەڕوانگەی ژمـــارەو بڕەوە بەبەراورد لەگـــەڵ چینی یەکەمدا زۆر زۆرترن و پێی دەگوترێت خەڵک[11]، خودی ئەم خەڵکەش لەچینی جۆراوجۆر پێکهاتوون کە بەشێوەی یاسایی یاخود نایاسایی، بەداخواستانە یاخود بەناچاریـــی دەچنە ژێرباری حکومەتەوە . بۆ دەرکەوتنی مێـــژوو، بوونی هەردوو چینی فەرمانڕەواو فەرمانبەســـەرداکراو پێویستە . سیاسەت، کۆکەرەوەی خانەدانەکانەو دیموکراسی لە وەهمو خەیاڵێک پتر نییە .

مۆســـکا کە لە پالریمۆ لەدایکبووەو لە ڕۆما گەیشتە ئوستادی زانکۆو پلەی سیناتۆر، هەوڵی دا تەواوی ئەو کێشانە بگشتێنێت کە لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمی زاییندیدا لە ئیتاڵیا دەیبینی، چونکە لەو ســـەردەمەدا ڕێبازی لیبراڵیزمو لەهەمانکاتدا ئایدیـــا ئازادیخوازەکان ڕێگەی بۆ ئینتیما داروینیزمـــە کۆمەڵایەتییەکانیش هەموار دەکردو کۆمەڵگای سەرمایەداریشـــی بەرەو کۆمەڵگایەکی چینایەتی نوێ ئاراســـتە دەکرد کە دەستێوەردانی دەوڵەتی لە ئابوریو کۆمەڵگادا وەک دەوڵەتێکی دەســـتوەردەر بەپێویست دەزانی کە کەڵەکەکردنی سەرمایەشی دەهێنایەدی، بە زەروورییی دادەنا تا بەڕووکەشـــانە دیموکراسی نوێنەرایەتی پێشـــکەش بکات، لەمڕووەشەوە بووە جێی ڕەخنەی توندی مۆسکا. ناوبراو بۆ سەلماندنی بەڵگەکانی خۆی دەڵێت:

"نوێنەر لەڕاســـتیدا دەبێ بەرژەوەندییەکانی دەنگدەری خۆی لەبەرچاو بگرێت، هەروەکچۆن کە ئەم مەســـەلەیە لە مافە تایبەتییەکانیدا ڕەچاو دەکرێت، لەکاتێکدا نوێنەری کۆمەڵگا لە پراکتیکدا ئازادییەکی بێســـنورو بێگەمارۆی دەستدەکەوێت کە هەست بەوە ناکات پێویستییەکی بەردەوامی بە ڕاوێژکردن لەگەڵ دەنگدەرانیدا هەبێت، لەوەش واوەتر ســـودی نیگەتیڤانە لەهەستەکانی دەنگدەر وەردەگرێتو دەیخاتە ژێر کاریگەری مەبەســـتەکانی خۆیەوە، لەمڕووەوە ئەم نوێنەرایەتییە دەگۆڕێ بۆ پەیوەندییەکی یەکلایەنە کە زیاتر نمایشێکی گاڵتەجاڕانەیە تا نوێنەرایەتی میللەت».

ناوبراو لەدرێژەیدا دەڵێت:

«لەمبارەیەوە ستانداردێکی گشتی زاڵە، واتا چینی سیاسەتمەدار مەبەستەکانی خۆی لەڕێگەی ئەو بیروڕایانەی کە بەســـەر کۆمەڵـــگادا زاڵە، لەچوارچێوەیەکی بەرواڵـــەت عەقڵانیدا دەیخاتەڕوو تا مەبەســـتەکانی خۆی بەدیبهێنێت. هێندە بەســـە تەنها گروپێکی کەم لەئـــەوان واتە لایەنگرانی سیاســـەت لەناو چیـــنو توێژەکانی کۆمەڵگادا بـــە پروپاگەندەیەکی هەمیشـــەییانە ئەم ئامانجانە بەزیندوویـــی بهێڵنەوەو ئامانجەکانو بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەســـتەبەر بکەن. گروپێکی کەمی

دەســـتەبژێر (نوخبە) لە کۆمەڵگادا بەدانانی کاریگەری لەســـەر چینی ناوەند، پایەکانی دەسەڵاتی خـــۆی پتـــەو دەکات، چینەکانی خوارەوەش کاریگـــەری لە چینی ناوەندی کۆمەڵـــگاوە وەردەگرن‌و بەمشێوەیە هەمیشە گروپی کەمینە بەڵام خاوەن ڕۆڵ بەسەر گروپەکانی زۆرینەی ملکەچ (خەڵک)دا حکومڕانی دەکەن»[12].

## 2- ڤیلفیریدۆ پاریتۆ:

دووەمین تیۆریستی گرنگ کە جەخت لەسەر حکومەتی کەمینە دەکاتەوە، ڤیلفیریدۆ پاریتۆیە. پاریتـــۆی کۆمەڵنـــاس‌و ئابوریزانـــی ئیتاڵیایی لـــە بناغەدانەرانی (قوتابخانەی لـــۆزان)ە، لەتەک مامۆستاکەی خۆیدا (والراس)[13] لە شوێنکەوتووانی ئابوریی ماتماتیکە.

پاریتۆ وەک کۆمەڵناســـێک، ڕیالیست‌و پراگماتیست[14] بوو. گرنگترین بەرهەمی پاریتۆ (نامەی کۆمەڵناســـی گشـــتی)[15]ە کە لە ســـاڵی (١٩١٦)دا لە فلۆرەنســـا بڵاوکرایەوە، لەگەڵ ئەمەشـــدا کاریگەرییەکی زۆری لەسەر مۆسکاو میشلز (میخیلز) داناوە[16]. وەک مامۆستایەکی ئابوریی نەتەوەیی زانکۆی لۆزان لە ســـاڵانی (١٩٠٢-١٩٠٣) سیستەمی سۆشیالیســـتی بەتوندی خستەژێر ڕەخنەوەو بە سیستەمێکی دەروێشیانەی ئایدیالیستی ناوزەدی کرد کە تەنها لە زەینی عەوامدا شیاوی هاتنەدیە.

پاریتۆ چۆنییەتی پێکهێنانی دەستەبژێرەکانی خستۆتەژێر لێکۆڵینەوەوەو لەمڕووەشەوە تێکۆشانی چینایەتی بەتەواوەتی‌و بەیەکجاریی ڕەت ناکاتەوە.

ڕستە بەناوبانگەکەی پاریتۆ لەوێدا کە دەڵێت: «مێژوو گۆڕستانی بنەماڵەو دەستەبژێرەکانە»، بێگومان دژەتێزێکە لەبەرامبەر ڕستەکەی مارکس لە مانیفێستی کۆمۆنیستدا کە وتبووی: «مێژووی تەواوی کۆمەڵگاکان تائەمڕۆ بەمێژووی تێکۆشانە چینایەتییەکانەوە دەمێنێتەوە».

پاریتـــۆ لـــە گرنگتریـــن بەرهەمی خۆیـــدا واتا (سۆســـیۆلۆجیای گشـــتی)، دوو جـــۆر ڕەفتار لێکجیادەکاتـــەوە: ڕەفتاری لۆژیکی‌و ڕەفتـــاری نالۆژیکی. ئەگەرچی ئەو بڕوای وایە کە لەنێوان ئەم دوو ڕەفتارەدا ســـنورێکی چەقبەســـتوو نییە، بەڵکو ســـنوری نێوان ئەم دوو ڕەفتارە جوڵاو بووەو هەرجۆرە سنوردانانێک لەنێوان ئەم دووانەدا، زۆر بەگرفت دەبێت.

ڕەفتـــاری لۆژیکی، ڕەفتارێکە کە هەم لە ڕوانگەی بابەتیانەو هەم لە ڕوانگەی خودیانەوە بەیەک ئەنجـــام بگات. بۆنمونە جوتیار بێنەرە بەرچاو کە گەنم دەچێنێت تا داهاتێک لە ئەنجامی کارەکەی خۆیـــەوە لە کۆتایی کارەکەدا بەدەســـت بهێنێت. ئەم کارە هەم خـــودی‌و هەم بابەتی بەیەک ئەنجام دەگات، بەمەرجێ کێشـــەیەک لە پرۆسیســـی بەرهەمهێناندا نەیەتەپێش بۆنمونە کوللە هێرشی بۆ نەبات.

پاریتۆ ڕەفتارەکانی بەدەر لەم پرۆسیســـە، بە ڕەفتاری نالۆژیکی ناوی دەبات. بەگوزارشـــتێکی باشـــتر، ئەگەر ڕەفتـــار پەیوەندییەکی نالۆژیکی لـــە ڕوانگەی خودی‌و بابەتییـــەوە لەگەڵ یەکتردا هەبێت، ئەو ڕەفتارە نالۆژیکـــی دەبێت. پاریتۆ جۆری دووەمی زیاتر ئەنالیزە کردووەو دەرئەنجامی لێوەردەگرێت.

بەبڕوای ئەو، ڕەفتارە نالۆژیکییەکان لەلایەن جێماوەکان[17]و داتاشـــراوەکان[18]ەوە ڕێنما دەکرێن.

پاریتۆ جێماوەکان وەک غەریزەیەکی بنەڕەتی پێناس دەکات کە کاریگەرییەکی بەردەوامی لەسەر ڕەفتاری تاکەکەسی هەیە. لەکاتێکدا مەبەستی ئەو لە داتاشراوەکان، شیکردنەوەی جێماوەکانە. بە وتەیەکی تر ئەگەر جێماوەکان بە پرەنسیپ دابنێین، ئەوا داتاشراوەکان دەبێ بە تیۆری جێماوەکان دابنێین. پاریتۆ جێماوەکان بۆ شەش چین دابەش دەکات:

١- غەریزەی ڕێوشوێن یاخود پێکهاتە[١٩].

٢- مانەوەی کۆمەڵەکان[٢٠].

٣- پێویستبوونی دەربڕینی هەستە سۆزدارییەکان کە لەژێر کاریگەریی ڕەفتارە دەرەکییەکاندایە.

٤- جێماوەکانی پەیوەست بە سۆشیالیزەیشن.

٥- یەکپارچەیی تاکەکەس و موڵکەکانی.

٦- جێماوە سێکسییەکان.

ئەگەرچی ئەم شەش چینە بەشێوەی تۆڕێکی یەکگرتوو، پارێزگاریی لە جێماوەکان دەکەن، بەڵام لە دیدی پارتیۆوە، (غەریزە) یاخود (مانەوە) لە (پێداویستی) یاخود (جێماوە) بایەخدارترە و لەدەرەنجامیشیاندا سود لە ئاوێتەکردنی هەردوو چینی یەکەم و دووەم وەردەگرێت.

پاریتۆ بڕوای وایە کە دەستەبژێرەکان بە بەدەستەوەگرتنی هێزی حکومی، بایەخ بە خواستەکانی خەڵک نەداوەو لە بنچینەدا خەڵک تا ئەو ئاستەی کە سەر بەم دوو چینە بن واتا جێماوەکان و بەرهەمەکان، بەتەواوەتی جەماوەرێکی هەڵچوون[٢٢].

پارتیۆ لەژێر کاریگەریی میکاڤیلیدا، بڕوای وایە کە ئەو مرۆڤانەی خاوەنی غەریزەیەکی پێکهاتەیین، زۆر هۆشمەند و داهێنەرن، ئەگەرچی بەئەندازەیەکی تەواو ئازا نین. پارتیۆ ئەو جۆرە کەسایەتییە بە (سروشتی ڕێوی) ناوی دەبات.

لە بنچینەدا، هێڵی جیاکەرەوەی مرۆڤ لە گیانلەبەر بوونی ئەو غەریزەی ڕێوشوێنەیە کە لە مرۆڤدا هەیە. هەمان غەریزە دەبێتەمایەی پەرەسەندن و بەرفراوانبوونی پێداویستیە لۆژیکییەکانی مرۆڤ. ئەنجامی ئەم کارەش، پێشکەوتنی شارستانییەتی مرۆڤە، کەواتە بەباشی دیارە کە ئەم غەریزەیە لە مرۆڤدا چ گرنگییەکی هەیە. پارتیۆ دەڵێت درەخشانترین کۆمەڵگاکان بەدرێژایی مێژوو، ئەو کۆمەڵگایانە بوون کە خاوەنی برێکی زۆر لە چینی یەکەمی جێماوەکان بوون. پارتیۆ ئەسینای سەدەی پێنجەمی بەر لە زایین وەک باشترین نمونە دەهێنێتەوە.

دووەمین چین لە پۆلێنبەندی جێماوەکاندا (مانەوەی کۆمەڵەکان)ە. بەهەمانشێوەی کە لە چەمکەکەیەوە دێ، بەتەواوەتی لەهەمبەر چینی یەکەمدا واتا (غەریزەی ڕێوشوێن)دا دەوەستێت. ئەم چینە بەپێچەوانەی چینی یەکەمەوە کە گۆڕان و جوڵە لە تاک و کۆمەڵگادا دێنێتەدی، دەبێتەمایەی ئەوەی تا جۆرە جێگریی و پاراستنی بارودۆخێک بێنێتە ئاراوە. بەمانایەکی تر مرۆڤ لەژێر کاریگەریی ئەم جێماوانەدا، حەز بە (پاراستنی ڕێوشوێن) دەکەن و کەمتر ئینتیما بۆ گۆڕان و وەرچەرخان نیشان دەدات، لەمڕووەوە فەرمانە ئاکارییەکان بەبێ ئەنالیزەکردنێکی زانستیانە قبوڵ دەکات[٢٣].

بەمانایەکی تر ئەو کەسانەی برێکی تەواویان لەم جێماوانە هەبێ، لەبەرامبەر بیروباوەڕە

ئاكارییەكاندا، دەمارگیرن و بەئاســـانی ئامادەی قبوڵكردنی گۆڕان و مەسەلە نوێیەكان نابن. پارتیۆ بڕوای وایە كە ئەو چەشنە كەسانە ئەگەرچی بیركۆڵن بەڵام ئازا و دلێرن. پارتیۆ نازناوی (سروشتی شێر) بەم چەشنە كەسایەتیانە دەدات.

لە بنچینەدا لەدیدی پارتیۆوە ئاڵوگۆڕە توندەكان، سەردەمانێك دەبنەمایەی شۆڕش كە پووكانەوەی كلتوریی لە چینەكانی ســـەرەوەدا دەســـت پێبكات، بەجۆرێك كە چیتر جێماوە ســـودمەندەكان بۆ پاراســـتنی دەسەڵات نەمابنەوە. لەهەمانكاتدا لە چینەكانی خوارەوەی كۆمەڵگادا، چۆنییەتی رەگەزە پێكهێنەرەكانی دەسەڵات فۆرمەڵە دەبێت. بەكورتی ئەو ئەنجامەی پارتیۆ لەم باسەوەی وەردەگرێت، ئەمەیە كە تەنها ئەو گروپە دەســـتەبژێرانەی بتوانن رێژەیەكی گونجاو و پێویســـت لە سروشـــتی (رێوی) و (شێر) لە خۆیاندا كۆبكەنەوە، دەتوانن لە دەسەڵاتدا بمێننەوە.

بەڵام لەبەرئەوەی كۆمەڵگا هیچكاتێ بەچەقبەســـتوو نامێنێتەوە، كەواتە گواســـتنەوە لە گروپی شـــێرەكانەوە بۆ رێوییەكان و بەپێچەوانەشـــەوە، هەمیشـــە لەبەردەوامیدا دەبێت. بە دەستڕۆیشتن و زیادبوونی شـــێرەكان لەگروپی حكومڕانیدا و پاشـــان ئینتیمایان بۆ سروشـــتی رێوییەكان، ئەم هاوســـەنگییە تێكدەچێت. هەربۆیە بەگشتی شێرەكان لەهەمبەر رێوییەكاندا رادەوەستنەوەو رێوییە حكومڕانەكان سەرەتا بەپەنابردنە بەر زۆرەملـێ و هێزی ناچاركردن، هەوڵی ئارامكردنەوەی شێرەكان دەدەن و ئەگەر ســـەركەوتووش نەبن، ئەوا دروشـــمەكانی ئازادی و یەكســـانی بەرز دەكەنەوە، بەڵام شـــێرەكان بەســـەر رێوییەكاندا زاڵ دەبن و دەسەڵات بەدەستەوە دەگرن. بەڵام دوای ماوەیەك و وردە وردە سروشـــتی رێوییەكان كاریگەریی لەسەر شێرەكان دادەنێ و سەرلەنوێ ژمارەی رێوییەكان زۆر دەبنەوەو دۆخەكەی پێشـــوو دووپات دەبێتەوە. هەر كۆمەڵگایەك كە رەچاوی بكەین، بۆ دوو گروپ دابەش دەبێت: (دەستەبژێرەكان) و (خەڵك). دەستەبژێرەكان خۆیان بۆ هەردوو گروپی (حكومڕان) و (ناحكومڕان[٢٤]) دابەش دەكەن. بەهەمانشێوەی كە پارتیۆ دەڵێت كۆمەڵگا پێویستی بە بزاوتنە، ئەو لەو بڕوایەدایە كە هەمیشە بزاوتێك لە خوارەوە بەرەو سەرەوە لە كۆمەڵگادا بەردەوامە. ئەگەرچی دەســـتەبژێرە حكومڕانەكان لەهەوڵی ئـــەوەدان رێگە لەم بزاوتە بگرن، بەڵام بەگشـــتی دەرەنجامی كارەكە بەتەواوەتی سەركەوتوو نابێت.

لەمبارەیەوە پارتیۆ لەســـەرەتاوە كۆمەڵگا بۆ دوو كۆمەڵگای توندڕەو دابەش دەكات: (كۆمەڵگای كـــراوە) و (كۆمەڵگای داخراو). كۆمەڵگای كراوە ئـــەو كۆمەڵگایەیە كە تیایدا ئەم بزاوتە بەخێرایی و بەتوندییـــەوە ئەنجام دەدرێت، بەڵام لـــە كۆمەڵگای داخراودا ئەم بزاوتە بەئارامی لەبەردەوامیدایەو بەنزیكەیـــی بزاوتێكی هەســـتەوەری تێدانییە. بەبڕوای پارتیۆ، كۆمەڵگا میانڕەو و راســـتەقینەكان لەنێوان ئەم دوو كۆمەڵگا توندڕەوەدا وەستاون. ئەگەر ئەم ڕەوتە واتا بزاوتەكە لە خوارەوە بۆ سەرەوە ڕابوەستێت، كۆمەڵگا چەقبەستوو و گەندەڵ دەبێت[٢٥].

پارتیۆ لەو بڕوایەدایە كە حكومەتە میراتییەكان بەگشـــتی جوتیاران و بازرگانان و پیشـــەكاران بەپیشەكانی خۆیانەوە بەستۆتەوەو بەمشێوەیە كاست (Caste)[٢٦]دێننە ئاراوە. لە ڕوانگەی ئەوەوە، سیستەمی سەرمایەداریی ئازاد، باشترین گرەنتی كۆمەڵگایەكی میانڕەوە.

نابـــێ ئەوە فەرامۆش بكرێ كە پارتیـــۆ ئەندازیار بوو، كەواتە كـــردە لۆژیكییەكانی لە دیدگای ئەندازیارێكەوە دەبینی، هەروەكچۆن دوای ئەوەی روویكردە زانســـتی ئابووریی، پاشـــان رەفتاری لە

دیدگای ئابوریی و بەرژەوەندخوازییەوە دەبینی. بەمانایەکی باشتر پێویستە پارتیۆ بە کۆمەڵناسێک دابندرێ کە بیر لە سیستەمێکی سیاسی دەکاتەوە کە وێڕای زۆرداربوونی، میانڕەویش بێت، واتا سیستەمێک کە حکومڕانەکانی ئەو سیستەمە توانستی بڕیاردانیان هەیە، بەڵام ئازادی بیرکردنەوە بۆ هاوڵاتیان و بەتایبەتی پسپۆڕان و ڕووناکبیران دەپارێزن. بەمانایەکی باشتر پارتیۆ لیبرالیزمی فکریی بۆ کۆمەڵگا بەپێویست دەزانێت[٢٧]. هەڵبەتە دەبێ ئەوە رەچاو بکرێت کە ئەو وانەیەی پارتیۆ لە ئەزموونەکانی خۆیەوە فێری ببوو، بایەخی بەدیموکراسی نەدەداو دیموکراسی بەبێ بەرهەم و پوچ دەزانی.

پارتیۆ تیۆری خەباتی چینایەتی مارکس پەسەند دەکات، بەڵام دوو رەخنەی بنچینەیی دەخاتە نێو: یەکەمیان پارتیۆ بەپێچەوانەی مارکسەوە ئەوە پەسەند ناکات کە خەباتی چینایەتی تەنها لەژێر کاریگەریی ئابوریی دێتەئاراوە، واتا لەبەرئەنجامی ئەو ناکۆکیانەوە بێ کە لە موڵکایەتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانەوە دروست دەبێت، بەڵکو ئەو خەباتە دەتوانێ کۆمەڵێک سەرچاوەی تریشی هەبێت. بۆ نمونە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەم تێڕوانینە زاڵ ببوو کە ئەگەر ناکۆکییە مەزهەبییەکان لەنێوبچێت، کۆمەڵگا لە ئاشتی و ئارامیدا دەبێت، لەکاتێکدا ئەم ناکۆکییە لە سەدە نوێیەکانیشدا لەنێوچوو و ناکۆکییەکی تر واتا ناکۆکی سۆشیالیستی جێگەی گرتەوەو خەباتی چینایەتی بەجۆرێکی تر مایەوە.

ئەگەر وادابنێین حکومەتی پرۆلیتاریا بەرقەرار ببێ و هیچیتر سەرمایە بەشێوەی تایبەتی نەمێنێت، ئەوا هەر ناکۆکی نێوان ڕووناکبیرە جۆراوجۆرەکان و کرێکاران بە پلەوپایەیەکی تایبەتی جیاوازەوە دێنەوە مەیدان، بەکورتی مرۆڤەکان لە کاروبارە جۆراوجۆرەکانیاندا داوای لەپێشتربوون دەکەن، لە بنەڕەتدا خەباتی چینایەتی سەدەی نۆزدەهەم لەگەڵ خەباتی چینایەتی سەدەکانی رابردوو لەڕووی خودییەوە جیاوازن، بەکورتی خەباتی چینایەتی پرۆلیتاریا لەگەڵ خەباتی چینایەتی بۆرژوازی و سەرکەوتنی ئەم چینەش، دەبێتە خاڵی کۆتاییهاتنی چینایەتی.

لەکاتێکدا ئەگەر ئەو جۆرە ڕووداوە ڕوویدات، لەئەنجامدا نابێتەهۆی سەرکەوتنی چینی پرۆلیتاریا، بەڵکو سەرکەوتنی ئەو چین و توێژە کەمەیە کە پرۆلیتاریا ڕێبەرایەتییەکەی کردووە، لەڕاستیدا هەمان ئەو گروپە کەمەی (دەستەبژێرەکان)ن کە بەناوی پرۆلیتاریاوە دەدوێن. بەواتایەکی تر پارتیۆ گۆڕانی کۆمەڵگا قبوڵ دەکات، بەڵام ئەنجامەکەی بە دانانی دەستەبژێرە نوێیەکان لەجێگای دەستەبژێرە کۆنەکان دادەنێت، واتا لە ڕوانگەی ئەوەوە نەبەردی چینایەتی هیچکاتێک ڕاناوەستێت.

مارکس و ئەنگلز لە مانفێستی حیزبی کۆمۆنیستدا دەڵێن: سەرجەم بزووتنەوە مێژووییەکان تا ئەمڕۆ، کۆمەڵێک بزووتنەوەی کەمینە بووە بە قازانجی کەمینە، لەکاتێکدا بزووتنەوەی پرۆلیتاریایی بزووتنەوەیەکی ڕابووی زۆرینەی گەورەیە بەقازانجی زۆرینەیەکی بەرفراوان.

پارتیۆ لە وەڵامدا دەڵێت: بەداخەوە ئەم شۆڕشە کە دەبوایە بەختەوەرێتییەکی پاک و خاوێن لەپێناو مرۆڤدا بهێنێتەئارا، لە سەرابێکی فریودەر زیاتر نییە کە هیچکاتێ نابێتە ڕاستی. مێژووی کۆمەڵگا مرۆییەکان، مێژووی هەنگاو بەهەنگاوی سەرهەڵدانی ئەرستۆکراتەکانە. کۆمەڵێک ئەرستۆکراتی جۆراوجۆر لەدایک دەبن، سود لە دەسەڵات دەبینن و سەرەنجام بەرەو پەراوێز دەچن

و پێگەکەی خۆیان بەگروپێکی نایابی نوێ دەدەن، کەواتە بەهەمانشـــێوەی پێشـــتر وتمان، مێژوو گۆڕستانی ئەرستۆکراتەکانە[٢٨].

پارتیۆ کە لەژێر کاریگەریی میکاڤیلیدایە، لەو بڕوایەدایە بنەماکانی حکومەت ســـەرجەم گروپە حکومڕانەکان بەتێکەڵاوییەک لە زۆرداریی و بیروباوەڕی خەڵکەوە فۆرمەڵە دەبێت و پتەو دەبێت، بەڵام لە حکومەتدا دەبێ زۆرەملێ و ناچارکردن لەپێش بڕواو متمانەی خەڵک بە دەستەی حکومڕانەوە بێ، چونکە دەنگ و متمانەی خەڵک بەســـادەیی دەتوانرێ لەڕێگەی پڕوپاگەندە و وتاردانە ئاگراوییەکان و هەڵخەڵەتاندنەوە بەدەستبهێنرێت.

پارتیۆ لەو بڕوایەدایە کاتێک شـــۆڕش سەردەکەوێت کە دەسەڵاتداران ئەرکەکەی خۆیان لەبواری پاراستنی دیسپلین لەڕێگای زۆرەملێوە فەرامۆش بکەن. کەواتە بەمشێوەیە دەسەڵاتی خەڵک وابەستە بە لاوازیی دەســـەڵاتی حکومڕانانەوە و ئەگەر گروپی حکومڕان نەتوانن بەشێوەیەکی کاریگەر هێزی ناچارکردن بەکاربهێنێت، دەبێ لەنێوببرێت و جێگەی خۆیان بە گروپێکی ستەمکار و دەسەڵاتداری تر بدەن، چونکە سروشتی سیاسەت بەم چەشنە بووەو هەرواش دەبێت[٢٩].

زۆر کەس پارتیۆ بە بنیاتنەری فکری فاشیزم دەزانن، هەروەکچۆن لیبراڵەکان بەتایبەتی لایەنگرانی مەسەلەی ئابوریی ئازاد و حکومەت، بەلایەنی کەمەوە پارتیۆ بەهاوڕەوتی خۆیان دەزانن.

پارتیۆ وەک کۆمەڵناســـێکی لیبراڵ و ئەندازیار و ئابوریـــزان، پەیڕەویی لەو بیروباوەڕانە دەکرد کـــە خۆی بڕوای پێیانبوو. نابـــێ پارتیۆ بەنوێنەری قوتابخانە یاخـــود حیزبێکی تایبەت بزانرێت، هەروەکچۆن دژ بەتوندوتیژیی بوو، سەرزەنشتی دیموکراسیزمی ساکاریشی دەکرد. بەدەر لەوەش، ئەو لە (١٩ی ئابی ١٩٢٣) واتا نزیکەی یەک ساڵ دوای گەیشتنە دەسەڵاتی مۆسۆلۆنی، چاوەکانی لێکنا، بەڵام بەهەرحاڵ دەبێ ئەوە پەســـەند بکەین کە پارتیۆ ئەو دیســـپلین و یاساناسی و پشتیوانییەی کە بۆ تیۆری دەســـتەبژێرەکانی خۆی لە فاشیزمەوە وەریدەگرت، پشتیوانی لە فاشیزمی ئیتاڵیاش دەکرد[٣٠].

## 3- ڕۆبەرت میشێڵز (میخێڵز)[31]:

بێگومان ڕۆبەرت میشێڵزی کۆمەڵناسی بەرەچەڵەک ئەڵمانی دەبێ بە سێیەمین ئەڵقەی زنجیرەی دەســـتەبژێرە کلاسیکییەکان دابنێین کە بەهۆی عەشـــقی بۆ مێژوو و کلتوری ڕۆمای کۆن، کۆچی بۆ ئەڵمانیا کرد و تا کۆتایی تەمەنی ئەم وڵاتەی بۆ نیشـــتەجێبوون هەڵبژارد. دەکرێ لە دووتوێی دوو بەرهەمە گرنگەکەی ئەودا (سۆســـیۆلۆژیای حیزبەکان لە دیموکراســـییە مۆدێرنەکان)[٣٢] کە لە ساڵی (١٩١١ز) بڵاوکرایەوەو (فاشیزم و سۆشیالیزم ڕەوتێکی سیاسی لە ئیتاڵیا)[٣٣] کە لەدوو بەرگدا لە ســـاڵانی (١٩٢٥-١٩٢٦ز) بڵاوبۆوە، گرنگترین بیروباوەڕەکانی میشێڵز شرۆڤە بکرێت. میشێڵزیش هەروەک مۆسکا و پارتیۆ، ڕەشبین بوو لە دیموکراسی.

مەیدانی توێژینەوەکانی میشـــێڵز لە پلەی یەکەمدا، پەیوەندی نێوان (ڕێکخراو)و (سیاسەت)ە. بەمانایەکی تر میشـــێڵز کۆمەڵناسێکی سیاســـییە کە (ڕێکخراوە چینایەتییەکان)ی خستۆتە ژێر لێکۆڵینەوەیەکی راســـتەوخۆی خۆیەوە. میشێڵز دەگاتە ئەم ئەنجامەی کە (ڕێکخراو) خاسییەتێکی

تایبەتی و گرنگی هەیە، لەمڕووەوە لە کتێبی (سۆسیۆلۆژیای حیزبەکان)دا بەم رستانە دەست پێدەکات:» دیموکراسی بەبێ رێکخراو، نایەتەدی»[٣٤]. واتا لەبارەی دیموکراسییەوە، کۆمەڵێک سنورداركردنی ناچاریانە دروست دەکات.

لە بنچینەدا لەبەر چەند هۆکارێکی تەکنیکی و سایکۆلۆژی، رێکخراو دەبێتەمایەی ئەوەی کە لەناوەوەی حیزبە سیاسی، سەندیکایی و تەنانەت حکومەتیشدا، گروپێک بێتەئارا کە بەتێپەڕبوونی کات، سەرکردەی ئەم گروپە زۆرترین دەسەڵات لەنێو دەستەکانی خۆیدا چڕ بکاتەوە، لەمەش سەرنجراکێشتر کەس و خەڵکیش لەم پرۆسەی چڕبوونەوەی دەسەڵات لەدەستی حکومەتدا، بێلایەن نەبوون و جەختیان لەسەر کردۆتەوە[٣٥].

لە بنچینەدا سەرکردەکان لەبەرئەم دووبارە هەڵدەبژێردرێنەوە کە ماوەیەکی درێژخایەن، دەسەڵاتیان بەدەستەوە بووە. ئەزموون نیشانی دەدات کە رێکخراوە نوێیەکان چانسێکی کەمتریان بەبەراورد لەگەڵ رێکخراوە دێرینەکاندا بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات هەیە، هۆکارەکەشی ئەمەیە کە رێکخراوە دێرینەکان زیاتر هەوڵ بۆ پارێزگاریی لە دروستبوونی ئەم پرۆسەی دەسەڵاتە دەدەن.

ئەم هەقیقەتەی کە خەڵک بەبێ سەرکردە ناتوانێ هیچ کارێک بکات، هێز بە سەرکردە دەبەخشێت[٣٦]. ئەگەرچی سەرکردە خۆی وەک نوێنەری خەڵک دەناسێنێت، بەڵام لە کارکردندا بەرەو ئۆتۆکراسی دەچێت. سەرکردەکان چ لە ڕوانگەی ماددی و چ لە ڕوانگەی مەعنەوییەوە، سەرجەم خەسڵەتە کۆمەڵایەتی، ئابوری و...هتد دەستەبەر بکەن. ئۆرگانیزەکردنی خەڵک لەڕێگەی سەرکردەکانەوە بەهاریکاریی پڕوپاگەندە فریودەرەکان ئەنجام دەدرێت، خەڵکیش دەستەبژێرە سەرکردەکان وەک نوێنەری خۆیان هەڵدەبژێرن. هەروەک وترا، هەمیشە چانسی هەڵبژاردنی سەرکردە دێرین و بەناوبانگەکان پترە.

لە ناکۆکی نێوان خەڵک و سەرکردە دەستەبژێرەکاندا، بەگشتی سەرکەوتن بۆ سەرکردەکانە، تا ئەو ساتەی سەرکردەکان لەگەڵ یەکتردا یەکگرتوون، تەنها ئەگەری مەترسییەک بۆ دەستەبژێرە حکومڕانەکان، دەستەبژێرێکی نوێیە کە بە کۆمەڵێک دروشمی جۆراوجۆرو نوێوە، خەڵک بەرەو لای خۆیان راکێش دەکەن، دەبێ سەرنج لەوە بدرێ کە گروپە دەستەبژێرە نوێیەکەش، هەر خۆشیان بەشێکن لە دەستەبژێرەکان[٣٧].

ئاڵوگۆڕی سایکۆلۆژیانە[٣٨] کە سەرجەم سەرکردەکان (دەستەبژێرەکان) لە سەرکێش و ئایدیالیستەکانەوە بۆ لایەنگرانی موحافیزکارێتی دەگۆڕێت، لە راستیدا یاسای رێبەری هەموو رێکخراوەکانە.

میشێڵز وەک باوەڕدارێکی دیموکرات و سۆشیالیستێک[٣٩]، رووبەرووی ئەم پرسیارە دەبێتەوە کە واقیعییەتی دیموکراسی چییە؟ ئەویش وەڵامەکەی لە ستراکتوری حیزبە دیموکراتە نوێیەکاندا دەدۆزێتەوە، واتا بۆ پاراستنی حیزبێکی سیاسی، ئەو بۆرۆکراسی و دیسپلینە بەئەرکی سەرشان دەزانێ کە خۆی دەکاتە ئەلتەرناتیڤی راگەیاندن و جێبەجێکردنی بیروباوەڕە تاکەکەسییەکان. بەلای میشێڵزەوە ڕوونە کە هیچ جۆرە رەچەتە و چارەسەرێک بۆ لابردنی ئەم کێشەیە نییە، لەبەرئەم هۆیە گوێ بۆ یاسایەک شل دەکات کە لە دیدی ئەوەوە گرنگترین و شیاوترین یاسای نەمری کۆمەڵگا سیاسییەکانە لە جیهاندا، واتا (یاسای ئاسنینی ئۆلیگارشی)[٤٠].

میشێڵز لەمڕووەوە دیموکراسی پراکتیکی بە مەحاڵ دەزانێت، ئەگەرچی ئومێد بۆ دیموکراسیش دەخوازێت. لەڕوانگەی ئەوەوە، سۆشـیالیزمیش وەک قوتابخانەیەک هیچ جۆرە چانسـێکی لەپێناو گەیشتن بەدروشمەکانی خۆی نابێت، بەڵکو تەنها ئەم چانسەی هەیە کە وەک چینێکی حکومڕانی نوێ سـەرکەوتن بەدەست بهێنێت کە لەڕووی هەڵسەنگاندنەوە لەگەڵ چینی حکومڕانی کۆندا، هیچ جۆرە جیاوازییەکی نابێت[٤١]، چونکە لەگەڵ سـەرکەوتنی سۆشیالیزمدا، دوای ماوەیەک سۆشیالیزم دەمرێت و سەرکردەکانی لەژێر ناوی سۆشیالیزمدا، ئۆلیگارشییەکی نوێ دەست پێدەکەن.

تەنها لەدوادوای تەمەندا بوو کە میشێڵزیش هەروەک پارتیۆ بەهۆی بەڵگەکانی دەستەبژێرایەتییەوە، ئینتیما بۆ فاشیزم پەیدا دەکات، بەڵام دەبێ سەرنج لەوە بدرێت کە چەمکی تیۆری دەستەبژێرەکان کە لەراسـتیدا لەهەمبەر تیۆرە دیموکراسییەکاندا رادەوەسـتێتەوە، لەلایەن بنیاتنەرەکانییەوە واتا پارتیۆ و میشـێڵز بەگومانەوە کەوتۆتە بەردەم رەخنەوە، لەکاتێکدا لەلایەن فاشـیزمەوە بە ڕێزێکی تایبەتییەوە تێی دەنۆڕدرێت[٤٢].

لەبنچینەدا تێگەیشتنە دژە دیموکراسییەکان لە چوارچێوەی توێژینەوەی تیۆرە دەستەبژێرایەتیی ەکاندا، کاتێک دەگاتە ترۆپکی خۆی کە کۆمەڵە تیۆریستێکی وەک میشێڵز، بەگومانەوە دیموکراسیان سـەرلەنوێ خسۆتەوە بەر شرۆڤە، لەمبارەیەوە تەنانەت ڕێزی فاشیزمیشیان بۆخۆیان بەدەستهێنا، چونکە میشێڵز بڕوای وابوو کە دیموکراسی لەڕێگەی جەماوەرەوەو لەپێناو جەماوەردا هیچ مانایەک ناگەیەنێت، بەڵکو دیموکراسی وا مانا دەگەیەنێت کە بەدەستی جەماوەرە بەڵام قازانجەکەی لەپێناو دەسـتەبژێردایە. ئەو لـەو بڕوایەدایە کە هیچ گروپێک، حیزبێک یاخـود حکومەتێک بەبێ بوونی (رێکخراو)ێک ناتوانێ بەردەوام بێت و بەئامانجەکانی خۆی بگات، دەبێ ئەم پرەنسـیپە بنەڕەتییە قبوڵ بکات کە لەڕاستیدا (رێکخراو) ماناو کاری راستەقینەی ئۆلیگارشییەتە، حکومەت هیچکاتێ شـتێک نەبووە بەدەر لە رێکخراوی کەمینەیەک کە هەمیشـە چاودێری پاراسـتن و بەردەوامبوونی دەسـەڵات و ئیمتیازاتەکانی خۆیەتی. (رێکخراو) دیسپلین دروسـت دەکات، کەواتە سنوردارکەری ئازادییەو دەبێتەمایەی موحافیزکاریی.

دەسەڵاتی حکومەت، دەسەڵاتێکی دیسپلینکارە کەواتە دژ بە ئازادییە، ناوبراو لەمبارەیەوە دەڵێت: «بەگشـتی ئەو کەسانە دەبنە شۆڕشـگێڕ کە زیاتر ئازادن، کەواتە وابەستەبوون بەڕێکخراوێکەوە (خێزان، پیشـە، حیزب یاخود دەوڵەت بێ) مرۆڤ موحافیزکار دەکات، کەواتە دەوڵەت و شۆڕش دژ بەیەک رادەوەستنەوە».

ئەو ئەنجامەی کە میشـێڵز لەم باسـەوە وەریدەگرێت، ئەوەیە تا چ سـنورێک دیموکراسی واتا حکومەتی خەڵک بەسەر خەڵکدا یاخود حکومڕانی خەڵک دەتوانێ کارساز بێت و لە بنچینەدا تا چ ئاستێک حیزبە دیموکراسـییەکان[٤٣] لەنێوان پڕوپاگەندەو کارکردندا، ناکۆکیان دەبێت. لە ڕاستیدا میشێڵز هەوڵ بۆ سەلماندنی ئەم خاڵە دەدات کە تا چ سنورێک دیموکراسی وەک بەشداریی هەمووان لە سەرکردایەتی و بڕیارداندا، تەنانەت لەناوەوەی پڕوپاگەندەترین حیزبە دیموکراسییەکاندا (حیزبی سۆشیال دیموکراسـی ئەڵمانیا) لە ناوەرۆکدا پوچەڵە. چونکە ئەگەر واگریمانە بکەین لە سەرەتادا کرێکاران و کەسانی چینی خوارەوە، لە پۆستە گرنگە حیزبییەکانی ناوخۆی حیزبە چینایەتییەکان دادەندرێن یاخود هەڵدەبژێردرێن، دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک نەک ماوەیەکی درێژخایەنیش، بەهۆی

ئەو زانیاریانەی کە بەپێی زەروورەتی کارکردن دەخرێتە بەردەمیان یاخود بەهۆی ئەو لێهاتووییەی کە بەدەستی دەهێنن، لەوەش واوەتر بەهۆی سەرقاڵبوون بە کارە فکرییەکان لەبری کارە دەستییەکان، خــۆی لەخۆیدا خو بە ئەرســتۆکراتییەت و دەســەڵاتخوازییەوە دەگرن. ئەمــەش یەکێکە لەو دوو تەوەرەیەی کە (یاســای ئاسنینی ئۆلیگارشــی) پایەکانی خۆی لەسەر داکوتاوە و تەوەرەیەکی تری پاڵنەری دەروونی خەڵکە[٤٤].

بەبڕوای میشــێڵز، پێداویستی مەزهەبیانەی خەڵک لەسەر بنەمای ڕێزگرتنە لە سەرکردەکان کە بۆ حیزبــەکان دەگوازرێتەوە، هەروەها بێباکی خەڵک لە بواری کارە کاریگەرەکانی دیموکراســی و بەشــداریی لە ســەرکردایەتیدا، نەک تەنها ڕێگا بۆ کەمینەیەکی سنوردار واتا گروپی سەرکردەکان والا دەکات، بەڵکو دەبێتەمایەی ئەوەی کە ســەرکردەکان لەپێناو چڕکردنەوەی دەسەڵات لە دەستی خۆیانــدا، ببنە خاوەنی هاندانی خەڵکیش. لەو چەشــنە هەلومەرجەدا، ئەگــەری گۆڕانی بارودۆخ و ناڕەزایەتــی لە خوارەوە زۆر لاوازە. لە کێشمەکێشــمی نێوان ســەرکردە ئەرســتۆکرات و خەڵکە هەژارەکاندا، هەمیشــە دەستەی یەکەم براوەیەو ئەگەر گۆڕان و وەرچەرخانێکیش ڕوودبدات، ئەوا لەو کێشمەکێشانەوە سەرچاوە دەگرێت کە لە جۆری ناکۆکی تێڕوانینی نێوان خودی سەرکردەکانە[٤٥].

بەبڕوای میشێڵز، شۆڕش و ئاڵوگۆڕە سیاسییەکان هەمیشە لەو ناکۆکیانەوە دێتەئارا کە لەنێوان دەســتەبژێرەکاندا هەیە، لەمبارەیەوە ئەرکی خەڵک تەنها ئەمەیە کە بەقازانجی دەستەبژێر ڕاپەرین بکەن و بڕژێنە سەر شەقامەکان و تەنانەت لەم ڕێگایەدا بشکوژرێن. خەڵک هەمیشە بێ ناونیشانن بەلام دەستەبژێرەکانیش بەرهەمهێنەری مێژوون.

بەهەمانشــێوەی پێشتر وتمان، میشێڵز ئەگەرچی ڕەشبینە بە دیموکراسی، بەلام دیموکراسی لە جۆرەکانی تری حکومڕانی بەباشــتر دەزانێت، بەواتایەکی تر شەڕی دیموکراسی بە کەمتر لە شەڕی جۆرەکانی تری حکومڕانی دادەنێت. ئەو هەروەک ئەرستۆ، حکومەتی فەزیلەت و ئەقڵ بە حکومەتی دڵخــوازی کۆمەڵگا دەزانێت، لەمڕووەوە لەپێناو نەهێشــتنی کەموکورتییەکانی حکومەتدا دەبێ بە هاریکاریی فێرکردن و وانەدانی خەڵکەوە، حکومەتێکی دڵخواز دەستەبەر بکرێت.

## پەراوێزەکان:

1-elit.

2-eligere.

3-Bottomore, TB,Elite and Gesellschaft,Beck,1966, s.7.in;Beyme,s.243.

4-klassen lehre.

5-dichotomisch

6-Gaetano Mosca (1858-1941)

7-Beyme, Klaus von, “Dei Politischen Theorien der Grgenwart’ munchen, 1984, s, 242f.

8-Thomas Carlyle.

9-Elementi di scienza politica (1895).

10-Fenske, Hand, ebd. S 505.

١١–دال، ربرت: تجزیەو تحلیل جدید سیاســت. ترجمە: حســین ظفریان، تهــران، چاپ خرمی ١٣٦٤، ص (٦٠–٦١).

12- Rohrich, W. «Eliten» ebd.s.90f.

13-Leon Esprit Walras (1834-1910).

14-pragmatist.

15-Trattato di sociologia general.

١٦-ئەگەرچــی هەندێ لــە لێکۆڵیارانی بیروبــاوەڕی ئەلیتیزم لەم بڕوایەدان کە پاریتــۆ لەژێر کاریگەریی مۆسکادا بووە.

١٧-مەبەســت لەجێماوەکان (Residuen) ســەرجەم ئــەو دابونەریت و کلتورانەیە کە لــە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکیتــر جێماوە، بەســەرمایەیەکی گرنگی کۆمەڵــگا دادەندرێت، زۆرجار مامەڵەی شارســتانیانە یاخود دواکەوتووانەی تاکەکەسێک کەم تا زۆر لە ژێر کاریگەریی ئەو دابونەریتە جێماوانەدایە (و–ک).

١٨- مەبەســت لە داتاشراوەکان (Derivaten): ســەرجەم ئەو ڕەفتارو مامەڵانەیە کە لەلایەن نەوەیەکەوە بەرهەم دەهێندرێن، زۆرجاریش دەبێتە هۆکارێک بۆ دۆزینەوەی شــەقڵی ئەو نەوەیە. دوای ئەوەی کە بۆ نەوەی پاش خۆیان جێیانهێشت، ئەوا دەبێتە جێماو یاخود میرات (و–ک).

19- Kombibations instinkt.

20- Gruppenbeharrung.

٢١-ارون، ریمون: مراحل اساسی در اندیشە جامعەشناسی، جلد دوم، ص (٥، ١٣٤، ١٨٨)

22-Fenske, Hand, ebd. S 506.

٢٣- ئــەو کۆمەڵگایانەی خاوەنی زۆرترین جێماون، کەمتر دەتوانــن خۆیان لەو دابونەریتە جێماوانە ڕزگار بکــەن و ڕەفتــار و مامەڵەی نــوێ و مۆدێرن قبوڵ بکەن، کاتێکیــش دەوترێ فەرمانــە ئەخلاقییەکان بەبێ ئەناڵیزەکردنی زانســتیانە قبوڵ دەکەن، مەبەست لەوەیە کە هەر دابونەریتێک لە کۆنەوە بۆ کۆمەڵگا مابێتەوە ئەوا بێ چەندوچون قبوڵیانە، تەنانەت ئامادەش نین لێکدانەوەیەکی زانستی بۆ ئەو فەرمانە ئەخلاقیانە بکەن کە لە باوباپیرانیانەوە بۆیان ماوەتەوە (و–ک).

٢٤- مەبەست لە دەستەبژێرە ناحکومڕانەکان، ئەو کەسانەن کە لە پیشەکەی خۆیاندا سەرکەوتنی تەواوەتیان بەدەستهێناوە وەک: یاساناسان، پیشەکاران، وەرزشکاران و هاوشێوەکانیان.

٢٥-پارتیۆ لەمبارەیەوە ڕۆما بەنمونە دەهێنێتەوە کە لە سەدەی دووەمی زاینییەوە بۆ دواتر، ئیمپراتۆرییەتەکەی دووچارب ئەو چەشنە گەندەڵییە کردەوە، بەمانایەکی روونتر کۆمەڵگاکە گەنی.

٢٦- Caste بەمانای چینوتوێژ و هۆزێکی دیاریکراو و جێگیر دێت.

٢٧- ارون، مراحل سیاسی اندیشە در جامعەشناسی، ص (١٨٢).

٢٨- ارون....ص (١٦٨-١٧٠).

٢٩- ارون....ص (٥-١٨٤).

30- Rohrich, W. «Eliten» ebd.s.91.

31- Robert, Michels (1876-1936).

32- Zur Soziologie des parteiwesens in der modernen Demkratie.

33- Sozialismus und faschismus als politische strommungen in Italien.

34-Michels, Robert, Zur Soziologie des parteiwesens in der modernen Demkratie (Leipzig 1911) Stuttgart, Kronerverl, s, 9.

35- Michels, ebd, s, 17.

36-Theimer, Walter, Lexikon der Politik, munchen, 1981, s, 197.

37-Michelsm, Zur Soziologie des parteiwesens, , ebd, s, 43 ff.

38-Metamorphose.

39-Fenske, Hand, ebd. S 505.

40-ehernen gesetz der oligarchie.

41-Beyme, Klaus von, “Dei Politischen Theorien der Grgenwart’ munchen- Zurich, 1984, s, 233.

42-Beyme, , ebd. S. 263.

٤٣-مەبەستی ناوبراو بەپلەی یەکەم حیزبی سۆشیال دیموکراسی ئەڵمانیایە.

44-Michels, ebd, s, 34f.

٤٥- ئەم تێڕوانینە لەراســتیدا ئیلهاموەرگرتنێکە لە بیروباوەڕەکانی پارتیۆوە کە دەڵێت: مێژوو گۆڕستانی خانەدان و دەستەبژێرەکانە.

## سەرچاوە:

دکتر ملک یحیی صلاحی، اندیشـــەهای سیاســـی غرب در قرن بیستم، نشر قومس، چاپ اول، 1381، ص (21-34)

# هاوڵاتیبوون و دەوڵەتی دیموکراتی

**نضال دەروێش**
**لە عەرەبییەوە: یاسین عومەر**

لە ڕووی بنەماوە ئەم نزیککەوتنەوەیە لە چەمکی هاوڵاتیبوون، دادەمەزرێت لەسەر گریمانەی دژایەتیو لێکدژیی لەنێوان کۆمەڵگەی مەدەنیو دەربڕینە سیاسییەکەی واتە دەوڵەتی دیموکراتی لەلایەکەوە، لەگەڵ کۆمەڵگەی جەماوەریی مێگەلیو دەربڕینە سیاسیەکەی واتە دەوڵەتی باڵادەستی خاوەن مۆرکی تۆتالیتاری لەلایەکی دیکەوە. ئەمەش لەبەرئەوەی بڕوام وایە ئەم دژایەتییە، بەشی سەرەکیی ئەو دژایەتییە پێکدەهێنێت کە تەحەکوم بە کۆی دژایەتییە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکانی دیکەوە دەکات. لەو کۆمەڵگایانەدا کە لە ژێر باڵی دەوڵەتی دەسەڵاتخوازدا دەژین، دەوڵەت بەئاقاری دابینکردنی گشت ئەو کۆڵەکانەی کە لەپێناوی سەرلەنوێ بنیاتنانەوەیی خۆیدایە، کۆمەڵگە دەگۆڕێتو دەیکات بە تۆپەڵە مرۆڤێکی پەرشو بڵاوی دوور لەیەک، یان دەیانکات بە کۆمەڵگەلێک یاخود کۆمەڵە تاکێکی سەلبیو دابڕاو و ترساو و ئەو کۆمەڵگەیە بەرهەم دێت کە ناوزەد دەکرێت بە کۆمەڵگەی ڕەعیەت، کە پەیوەندییەکەی لەگەڵ دەسەڵاتدا پەیوەندییەکی ڕاعیو ڕەعیەتئامێزانەیە (شوانو مێگەل)، کۆمەڵگە مەدەنییەکەیش (واتە مەملەکەتی ئازادی)، بچوک دەبێتەوە بۆ کۆمەڵێک تاکی سەلبی کە لە بارودۆخێکی مێگەلییانەدا دەژینو خەسڵەتی هاوڵاتێتی لە هاوڵاتی دەسەنرێتەوە و نامێنێت، ئەم خەسڵەتەش (مەبەست هاوڵاتێتی)یە، خۆی لەخۆیدا کۆڵەکەی سەرەکیی دەوڵەتی یاساو ڕەگەزی دیموکراتییە. ئالێرەوەیە

ئەو پەیوەندییە چۆنایەتییەی کە دەوڵەتی دیموکراتیی لە دەوڵەتی دەسەڵاتخواز جیا دەکاتەوە، لەسەر لێواری هاوڵاتیبوون وەستاوە کە خەسڵەتێکەو تاکەکانی خەڵک بەدەستی دەهێنن، تا بەهرەمەند بن لە بەشدارییکردنی تەواو لە دەوڵەتێکدا کە سنورێکی هەرێمایەتی هەبێت (موسوعە العلوم الاجتماعیە)، هەروەها دەروەستی لێکبەرامبەر لەنێوان کەسەکانو دەوڵەتدا هەبێت. کەسەکە لە ئەنجامی ئینتیماکردنی بۆ کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو مافە سیاسیو مەدەنییەکانی خۆی بەدەست دەهێنێت، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەرکگەلێکیشی دەکەوێتە ئەستۆ کە دەبێت ئەنجامیان بدات. واتە هاوڵاتیبوون بریتییە لە دەربڕینێکی یاسایی سەبارەت بە بوونێکی سیاسی بۆ نیشتیمان (دەوڵەت)و هاوڵاتی پێکەوە، ئەمەش بەردی بناغەیە بۆ پەرەپێدانی دەوڵەتو نیشتیمان هەر لە سیستەمە سیاسییو کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکەوە بیگرە، تا ڕاسانە ڕۆشنبیریو پێشکەوتنە ژیارییەکەی. بەواتە نەبوونی خەسڵەتی هاوڵاتیبوونی هاوڵاتی، بە مەدلولە مەدەنیو سیاسیو یاساییەکەی، ڕوییەکی دیکەی نەبوونی دەوڵەتە بۆ مەدلولە مەعنەویو ڕەمزییەکەیشی نەک هەر تەنها مەدلولە مادییەکەی، چونکە هاوڵاتیبوون خەسڵەتێکی بابەتیانەیە کە جیاوازیو جیاکاریو و هەڵاواردن قبوڵ ناکات، دروست وەک مرۆڤایەتی، لەبەرئەوەی لەنێوان ڕۆڵەکانی نیشتیمانێکو ئەندامانی کۆمەڵگەیەکی مەدەنیو دەوڵەتێکی دیموکراتیدا، کەسێک نیە لە کەسێکی تر زیاتر هاوڵاتی بێت، یان لە مرۆڤێکی دیکە مرۆڤتر بێت، پاشانیش ڕێگایەک نیە بۆ هیچ چەشنە ئیمتیازێک لەو ئیمتیازانەی کە لە دەوڵەتی دەسەڵاتخوازدا ناسراون. لەبەرئەوە دەوڵەتی دیموکراتی هەر لە بناغەوە دەوڵەتی مافو یاسایە، بۆ هەموو هاوڵاتییەکانی بە یەکسانی. نەبوونی جیاوازیو هەڵاواردن لە مەسەلەی هاوڵاتیبوونو مرۆڤایەتیدا، بناغەی ڕاستەقینەی یەکسانیی هاوڵاتیانە لەبەردەم یاسادا. بەمەش دەتوانین بڵێین کە هاوڵاتیبوون لە ژینگەیەکی سیاسیی دیموکراتی -یاساییدا نەبێت کە پشت بەڕستێک مافو ئەرک دەبەستێت، دروست نابێت، واتە دانپیانانێکی مەبدەئیو بنەڕەتی بە بوونی لێکدژیو دژایەتیو مافی جیاوازبوونو فرەییو جیاوازی بە هەموو واتایەک، کە گشت جۆرەکانی دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتو بڕیار یاخود گاڵتەکردنو سوکایەتی کردن بە تواناکانی هاوڵاتیان و توانا ئەقڵیو کردەوەییەکانیانو هەمەچەشنییان، پێکدەهێنێت. ئەو بنکە پانوپۆڕەی کە لە پانتایی سیاسیو کۆمەڵایەتییدا چەمکی هاوڵاتیبوون لە ئامێز دەگرێت، بریتییە لە بنەمای دادپەروەریو یەکسانی. هەر کات کۆمەڵگە پابەند بێت بەم بەهایانەو پێداویستییەکانیان دەبێتە هۆی دانانان بە مافو ڕەوایی جیاوازییو هەمەچەشنیو دژبوون کە پێکهاتەکانی نیشتیمانو دەربڕینەکەی (دەسەڵاتەکەی) پێکەوە دەبەستێت، کە بۆ دەربڕین لە خۆی بە واتا ڕۆشنبیریو سیاسییەکەی ڕێگای ڕەواو دیموکراتیو یاسایی دەدۆزێتەوە. پێشمەرجی دادپەروەری دانانە بە بوونی فرەیی لە پانتایی کۆمەڵایەتیو سیاسیو ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان ئەم فرەییانەیە، لەسەر بنەمای هاوڵاتیبوونێکی یەکسان. واتە بەژنو پێکهاتی هاوڵاتیبوون لە مافە سروشتییە چەسپاوەکان و مافە مەدەنییە وەرگیراو (مکتسب)ەکان و ئەرکو پابەندبوونە لێکبەرامبەرەکان و ئازادیە بنچینەییەکاندا ڕێکخراوە. لەبەر ڕۆشنایی و لەسەر بناغەی هاوڵاتیبوونە ناسنامەی نیشتمانی دیاریدەکرێت، کە ئاخۆ کۆمەڵگە چییەو ئەو شتانە چین کۆمەڵگە لەسەر ئاستی مادیو مەعنەوی بەرهەمی دەهێنێت. دوای ئەوە چەمکی هاوڵاتیبوون هاوواتای چەمکی بەشداریکردنە لە بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیو

له كاروباری گشتیو له داڕشتنی ئاینده‌ی نیشتیمانیشدا، له‌سه‌ر ئاستی تاكیشدا هاوڵاتیبوون ئاره‌زوویه‌كی ڕه‌سه‌نه، بۆ ئه‌و گشتێتیه‌ی له كۆمه‌ڵگه‌ی مه‌ده‌نیو ده‌وڵه‌تی دیموكراتیو هه‌روه‌ها له كۆمه‌ڵی مرۆڤایه‌تیشدا دیاری ده‌كرێت كه‌ دواڕۆژی هه‌موانه‌.

هاوڵاتیبوونی ڕاسته‌قینه‌، خۆی له‌ ڕاستییه‌كانی پێكهاته‌ ڕۆشنبیریو كۆمه‌ڵایه‌تیو سیاسییه‌كه‌ به‌گه‌وره‌تر نازانێتو نه‌فی ناكاته‌وه‌، هه‌روه‌ك چۆن واقع ناشێوێنێتو ساخته‌ی تیاناكات، به‌ڵكو له‌ سۆنگه‌ی داننان به‌ ڕاستییه‌ چه‌سپاوه‌كانه‌وه‌ مامه‌ڵه‌ له‌گه‌ڵ ئه‌م واقیعه‌دا ده‌كاتو كار بۆ كردنه‌وه‌ی بواری ئازادیو كراوه‌ییو فره‌یی له‌ پانتایی نیشتیمانیدا ده‌كات. ئاسایشو سه‌قامگیریو نوێكردنه‌وه‌و چاكسازیش تا ڕاده‌یه‌كی زۆر، گرێدراوه‌ به‌ بوونی هاوڵاتیبوونێكی یه‌كسانو پارێزراو به‌ سیسته‌مو یاسا، یاساش به‌ڕێوه‌ده‌چێت به‌بێ ئه‌وه‌ی ده‌ستدرێژی بكاته‌ سه‌ر پێشمه‌رجه‌كانی هاوڵاتیبوونێكی یه‌كسانو پێداویستییه‌كانی.

له‌به‌ر ڕۆشنایی ئه‌م شتانه‌دا، هێڵی سه‌ره‌كیی ڕۆشنبیریی نیشتیمانیو ئاسۆكانیو بنه‌ما چه‌سپیوه‌ به‌راییه‌كان و سروشتی كارلێكو ئه‌و موساقه‌فه‌یه‌ی كه‌ له‌ نێوان هه‌موو ئه‌و فره‌ییه‌ی كه‌ له‌ پانتایی نیشتیمانیدا هه‌یه‌ پێك دێت. له‌مه‌وه‌ ڕۆشنبیریی نیشتیمان ده‌ربڕینێك ده‌بێت سه‌باره‌ت به‌ حاڵه‌تی ئه‌و فره‌چه‌شنیو فره‌ییه‌ی كه‌ له‌ نیشتیماندا هه‌یه‌، نه‌ك ڕۆشنبیریی توێژێك یان كۆمه‌ڵێك، به‌ڵكو ڕۆشنبیریی نیشتیمان به‌ هه‌موو هه‌مه‌جۆریو تایه‌فه‌و ده‌ربڕینه‌كانیه‌وه‌. ڕۆڵی ده‌وڵه‌ت و داموده‌زگاكانیشی له‌م چوارچێوه‌یه‌دا، بریتی ده‌بێت له‌ ده‌سته‌به‌ركردنی كه‌شو هه‌وایه‌كی یاساییو سیاسیو كۆمه‌ڵایه‌تیو دروستكردنی چوارچێوه‌و داموده‌زگاگه‌لێك كه‌ بتوانێت هه‌موو ده‌ربڕینه‌كان له‌خۆبگرێت، بۆئه‌وه‌ی به‌هه‌موویان به‌شداری بكه‌ن له‌ داڕشتنی چه‌مكی ڕۆشنبیریی نیشتیمانیو ده‌وڵه‌مه‌ندكردنی ناوه‌ڕۆكه‌كه‌ی به‌ به‌هاكانی كۆمه‌ڵگه‌و به‌هاكانی سه‌رده‌مه‌كه‌. به‌م واتایه‌ ڕۆشنبیریی نیشتیمانی ده‌ربڕینێكی بابه‌تیانه‌ پێكده‌هێنێت، سه‌باره‌ت به‌ هه‌موو ئه‌و پێكهاته‌ هه‌مه‌جۆرو فرانه‌ی كه‌ هه‌ن و ده‌ربڕی هه‌قیقه‌تی كۆمه‌ڵایه‌تی و مێژوویین.

له‌م ناوكۆیه‌دا (سیاق)، ده‌كرێت له‌باره‌ی (ڕۆشنبیریی هاوڵاتیبوونه‌وه‌) ئاخاوتن بكرێت كه‌ وه‌ك ته‌وه‌رێكی بنچینه‌یی باڵاده‌ست به‌سه‌ر كۆی كارلێكردنه‌كاندا و بریتییه‌ له‌و ڕۆشنبیرییه‌ی، پشت به‌ (بنه‌ماكانی هاوڵاتیبوون) ده‌به‌ستێت. كه‌واته‌ هاوڵاتیبوون بریتییه‌ له‌ كۆی ئه‌و مافو ئه‌ركانه‌ی، كه‌ له‌ڕێی برێك له‌ هۆشیاریو زانینه‌وه‌ به‌دی دێت كه‌ هه‌وڵی تاك بۆ به‌ده‌ستهێنانی مافی هاوڵاتیبوونو به‌ئه‌مه‌ك بوون له‌به‌رامبه‌ر ئه‌ركه‌كانیدا ده‌سه‌پێنێت. ئه‌م هه‌وڵه‌ ده‌بێت له‌ڕێی ئه‌و هۆكاره‌ ڕه‌وایانه‌وه‌ بدرێت كه‌ ڕژێمه‌كه‌ دیاریی ده‌كاتو تاكیش فێری ده‌بێتو پێی ئاشنا ده‌بێت. له‌به‌ر ڕۆشنایی ئه‌م ده‌ستنیشانكردنه‌دا، په‌یوه‌ندیی هاوڵاتیبوونمان به‌ نیشتمانپه‌روه‌رییه‌وه‌ بۆ دیاری ده‌كرێت كه‌ بریتییه‌ له‌ په‌یوه‌ندیی حوكمی واقیع به‌ حوكمی به‌هاوه‌. به‌جۆرێك وا ده‌رده‌كه‌وێت بۆمان كه‌ هاوڵاتیبوون حوكمی واقیعه‌، له‌به‌رئه‌وه‌ی ئیدنتیمایه‌كی بابه‌تییه‌ بۆ نیشتیمانو كۆمه‌ڵگه‌و ده‌وڵه‌ت (نیشتیمانپه‌روه‌رییش حوكمێكی به‌هایه‌ دیاریكه‌رێكی خودییه‌ بۆ تاكو بۆ كۆمه‌ڵگه‌و بۆ ده‌وڵه‌تیش)، كه‌ ئه‌مه‌ش به‌و مانایه‌ی كه‌ هیچ نیشتمانپه‌روه‌رییه‌ك، بێ هاوڵاتیبوون بوونی نییه‌ و هاوڵاتیبوونیش به‌بێ مافه‌ مه‌ده‌نیو ئازادییه‌ بنه‌ڕه‌تییه‌كان بوونی نییه‌. سڕینه‌وه‌ی هاوڵاتی سڕینه‌وه‌ی دیموكراتیه‌تو ده‌وڵه‌ته‌، پاش ئه‌وه‌ ئافه‌رۆزكردنی حوكمی واقیع ئافه‌رۆزكردنی حوكمی

ئەو بەهایەیە کە بەتوندترین شێوە پێوەی بەستراوە.

ئەو لێکۆڵینەوانەی لە هاوڵاتیبوونیان کۆڵیوەتەوە، جەختیان لە سەر سێ لایەنی بنەڕەتی کردۆتەوە کە بریتین لە: مافو ئەرکو ئامڕازەکان، ئەمەش لەڕێی ئەم سێ خاڵەی خوارەوە خراونەتەڕوو.

1. بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی.
2. بەشداریی کۆمەڵایەتی.
3. هۆشیاریی سیاسی.

هاوڵاتیبوون وەک هەر ڕێبازێکی دیکە لە سێ ڕەگەز پێکدێت کە بریتین: لە زانیاریو هەستو ڕەفتار. دەکرێت مەنهەجییانە لە دوو ئاستدا سەیری ئەم سێ ڕەگەزە بکەین: ئاستی یەکەم چەمکی زەینیو هەستی دەروونیە کە لە زانیاری لەبارەی نیشتیمانو هۆشیاری بە مافەکانو ئەرکەکانو خۆشەویستیی نیشتیمانو ڕەزامەندبوون لە بەدەستهێنانی مافەکانو جێبەجێکردنی ئەرکەکاندا خۆی دەبینێتەوە، ئاستی دووەمیش پراکتیزەکردنی هاوڵاتیبوونە کە زۆربەی کات دوو لایەنی هەیە: لایەنی یەکەم بریتییە لە پابەندبوونی گشتی بە سیستەمو یاساکانو ڕێز لێگرتنیان، لایەنی دووەمیش پراکتیزەکردنی کاری سیاسیو چالاکیی مەدەنی خۆبەخشانەیە. ئەگەر ئاستی یەکەم بەشێکی زۆری پشت بە پەروەردەو فێرکردنو دامودەزگاکانی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی وەک خێزانو مزگەوت ببەستێت، ئەوا زۆربەی زۆری ئاستی دووەم پشت بەو سیستەمو یاسایەنە دەبەستێت کە لەلایەکەوە کاری هاوڵاتیان ڕێکدەخەن، لەلایەکی دیکەشەوە پشت بە ئاستی پاڵنەر لەلای تاکەکان دەبەستێت. ڕەنگە ئاستی هاوڵاتیبوون لای هاوڵاتی بەرز بێت، بەڵام لەبەرئەوەی سیستەمەکان کۆتوبەند بۆ کاری هاوڵاتی و بەشداریکردنی لە بواری کاری سیاسیو چالاکیی مەدەنی دروست دەکەن، هاوڵاتی بەشداری ناکات، نەک لەبەر لاوازی پاڵنەر لای هاوڵاتی، بەڵکو لەبەرئەوەی سیستەمو یاساکان لەمەدا ئازادیی هاوڵاتی کۆتوبەند دەکەن. هۆشیاری بەهاوڵاتیبوون، بە خاڵی دەستپێکی بنچینەیی دادەنرێت، لە پێکهاتنی ڕوانینی مرۆڤ بۆ خۆیو وڵاتەکەیو ئەو کەسانەی لە خەسڵەتی هاوڵاتیبووندا لەگەڵی بەشدارن، لەبەر ئەوەی لەسەر بنچینەی ئەم بەشدارییەیە کە ئینتماو نیشتمانپەروەری دروست دەبێ. بۆیە نەبوونی مافی هاوڵاتیبوون دەبێتە هۆی ڕوخانی هەستی ئینتیما بۆ نیشتیمان، جیاوازیکردنیش لە ئاستی بەهرەمەندبوونی تاکەکان بۆ ئەم مافانە، دەبێتە هۆی تەقینەوەی مەسەلەی هەڵاواردنی زۆردارانەو لەبەر یەک هەڵوەشاندنی پەیوەندیی تەواوکاری نیشتیمانی. بەمەش دەتوانرێت بوترێت بنەمای هاوڵاتیبوون بە جیاکردنەوەی دوو جۆر لە مافەکان دەچەسپێت، ئەوانیش بریتین لە: مافە مەدەنییەکان و مافە سیاسییەکان. یەکەمیان ئامانجی ئەوەیە مرۆڤ بە حوکمی ئەندامبوونی لە ناو گروپێکی سیاسیدا، واتە ئەندامێتی لە پێکهاتی مرۆیی دەوڵەتدا بتوانێت وەک هاوڵاتییەک لەناو وڵاتەکەی خۆیدا بژێت. ئەمانەش مافگەلێکن پێویستە لە توانای هەر مرۆڤێکدا بێت، بەوپەڕی ئازادییەوەو بەبێ خۆ تێهەڵقورتاندنی کەسانی دیکە یاخود دەوڵەت مومارەسەی بکات، وەک ئازادیی بیروڕا دەربڕینو مافی خاوەندارێتی، تا ئەو سنوورەی کە سەرپێچی لە یاسا ناکات، بەڵام دووەمیان (واتە مافە سیاسیەکان) زیاتر کاریگەرە، ئەم مافانە

بەشدارییەکی ئیجابیانە لە مومارەسەکردنی دەسەڵاتە گشتییەکان بۆ خاوەنەکەی لە وڵاتەکەیدا دەستەبەر دەکەن، ئەمەش لەڕێی بەشداریکردنەوە لە دامەزراوە سیاسیو یاساییو دەستورییەکانی فەرمانڕەوایەتیدا، هاوڵاتیبوون بۆ کەسێک نابێت کە بەپێی دەستوور و یاسا ئەم جۆرەی دووەمی مافی نەبێت.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە هاوڵاتیبوون گرێدراوی مافی بەشداریکردنە بە تێگەیشتنە گشتییەکەی، واتە بەشداریکردن لە هەموو ئەو شتانەی پەیوەستن بە نیشتمانەوە. بە تێگەیشتنە تایبەتییەکەشی، واتە بەشداریکردن لە فەرمانڕەوایەتییدا. واتە مرۆڤ لایەنێکی دانپیانراو بێت لە فەرمانڕەوایی وڵاتەکەیو بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیداو لە مومارەسەکردنی ئەو ڕۆڵەدا بێبەری نەبێت.

ئەو تاکانەی نیشتەجێی سەر خاکی ئەم دەوڵەتەنو ناچار دەکرێن گوێڕایەڵی فەرمانە دەرچووەکانی ئەم دەوڵەتە بن، بە بێ ئەوەی بەشداری لە ئامادەکردنو دەرکردنی ئەم فەرمانانەدا بکەن تەنها بێگانەکانن. ئەم دانیشتوانە (مەبەست بێگانەکانە) سەرباری ئەوەی کە بەهرەمەندن لە مافە مەدەنییەکان، بەڵام ناکرێت بە هاوڵاتی دابنرێن، واتە ئەو مافەیان نیە کە ئەندامە ڕەسەنەکان لە گروپە سیاسیەکاندا هەیانەو بەشداری ئاڕاستەکردنو بەڕێوەبردنی ژیانی سیاسی وڵات دەکەن.

پەیوەندییەکی لە پسان نەهاتوو لەنێوان ڕەوتی پێگەیشتنو پێشکەوتنی هاوڵاتیبوون لەلایەک، لەگەڵ تێرو تەسەل بوونی پێکهاتەکانو ڕەوتی سەربەخۆیی دەوڵەتو جێگیری عیزەتو کەرامەتی نیشتمانیدا هەیە، لە لایەکی دیکەشەوە لەگەڵ ڕەوتی چەسپاندنی مافە سیاسیو مەدەنییەکانی هاوڵاتیدا هەیە. ئەوە مافە مرۆییەکانی و بەهرەمەندبوونی لە یەکسانی تەواو لە مافو ئەرکەکان بەبێ جیاکاریکردن لە کەشو هەوای ئازادییە دیموکراتییەکان با لەولاوە بوەستێت، بەمەش ئازادیی نیشتیمانو ئازادیی هاوڵاتیی تەبا دێنەوە. ماهییەتی دەوڵەتیش (مەبەست مەملەکەتی یاسایە)، بێ خلتەو پاکژ دەبێت لەگەڵ پاکژیو بێ خلتەیی ماهییەتی هاوڵاتیبوونو دیموکراتیەتدا. بۆیە وتمان هاوڵاتیبوون خاڵی جیاکەرەوەی نێوان کۆمەڵگەی مەدەنیو دەربڕینە سیاسییەکەی (واتە دەوڵەتی دیموکراتی) لە کۆمەڵگەی جەماوەری و دەربڕینە سیاسییەکەی (واتە دەوڵەتی دەسەڵاتخوازی) پێکدێنێت کە چ وەک تێگەیشتن لێیو چ لە ڕووی واقیعیشەوە دەیخاتە خانەی ئەو پێکهێنەرە بنەڕەتییانەی دەوڵەتی خاوەن مەیلی دیموکراتی دروست دەکەن.

**سەرچاوە:**

http://www.cdf-sy.org/paper/mowatna.htm

# هێزی شوناس

## (THE POWER OF IDENTITY) [1]

### -هۆكاری گۆڕانی كۆمەڵایەتی لە كۆمەڵگەی تۆڕیدا-

**مانوێل كاستێڵز**

**ئامادەكردنی: هادی محەمەدی**

**سەرەتا** [2]:

پاش سەقامگیربوونی سیستمی بورژوازی، ئادام سمیت و دەیڤید ریكاردۆ، چییەتی و كارامەیی ئەم سیستمەیان راڤە كرد، پاشان كارڵ ماركس هۆكاری ناشیاوی و ناكارامەیی ئەم سیستمەی دەرخست، سەرەڕای ئەمەش هەژمونی و دەسەڵاتی بورژوازی گەشەی كردوو پەرەی سەند و سەرتاسەری دنیای تەنی. پێشبینییەكانی ماركس لەمەڕ پێكهاتنی كۆمەڵگەی سۆسیالیستی راست دەرنەچوون، دەسەڵاتی سەرمایەداری درێژەی كێشا و، لەپاش بیرمەندانی قوتابخانەی فرانكفۆرت ئیتر دنیا كەمتر بیرمەندێكی بیرتیژی بەخۆیەوە بینی تا دۆخی سەردەم بە قووڵی شروڤە بكات. هەموو بیرمەندانی پۆستمۆدێرن چوونە نێو دەقەكان و خۆیان لە قەرەی كێشە سیاسی و كۆمەڵایەتییەكان نەدا، لەم نێوەشدا پەیوەندی سەرمایەدارانە بە ئاراستەیەكی جیاوازدا و بە ئامێری ئەلكترۆنیك و بە رایەڵ و تۆڕی ئینتێرنێت و سەتەلایتەكان ئێجگار پەرەیسەند و پێكهاتەیەكی زۆر ئاڵۆزی پێكهێنا. هەتا دەركەوتنی كتێبە بەناوبانگەكەی مانوێل كاستێڵز، چاخی زانیاری (١٩٩٩)، بیرمەندان و كۆمەڵناسان دۆخی تازەیان بەشێوەی كۆنكرێت شرۆڤە نەكردبوو.

لە دواساڵەكانی سەدەی بیستەمدا مانوێل كاستێڵز، بیرمەند، كۆمەڵناس و مامۆستای زانكۆ لە كتێبی بەنرخی چاخی زانیاری دا تۆژینەوەیەكی ئێجگار قووڵ

و بەرین لەمەڕ پەیوەندییە تازەکانی کۆمەڵگەی ئەمڕۆ ئەنجام دەدا و بۆشایی ناوبراو پڕدەکاتەوە. کاستێڵز سەرەڕای ئەوە کە بە دیدێکی نوێوە پێوەندییەکانی کۆمەڵگەی بورژوازی لە سەردەمی رایەڵ و تۆڕەکانی پێوەندی و زانیاریدا راڤە دەکا و چەندین ئاراستە و ئاسۆی تازەمان بەڕوودا دەکاتەوە، پێوەندی کار و سەرمایە و کریکاران و سەرمایەداران لە سەردەمی مۆدێرن و لە نێو تۆڕەکاندا سەرلەنوێ شرۆڤە دەکا و دۆخی سەرهەڵدانی چەندین رەوت و بزاڤ و سوژە و بکەری نوێ راڤەو پێناسە دەکات کە وەک پێکهێنەرانی دۆخ و کۆمەڵی داهاتوو رۆڵ دەگێڕن. کاستێڵز فێرمان دەکات کە لە چاخی زانیاریدا جەنگی دەسەڵات بە سوپا و لەشکری تۆکمە و، بە چەک و چۆڵی قورس ناکرێت، بەڵکو زیاتر لەنێو تۆڕەکانی زانیاریدا و، بە هێزی شوناس و بە کەرەستەی رەمز و هێماکان دەکرێت؛ هەر گرووپێک کە بتوانێ پەیام و رەمز و هێماکانی خۆی لە مێشکی جەماوەردا بڕوێنێ، دەتوانێ لە بواری سیاسی و کۆمەڵایەتیدا، هەژمونی و دەسەڵات بەدەست بێنێ.

ئەم خاڵە بۆ نەتەوەیەکی ژێردەستی، وەک گەلی کورد کە لە جەرگەی خەباتی رزگاریخوازیدایە گرنگی مان و نەمانی هەیە. کاتێ سەیری میدیا و تەلەڤزیۆنی پارتەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان دەکەین، دەبینین بەهۆی بێ فکری، بێ شوناسیی و دیسکۆرسی لاواز، هەر لەدایک نەبوون، مردوون. چونکە هێشتا بە مێتۆدی سەردەمی جەنگی سارد بیردەکەنەوە و هێشتا ئەم دنیا نوێیە کە کاستێڵز راڤەی کردووە، ناناسن!

کاستێڵز کە لە بواری ئەندێشەدا خۆی لە بەرەی چەپدا دەبینێتەوە، لەم کتێبەدا سەرەڕای شیکاری قووڵی ئابوری، سیاسی و کۆمەڵایەتی، زۆر گرنگی بە دوو چەمکی کولتور و شوناس دەدات، بەڕای کاستێڵز لە چاخی زانیاریدا کولتور سەرچاوەیەکی گرنگی دەسەڵات پێکدێنێ و رەوت و بزاڤی شوناسخواز بالانس و هاوکێشی سیاسی کۆمەڵایەتی دنیای داهاتوو دیاری دەکەن.

کاستێڵز لەم کتێبەدا ئاماژە بە بزاڤی نەتەوەیی و شوناسخوازی کوردستانیش دەکا و دەنوسێ: «چەندین نەتەوە و بزاڤی ناسیۆنالیستی هەن کە هێشتا نەیانتوانیوە بە دەوڵەتی نەتەڤی مۆدێرن بگەن (وەک سکۆتلەند، کێبێک، کوردستان، فەلەستین)، بەڵام خاوەن شوناسی فەرهەنگی — هەرێمی بەهێزن و، هەندێکیان ئەوە چەندین سەدەیە وەها شوناسێکیان دەرخستووە و وەک خەسڵەتێکی نەتەویی بەیانی دەکەن».

لە کاتێکدا کە ئێمەی کورد بە تامەزرۆیی باسی گرنگی و کارامەیی کۆمەڵی مەدەنی دەکەین، بڕوانن کاستێڵز چۆن باسی بەسەرچوون و پووکانەوەی ئەم چەمکە لە وڵاتانی مۆدێرندا دەکات: «رێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی کە بەپێی دەوڵەتانی دیموکراتیک و پەیمانی کۆمەڵایەتی نێوان سەرمایە و کار پێکهاتبوون، کەم تا زۆر وەک تویکڵێکی بۆشیان لێهاتووە و بۆ پێوەندی گرتن لەگەڵ بەهاکان و ژیانی خەڵکانی زۆربەی کۆمەڵگاکان، تادێ لاوازتر دەبن. ئەمە تەنزێکی تاڵ و تراژیکە کە رێک لە کاتێکدا کە زۆربەی وڵاتانی جیهان سەرئەنجام رێگەی گەیشتن بە لیبراڵ دیموکراسییان هەموار کردووە (کە بە رای من بناغەی هەموو جۆرەکانی دیموکراسی پێکدێنێ)، ئەم رێکخراوانە بەچەشنێک لە پێکهاتە و رەوتە گرنگ و سەرەکییەکانی (دنیای نوێ) دابڕاون کە بۆ زۆربەی خەڵک وەک چەند شێوازێکی تەوساوی لەسەر روخساری تازەی مێژوو دەردەکەون. لە کۆتایی ئەم هەزارەدا، شا و شاژن، یانی دەوڵەت و کۆمەڵی مەدەنی، هەردوو بێ تاج و تەخت کەوتوون و منداڵەکانیان

-هاوڵاتیان- ئاوارەی هەتیوخانەکان بووون».

ئێمە گەلانی دواکەوتووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کاتێک هانا بۆ چەمک و فۆرماسیۆنە مێژوویی کۆمەڵایەتییەکان دەبەین کە گەلانی مۆدێرن دەمێک ساڵە ئەزموونیان کردووە و سەرئەنجام تووڕیان داوە. بەسەرهاتی ئێمە لەم وتانەی مارکسدا زیاتر دەردەکەوێ: «نەتەوەی ئەڵمان هاوکات لەگەڵ گەلانی مۆدێرن، قۆناغەکانی ئازادی سیاسی تێپەڕ نەکرد... کەوابوو چۆن دەتوانێ بە قەڵەمبازێکی پڕمەترسی نە تەنیا لەمپەرەکانی خۆی بەڵکو ئاستەنگەکانی گەلانی مودێرن تێپەڕێنێ؟

نەتەوەی ئەڵمان خەونی شۆڕشێکی سیاسی پەتی دەبینێ... بەشێک لە کۆمەڵی مەدەنی زەمینەی ئەم شۆڕشە پێکدێنێ، کە بە ئازادکردنی خۆی دەسەڵاتی گشتی بەدەستەوە دەگرێ... هیچ چینێک لە کۆمەڵی مەدەنی ناتوانێ وەها رۆڵێک بگێڕێ، مەگەر ئەوە کە بزاڤێک لە خۆی و لە جەماوەردا پێکبێنێ... مەگەر دۆخی خۆی لەگەڵ کۆمەڵگە یەکسان بکا و وەک نوێنەری هەموو کۆمەڵ دەور ببینێ...

بەڵام هیچکام لە چینەکانی ئەڵمان وەها دیدگایەکی بەرینیان نییە کە بکرێ تەنانەت بۆ ساتێک بە رۆحی نەتەوە و بەها و شوناسی نەتەڤی بزانین، هیچ چینێک خاوەن وەها وشیارییەک نییە کە بتوانێ هێزی ماددی لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسی لێکهەڵپێکێ... کەوابوو، تەنیا پاشاکانی ئەڵمانیا نین کە ناوەخت بە تاج و تەخت دەگەن، بەڵکو هەر بەشێک لە کۆمەڵی مەدەنی پێش ئەوەی جەژنی سەرکەوتنی خۆی بگرێ، تامی شکست دەچێژێ، بەرلەوەی ئاستەنگەکان ببەزێنێ، پەرە بە کێشەکانی خۆی دەدا و، بەرلەوەی کە بتوانێ سروشتی بەخشندەی خۆی پیشان بدات، سروشتی چاوچنۆکی خۆی دەردەخات. سەرئەنجام تەنانەت دەرفەتی گێڕانی رۆڵی گرنگ، پێش ئەوەی کە هەموار بێت، لەدەست دەچێت. هەر چینێک هەر کە لە دژی چینی باڵادەستی خۆی دەست بە خەبات دەکات، لەگەڵ خەباتی چینی بندەستی خۆی چنگاوژ دەبێت. هەر ئەمەیە کە شازادەکان لەگەڵ شا، بروکراسی لەگەڵ ئاریستوکراسی و بورژوازی لەگەڵ هەموویان لە شەڕدایە. ئەمە لە کاتێکدایە کە پرۆلیتاریا هەر لە ئێستاوە خەباتی لە دژی بورژوازی دەست پێکردووە. هێشتا چینی ناوەڕاست ناوێرێ بیر لە رزگاری خۆی بکاتەوە کە گەشەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و پێشچوونی تیۆری سیاسی، ئەو بیرە بەتاڵ دەکاتەوە»...

* * *

چەندین نووسەر و رۆژنامەی بەناوبانگی جیهان بەمجۆرە باسی کتێبەکەی کاستێڵز دەکەن:

### پیتێر هاڵ:

«مانوێل کاستێڵز بەرهەمێکی هێند مەزنی خولقاندووە کە بەڕاستی شان لە شانی سەرمایەی مارکس دەدات. وەک چۆن مارکس لە کتێبی سەرمایەدا کارکرد و کێشە کۆمەڵایەتییەکانی سەرمایەداری سەردەمی پیشەسازی راڤە دەکات، کاستێڵزیش لە کتێبی چاخی زانیاری دا سیستمی سەرمایەداری سەردەمی زانیاری و جیهانگیری راڤە دەکات، یانی کاستێلز ئاڵۆزترین پرسی سەردەمی هەڵبژاردووە و سەرکەوتوانە شرۆڤەی کردووە».

### ئانتۆنی گیدێنز:

«ئێمە ئەمڕۆ لە سەردەمێک لە ئاڵوگۆڕی خێرا و سەرسوڕهێنەردا دەژین کە ڕەنگە نیشانەی تێپەڕاندنی سەردەمی پیشەسازی بێت، ئەی کوان شیکاری و تۆژینەوەی کۆمەڵناسانە کە ئەم سەردەمی وەرچەرخانە راڤە بکەن؟ بەڵام بێگومان ئەم بەرهەمەی کاستێڵز کە بزاڤەکانی ئابووری کۆمەڵایەتی چاخی زانیاری راڤە دەکات، لە ساڵانی داهاتوودا وەک گرنگترین سەرچاوە رۆڵ دەگێڕێ».

### ئانتۆنی سمیت:

«کاستێڵز پارادۆکسێک راڤە دەکات کە لەودا هاوکات لەگەڵ لاوازبوونی دەوڵەتی نەتەوەیی، رەوت و بزاڤی ناسیۆناڵیستی گەشە دەکا و پەرەدەستێنێ... ئەو لەم بابەتەوە چ لە بواری تیۆریک و چ لە شیکردنەوەی روداوەکاندا توانایەکی بەرینی هەیە و وەک کۆمەڵناسێکی پسپۆڕ، دۆخی سەردەمی ئێمە بەوردی شرۆڤە دەکات».

### ئایدا سوسێر:

"کاستێڵز بارودۆخی کۆمەڵگەی چاخی زانیاری و ئەو هێز و گروپانە راڤە دەکات کە خەریکن پێکهاتەی دەوڵەت، نەتەوەکان، ئایدیۆلۆژی و رەگەز لە سەرتاسەری جیهاندا دەگۆڕن. ئەم کتێبە روانگەیەکی بەهێز و پڕناوەرۆک لەمەڕ ئاژاوەی مۆدێرنی جیهانی و ئەو شتەی کە هەندێ کەس بە <ئاسۆی نامۆی پۆست مۆدێرن> پێناسەی دەکەن، ئاراستە دەکات. نووسەر بە دیدێکی قووڵ و بەرین و رەسەن ئەو ئاڵوگۆڕانە شرۆڤە دەکات کە بەرۆکی ئێمەی گرتووە».

### ڤال ستریت ژورناڵ:

"مانوێل کاستێڵز پەیوەندی ئابووری کۆمەڵایەتیەکانی چاخی زانیاری راڤە دەکات».

### ڤایرد:

"ئەمە کتێبێکە کە خوێندنەوەی ئێجگار پێویستە»".

### لۆمۆند:

"چاخی زانیاری کتێبێکی سەردەم سازە»

### فاینێنشاڵ تایمز:

"ئەم کتێبە زۆر یارمەتیمان دەدات تا ئابووری چاخی زانیاری ئەم سەردەمە بناسین و جێگە و شوێنی خۆمان لەودا دیاری بکەین»

پێویستە بوترێ مانوێل کاستێڵز ساڵی ١٩٤٢لە ئیسپانیا لەدایک بووە. کاستێڵز پاش دوازدە ساڵ مامۆستایی لە زانکۆی پاریس، ئێستا مامۆستای کۆمەڵناسی و پلان دانانە لە زانکۆی بێرکلی لە کالیفۆرنیا. ئەو هەروەها لە زانکۆکانی مەدرید، شیلی، مونترال، کامپیانس، کاراکاس، مکزیکو، ژنێڤ، کوپنهاگ، بۆستۆن، ئەمستردام، سنگاپوور، تایوان، هۆنگ کۆنگ، مۆسکۆ و بارشلۆنا مامۆستا بووە و کار و تۆژینەوەی کردوو».

کاستێڵز تا ئێستا ٢٠ کتێبی چاپ کردووە کە شاری زانیاری (١٩٨٩) یەکێ لەم کتێبانەیە. کتێبی چاخی زانیاری تا ئێستا (٢٠٠١) بۆ زیاتر لە ١٠ زمان وەرگێڕدراوە. ئەم بابەتە بەشی دووهەمی ئەنجامی سێ بەرگی کتێبەکەی کاستێڵزە کە خۆی کورتی کردۆتەوە.

-وەرگێڕ-

لە کازیوەی سەردەمی زانیاریدا، قەیرانی ڕەوایی، دامودەزگای سەردەمی پیشەسازی داگرتووە و مانا و کارکردی لێ ئەستاندوون. دەوڵەتی نەتەوەیی مۆدێرن بەهۆی تالآن و بڕۆی تۆڕە جیهانییەکانی سەرمایە، دەسەلآت و زانیاری، بەشی زۆری سەربەخۆیی و توانای خۆی دۆڕاندووە. دەوڵەت کە تێدەکۆشێ لە ئاستی جیهانیدا ڕۆڵی ستراتژیک بگێڕێ، هێزی نوێنەرایەتی شارەگە نێوخۆییەکانی خۆی لەدەست داوە. سپاردنی یەکە دەوڵەتییەکان بە کەرتی تایبەتی و نەمانی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی، ئەگەرچی فشاری بروکراتیکی لەسەر کۆمەلآن لابردووە، بەلآم دۆخی ژیانی زۆرینەی هاولآتیانی خراپتر کردووە و، پەیمانی مێژوویی نێوان کار و سەرمایە و دەوڵەتی تێکداوە و، زۆربەی دالدەکانی ئاسایشی کۆمەلآیەتی لەنێو بردووە. ئەمانە چەند پرسێکن کە لەبەر چاوی خەڵکی ئاسایی، ڕەوایی دەوڵەت لەنێو دەبەن. ڕەوت و بزاڤی کرێکاری کە بەهۆی نێودەوڵەتی بوونی بەرهەمهێنان و سەرچاوە ماڵییەکان لێکدابڕاون، بۆئەوەی کە ناتوانن خۆیان لەگەڵ تۆڕسازی کۆمپانیاکان و تاکیبوونەوەی پرۆسەی کار، سازگار بکەن، تووشی هەڵوەشانەوە بوون و ئیتر وەک سەرچاوەی سەرەکی ڕێکخستنی کۆمەلآیەتی و نوێنەری کرێکاران حساب ناکرێن. بزاڤی کرێکاری بەتەواوی نەفەوتاوە بەڵکو زیاتر وەک کارگێڕی سیاسی لێهاتووە کە تێکەڵ بە ئۆرگانە گشتییەکان بووە. کڵێسا گەورەکان، کە شێوازێک لە دینی سێکۆلاریزە نوێنەرایەتی دەکەن کە بە دەوڵەت و بازاڕ وابەستەن، بەشی زۆری توانای خۆیان بۆ هاندانی خەڵک، چ لە بواری دڵدانەوەدا و چ لە بواری فرۆشتنی پلە و پایەی بەهەشتدا، دۆڕاندووە. دژایەتی باوکسالاری و، قەیرانی بنەماڵەی باوکسالار، بەردەوامی نۆرماڵی گواستنەوەی هێما کولتورییەکانی لەم نەوە بۆ ئەو نەوە خەوشدار کردووە و بنەماکانی ئاسایشی تاکی سست کردووە و بەمجۆرە ژنان و پیاوان و منالآنی ناچار کردووە ڕێگەی تازە بۆ ژیان بدۆزنەوە. بیر و ئایدیۆلۆژی سیاسی زادەی ڕێکخراوە پیشەسازییەکان، هەر لە لیبرالیزمی دیموکراتیک بەپێی دەوڵەتی نەتەوەیی تا سۆسیالیزمی کرێکاری، لە دۆخی کۆمەلآیەتی نوێدا مانایەکی شیاو بۆ خۆیان نادۆزنەوە، کەوابوو گرنگی خۆیان لەدەست دەدەن و، بە تێکۆشان بۆ مانەوە، بە چەندین شێوازی جیا جیا خۆیان دەگۆڕن تا لەگەڵ دۆخی نوێ خۆ ڕێک بخەن، سەرئەنجام لە ئالآی تۆزاوی جەنگە لەبیرکراوەکان دەچن کە لەئاست کۆمەڵگەی نوێ، ڕۆڵی پاشکۆ دەگێڕن نەک پێشەنگ.

بەمجۆرە، بەهۆی چەندین پرۆسەی هاوڕەوت، سەرچاوەی ئەو شتە کە لەم کتێبەدا بە شوناسی ڕەوایی بەخش پێناسەمان کرد، بەتەواوی وشکی کردووە. ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی کە بەپێی دەوڵەتانی دیموکراتیک و کونتراکتی کۆمەڵایەتی نێوان سەرمایە و کار پێکهاتبوون، کەم تا زۆر وەک تویکڵێکی بۆشیان لێهاتووە و بۆ پێوەندی گرتن لەگەڵ بەهاکان و ژیانی خەڵکی زۆربەی جڤاتان، تادێ لاوازتر دەبن. ئەمە تەنزێکی تاڵ و تراژیکە کە ڕاست لە کاتێکدا کە زۆربەی وڵاتانی جیهان سەرئەنجام ڕێگەی گەیشتن بە لیبراڵ دیموکراسییان هەموار کردووە (کە بەڕای من بناغەی هەموو جۆرەکانی دیموکراسی پێکدێنێ)، ئەم ڕێکخراوانە بە چەشنێک لە پێکهاتە و ڕەوتە گرنگ و سەرەکییەکان دابڕاون کە بۆ زۆربەی خەڵک وەک چەند شێوازێکی تەوساوی لەسەر ڕوخساری تازەی مێژوو دەردەکەون. لە کۆتایی ئەم هەزارەدا، شا و شاژن، یانی دەوڵەت و کۆمەڵی مەدەنی، هەردوو بێ تاج و تەختن و منداڵەکانیان –هاوڵاتیان– ئاوارەی هەتیوخانەکان بوون.

فەوتانی شوناسە هاوبەشەکان، کە بە مانای لێکترازانی کۆمەڵگە وەک سیستمێکی واتاداری کۆمەڵایەتییە، بارودۆخی سەردەمی ئێمە پیشان دەدات. هیچ پێویستییەک لە ئارادا نییە کە شوناسی نوێ پێکبێ و سەرلەنوێ بزاڤی کۆمەڵایەتی مۆدێرن بخولقێنێ. لە یەکەم نیگادا، سەرهەڵدانی جیهانێک دەبینین کە بەتایبەت لە بازاڕەکان، تۆڕەکان، تاکەکان و ڕێکخراوە ستراتیژیکەکان پێکهاتووە و بە مۆدێلەکانی «چاوەڕوانی ئەقڵانی» بەڕێوە دەبرێت (کە تیۆرییەکی ئابووری تازە و گەشەکردووە)، تەنیا هەندێ جار «کەسانی ئەقڵانی» لەپڕ تەقە لە دراوسێی خۆیان دەکەن، دەستدرێژی دەکەنە سەر کیژۆڵەیەک، یان گاز بەردەدەنە نێو تۆنێلەکانی ژێرزەمین. لەم دنیا نوێیەدا مرۆڤ پێویستی بە شوناسەکان نییە: غەریزەی سەرەکی و خواستی دەسەڵات و مەزندەی ستراتژیکی خۆپەرستانە و، لە ئاستێکی مەزنتردا، «خەسڵەتی ئاشکرا و بزاڤی ئاوارەی خێڵەکی و، توخمی دیڤۆنوسی، هەڕەشەی بەزاندنی هەموو سنوورەکان دەکات کە هەموو داب و نەریتی شارستانیەت و یاسا و ڕێسای نێودەوڵەتی سیاسی — قانوونی تێکدەدات». دنیایەک کە دژبەرانی، هەروەک پێشتر لە چەند وڵاتێک بینیمان، پاشماوەکانی پێکهاتەی دەوڵەت کە پرسی ڕەواییان وەلاناوە سەرلەنوێ خواستی ناسیۆناڵیستی گەلاڵە دەکەن. پرسی دەسەڵاتیان بۆ دەسەڵات دەوێ و هەندێ جار لە توێی پەردەی ناسیۆناڵیستیدا دەیشارنەوە. لەو وڵاتانە کە لە بەرگی یەکەم و دووهەمی ئەم کتێبەدا باسمان کرد، تۆوەکانی کۆمەڵگایەکمان راڤەکرد کە جیهانبینییەکەی لەنێوان لۆژیکی کۆنی دەسەڵات و لۆژیکی مۆدێرنی جیهانبینی خۆپەرستدا دوو لەت بووە.

سەرەڕای ئەمەش، زۆر شوناسی بەهێزی بەرەنگاری دەبینین، کە لە بەهەشتی برایەتیدا سەنگەر دەگرن و بەرامبەر شەپۆلی جیهانی و تاکگەرایی رادیکاڵ دەوەستن. ئەوان ئەندامان و لایەنگرانی خۆیان بەپێی بەهاکانی کلاسیک، خودا، نەتەوە و بنەماڵە پەروەردە دەکەن و حەسارەکانی کەمپی خۆیان، بە دامودەزگای قەومی و بەرەنگاری ناوچەیی دەپارێزن. شوناسەکانی بەرەنگاری تەنیا بۆ بەها کۆنەکان کورت نابنەوە. بەڵکو بەهۆی ڕەوت و بزاڤی ئەکتیڤی کۆمەڵایەتیش دەخولقێن، ئەو بزاڤانە دەیانەوێ لە دەڤەری بەرەنگاری خۆیاندا خاوەن سەربەخۆیی بن، تا هێزی شیاو بۆ هێرشبردن بۆ دامودەزگای دوژمنی ستەمکار بەدەست بێنن. بزاڤی ژنان، کەم تا زۆر بزاڤێکی لەم چەشنەیە

که له هەر شوێنێک وشیاری دژبەری باوکسالاری پێکدێت، دەرفەتێک بۆ ژنان دەڕەخسێنێ؛ بزاڤی ئازادی سێکسیش بزاڤێکی لەم چەشنەیە چونکە فەزای ئازادی ئەم بزاڤە، هەر لە مەیخانەکان تا ناوچە شارییەکان، ئامێری سەرەکی خۆناسی ئەمان پێکدێنێ. تەنانەت بزاڤی پاراستنی ژینگە کە پانتایی گەردوونی هەیە، زۆرجار لە دەستە و گرووپی بچووک و لە خەڵوەتی ماڵەکانەوە دەست پێدەکات کە پێش دەستەمۆکردنی زەمەن، شوێن و فەزاکان دەپارێزێ.

کەوابوو، شوناسە بەرەنگاریکەرەکان لە کۆمەڵگەی تۆڕیدا بەڕادەی بەرنامەی تاکگەرایانەی کۆمەڵی مەدەنی سەردەمی پیشەسازی برەویان هەیە. بەڵام سەرەڕای ئەوەی ئەم شوناسانە هەروا لەئارادان، بەدەگمەن دەتوانن پێوەندی پێکبێنن. ئەوان لەگەڵ دەوڵەت پێوەندییان نییە، بێجگە لەو کاتانە کە لەپێناو بەرژەوەندی یان بەهاکانیان لەگەڵ دەوڵەت دیالۆگ یان شەڕ دەکەن. ئەوان لەگەڵ یەکتریش پێوەندییان نییە، چونکە بەپێی چەندین پرنسیپی ئێجگار جیاواز پێکهاتوون کە لەئاست یەکتر سەرسەختانە یاسای «خودی» و «ناخودی» بەکاردێنن. لەبەرئەوە کە لۆژیکی سێکت کلیلی مانەوەیان پێکدێنێ، گرنگی بە خۆ-پێناسەکردنی تاکی نادەن. کەوابوو، لەلایەکەوە، نوخبەی جیهانی نێو فەزای ڕەوتەکان، زیاتر کەسانێکی بێ شوناسن: لە لایەکی ترەوە، لە کاتێکدا کە خەڵکانی بێ بەش لە مافی هەڵبژاردنی سیاسی و فەرهەنگی و ئابووری، بەرەنگاری دەکەن، «هاوڵاتیانی جیهان» زیاتر ڕوو لە شوناسی کۆیی دەکەن.

کەوابوو، دەبێ توێژێکی تر بە توێژە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵی تۆڕی زیاد بکەین. هاوکات لەگەڵ سیستمی دەوڵەت، تۆڕە جیهانییەکان و، کەسانی خۆپەرست، چەندین گرووپی تر هەن کە بەپێی شوناسی بەرەنگاری پێکهاتوون. بەڵام ئەم توخمانە لەگەڵ یەکتر پێوەندییان نییە، چونکە لۆژیکی هەرکامیان حاشا لەویدی دەکا و ناتوانن بە ئاشتی پێکەوە بژین.

کەوابوو پرسی سەرەکی بریتییە لە سەرهەڵدانی چەندین شوناسی سیستماتیک، کە وزە و پۆتانسیەلی ئەوەیان هەیە کە کۆمەڵی مەدەنی مۆدێرن و سەرئەنجام دەوڵەتێکی مۆدێرن سەرلەنوێ بژێننەوە. من لەم بابەتەوە نامەوێ بەرنامەیەک دابڕێژم یان پێشگۆیی بخەم، بەڵکو دەمەوێ ئاکامی ئایندەبینی ئەزموونەکانی خۆم لەمەڕ بزاڤە کۆمەڵایەتی و پرۆسە سیاسییەکان ڕاڤە بکەم. شیکاری من ئەم دەرفەتە ڕەت ناکاتەوە کە ڕەنگە چەندین بزاڤی کۆمەڵایەتی تەواو جیاواز، لە ئاراستەکردنی کۆمەڵگای داهاتوودا ڕۆڵی سەرەکی بگێڕن. بەڵام ئێستا، ساڵی ١٩٩٦، من نیشانێکیان لێ نابینم.

شوناسە خاوەن بەرنامەکان، لە شوناسی پێشووی کۆمەڵی مەدەنی سەردەمی پیشەسازی سەرچاوە ناگرن، بەڵکو بەپێی ئاڵوگۆڕ و پەرەسەندنی شوناسەکانی بەرەنگاری پێکدێن. بەڕای من بۆ پێکهاتنی سوژەی مێژوویی نوێ، چەندین بەڵگەی تیۆریک و بەڵگاندنی ئەزموونی لەئارادایە. بەڵام پێش باسکردنی ئەم پرسە، دەمەوێ چۆنیەتی پێکهاتنی شوناسە ئامانجدارەکان لە ناخی شوناسی بەرەنگارییەوە ڕاڤە بکەم.

ئەم ڕاستییە کە گرووپێک بەپێی شوناسێکی تایبەتی بەرەنگاری پێکدێت، بەو مانایە نییە کە بەرەو دروستکردنی شوناسێکی ئامانجدار دەڕواتە پێش. ڕەنگە ئەم گرووپە هەروا وەک گرووپێکی داکۆکیکار بمێنێتەوە. یان ڕەنگە تێکەڵ بە گرووپێکی هاوبەرژەوەند ببێ و لەگەڵ لۆژیکێکی چاکەلێدانی گشتی تێکەڵ بێت کە لۆژیکی زاڵی کۆمەڵگەی تۆڕی پێکدێنێ. بەڵام، هەندێ جار،

ڕەنگە شوناسی بەرەنگاری، شوناسی ئامانجدار پێکبێنێ و ئامانجی ئەو گۆڕینی تێکڕای کۆمەڵگە بەپێی بەهاکانی بەرەنگاری گرووپێک بێت کە بەرەنگاری دەسەلاتی سودی ڕەوتەکانی جیهانی سەرمایە، هەژموونی و زانیاری دەبێتەوە.

ڕەنگە گرووپێکی دینی وەک بزاڤێکی دینی بنیادگەرا دەرکەوێت کە ئامانجی ئەو خولقاندنەوەی ئەخلاقی کۆمەڵایەتی، دامەزراندنی دوبارەی بەها نەمرەکان بەپێی چەمکی خودا و، گشتاندنی ئایدیۆلۆژی دینی بەسەر گشت جیهان، یان لانیکەم دراوسێکان بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی نوێ بێت.

بەپێی شیکاری دوا ئەزموون، ڕەوتی ناسیۆنالیزم لە چاخی زانیاریدا لاوازتر دەبێت. لەلایەکەوە، ناسیۆنالیزم دەتوانێ پێگەی دەوڵەتی نەتەوەیی سەرلەنوێ بەهێز بکا و بە نوێنەرایەتی خەڵک، نەک خودا، سەرلەنوێ ڕەوایی بە دەوڵەت ببەخشێ. لە لایەکیترەوە، ڕەنگە ناسیۆنالیزم بە سەلماندنی ڕۆڵی بان دەوڵەتی نەتەوەکان و، بە پێکهێنانی چەندین تۆڕی فرەڕەهەندی دامودەزگای سیاسی لە جوگرافیای بگۆڕی دەسەلاتی هاوبەشدا، دەوڵەتی مۆدێرنی نەتەوەیی تێپەڕێنێ.

قەومگەرایی، کە هەم توخمی سەرەکی ستەمگەری و هەم ڕزگاربەخشی بووە، زیاتر بەجۆرێک فۆرمی دادەڕێژرێت کە لە شوناسەکانی تری جڤاتی (دینی و نەتەوەیی و ناوچەیی) داکۆکی دەکا و، لەخۆڕا هەوێنی بەرەنگاری و بەرنامەی نوێ ناخولقێنێ.

شوناسی ناوچەیی، ڕیشەی سەرەکی زیادبوونی حکومەتە ناوچەییەکان لەئاستی جیهانیدا پێکدێنێ و لەگەڵ فرەچەشنی بێ پایانی شەپۆل و ڕەوتە جیهانییەکان سازگارترە. خولقاندنەوەی فۆرمی دەوڵەت-شار تایبەتمەندی سەرەکی ئەم سەردەمە پێکدێنێ کە پێوەندی بە سەرهەڵدانی ئابووری بازرگانی نێودەوڵەتی سەرەتای سەردەمی مۆدێرنەوە هەیە.

بە لاوازبوونی باوکسالاری و بنیادنانەوەی بنەماڵەی مۆدێرن بەپێی یەکسانی ڕەگەزی لە هەموو دامودەزگای کۆمەڵایەتیدا، ڕەوت و گرووپی فمێنیستی و لایەنگرانی ئازادی سێکسی پێکدێن و دژایەتی سەرمایەداری باوکسالار و دەوڵەتی باوکسالار دەکەن.

بزاڤی پاراستنی ژینگە بە داکۆکی لە پانتایی ژیان و خۆشگوزەرانی و تەندروستی تاکەکان، دەیەوێ مرۆڤ لەگەڵ سروشت ئاشت بکاتەوە. ئەم بزاڤە بەپێی شوناسی ژینی — کۆمەڵایەتی ڕەگەزی مرۆڤ و بە قەبووڵکردنی مانای گەردوونی ڕەگەزی مرۆڤ، ئەم کارە دەکات.

ئەم شوناسانە، شوناسە ئامانجدارەکان بەهۆی بنیادنانەوەی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی نەخولقاون، بەڵکو بەرەنگاری گرووپی خولقاندونی، چونکە قەیرانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی و سەرهەڵدانی بزاڤ و شوناسی بەرەنگاری، ڕێک لە خەسڵەتەکانی کۆمەڵگەی تۆڕییەوە سەرچاوە دەگرێ کە کۆمەڵی مەدەنی لاواز و شوناسی بەرەنگاری بەهێز دەکات. یانی، جیهانیبوون، بوژاندنەوەی پێکهاتەی بورژوازی، تۆڕسازی ئۆرگانی، فەرهەنگی مەجازی و، گرنگی تەکنۆلۆژی بۆ تەکنۆلۆژی، کە خەسڵەتە گرنگەکانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی چاخی زانیاری پێکدێنن وەک سەرچاوەی قەیرانی دەوڵەت و کۆمەڵی مەدەنی سەردەمی پیشەسازی ئەژمار دەکرێن. هاوکات ئەم خەسڵەتانە وەک چەند هێزێک دەردەکەون کە بەرەنگاری کۆمەڵایەتی لەئاستیان ڕێکدەخرێت و چەندین شوناسی ئامانجداری نوێ لە گۆشە و کەناری ئەم بەرەنگارییەوە سەرهەڵدەدەن. بەرەنگاری و بەرنامەکان لەگەڵ لۆژیکی

زاڵی کۆمەڵگەی تۆڕی لە ناکۆکیدان و لە سێ دەڤەری سەرەکی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی مۆدێرندا خەباتی بەرەنگاری و هێرشبەرانە دەست پێدەکەن: شوێن، کات، تەکنۆلۆژی.

گرووپەکانی بەرەنگاری، فەزا و شوێنی خۆیان بەرامبەر لۆژیکی بێشوێنی رەوتەکانی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی چاخی زانیاری، پێناسە دەکەن. ئەوان بەرامبەر هەڵوەشانەوەی مێژوو لە زەمەنی بێ زەماندا و، گرنگی پرسی کاتی لە فەرهەنگی مەجازی واقعیدا، شانازی بە یادەوەری مێژوویی خۆیانەوە دەکەن، یان لەسەر بەردەوامی بەهاکانیان پێدادەگرن. ئەوان لە تەکنەلۆژی زانیاری بۆ پێکهێنانی پێوەندی ئاسۆیی لەنێوان خەڵک و، نەریتی دینی گرووپی بەهرە دەبەن، ئەمە لە کاتێکدایە کە پەرستنی بۆتی نوێی تەکنۆلۆژی رەت دەکەنەوە و بەها بەرزەکانی خۆیان لە دژی لۆژیکی بنەماشکێنی تۆڕەکانی کۆمپیوتەری ئۆتۆماتیک دەپارێزن.

پارێزەرانی ژینگە هەم بۆ خۆیان و هەم بۆ سروشت، لەسەر بەکارهێنانی شوێن پێدادەگرن و، لەئاست لۆژیکی ئابستراکت و ناسروشتی فەزای رەوتەکان دەوەستن. ئەوان دیدگای گەردوونی زەمەنی «planetary» دەوروژێنن، کە رەگەزی مرۆڤ لەگەڵ دەڤەری رووە لە گۆڕان یەکپارچە دەکات و لەئاست سڕینەوەی زەمەن بەهۆی نەمانی بەردەوامی دەوەستن؛ لۆژیکێ کە لە قاڵبی زەمانی بێ زەماندا جێگیردەبێ. پارێزەرانی ژینگە دەڵێن دەبێ زانست و تەکنەلۆژی خزمەت بە ژیان بکەن، نابێ زانست و تەکنۆلۆژی بەسەر ژیاندا زاڵ بن.

فمێنیستەکان و لایەنگرانی شوناسی سێکسی لەسەر کونترۆڵکردنی شوێنی جیانەکراوی خۆیان، یانی جەستەیان، پێدادەگرن؛ جەستەیەک کە لەنێو فەزای تۆڕەکاندا حاشای لێدەکرێ و بەهۆی باوکسالاری و بە نواندنەوەی وێنەکانی ژنان و فتیشیزمی سێکسی دەستکاری دەکرێ و، حاشا لە مرۆڤێتی و شوناسی دەکرێت. ئەوان هەروەها بۆ کونترۆڵکردنی زەمانی خۆیان خەبات دەکەن، چونکە لۆژیکی بێ زەمەنی کۆمەڵگەی تۆڕی، چەندین رۆڵ و ئەرک بەسەر ژناندا دەسەپێنێ بەڵام ژیانی نوێی ئەوان بەپێی زەمەنبەندی تازە رێکناخات. بەمجۆرە نامۆیی لەگەڵ زەمەن، وەک زەقترین بەدبەختی ژنانی ئازاد لە رێکخراوێکی کۆمەڵایەتی نائازاددایە. ئامانجی بزاڤی فمێنیستی و لایەنگرانی ئازادی سێکسی، بەکارهێنانی تەکنۆلۆژی لەپێناو دەستەبەرکردنی مافەکانیاندایە (وەک مافی منداڵدار بوون و مافی کۆنترۆڵ کردنی جەستە)، کە لەئاست بەکارهێنانی باوکسالارانەی زانست و تەکنەلۆژی رادەوەستێ؛ بەکارهێنانی هەندێ نەریتی پزیشکی و دەمارگرژی خۆپەرستانە بەسەر ژناندا؛ یان کەمتەرخەمی دامودەزگای زانستی بە تۆژینەوە لەمەڕ ئایدز تا کاتێک کە پێیان وابوو بەهۆی هۆمۆسێکسواڵیتە پێکدێت. ئێستا کە مرۆڤ دەیەوێ سنوری تەکنەلۆژی کۆمەڵایەتی بەسەر زاوزێی ئاژەڵاندا کونترۆڵ بکات، شەڕێکی قووڵ لەنێوان جەستەکان وەک چەندین شوناسی سەربەخۆ و جەستەکان وەک چەند دەسکردێکی کۆمەڵایەتی لەئارادایە. بەم بۆنەوەیە کە سیاسەتی شوناس لە جەستەی ئێمەوە دەست پێدەکات.

بەمجۆرە، یاسای زاڵی کۆمەڵگەی تۆڕی چەندین کێشەی تایبەت بە خۆی هەڵدەگیرسێنێ، کە بەشێوەی شوناسی بەرەنگاری گرووپی و شوناسی ئامانجدار دەردەکەون کە بەشێوەی خۆڕسک لەم فەزایەوە پێکدێن؛ ئەڵبەت بەهۆی هەلومەرج و لە رێگەی چەندین پرۆسەوە کە تایبەت بە هەر پێکهاتەیەکی ئۆرگانی و فەرهەنگی تایبەتن. چەندین بزاڤی ناکۆک پێکدێن کە کاکڵی سەرەکی

پرۆسەی مێژوویی پێکدێنن و بەمجۆرە پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی مۆدێرن و، گۆشت و پێستی کۆمەڵگەی ئێمە دروست دەبێت. لەم پێکهاتە کۆمەڵایەتییەدا دەسەڵات چ جێگایەکی هەیە؟ لەم دۆخە مێژووییەدا دەسەڵات چۆن پێناسە دەکرێت؟

هەروەک لەم کتێبانەدا باسمان کرد، ئیتر دەسەڵات لە ئۆرگانەکانی (وەک دەوڵەت)، رێکخراوەکان (کۆمپانیای سەرمایەداری)، یان بەکارهێنەرانی هێماکان (کلیسا و میدیاکان)دا چەق نابەستێ. دەسەڵات لە تۆرە جیهانییەکانی سامان، هێژمۆنی، زانیاری و وێنەکاندا کە سیستمێکی بگۆڕ و جوگرافیای نامادەی پێکدێنن، بڵاودەبێتەوە و دەتوێتەوە، بەڵام لەنێو ناچێ. دەسەڵات هێشتا بەسەر کۆمەڵگەدا حکومەت دەکات؛ هێشتا بەسەر ئێمەشدا زاڵە و فۆرم و شێوازی ژیانمان دیاری دەکات. نە تەنیا بەم هۆیەی کە چەندین سیستم و دەزگای جیاواز هێشتا دەتوانن پرنسیپ بە جەستەکان ببەخشن و بیرەکان رکێف بکەن؛ ئەم فۆرمە لە دەسەڵات، هاوکات، هەم نەگۆڕ و هەم روو لە فەوتانە. نەمرە چونکە مرۆڤەکان تاڵانکارن و هەرواش دەمێننەوە. بەڵام فۆرمی ئێستای دەسەڵات بەرەو فەوتان دەچێت: بەکارهێنانی ئەم جۆرە دەسەڵاتە بۆ بەرژەوەندی خزمەتکارانی، تادێ ناکارامەتر دەبێت. دەوڵەتان دەتوانن تیر بهاوێژن، بەڵام بۆئەوەی سیمای دوژمنان و جێگای شەرخوازان تا دێ ئاڵۆز و نادیارتربێ، ئەوان دەبێ کوێرانە تیر لە تاریکی بهاوێژن و ئەم ئەگەرە قەبوڵ بکەن کە رەنگە خۆیان بپێکن.

دەسەڵاتی مۆدێرن لە هێماکانی زانیاری و لە وێنەکانی مانیتۆر و تەلەڤزیۆنەکاندا شاراوەیە کە کۆمەڵگاکان ئۆرگانەکانی خۆیان بەوپێیە رێکدەخەن و، خەڵکیش لە دەوری ئەو ئۆرگانانەدا بناغەی ژیان پێکدێنن و لەمەڕ ئاکار و رەفتاری خۆیان بڕیار دەدەن. پێگەی ئەم دەسەڵاتە لە مێشکی خەڵکدایە. بەمجۆرەیە کە لە چاخی زانیاریدا دەسەڵات لە یەک کاتدا حازر و ئامادەیە و هەروەها پرژ وبڵاو و نادیارە. هەرکەس یان هەر شتێک لە پرسێکدا سەرکەوتبێ کە بیری خەڵکی خەریک کردبێ، بە دەسەڵات دەگات، چونکە هیچ کەرەستەو و سیستمێکی بەهێز و بێ رۆح ناتوانێ لەگەڵ ئەو بیرانە رکەبەرایەتی بکات کە دەسەڵاتی تۆڕەکان رێکی خستوون. بەڵام رەنگە ئەم دەسەڵاتە کاتی بێت چونکە هەڵداچوونی شەپۆل و رەوتەکانی زانیاری، بەردەوام هێما کولتورییەکان وەردەچەرخێنن. بەم بۆنەوە شوناسەکان تا ئەم ئاستە گرنگییان هەیە و، سەرئەنجام لە وەها پێکهاتەیەکدا کە هەردەم دەسەڵات دەگۆڕێ، ئاوا بەهێزن- ئاخر شوناسەکان، بەپێی ئەزمون، چەندین بەرژەوەندی و بەها و بەرنامە دروست دەکەن و بە داڕشتنی پێوەندییەکی تایبەت لەگەڵ سروشت، مێژوو، جوگرافی و فەرهەنگ، لە فەوتان بەرەنگاری دەکەن. شوناسەکان لە هەندێ دەڤەری پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا دەسەڵات رکێف دەکەن و داکۆکی لەو دەڤەرانە دەکەن، یان هێرشی خۆیان لە جەنگی زانیاریدا لەئاست ئەو هێما فەرهەنگیانە رێکدەخەن کە رەفتاری مرۆڤ و ئۆرگانە تازەکان دەسازن.

لە وەها دۆخێکدا، بکەرانی چاخی زانیاری کێن؟ ئێمە هەندێ سەرچاوە دەناسین کە رەنگە بکەران لەوێوە پێکدێن. پێم وایە دەشزانین کە بکەران لەگەڵ هەندێ فاکتەر پێوەندییان نەماوە. بۆ نموونە بزاڤی کرێکاری وادەنوێنێ لەڕووی مێژووییەوە دواکەوتووە. مەبەستم ئەوە نییە کە بەتەواوی دەوری داچووە (هەرچەند لە زۆربەی شوێنەکانی دنیا تروسکەکانی کز و لاوازتر دەبێت) و گرنگی خۆی لەدەست داوە. لەڕاستیدا، سەندیکاکان لە زۆربەی وڵاتاندا بکەرانێکی سیاسی کاریگەرن و، زۆر

جار وەک تاقە کەرەستەی کرێکاران بۆ داکۆکی کردن لە خۆیان لە بەرامبەر سەرمایە و دەوڵەت رۆڵ دەگێڕن. بەڵام بەهۆی خەسڵەتی بنەمایی و ئەو پرۆسە مێژووییانە کە راڤەکران، پێم وانییە کە بزاڤی کرێکاری بەشێوەی خۆڕسک و لە ناخی خۆیەوە شوناسێکی ئامانجدار بخولقێنێ کە بتوانێ سەرلەنوێ کۆمەڵگە رێکبخات و ئۆرگانە کۆمەڵایەتییەکانی چاخی زانیاری بژێنێتەوە. بێگومان کرێکارانی شۆڕشگێڕ وەک بەشێک لە دینامیزمی کۆمەڵایەتی مۆدێرن کاریگەر دەمێننەوە. بەڵام پێم وانییە کە سەندیکاکانیش وا بن.

پارتە سیاسییەکانیش وەک فاکتەری سەربەخۆی کۆمەڵایەتی دوا وزە و توانای خۆیان بەکار بردووە، دامودەزگاکانی دەوڵەتی نەتەوەیی، کە گیرۆدەی لۆژیکی سیاسەتی چاخی زانیاری و یاسا و دەستوری خۆیانن، بەشێکی گرنگ لە کاریگەرییی خۆیان دۆڕاندووە. سەرەڕای ئەمەش، هێشتا وەک چەند ئامێرێکی گرنگ خواستەکانی کۆمەڵگە لە چەندین بواری سیاسەتی نەتەوەیی، نێونەتەوەیی و بان نەتەوەییدا وەگەڕ دەخەن. لەراستیدا، سەرەڕای ئەوەی کە بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان ناچار دەبن مکانیزمێکی نوێ فەراهەم بکەن کە سەرلەنوێ دۆخی کۆمەڵ لێکبدەنەوە، هەندێ لە پارتە سیاسییەکان (رەنگە لە قاڵبی تازەی زانیاریدا) لە سەقامگیرکردنی ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتیدا رۆڵی گرنگ دەگێڕن؛ وەک دالآلنی کاریگەر نەک داهێنەرانی بەهێز.

کەوابوو، بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان بەهۆی بەرخۆدانی کۆیی لەئاست جیهانگیری و بنیادنانەوەی بورژوازی و تۆڕسازی ئۆرگانی و زانیاریخوازی بەرەڵا و باوکسالاری، خەریکن سەرهەڵدەدەن– یانی، لە ئێستادا، پارێزەرانی ژینگە، فمێنیستەکان، بنیادگەرایانی دینی، ناسیۆناڵیستەکان و ناوچەگەرایان وەک بکەرانی چاخی زانیاری ئەژمار دەکرێن.

ئەوان خواستەکانی خۆیان بە چ شێوەیەک بەیان دەکەن؟ لێرەدا شیکاری من بەناچار شرۆڤەیەکی زەینییە، ئەگەرچی تێدەکۆشم روانگەیەک ئاراستە بکەم کە بەپێی ئەزمون و بەڵگەکان بێت.

ئەو بکەرانەی کە پلان و پرۆگرامی شوناسیان هەیە و دەیانەوێ هێما و نیشانە فەرهەنگییەکان بگۆڕن تا بتوانن هێماکان رێک بخەن. ئەوان دەبێ فەرهەنگی مەجازی واقعی کە لە کۆمەڵی تۆڕیدا قاڵبی پێوەندییەکان پێکدێنێ، بگۆڕن و بەهاکانی خۆیان جێگیر بکەن و، رەمز و هێماکانی شوناسی سەربەخۆی خۆیان، بناسێنن. من دوو جۆری سەرەکی ئەم بکەرانەم بینیوە. یەکەمیان بە پێغەمبەران ناودێر دەکەم. ئەوان کەسێتی مەجازین کە رۆڵی رێبەری کاریزماتیک ناگێڕن، بەڵکو وەک سیمای دەمامکداری ئاخێزێکی مەجازی رۆڵ دەگێڕن، بەمجۆرە ئەوان بۆ خەڵکی راپەڕیو و وەک نوێنەری ئەو خەڵکە دەپەیڤن. کەوابوو، خەڵکی راپەڕیوی بێدەنگ دەبن بە خاوەنی دەنگ و، شوناسیان دەتوانێ تێکەڵ بە خەباتێکی مەجازی ببێت و بۆ گەیشتن بە دەسەلات، یانی کونترۆڵکردنی مێشکی خەڵک، بەختی خۆی تاقی بکاتەوە. بەدڵنیاییەوە فەرماندە مارکوس رێبەری زاپاتیستەکانی مەکسیک رێبەرێکی لەم چەشنەیە. هەروەها ئاساهارا رێبەری سامناکی ژاپۆنی... نمونەیەکی جیاوازتر، وشیاری ژینگەپارێزانەیە کە زیاتر سترانبێژانی مۆسیقی راک باسی دەکەن، وەک ستینگ و هەوڵەکانی بۆ پاراستنی ئامازۆن؛ یان کەسێک وەک ئۆنابێمبێر کە نەریتی ئانارشیزم بەکاردێنی و دەیەوێ بەشێوەی توندوتیژ لەئاست زیانەکانی تەکنەلۆژی، سروشتی رەسەن بپارێزێ.

لە بزاڤی بونیادگەرای ئیسلامی یان مەسیحیدا هەندێ لە ڕێبەرانی دینی ڕۆڵێکی لەم جۆرە دەگێڕن و بە ڕاڤەکردنی دەقە پیرۆزەکان، هەقیقەتی خودا دەڵێنەوە، بەو هیوایە کە ئەم ڕاستییە دڵ و دەروونی خەڵک ببزوێنێ و چرای بڕوایان داگیرسێنێ. بزاڤەکانی پاراستنی مافی مرۆڤیش زیاتر بە هۆی هەندێ کەسێتی مەجازی سەرسەخت ڕێبەری دەکرێن، وەک ساخارۆڤ کە نوێنەری کۆنی ئۆپۆزیسیۆنی روسیایە. من بە ئەنقەست چەندین نموونەی جۆراوجۆرم هێناوەتەوە تا نیشانی بدەم کە پێغەمبەرانی «چاک» و «خراپ» لەئارادان و ئەم چاکی و خراپییە پەیوەندی بە روانگە و بەرژەوەندی شەخسی مرۆڤەوە هەیە. بەڵام هەموویان بۆیە ڕۆڵی پێغەمبەر دەگێڕن کە ڕێگاکان ڕۆشن دەکەنەوە و بەهاکان دەچەسپێنن و، بە ناردنی هێماکان خۆیان دەبن بە هێما، بەجۆرێک کە پەیام و پەیامنێر تێکەڵ دەبن. وەرچەرخانی سیاسی، کە زیاتر لە ناوەندی دامودەزگای لەرزۆک و پێکهاتەی سیاسی لاوازدا ڕوودەدات، هەمیشە بانگی هاتنی پێغەمبەرانی داوە. بۆ گەیشتن بە چاخی زانیاری، تەنانەت زیاتر لە پێشوو، ئەم ڕاستییە ڕوودەدات، سەردەمێک کە لەودا فۆرم و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بەپێی ڕەوتەکانی زانیاری و هێنان و گۆڕینی هێماکان، سازدەکرێت.

دووهەمین و سەرەکیترین سوژە/ بکەر کە لە نێو بزاڤە کۆمەڵایەتییەکاندا بینیمانەوە، بریتییە لە فۆرمی ناسەنترالّ و تۆڕی ڕۆڵ و ڕێکخراوەکان، کە تایبەتمەندی بزاڤی کۆمەڵایەتی مۆدێرن پێکدێنێ و ڕەنگدانەوەی لۆژیکی تۆڕی دەسەڵات لە چاخی زانیاریدایەو، دژکردەوەیەکە لە ئاست ئەم چاخەدا. وەک بزاڤی پارێزەرانی ژینگە کە بەپێی تەوەری تۆڕە نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکان چالاکی ناسەنترالّی خۆیان ئەنجام دەدەن. بەڵام من وەها ڕەوتێکم لەنێو بژاڤی فمێنیستی، دژبەرانی نەزمی جیهانی و، بونیادگەرایانی دینیدا نیشان داوە. ئەم بزاڤانە ڕێکخستنی چالاکی و بەشداری لە سیستمی زانیاریدا تێدەپەڕێنن. ئەوان بەڕاستی هێما کولتورییەکان بەرهەم دێنن و دابەشی دەکەن. ئەوان تەنیا لەنێو تۆڕی خۆیاندا ئەم کارە ناکەن، بەڵکو لە شێوازی جۆراوجۆری دانوستاندا ئەنجامی دەدەن. ستراتیژێکی فەرهەنگی کە سەنتەرێک دایڕشتبێ بەدەگمەن کاریان تێدەکات. سەیرترین و سەرکەوتووترین کار و چالاکی ئاوان، زیاتر بەرهەمی «ئاژاوە» لە تۆڕی دانوستانی چەندلایەنەدایە؛ وەک دروست کردنی جۆرێک «فەرهەنگی سەوز» بەهۆی تریبوونێکی جیهانی، بەپێی هاودەنگی ئەزموونەکانی پاراستنی سروشت و مانەوەی سەرمایەداری، بەشێوەی هاوکات. یان بەهۆی دەرفەتی فەوتانی باوکسالاری کە بەهۆی دانوستانی ئەزموونەکانی ژنان لە ڕەوت و گرووپی فمێنیستی، گۆڤاری ژنان، کتێب فرۆشی ژنان، سینەمای ژنان، دەرمانگەی ژنان و تۆڕی داکۆکی ژنان لە پەروەردەی منالاندا پێکدێت. بەمجۆرە خەسڵەتی زراڤ و ناسەنترالّی تۆڕەکانی ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتی، ناسین و تێگەیشتنی شوناسە ئامانجدارەکان کە تازە لەدایک دەبن تا ئەم ئاستە دژوار دەکات. لەبەر ئەوەی کە دیدگای مێژوویی ئێمە، لەگەڵ سوپای تۆکمەو ئاڵای ڕەنگاورەنگ و دروشمی ڕوونی ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتیدا ڕاهاتووە، کاتێک گەشەی شێنەیی ئاڵوگۆڕی گەشەسەندووی هێماکان دەبینین کە لە تۆڕە جیاجیاکان و بەدەر لە حەسارەکانی دەسەڵات ڕوودەدەن، تووشی حەپەسان دەبین. لەنێو کووچە تەنگەکانی کۆمەڵگە، یانی لەنێو تۆڕەکانی ئەلکترۆنیک یان تۆڕەکانی بەرەنگاری جەماوەریدایە کە هەستم بەوە کردووە کە هێزی شوناس تۆوی کۆمەڵگایەکی نوێی لە بەستێنی مێژوودا چاندووە.

## پەراوێزەکان:

١-بەڕای کاستلز شوناس پرۆسەیەکە کە لەودا بکەرێکی کۆمەڵایەتی خۆی دەناسێ و بەپێی خەسڵەتێک یان کۆمەڵێک خەسڵەتی کولتوری و، بە بێ ئاماژە بە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، ئایدیا و جیهانی واتایی خۆی سازدەکات. کاستلز لە سەردەمی مۆدێرندا سێ جۆر شوناس پێناسە دەکات کە بریتین لە : ١) ڕەوایی بەخش کە لەلایەن پاشماوەکانی دەوڵەتی سەردەمی پیشەسازی گەڵاڵە دەکرێت. ٢) شوناسی بەرەنگاری کە بەرنامەی گرووپی دینی و لایەنگرانی بەها کۆن و کلاسیکەکان پێکدێنێ. ٣) شوناسی ئامانجدار تایبەتە بە ڕەوت و بزاڤی نەتەوەیی ئێتنیکی. (و.ک)

٢-بەشی یەکەمی ئەم بابەتە بە ناوی چاخی زانیاری: ئابووری، کۆمەڵگە، کولتور پێشتر لە گۆڤاری زانستی سەردەمدا بڵاوکرایەوە، بۆئەوەی خوێنەران باشتر کاستێلز و بەرهەمەکەی بناسن، لێرەدا دیسان سەرەتای بەشی یەکەم دێنینەوە.

٣-کارڵ مارکس، هەوڵێک بۆ نرخاندنی فەلسەفەی هێگل.

## سەرچاوە:

عصر اطلاعات، قدرت هویت، مانوئل کاستلز، نشر طرح نو، تهران ١٣٨٠، صص ٤٢٥-٤٣٥.

# ئەوانەی گەڕاونەتەوە بۆ ئاین..

## لێکۆڵینەوەیەك لە دیاردەی گۆڕینی ئاین و مەزهەب

هاشم ساڵح
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

زۆر بە دەگمەن یەکێک لە توێژەرەوەکان، خۆی لە قەرەی ئەم بابەتە ئاڵۆزە دەدات کە لە ڕۆشنبیری عەرەبیماندا وەک جۆرێک لە تابۆی لێهاتووە، مەبەستم بابەتی گۆڕینی ئاینە. ئەم بابەتە لە زمانی فەقیهی کۆندا ناونیشانێکی ترسناکی لەخۆدەگرت، ئەویش (هەڵگەڕاوە-الردە)یە. بێگومان سزای کەسی هەڵگەڕاوە بەپێی فەرمودەیەکی بەناوبانگ، گەرچی تا ئاستێک گومان لە ڕاستی ئەو فەرمودەیە دەکرێت، کوشتنە. فەرمودەکە دەڵێ: ئەوەی ئاینی خۆی گۆڕی بیکوژن. ئەمە فەرمودەیەکە بە تەواوی پێچەوانەی ئازادی ئاین یاخود ئازادی پەرستنو ویژدانە کە لە سەرجەم دەستورە تازەکانو ڕاگەیاندنەکانی مافی مرۆڤدا هاتووەو جەختی لەسەر کراوەتەوە. بگرە لە جیهانی عەرەبیدا گۆڕینی ئاین، شێوەیەکی شورەییئامێز یاخود شێوەی تاوانێکی نەگریسی وەرگرتووە. لەوانەیە تەنها کاریگەرییەکی نێگەتیڤی لەسەر خودی تاکە کەسەکە نەبێت، بەڵکو کاریگەری لەسەر هەموو خزمو کەسوکارەکەشی هەیە. ئەم حاڵەتە تەنها خەڵکە ڕەشۆکەکە ناگرێتەوە، بەڵکو سەرانی گەورەی دەوڵەتیش دەگرێتەوە. گەورەترین بەڵگە بۆ ئەوە مەلیک «فاروق»ە. مەلیک «فاروق» دوای ئەوەی خوشکەکەی چووە سەر ئاینی مەسیحی، بەڕادەیەک هەستی بە ڕیسوایی‌و سەرشۆڕی کرد، لە داخو کەسەردا کۆچی دوایی کرد، وەک ئەوەی «هانی نەسیرە» لە کتێبە نایابەکەیدا باسی لێوەدەکاتو ئێمەش لێرەدا ڕانانی بۆ دەکەین.

لە میانەی تەنها ئێوارەیەکدا، کتێبی ئەم توێژەرە گەنجە میسرییەم خوێندەوە، هۆکارەکەشی ئەوەیە بابەتەکەی بۆ بزوتنەوەی ڕۆشنگەری عەرەبی زۆر گرنگە، چونکە هیچ ڕۆشنگەرییەک بەبێ ئازادییەکی تەواوی ئاین، بونی نییە. هەر ئەمەشە دانەری کتێبەکە زیاد لە جارێک باسی لێوەدەکات، گەرچی خۆی پەیوەستە بە ئیسلامەوە. وەلێ ئیسلامێکی سادەو لێکبوردە کە بە شێوەیەکی ئاسان لێیتێدەگەیت، ئیسلامێک لەسەر ڕێبازی مامۆستا مەزنەکانمان، وەک «محەمەد فەرید وەجدی»، «ئەحمەد زەکی ئەبو شادی»و ڕۆشنگەرە عەرەبەکانی دیکە. بەڵام ناکرێ بە یەککەرەت بگەینە ئەم ئازادییە. خەسڵەتە عەقڵانیو هۆشدارییەکەی کتێبەکەی «هانی نەسیرە» ئالێرەدایە، ئەو کاتێ لە کتێبەکەیدا هەندێ فیکرو ڕۆشنایی بوێرانە دەخاتەڕوو، زۆر دوورە لە سادەگۆییو هەرزەگۆیی فیکری. ڕۆژئاواش تەنها دوای سێ سەدەو دوای ململانێیەکی توند لەگەڵ عەقڵی جێگیرو ڕەگداکوتاوی فێدەمێنیتاڵیزمی مەسیحی، گەشتە ئازادی ئاینی.

دانەری کتێبەکە گەرچی شانازی بە ئاینی ئیسلامەوە دەکات، بەڵام هەر لە سەرەتاوە ڕاشکاوانە ڕایدەگەیەنێت دژ بە (الاکراه فی الدین)ە، لە لاپەڕە پێنجی کتێبەکەوە دەڵێت: (ئازادی پەرستن، مافێکە هەموو خوێندنەوەیەکی ڕۆشنگەرانە بۆ ئاینو هەموو پەیماننامە نێودەوڵەتیو مرۆڤایەتییەکان، جەختی لەسەر دەکەنەوە. هەروەها یەزدانی گەورە فەرمویەتی: ئەوەی دەیەوێ با ئیمانداربێتو ئەوەشی دەیەوێ با کافربێت، تەنها یەزدانە مەسەلەکان یەکلایی دەکاتەوەو حساب لەگەڵ کەسەکاندا دەکات).

«هانی نەسیرە» لە پێگە فیکریەکانی مۆدێرنەوە، تەماشای ئاین دەکاتو لەوێوە دەستپێدەکات، نەک لە پێگە تەقلیدییەکانەوە، گەر وانەبوایە ئەوا کتێبەکە هەموو گرنگیو بایەخی خۆی لەدەستدەدا. چونکە کتێبە تەقلیدییە پڕ وەعزو ئامۆژگارییە جاڕسکەرەکان، گۆڕەپانەکەیان پڕ کردووەو ئێمە پێویستمان بە کتێبێکی تەقلیدی تازە نییە. گرنگ تازەکردنەوەی تێڕوانینو ئاسۆو تازەکردنەوەی شێوازی چارەسەرکردنەکانە.

دانەر جیاوازی لەنێوان سێ جۆر لە گۆڕان لە ئایندا دەکات، یەکەمیان گۆڕانی تەواوەتی، واتە گۆڕینی ئاینێک بۆ ئاینێکی دیکە. دووەمیان گۆڕانی (بەشی-الجزئی)، واتە گۆڕینی مەزهەبێک بۆ مەزهەبێکی دیکە لەناو هەمان ئایندا. بێگومان ئەم گۆڕانەیان ئاسانترەو بۆ کەسەکە دەردەسەری کەمترە، چونکە مەرجەعیەتی ئاینەکە بەتەواوی ناگۆڕدرێت. گەر کاسۆلیکیەک گۆڕا بۆ پرۆتستانت یان بە پێچەوانەوە، ئەوا هەر بە مەسیحی دەمێنێتەوەو مەرجەعیەتی مەسیحو ئینجیلە. گەر شیعەیەک گۆڕا بۆ سونە یان بە پێچەوانەوە، ئەوا بە موسڵمانی دەمێنێتەوەو مەرجەعیەتی «محەمەد»و قورئانە.

وەلێ نازانم نوسەر بۆچی گۆڕانی سێیەمیان، لە ئیمانی ئاینییەوە بۆ بێ ئیمانی یان بۆ ئیلحاد، ناوناوە گۆڕانی دژ؟ ئایا باشتر نەبوو بەوپەڕی سادەییەوە بڵێت: چونەدەرەوە لە ئاین؟. جگە لەوانە گۆڕانی چوارەمیش هەیە کە بریتییە لە گۆڕانی عەلمانی نەک ئیلحاد، گۆڕانی عەلمانی زانستو ئیمان پێکەوە کۆدەکاتەوەو پاش کەمەکێکی دیکە قسەی لەسەر دەکەم. ئاشکرایە زۆربەی دانیشتوانی وڵاتە پێشکەوتووەکانی ڕۆژئاوا، لە جۆری چوارەمن. واتە بە شێوەیەکی عەمەلی دەستبەرداری مەسیحیەتی تەقلیدی بوونو خۆیان لە سروتو ڕێوڕەسمەکانی ڕزگارکردووە. ئەو

سروتو ڕێوڕەسمانە بەلای ئەوانەوە بووەتە پاشخانێکی ڕۆشنبیری یان میتافیزیکی یاخود ڕۆحی. ڕەنگە میللەتانی عەرەبیو ئیسلامی، بگرە تەواوی میللەتانی سەر گۆی زەوی، چاوەڕوانی ئەوەیان لێدەکرێت ڕۆژێک لە ڕۆژان، دەستبەرداری ئاینی تەقلیدی ببنو لێی بێنەدەرەوە، ئەمەش دوای ئەوەی لە ڕووی فیکرییو مادییو بژێوی ژیانەوە پێشدەکەون. ئیدی لەو کاتەدا مەسەلەی گۆڕینی ئاین، دەبێتە مەسەلەیەکی لاوەکیو ئەم هەموو هاتوهاوارو هاشوهوشەی ئێستا ناوروژێنێت کە هەنوکە لە کۆمەڵگاکانماندا وروژاندویەتی.

بیرمە کاتێ هاتم بۆ فەرەنسا، بەلامەوە سەیربوو، فەرەنسییەکان ڕێزی «مۆریس بێجار»ی مۆسیقاژەن دەگرن کە هاتبووە سەر ئاینی ئیسلام، بەتایبەتی ئیسلامی سۆفی کە پێی سەرسامبوو. لە کۆمەڵگای فەرەنسیدا کە بە شێوەیەکی گشتی ئیسلامیان خۆشناوێت، هاتنی ئەو مۆسیقارە بۆ سەر ئاینی ئیسلام، نەبووە هۆی ئەوەی ناوبانگو دواڕۆژو وەزیفەکەی لەدەستبدات، فەرەنسییەکان پێیان وابوو ئەو مەسەلەیە مەسەلەیەکی شەخسییەو شایەنی ئەوە نییە زیاد لە پێویست لەسەری ڕاوەستیت. ئەو گۆڕانە لە گۆڕانی ئینتیمای سیاسی دەچێت، وەک گۆڕان لە کەسێکی چەپخوازەوە بۆ کەسێکی ڕاستڕەو، یان بەپێچەوانەوە. بگرە بەلای فەرەنسیەکانەوە گۆڕینی ئینتیمای سیاسی، مەترسیدارترو بایەخدارترە، چونکە ئاین چیدی ڕەگەزێکی سەرەکی نییە لە دروستکردنی شوناسی تاک یان کۆمەڵ.

بەڵام مەسەلەکە لە جیهانی عەرەبی یان ئیسلامیدا تەواو جیاوازە، لێرە مەسەلەی ئاین یان مەزهەب، هەموو ڕەهەندەکانو مەترسییەکانی لەخۆگرتووە. لێرە ئاین مەسەلەیەکی شەخسی یان لاوەکی نییە، بەڵکو مەسەلەیەکی زۆر سەرەکیو بنەڕەتییە، هۆکەشی ئەوەیە ئاین پێگەیەکی گەورەی لە ژیانماندا داگیرکردووە، تەواو بە پێچەوانەی کۆمەڵگا ئەوروپییە بەعەلمانیبووەکان کە عەیامێکە بونەتە کۆمەڵگای عەلمانی. ئاشکرایە چوونە سەر ئاینی بوزی لە ئەوروپاو هەموو ڕۆژئاوادا، بووەتە مۆدە، وەک ئەوەی «هانی نەسیرە» باسی لێوەدەکات. بەناوبانگترین کەس کە چووەتە سەر ئاینی بوزی، ئەکتەری ناودار «ڕیشارد جیر»ە، ئەم ئەکتەرە دوای وازهێنانی لە مەسیحیەتو چوونە سەر ئاینی بوزی، لە کۆمەڵگای ئەمریکیدا ڕوبەڕوی هیچ کێشەو گرفتێک نەبووەوە، بگرە بە پێچەوانەوە، چونکە تا ئێستاش ناوبانگو جەماوەربونی وەک خۆی ماوەتەوەو لە ئاستێکی زۆر بەرزدایە. بەڵام فەیلەسوفی فەرەنسی «ڕۆجێ گارودی» دوای ئەوەی هاتە سەر ئاینی ئیسلام، ئەم دەستەواژە جوانەی وت کە دانەری ئەم کتێبە زیاد لە جارێک ئاماژەی پێداوە: (محەمەدێکم بردەوەو مەسیحیشم نەدۆڕاند).

سەبارەت بەو سێ گۆڕانەی کە نوسەری کتێبەکە ئاماژەیان پێدەکات، پێمانوایە گۆڕانی گرنگو گەورەو بەربڵاو، ئەو گۆڕانە نییە کە خەڵکانی چاخی مۆدرێن، لە ئاینداری تەقلیدییەوە، بگوازنەوە بۆ بێ دینی یان بۆ ئیلحاد یاخود بۆ بێئیرادەیی، ئەمەش وەک کاردانەوەیەک لە دژی دەمارگیریو داخرانی مێژوویی. بەڵکو گۆڕانی گرنگو گەورە بریتییە لە گواستنەوە لە ئاینداری تەقلیدی سەدەکانی ناوەڕاستەوە، بۆ ئیمانی ئازادو مۆدرێن، واتە ئیمان بە خوداو بە بەها ڕۆحیو ئەخلاقییە باڵاکان، بەبێ پەیوەستبوون بە سروتو ڕێوڕەسمە پروکێنەرەکانەوە کە چیتر لەگەڵ عەقڵیەتی سەدە تازەکانو بارودۆخی وەزیفەو کاری ڕۆژانەو بەرهەمهێناندا یەکناگرێتەوە. من پێموایە ئەم

جۆرە گۆڕانە پانو فراوانە بەسەر زۆربەی ئادەمیزادەکاندا دێت، گەر بارودۆخی ژیانیان باشببێتو تازەگەری زانستیو فەلسەفی لەنێوەندەکانیاندا بڵاوببێتەوە، وەک ئەوەی لەناو میللەتانی ئەورووپای ڕۆژئاوای پێشکەوتوو ڕوویدا. ئەو میللەتانە بەشێوەیەکی پراکتیکی دەستبەرداری بڕێکی زۆری سروتو ڕێوڕەسمی مەسیحی بوون، بەڵام بەبێ ئەوەی دەستبەرداری ئیمان، بە مانا جەوهەرییەکەی ببن.

لێرەدا پێویستە جیاوازی بکەین لەنێوان بێئیمانی (ئیلحاد)و ئیمانی مۆدرێن، چونکە عەلمانییەت بریتی نییە لە بێئیمانی، بەڵکو بریتییە لە ئازادی ویژدانو بیروڕا. بەشی زۆری عەلمانییەکان ئیماندارن، بەڵام بە مانا تازە لیبرالیەکەی وشەی ئیماندار، نەک بە مانا دەمارگیرییەکەی سەدەکانی ناوەڕاست. لێرەوەیە لە تەواوی ئەورووپاو ڕۆژئاوادا، جیاوازی دەکرێت لەنێوان مەسیحییە لیبرالییەکانو مەسیحییە دەمارگیرەکان یان توندڕەوەکان. دەستەی یەکەم لەڕێگەی هاوکێشەیەکی ڕۆشنگەریانەی تازەوە، گونجاندنێک لەنێوان زانستو ئیماندا دروستدەکەن، کەچی دەستەی دووەم ناتوانن ئەو کارە بکەن، چونکە ئەوانە ڕقیان لە زانستو عەقڵ دەبێتەوەو بەشێوەیەکی کوێرانەو داخراو ئیماندارنو سەرجەم بیروڕاکانی دیکە ڕەتدەکەنەوە. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە بێئیمانی قەدەغەبێت، بەڵکو ئەوە یەکێکە لە چارەسەرەکان کە لە شارستانیەتی ڕۆژئاوادا خراوەتەڕوو، وەلێ هەموو چارەسەرەکە نییە. هەرچۆنێک بێت بەشێوەیەکی گشتی بێئیمانی فەلسەفی، هەرگیز مانای چونەدەرەوە نییە لە ئەخلاقو بەها باڵاکان، بێئیمانەکانی ئەورووپا لە هەموو کەس زیاتر پەرۆشی یاساو خۆشبەختی کۆمەڵگاو ڕێزگرتنی کەرامەتی مرۆڤایەتین. لێرەوە تەنانەت کەسی بێئیمان بە جۆرێک لە جۆرەکان ئیماندارە، ئەو بەشێوەیەکی فەلسەفی ئیمانی بە بەها باڵاکان هەیە.

«هانی نەسیرە» پێش ئەوەی دەمارگیری کوێرانە ئیدانەبکات، هەندێ بیرەوەری شەخسی خۆی دەگێڕێتەوە کە ڕەنگە بیرەوەری هەمومان بێت.

(چاکەکاری «الفضیلة» لە ڕێگەی دەمارگیری خاوەنەکەیو نەبینینی چاکەکاری ئەوانی دیکە، دەبێتە خراپەکاری–الرذیلة...کاتێ خۆم بە پیرۆز دادەنێمو ئەوانی دیکە بە نەگریس، ئەوا بێگومان تێڕوانینم بۆ پیرۆزیی خەوشو درزێکی گەورەی تێدایە... ئەوەی پێیوابێت ڕەگەزەکەی لە ڕەگەزەکانی دیکەو عەشیرەتەکەی لە عەشیرەتەکانی دیکەو ڕەنگی لە ڕەنگی ئەوانی دیکەو چینەکەی لە چینەکانی دیکە باشترە، ئەوە نەزانو تێنەگەیشتووە... بەڵێ دەکرێ ئەوانی دیکە هەڵەبن، بەڵام چارەسەرکردنی هەڵەکە لەڕێگەی گفتوگۆوە دەکرێت نەک کوشتنو بێبەشکردن.. کارکردن بە لۆژیکی کوشتن، بووە هۆی شەڕی عەشیرەتەکانو لەوێشەوە گەندەڵبوونی نەتەوەکان).

ئەمەیە هەنووکە لە تەواوی جیهانی عەرەبیو ئیسلامیدا ڕوودەدات، لە یەمەنەوە بۆ عێراقو لە ئەفغانستانەوە بۆ پاکستانو ئەوانی دیکە. لەبەرئەوەی تێگەیشتنێکی دەمارگیرانەو تەسکبین بۆ ئاین یان مەزهەب بەربڵاوە، بۆیە نە چارەسەر هەیە نە ڕزگاربوون نە یەکێتی نیشتیمانی، بەڵکو سەربڕینو جەنگی ناوخۆ هەیە. ئەورووپا لە جەنگە مەزهەبییە توندەکانی نێوان کاسۆلیکو پرۆتستانت ڕزگاری نەبوو، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە تێگەشتنی سەدە تاریکەکانی بۆ ئاینی مەسیحی لێکهەڵوەشاندەوەو تێگەشتنێکی تازەی ڕۆشنگەرانەو سیستمێکی عەلمانی فرەیی خستە شوێن.

دواتر نوسەری کتێبەکە بەردەوامدەبێتو سەرسوڕمانی خۆی بە ئەزمونی تازەگەری ڕۆژئاوا دەردەبڕێتو دەڵێ: (تازەگەری ڕۆژئاوا لە قوڵایدا هیچ نییە جگە لەوەی کەرامەتی بۆ مرۆڤ وەک مرۆڤو تاک وەک تاک گەڕاندەوەو هەڵبژاردنی وەک هەڵبژاردنێکی ئازادو بەرپرسیارانەی خستەبەردەست، بەبێ ئەوەی تەماشای ئاینەکەی یان ڕەنگی یاخود ڕەگەزی بکات. ئەوە بووە هۆی هێنانەئارای مافی جیاوازیو دانپیانان، هەروەها بووە هۆی هێنانەئارای ڕیزبەندی کۆمەڵایەتیو داهێنانی فیکرییو زانستی، دوور لە هەر وەعزو ئامۆژگارییەک. ئێمە پێویستە لەسەرمان ڕێزی دەزگای ئاینی ڕۆژئاوا بگرین کە خەڵکانی شارەزاو خوێندەوار بەڕێوەی دەبات، ئەو خەڵکە خوێندەوارانە وایانکرد دەزگای ئاینی ئەوێ، توانای ئەوەی هەبێت لەگەڵ تازەگەری ڕۆژئاوادا بگونجێتو بەدەم داواکاری پێداویستییەکانی خەڵکەوە بچێت. هەر ئەوەش بوو وایکرد ئەو دەزگایە بتوانێت ژیانی لەگەڵ سەردەمو لەگەڵ تازەگەریدا ڕێکبخات، بگرە لە ئێستادا توانیویەتی ڕۆڵی خۆی زیاترو سەرکەوتوانەتر ببینێت، ئەمەش لەو کاتەدابوو کە بە بوێرییەوەو دوای چەندین سەدە، کەرامەتی بۆ «گالیلۆ» گەڕاندەوەو بێبەری کرد لەو تۆمەتانەی درابونەپاڵی، هەروەها کەرامەتی بۆ «داروین» گەڕاندەوە، ئەم دەزگا ئاینییە بێبەریبونی خۆی لە زۆرێک لە تێڕوانینی پیاوانی ئاینی جاران ڕاگەیاند کە لەسەردەمی کۆندا بڵاوببونەوەو چەقیانبەستبوو).

ڕاستە، من هەندێ قسە بۆ قسەکانی «هانی نەسیرە» زیاددەکەمو دەڵێم: هیوادارم ئەو ڕۆژە بێت کە تێیدا ئێمەش بێبەریبوونی خۆمان لە بەشێکی زۆری فوقەهاکانی سەدەکانی ناوەڕاستو فەتواکانیان ڕاگەیەنین کە چیتر بەکەڵکی ئەم سەردەمە نایەن. بۆ نمونە وەک کوشتنی کەسی هەڵگەڕاوە، یان تەکفیرکردنی ئاینەکانی دیکە، یاخود تەنانەت تەکفیرکردنی گروپەکانی دیکەی ئیسلام، یان تەماشاکردنی خراپیان بۆ ئافرەت، یاخود بەرتەسککردنەوەی ئازادییە فەردییەکان لەمیانەی جێبەجێکردنی سنورە کۆنەکانی وەک فەلاقەکردن یان ڕەجمکردنی ئەوانەی مەی دەخۆنەوە، یاخود بڕینی دەستو قاچی ئەوانەی جیاوازن...هتد.

ئێمەش پێویستمان بەوەیە بە هەموو ئەو شتانەدا بچینەوە کە بەدرێژایی چەندین سەدە جێگیرو باوبووە. کڵێسای کاسۆلیکی دەستیکردووە بە ماڵینی بەردەرگای ماڵەکەی خۆیو داوای لێبوردن دەکات لەو کارانەی لەسەروەختی دادگاکانی پشکنینو کوشتارگا مەزهەبییەکان دژ بە کەمینەی پرۆتستانتو دژ بە زاناو بیرمەندەکان، ئەنجامیدابوون. کڵێسای کاسۆلیکی دەستیکردووە بە ڕەخنە لەخۆگرتنو پەشیمانبونەوە لە هەڵەکانی، پەشیمانبونەوە لە هەڵە فەزیلەتە. لەبەر ئەم هۆیەیە پاپاکان لەم ساڵانەی دوایدا ڕێزو حورمەتیان بەدەستهێناوە، بە پێچەوانەی جاران. بەڵێ کاتی ئەوە هاتووە لە فقهی سەدەکانی ناوەڕاستەوە بگوازینەوە بۆ فقهی تازەگەریو لێکبوردنو ئازادی.

ئالێرەدا «هانی نەسیرە» لەنێو ئەو تاریکو نوتەکەی تێیدا دەژین، هەندێ پێشکەوتنی پۆزەتیڤمان پیشاندەداتو پێمان دەڵێت: (شێخ «عەلی جومعە»ی موفتی میسر کە لە شێخە ڕۆشنگەرو عاقڵەکانە، ساڵی ٢٠٠٧ بە ڕۆژنامەی (واشنتۆن پۆستی) ڕاگەیاندووە: لە سۆنگەی ئازادی ئاینییەوە، ڕێگەدەدات بە گۆڕینی ئاینو سزای هەڵگەڕاو لە ئاین بەکارنەهێنرێت، بە مەرجێک هەڕەشە لە سیستمی گشتی نەکات. دەڵێن دواتر لەو قسەیەی پەشیمانبووەتەوە).

بەڵام گەر شێخ «عەلی جومعە» لەم بارودۆخەی ئێستاو لە ئەنجامی فشاری شەقامو گەلەکۆمەی

سەلەفییەکان، لەو لێدوانە (سەرەڕۆیەی) پەشیمانیش بوبێتەوە، ئەوە جێگای شانازییە بۆ ئەو گەر بۆ تەنها جارێکیش بێت لێدوانی لەو چەشنەی داوە. بە بۆچونی من ئەم بابەتە جارێ کاتی نەهاتووە، چونکە ڕای گشتی ئیسلامی هەرگیز ئامادەنییە ئەوە قبوڵبکات. بەڵگەش بۆ ئەوە ئەو قسانەیە کە «هانی نەسیرە» سەبارەت بە دەمارگیری کۆنو تازە دەیانکاتو دەڵێت: (لە هەموو ئاینێکدا، خەڵکی عەوام-جەماوەر- لە تێگەشتنیاندا بۆ ئاین خەڵکانێکی سادەو ساکارن، بەڵام زۆربەی جار ئەو خەڵکە سادەو ساکارانە، دەبنە دەمارگیرترینو توندڕەوترین کەسی ئاینی. خەڵکی عەوام خوی بە شتە باوەکانەوە گرتووەو هەرگیز ڕازینابێت لەگەڵ شتە جیاوازو ناباوەکاندا هەڵکات).

ئەمە ڕاستە، بیرمەندەکان لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا، چ لە کۆنو چ لە ئێستادا، بەدەست فشاری ڕای گشتییەوە ناڵاندویانە. وەلێ خەڵکی عەوام، واتە جەماوەر، گەر ئاستی ڕۆشنبیریو پەروەردەکردنیو ئاستی گوزەرانی ژیانی بەرزکرایەوە، چیتر وەک عەوامێکی نەخوێندەوار یان وەک عەوامێکی تێکدەرو ئاشوبگێڕ نامێنێتەوە. تەماشای ئەوە بکە کە لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوادا ڕویدا، لەوێ خوێندنو ڕۆشنگەریو ڕۆشنبیری، بەشێوەیەک بڵاوبوەوە هەموو چینو توێژەکانی کۆمەڵگای گرتەوە، تەنانەت گوندە دوورەدەستەکانو لوتکەی شاخەکانیشی گرتەوە. ئیدی لەو چرکەساتەوە کەلێنی نێوان چینی دەستەبژێری ڕۆشنگەر لەگەڵ خەڵکە ڕەشۆکەکە بەرتەسکدەبێتەوە. لێرەدا دەگەینە دەستەواژەیەکی جوان کە یەکێک لە ڕۆشنگەرە گەورەکانی فەرەنسا وتویەتیو «هانی نەسیرە» لە لاپەڕە ٩٢ کتێبەکەیدا ئاماژەی پێداوە، دەستەواژەکە هی «فیکتۆر هیگۆ»یەو دەڵێ: (مۆدێرنە زانست وەک ئاینێکی تازە دەبینێتو کۆتایی بە هەموو ئاینەکانی پێش خۆی دێنێت).

بەڵێ مۆدێرنە وەک پەرچەکردارێک دژ بە دەمارگیری توندڕەوە مەسیحییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست دەرکەوت، دژ بە سەرکوتکردنی بیرمەندو زاناکان دەرکەوت، هەروەها دژ بەو دەمارگیرە توندڕەوانە دەرکەوت کە بەڕووی هەموو دۆزینەوە تازەکاندا دەوەستانو بە بیدعەیان لەقەڵەمدەدا. لێرەوە مۆدێرنەی عەرەبیش وەک پەرچەکردارێک دێتو بە رووی ئەو شەپۆلە بەرفراوانەی سەلەفییەتدا دەوەستێت کە لەمڕۆدا گرفتاری بووینو بەدەستییەوە دەناڵێنین.

بەڵام ئاین دوای هاتنی مۆدێرنە کۆتایی پێنایەت، وەک ئەوەی «فیکتۆر هیگۆ»و نەوەکەی، لە سەدەی نۆزدەهەمدا پێیانوابوو. بەڵکو لەسەر داروپەردوی ئایندارییی دەمارگیرو داخراوی سەدەکانی ناوەڕاست، ئاینداریییەکی لیبرالی کراوەو لێکبردوو، لە سەرجەم ناوچەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوادا دەرکەوت. لەسەر داروپەردوی ئیمانی کۆن، ئیمانێکی بکوژە، ئیمانی دادگاکانی پشکنینو جەنگەکانی خاچپەرستەکان، ئیمانێکی تازە، ئازاد، ڕۆشنگەر دەرکەوت. بەڵام لە لوتەکەی سەرکەوتنی زانستو دەستکەوتە پیشەسازیو تەکنەلۆجییەکەیدا، هەندێ لە ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە، پێیانوابوو ئیدی ئاین کۆتایی پێهاتووەو ناگەڕێتەوە. لە واقیعدا ئاین کۆتایی پێنەهات، بەڵام گۆڕانی بەسەرداهاتو پێشکەوت. تەماشاکە بزانە زانای بەناوبانگی تیۆلۆژیا «هانز کۆنگ» دەربارەی ئەم بابەتە مەترسیدارە، لە سێ کتێبە گەورەکەیدا کە لەم ساڵانەی دوایدا یەک لە دوای یەک دەرچوون: (جولەکەو مەسیحیو ئیسلام) دەڵێ چی، هیوادارم کەسێک بێتو ئەو سێ کتێبە وەرگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی، تاکو ڕۆشنبیران قەبارەی ئەو شۆڕشانەی تیۆلۆژیا ببینن کە لەسەدەی شازدەهەمەوە تاکو ئەمڕۆ، بەسەر مەسیحیەتی ڕۆژئاوادا هاتووە.

دواجار لەگەڵ «هانی نەسیرە»دا لەسەر ئەو پەرەگرافە ڕادەوەستم کە لە ڕابەری فێندەمێنیتاڵیستی تونسی «ڕاشد غەنوشی» وەریگرتووە، «غەنوشی» لەو پەرەگرافەدا ستایشی عەلمانیەتی دیموکراسی لە ڕۆژئاوادا دەکات کە ڕێگەی بە ئازادی پەرستنو ئازادی گوزارشتکردن داوە، هەر ئەو عەلمانیەتەش لەپشت بوونی ئەو هەموو موسڵمانە زۆرەوەیە لە ڕۆژئاوا... زۆرباشە، بەڵام ئێمە هیواداربوین مامۆستا «ڕاشد غەنوشی» ستایشی عەلمانیەتی ڕۆشنگەری لە جیهانی عەرەبیو ئیسلامیشدا بکردایە، نەک تەنها ئەوەی ڕۆژئاوا. ئێمە هیواداربوین بە دوو پێوانە یان بە دوو سەنگ شتەکان نەپێوێت. لێرەدا عەلمانیەت باشە، واتە لە ڕۆژئاوادا، بەڵام لێرە، لە جیهانی عەرەبیو ئیسلامی ڕەتدەکرێتەوە، بۆچی؟ ئایا «غەنوشی» ڕازییە بەوەی عەلمانیەتی ڕۆشنگەرانە، واتە ئازادی ویژدانو پەرستنو ئازادی ئایینداری یان بێ ئاینی، لە تونس یان سوریا یاخود میسرو جەزائیر..هتد پراکتیک بکرێت؟ ئایا لە جیهانی عەرەبیدا ڕازییە بە یەکسانی نێوان ئاینەکانو مەزهەبەکان، وەک ئەوەی وڵاتانی ڕۆژئاوای عەلمانی جێبەجێیدەکەن؟ مەحاڵە بەوە ڕازیبێت. پێویستە دان بەوەدابنێن شتێکی لەو شێوەیە لەلای ئێمە جارێ کاتی نەهاتووەو هێشتا ئامادەباشی ئەوەمان تێدانییە. ئێمە داوای شتێک ناکەین جێبەجێکردنی مەحاڵ بێت، بەڵام دەکرێ بەو ئاراستەیەدا لانی کەم چەند هەنگاوێک بچینەپێش. یان دەکرێ گەر یەکێک لە سەرکردەکانی عەرەب هەنگاوێکی لەو شێوەیەی نا، نەبینە بەربەست لەبەردەمیدا.

ئەوە کێ بوو چاونەترسانەو بوێرانە، ڕوبەڕوی نەریتە خنکێنەرەکانی کۆمەڵگای تونسی بووەوەو مافەکانی ئافرەتی بەخشییە ئافرەتان؟ لەگەڵ هەموو ئەو دەستکەوتو ئازادیانەی دیکە کە لەمڕۆدا تونس شانازییان پێوەدەکاتو لە وڵاتانی دیکەی عەرەبیدا نییە، ئایا ئەوە «حەبیب بۆرقێبە» نەبوو؟ باشە «غەنوشی» بۆچی ستایشی ئەوە ناکات، یاخود لانی کەم بۆچی ستایشی هەندێ لە دەستکەوتەکانی عەلمانیەتی تونسی ناکات. ئایا «غەنوشی» کە تاڕادەیەک فێندەمێنیتاڵیستێکی میانڕەوەو تا ئاستێکیش ڕۆشنبیرە، ڕازی دەبێت بەوەی میتۆدی ڕەخنەگرانەی مێژویی، بەسەر هەموو کەلتوری ئیسلامیدا پراکتیزە بکرێت، وەک ئەوەی لە ڕۆژئاوا بەسەر مەسیحییەتدا پراکتیزەکرا؟ ئایا ڕازییە بەوەی لە وڵاتەکانمان، جگە لە ئاینی ئیسلام ئاینی دیکە هەبێت، وەک ئەوەی ڕۆژئاوا ڕازین بەوەی لە وڵاتەکانیان ئیسلام هەیە؟ ئایا ڕازییە بەوەی کڵێساو سەومەعە لای ئێمەش هەبێت، وەک ئەوەی ئەوان ڕازین بەوەی مزگەوت لە پاریسو بۆرکسێلو ڕۆماو مەدرید هەیە؟

ئاخۆ «غەنوشی» ڕازییە بەوەی گەنجانی موسڵمان، لە ئاینداری تەقلیدی، بە هەموو سروتو ڕێوڕەسمو تاپۆ پڕۆکێنەرەکانییەوە، ڕزگاریان ببێت؟ ئایا ڕازییە بەوەی گفتوگۆیەکی مێژوییانە، زانستیانە، فەلسەفیانە، دەربارەی عەقیدە ئیسلامییە کەڵەکەبووەکان بکرێت، وەک ئەوەی ڕۆژئاوا لەگەڵ مەسیحیدا دەیکات؟ یان پێویستە بەبێ گفتوگۆکردن ئیمانی پێبێنین؟ ئایا ڕێگەدەدات بەو موسڵمانانەی لە ڕۆژئاوادان، بکەونە ژێر کاریگەری خودی ڕۆژئاواوەو دەستبەرداری ئیسلامی سەلەفی ببن، تاکو بتوانن بژینو تێکەڵ بە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان ببن کە لە دەست فێدەمینیتاڵیزمی مەسیحی ڕزگاریان بووە. گەر ئەوانەی نەکرد، مانای وایە ئەو تەنها لە وڵاتانی ڕۆژئاوا سەرسامە بە عەلمانییەتو پەرۆشی ئەوەیە (پەتای) عەلمانیەت نەگاتە وڵاتەکانمان. ئا ئەمەیە کەلتوری پێوانەکردن بە دوو پێوانە کە برا فەندەمێنیستاڵیستەکانمان پەیڕەوی لێدەکەن. بۆچی سەرسامن

بەو ئازادیانەی لە وڵاتانی ڕۆژئاوای عەلمانی لەئارادایەو سودی لێوەردەگرن، بگرە هەندێجار بۆ بڵاوکردنەوەی فیکری دەمارگیرو دژ بە عەلمانیەتو لێکبوردن، دەیقۆزنەوە. بەڵام لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا بەشێوەیەکی تەواو ڕەتیدەکەنەوە؟

لەم ڕەوتەدا دەکرێ پرسیارگەلێکی زۆر بخرێتەڕوو، بەڵام دواجار ئەوە گرنگ نییە فلانەکەس یان فیسارەکەس ئاینەکەی یاخود مەزهەبەکەی خۆی دەگۆڕێتو دەچێتە سەر ئاینێکی دیکە، ئەم مەسەلانە مەسەلەی تاکە کەسینو سنورێکی دیاریکراوو گرنگییەکی کەمی هەیە، وەک ئەوەی «هانی نەسیرە» دەیڵێت. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کۆی جیهانی عەرەبیو ئیسلامی، لە قۆناغی ئایینداری سەدەکانی ناوەڕاستەوە، کەلەسەر ڕقلێبونەوەو توندوتیژی بەندە، بگوازێتەوە بۆ قۆناغی ئایینداری مۆدرێن کە لەسەر ئازادی تاکە کەسو مافی هەڵبژاردن بەندە. ئەم دابڕانە ئەبستمۆلۆجییە گەورەیە، تا ئێستا لە هیچ شوێنێکدا ڕوینەداوە تەنها لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا نەبێت. ئێمە لە جیهانی عەرەبیدا، هێشتا هەر لەژێر سایەی ڕق لێبونەوە لە ئاینەکانی دیکە دەژین، ئەگەرچی قورئانی پیرۆز بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە ئەو مەسەلەیە ڕەتدەکاتەوە. هێشتا هەر لە فقهی تەکفیری سەدەکانی ناوەڕاستدا پەلەقاژێمانە، فقهێک ئەو کەسانەی ئاینی خۆیان دەگۆڕن، بە تۆمەتی هەڵگەڕاوە، حوکمی کوشتنیان بەسەردا دەدرێت. کەچی لە هەمانکاتدا باس لە تیۆلۆژیای تازەگەریو پاش تازەگەری دەکەن!

### سەرچاوە:

ماڵپەڕی الاوان، چوارشەمە، ٢١ تشرینی یەکەم، ٢٠٠٩

# چل ساڵ دوای
# شۆڕشی خوێندکارانی ١٩٦٨

**ئەنوەر حامد**
**لە عەرەبییەوە: سەردەم**

١٩٦٨ ساڵی لە دایک بوون بوو، بەڵام شۆڕش هەر لە کۆتاییەکانی جەنگی دووەمی جیهانیەوە، لە هەناوی کۆمەڵگاکانی خۆرئاوادا تاوی دەسەند و گەورە دەبوو. هەموو ئەو مەرگ و ماڵوێرانیەی شەڕ لە دوای خۆی جێیهێشتبوو، لەگەڵ دابەشبونی ئەوروپا بەسەر دوو کەمپی دژبەیەکدا و ئەو جەنگە ساردەی لەو دابەشبوونە کەوتەوە، گەنجان و خوێندکارانی ناچار کرد بە وروژاندنی پرسیار گەلێک، لە گرنگترینیان ئەمانە بوو: (ئایا تا ئێستاش دەسەڵاتداران و پارێزەرانی ئەو سستمە باش و بەکەڵکن؟ ئایا بەڵگەی پێویستیان نیشان نەدا کە ئەوانە بە ڕێگای ڕاستماندا نابەن؟).

گەنجان بوون بە پێشەنگی یاخی بوون، لەبەرئەوەی نەوەی باوکان ماندووبوو بوون و بڕستیان لەبەر بڕابوو. یەکەمین ئاماژەکانی شۆڕش لە کایەی ئەدەب و هونەردا دیاری داو ڕابەرانیشی هەر گەنجان بوون. ساڵی ١٩٥٧ «جۆن ئۆزبۆن» شانۆگەری (Look back in anger – بە تووڕەیی ئاوڕ لە دوای خۆت بدەرەوە)ی نوسی، ئەم ناونیشانە تەعبیرە لەو ڕۆحیەتەی کە شانۆگەریەکەی پێ نوسراوە. پاشان لە بەریتانیا بزاوتێکی ئەدەبی دروست بوو کە ئەندامەکانی ناویان لە خۆیان نا (Angry young men — گەنجانی تووڕە). هەروەها یاخی بوون لە دژی شێوازە باوەکان لە شانۆ و شیعر و مۆسیقا لە ئەوروپا و وڵاتە یەکگرتووەکانی

ئەمریکادا دەستی پێکرد. سەرەنجام لەناو گەنجاندا ئایدیۆلۆژیایەک دروست بوو کە تایتڵەکەی ئەمە بوو: (شۆڕش بەسەر پایەکانی ئەو ڕژێمە سیاسیەی بالا دەست بوو، یاخی بوون لە مۆراڵی باو و بەزاندنی هەموو تخوبەکان).

لەم سەروبەندەدا هەر بە تەنها سستمی خۆرئاوا و ئایدیۆلۆژیای سەرمایەداری نەبونە نیشانەی ڕەخنە، بەڵکو ئەو ڕەخنانە حوکمڕانی ستالینیشی گرتەوە. واتە شۆڕشگێڕە نوێیەکان کەوتنە گومانکردن لە بنەماکانی تیۆریای مارکسی کە پێشبینی بەرپابونی شۆڕشی پرۆلیتاریای و داڕمانی سستمی سەرمایەداری دەکرد، بەڵام سەرەڕای تێپەڕبونی سەدەیەک بەسەر دروستبونی چینێکی پرۆلیتاری بەهێز لە ئەوروپا، شتێکی لەو جۆرە ڕوی نەدا.

لێرەوە گەنجان بڕوایان بە هیچ شتێکی سەردەمەکەیان نەماو ئەو ئەلتەرناتیڤەش کە هەبوو شوێن باوەڕ نەبوو. کەواتە دەبێت چی بکرێت؟

فەیلەسوفە نوێیەکان وەک «هربرت مارکۆزە»ی ئەڵمانی کەبوو بە باوکی ڕوحی بزاوتە خوێندکاریەکان، لە هەوڵی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەدا بوو. ئەو پێیوابوو پرۆلیتاریا ئەو هێزە فریاد ڕەسە نەماوەو سەرمایەداری توانیویەتی لە ڕێی دروستکردنی پێداویستی وەهمی بەرخۆرییەوە و هەوڵدان بۆ تێرکردنی ئەو پێداویستیانە، چینی کرێکاران دەستەمۆ بکات. بەم پێیە ڕۆڵی ڕێبەرایەتیکردنی شۆڕش لە کرێکارانەوە، گواستراوەتەوە بۆ خوێندکاران و هێزە پەراوێز کەوتووەکانی ناو کۆمەڵگە، چونکە ئەمانە تا ئێستا سستمی سەرمایەداری نەیتوانیووە ناچاریان بکات بەوەی ملکەچی یاساکانی بن.

خەسڵەتی ئانارشیستانەی بزاوتی خوێندکاران لێرەوە سەرچاوە دەگرێت، بزاوتێک کە زۆر دوور بوو لەو دیسپلینەی تایبەتمەندی ئایدیۆلۆژیای مارکسیزمی تەقلیدی بوو. خوێندکاران لە شۆڕشەکەیاندا تێک و پێکدانی پایەکانی سستمی بالادەستیان کردبووە ئامانج، هەر لە دەسەڵاتی سیاسیەوە بۆ نۆرم و بەها ئەخلاقیەکانی و یاسا و دام و دەزگا کۆمەڵایەتیەکانی. شۆڕشی خوێندکاران داوای ئازادی سێکسی دەکرد، لە دەرەوەی دەزگای خێزان و ژیانی هاوسەرگیری. بڵاوبونەوەی کلتوری نەهێشتنی منداڵ بوون، یارمەتی دەربوو بۆ خۆپارێزی لە دەرەنجامە نێگەتیڤەکانی ئەو ئازادیە. گەنجە توڕەکانی ئەو قۆناغە، پشتیان لە بیرو باوەڕی دام و دەزگا ئایینیەکان کرد و لە بری ئاسمان و ئەوە دنیا، کەوتنە سۆراخکردنی بەختەوەری لەسەر زەمین. ئەوەی لەم پرۆسەیەشدا یارمەتیدەریان بوو، ئازادی جنسی و بەنگ کێشان و ئەو ئایدیۆلۆژیایە بوو کە بڕوای بە شکاندنی هەموو تخوبە ئەخلاقی و تەقلیدیەکان هەبوو.

گەرمەی ئەم کێشمە کێش و ڕاچەنینە لە ناو فەرەنسادا بوو، دواتریش ڕۆحی شۆڕش گەیشتە زانکۆکانی ئەمریکا و دژایەتیکردنی شەڕی ڤێتنام تەکانی زیاتری بە بزوتنەوەی خوێندکاری دا، هەروەها ئەوروپای خۆرهەڵاتیشی گرتەوەو بەهاری پراگ دروست بوو.

شۆڕشی خوێندکارانی ٦٨ لە فەرەنسا، بەزنجیرەیەک مانگرتن لە زانکۆکان و خوێندنگا ئامادەییەکاندا دەستی پێکرد. حکومەتەکەی «شارل دیگۆل» هەوڵیدا بە شێوازی پۆلیسی سەرکوتی بکات و ڕێگەی پێ بگرێت، ئەمەش بووە مایەی هەڵایسانی شەڕو پێکدادان لە شەقامەکانی (الحی اللاتینی)دا (کە بە گەڕەکی خوێندکاران دەناسرێت لە پاریسدا).

لەگەڵ مانگرتنی خوێندکاراندا، کرێکارانیش دایەنە پاڵیان و تاوای لێهات لە ماوەیەکی کەمدا، ژمارەی مانگرتوان گەیشتە دە ملیۆن کەس. حکومەتی فەرەنسا لەوەدا بوو بکەوێت، بەڵام هەروەک چۆن هەلومەرجەکە لە پرێکدا و بەخێرایی تەقیەوە، هەرواش بەخێرایی دامرکایەوە. کرێکاران گەڕانەوە سەر کارەکانیان و سەروەختێکیش هەڵبژاردنی تازە دەستی پێکرد (لە مانگی حوزەیران)دا، دیگۆلییەکان زیاد لە جاران بەهێز تربوون. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بزاوتی خوێندکاران نەیتوانی حکومەت ناچار بکات بە کۆتایهێنان بە جەنگی ڤێتنام، هەروەها لە ئەوروپای خۆرهەڵاتیش بزوتنەوەکە شکستی هێنا لەوەی سستەمی سۆسیالستی ناچار بکات لە پراگ تا چاکسازی بکات، بە تایبەت دوای ئەوەی تانکەکانی پەیمانی وارشۆ خۆیانکرد بەو شارە قەشەنگەدا. لە وڵاتانی ئێمەشدا جۆش و خرۆش بۆ پرانسیپەکانی شۆڕشی خوێندکاری، نەگەشتە ئەوەی بگاتە ئاستی بزوتنەوەیەکی ڕادیکال، بەڵکو تەنها هەندێک ئاقاری دەستەبژێری ڕادیکالی لە زانکۆ دەستەبژێرەکانی وەک زانکۆی ئەمریکی لە بەیروت و هەندێ بیریار و ڕۆشنبیری چەپڕەو، تەبەنیان کرد.

ئێستاو دوای تێپەڕبوونی چل ساڵ بەسەر شۆڕشی خوێندکاریدا، با بزانین چی لە پرانسیپەکانی ماوەتەوەو ئەکتیڤیست و چالاکوانەکانی بە کوێ گەیشتن؟

هەرچی پەیوەندی بە پرانسیپەکانەوە هەیە، ئەوا داڕمانی سستەمی سۆسیالستی لە ساڵی ١٩٩٠دا، زۆرێک لە هاوکێشەکانی ژێرەو ژورکرد و بووە مایەی کەنارگیرکردنی چەپی جیهانی و کۆمەڵگاکانی دنیا ڕوبانکردە بەرخۆری (بەرخۆری وەک یەکێک لە خەسڵەتەکانی کۆمەڵگەی سەرمایەداری کە ئامانجی شۆڕشی خوێندکاری بوو)، هەروەها گۆڕان و کێشەکانی دنیا بە تایبەت ئەو کێشانەی تایبەتی و شەخسی نین، جێ بایەخی گەنجان و خوێندکارانی زانکۆ کان نین.

سەبارەت بە چالاکوان و ئەکتیڤیستەکانی بزوتنەوەکەش، ئەوا بە سێ ئاڕاستەی جیادا ڕۆیشتن:

–هەندێکیان گەڕانەوەیان بۆ باوەشی سستەمەکە هەڵبژارد، وەک شۆڕشگێڕ و بیریاری فەرەنسی «ڕێجی دۆبرێ» کە لە جەنگەڵەکانی ئەمریکای لاتینەوە گەڕایەوە بۆ پاریس، تاببێتە ڕاوێژکاری «فرانسوا مێتێران». لەگەڵ «دانییال کوهن بندیت» «دانییە سور» کە یەکێک بوو لە ڕێبەرانی شۆڕشی خوێندکارانی پاریس کە بوو بە سەرمایەدارێکی خاوەن پلە و پایە، تا گەیشتە پەرلەمانی ئەوروپی.

–هەندێکی دیکەیان تا ئێستاش بڕوایان بەو پرانسیپانە ماوە، وەک بیرمەندی بەریتانی «تاریق عەلی» و ئەکتەری بەریتانی خاتوو «ڤانیسا ریدگریف» کە تا هەنوکە بە گیانی ئەو بیروبۆچونانەی شەستەکانەوە، درێژە بە کارو چالاکی سیاسیی خۆی دەدا.

–هەندێکی کەشیان (کە ئەمانەیان زۆرینەن)، دوچاری نا ئومێدیەکی قوڵ هاتن و خۆیان لە بەردەم دۆخێکی نەخوازراودا بینیەوە. ئەمانە لەوانەن کە هیچ ئینتیمایەکیان بۆ مۆراڵ و دامودەزگاکانی ئەو سستەمە نەماوە، لەبەرئەوە لە پەراوێزدا دەژین و نایانەوێت ملکەچی یاساکانی ئەو سستەمە بن و ببنە ئامرازی بەرهەم هێنان کە بەشداری لە پتەوکردنی پایەکانیدا دەکەن، بۆیە بونەتە دانیشتوانی سەر شۆستەکان.

سێ ساڵ بەر لە ئێستا بەرێکەوت، چاوم بە یەکێک لەوانە کەوت کە لەبەردەم کۆگاکانی «هارودز»دا شتێکی ڕاخستبوو لەوێدا دانیشتبوو. بەڵێ ئەو شوێنەی دیاری کردبوو بۆ ئۆقرە گرتن کە دەوڵەمەندەکانی شارەکە ڕوی تێدەکەن. تۆ بڵێی مەبەستی لەمە چی بێت؟ بۆ بەو جل و بەرگە دڕاوو سەرو قژە چڵکنەوە، لە ناو ئەو خەڵکە شیک پۆش و بۆن خۆشانەدا دادەنیشێت؟

لەگەڵ ئەوەشدا، نە لە کەس پاڕایەوەو نە بەزەیی کەسیشی بەلای خۆیدا ڕاکێشا. «مارک» نمونەی ئەو کەسانەیە کە سەر شۆستەکان دەکەنە ماڵی خۆیان. کاتێک سەیری دەکەیت هەست دەکەیت لە بەرامبەر کەسێکدای، لەوانەیە شەڕێکی دۆڕاندبێت، بەڵام هەرگیز دەستبەرداری شکۆمەندی خۆی نەبووەو بە یەکجاری ئاڵای سپی هەڵنەکردووە.

**سەرچاوە:**

BBC ARABIC.COM

# "محەمەد ئۆزۆن"..
# بەرهەمگەلێکی کۆڵەوار!

نزار ئاگری
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

ساڵی ١٩٨٥ بە زمانی کوردی کتێبێک بە ناوی (tu-تۆ)وە بڵاوکرایەوە. لە ژێریدا نوسرابوو ڕۆمان، نوسەر «محەمەد ئۆزۆن». شوێنی چاپ و بڵاوکردنەوەی: ستۆکهۆڵم لە سوید. پێشتر کەس ناوی نوسەرەکەی نەبیستبوو. بڵاوبونەوەی کتێبەکە شتێکی دڵخۆشکەر بوو، چونکە تێکستێکی ئەدەبی لەو جۆرە بەگژ ئەوسانسۆرەدا دەچووەوە کە تورکیا بەسەر هەموو ئەو شتانەی، پەیوەندییان بە زمان و کلتورو هونەری کوردیەوە هەبوو، سەپاندبووی. هەروەها لەبەر ئەوەی کتێبەکە (وەکی لە بارەیەوە دەوترا)، قەڵەمبازێکە لە بواری هونەری ڕۆماننوسین بە زمانی کوردی، بەو پێیەی بە ستایلێکی مۆدێرن نوسراوە. پاشان ڕۆمانەکانی دیکەی «ئۆزۆن»ی بە دوادا هات: (مەرگی پیرەمێردێکی پیاو چاک، تارمایی خۆشەویستی، ڕۆژێک لە ژیانی عەبداڵ زەنکی، بیری چارەنوس و.. هتد). دەقی یەکەمین ڕۆمانی (tu-تۆ)بە هەوڵی خوێندکارێکی ناشی دەچوو. دەقێک بوو پڕ لە هەڵەی لۆژیکی و داڕشتن و شتی تر. مایەی سەرسوڕمان بوو کە دەیانوت ئەم دەقە دەقێکی مۆدێرنە..

دواتر توانیم سێ ڕۆمانەکەی دیکەشی بخوێنمەوە: (تارمایی خۆشەویستی، عەبدال زەنکی، بیری چارەنوس) کە هەموویان ژیاننامەی چەند کەسایەتیەکی ناسراوی کوردن. ناوەڕۆکی ئەم سێ ڕۆمانە، دەقاودەق لە دیکۆمێنت و سەر بوردە

واقعیەکانەوە وەرگیراون. ئەڵبەتە کارێکی خراپ نییە نوسەر لە بەرهەمەکانیدا، سود لە ڕوداوە مێژووییەکان و کارەکتەرە واقعیەکان وەربگرێت. ڕۆماننوسی بە تواناش ئەوەیە، دەتوانێت کڵێشەی دەقێک بکێشێت کە ئەو ڕوداوو کارەکتەرانەی تێدا بتوێنێتەوەو بە شێوەیەکی ئەوەندە تازە لەگەڵ ڕوداوەکانی دەقەکەدا تێکەڵ بن، وەک ئەوەی ناوەڕۆکی تێکستەکە هیچ پەیوەندی بە سەرچاوەی ڕوداو و کارەکتەرە ئەسڵییەکانەوە نەبێت. «محەمەد ئۆزۆن» باس و خواسی زۆری لەسەر «عەبدال زەنکی و مەمدوح سەلیم و جەلادەت بەدرخان» کۆکردۆتەوە، بەڵام نەیتوانیوە ئەو هەواڵ و زانیاریانە بکاتە باکگراوندێک بۆ ئەو ڕۆمانانەی دەیانوسێت. ئەوەی ئەو کردویەتی، ڕیزکردنی ئەو زانیاری و باس و خواسانەیە کە لە دیکۆمێنتە نوسراوەکان یاخود لەو خەڵکانەی بیستووە کە قسەیان بۆ کردووە، بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و مێژوویی ڕاستەوخۆ.

بەمجۆرە «ئۆزۆن» دەستی کردبەوەی، خۆی وەکی ڕۆماننوسی یەکەمی کورد نیشان بدات. لەم پێناوەشدا و بۆ تۆخکردنەوەی زیاتری ئەو وێنەیە لەسەرخۆی، هەوڵێکی زۆری بەخەرجدا. لەم هەوڵە بەردەوامەشیدا، دەیویست ئەدەبی چەوساوە و سەرکوتکراوی کوردی نیشان بدات. ئەمەشی بۆ چووە سەر، کاتێک دەزگاکانی ڕاگەیاندن وەک تاکە نوێنەری سەرعی ئەدەبی نوێی کوردی، گرنگیان پێداو ڕۆشناییان خستە سەری.

وا دیارە ناوەندە ڕۆشنبیریەکانی وڵاتانی ئەسکەندەناڤی و بەتایبەتیش سوید، سورن لەسەر ئەوەی هاوسۆزبن لەگەڵ هەموو گروپێکی چەوساوەو زوڵم لێکراودا، بۆ ئەم مەبەستەش «محەمەد ئۆزۆن» یان بەچاکترین کەناڵێک زانیووە، تا لە ڕێی ئەوەوە داکۆکی لەگەڵێکی بەش مەینەتی وەک کورد بکەن، هەر بۆیە دەزگاکانی پەخش و بڵاوکردنەوەو وەرگێڕکارانی سویدی لە وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی کتێبەکانیدا هاوکاری بوون.

«محەمەد ئۆزۆن» دەچووە هەر شوێنێک، وەک قسەکەر بەناوی کلتورێکەوە کە لەبەردەم هەڕەشەی قڕکردندایە، پێشوازی لێدەکرا و گرنگیان پێدەدا. لەگەڵ بایەخدانی زیاتری کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بە پرسی کورد لە ڕووە ئینسانیەکەیەوە، گرنگیدان بە ڕووە سیاسی و نەتەوەیی و کلتوریەکانیش زیادیدەکرد. «ئۆزۆن» ئەمەی بە هەلێکی مێژوویی بۆ خۆی زانی و زۆر زیرەکانە، ئەو چرکەساتە و بونی خۆشی لە وڵاتێکی ئەسکەندەناڤیدا کە هاوسۆزیەکی تایبەتی بۆ کورد هەیە، قۆستەوەو بە یەکجاری خۆی ئیعلانکرد.

لەم سەروبەندەدا ناوەندە کلتوری و سیاسیەکانی سوید و وڵاتانی دیکەش، ئەو کەسەیان تێدا دۆزیەوە کە بۆی دەگەڕان. ئەدیبێکی تێکۆشەر کە بەرجەستەی خواست و ویستی گەلێک دەکات، خۆی لەبەردەم پرۆسەی پاکتاوکردن و سڕینەوەی مێژویدا ڕاگرتووەو بەرخورد دەکات. وەک ئاشکراشە واقیع و هاوکات مێژوش، سڵ لە بۆشایی دەکەنەوەو حەزی پێناکەن. هەر بۆیە «ئۆزۆن» و ئەو ناوەندانەش، ئەو بۆشاییەیان بەدی دەکرد و دودڵنەبوون لە پڕکردنەوەی. ئەو ناوەندانە بایەخیان بە ناوەڕۆکی ئەو شتەدەدا کە «ئۆزۆن» دەیویست لە تێکستەکانیدا باسی لێبکات: (کێشەی کورد و ئەو زوڵم و ستەمەی لێیدەکرا). زۆرێکی زۆریش پێیان وابوو ئەو شتانەی ئەو باسیان دەکات، بەسن بۆ ئەوەی گرنگی پێبدرێت.

بۆ سەوداکردن لەگەڵ نوسینەکانی ئۆزۆن»دا، ڕەهەندی سیاسی و پڕوپاگەندە پشکی شێریان

هەبوو. بەو جۆرەش سەیری تێکستەکانی دەکرا کە دەفتەرێکی تۆمارە و تەعبیر لە واقیع حاڵێک دەکات کە ئەوانی دی دەخوازن پێی ئاشنابن و شتی لە بارەوە بزانن. لە کاتێکدا بە دەگمەن نەبێت، ئاوڕ لە لایەنی ئەدەبی و هونەری ئەو نوسینانە نەدراوەتەوە. ئەوان بە ئامرازەکانی ڕەخنەی ئەدەبی، توخنی نوسنەکانی نەکەوتن، بەڵکو بە کەرەستەی سیاسی خەریکی تاوتوێکردنی بوون. ئەمەش وایکرد ئەو بۆچونە بە ئاسانی تێپەڕێت کە گوایە بەرهەمەکانی «ئۆزۆن» لەسەرزەمینی ڕۆمان و هونەر ڕادەوەستێت. بەمجۆرە بەهانەی سیاسی، بوو بە پاسپۆرتی نوسینێک بە ناوی ئەدەبەوە.

پاساو هێنانەوە بە خەباتکردن لە پێناو زمانێکی مافخوراو و زوڵملێکراودا، بەس بوو بۆ ئەوەی بە ئاسانی هەموو شتێک پەسەند بکرێت. لێرەوە «ئۆزۆن» بوو بەو منداڵە نازدارەی دەبوو بە نەرم و نیانی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، لەبەرئەوەی ئەو نوسەرێکە و مەرگەساتی کوردنیشانی جیهان دەدات. ئەمەش ئەو دەستەواژە بەردەوامە بوو کە دەوترایەوە، بەرامبەربەوەی «ئۆزۆن» لە کایەی ئەدەبی کوردیدا دەیکرد. لەلایەکی دیکەوە ئەو وتارانەی دەربارەی ڕەوشی گوزەرانی کورد دەینوسی، وایکرد گرنگی زیاتر و زۆرتری پێبدرێت.

ناوبانگی «ئۆزۆن» لەوێوە سەرچاوەی گرت کە ئاماژەیە بۆ واقعێکی تاڵ و دژوار، زیاد لەوەی ئاکامی بایەخ و گرنگی ئەو شتانە بێت کە دەینوسین. ئەو لایەنانەشی گرنگیان پێداو پشتگیریان لێکرد، بەهای هونەری و ستاتیکی نوسینەکانیان بۆگرنگ نەبوو، ئەوەی ئەوان بایەخیان پێدەدا ئەوە بوو کە ئەو سیمبولی واقیعێکە، دەبێت هاوسۆز بن لەگەڵی و بەزەییان پێیدا بێتەوە. پێدەچێت «ئۆزۆن»یش ئەمەی بە هەل و دەرفەتێکی باش زانیبێت کە دووبارە نابێتەوە.

هەر بۆیە ئەو شتانەی دەینوسی لە ژێر بەیداخی ئەدەبی مۆدێرنی کوردیدا بڵاویدەکردنەوە، بەمەش خۆی بۆ ئەوە ئامادە دەکرد تا ببێتە سەرمەشق لەو نوێگەریەدا. لەو ڕۆمانانەی «محەمەد ئۆزۆن» نوسیونی، ڕوداوی واقیعی لە پلەی یەکەمدا دێت و دوا قسەش بۆ ئەو کارەکتەرە ڕیالیستیەیە کە ڕەگو ڕیشەی لە ناو پێدراوێکی جوگرافی و مێژویی دیاریکراودایە.

زۆربەی ڕوداو و کارەکتەرەکان (بگرە هەموویان)، خاوەنی پێگەیەکی دیاریکراوو شوێنێکی واقیعیین. هەروەها لە کاتێکی واقیعیشدا دەگوزەرێنن کە بەموو لێی لانادەن. واتە دەتوانین بڵێین ئەوانە ڕمانگەلێکی سەد دەرسەد واقیعین، بەڵام واقعی بونیان واقعی بونێکی ڕۆمان نییە، بەڵکو واقعی بونێکی فیعلیە. واتە ڕوداو و کارەکتەرەکان بونێکی واقعییان هەیە و بەمەزەندەی خۆمان و دوور لە سیاقی ڕۆمان، دەتوانین لێیان دڵنیابین و بیانناسینەوە. بۆ نمونە لە ڕۆمانی (tu – تۆ)دا نوسەر ژیاننامەی خۆی دەگێڕێتەوە، هەر وەک بۆ خۆشی دەڵێت: (لە ڕۆمانی سێبەری خۆشەویستیدا، چیرۆکی مەمدوح سەلیم بەگ باس دەکات و لە عەبدال زەنکیشدا، سەربوردەی ئەو گۆرانیبێژە میللیەی کورد دەگێڕێتەوە. هەروەها بیری چارەنووس، باس لە ژیان و کارەکانی جەلادەت میدحەت بەدرخان دەکات).

کەچی بە خەڵک و خوای دەوت: (ئەو هونەرێکی مۆدێرنی ڕۆماننوسینی لە ئەدەبی کوردیدا هێناوەتە ئاراو، زمانێکی ڕۆماننوسینی دانسقەشی فۆرمەلە کردووە کە بەر لەو کەس پەی پێنەبردووە) با ئەمە لای خۆمان هەڵگرین و لە بیرمان بێت کاتێک دەمانەوێت ڕۆمانەکانی بخوێنینەوە، ئەویش لەبەر ڕۆشنایی ڕۆماندا، وەک هونەرێکی ڕەگ داکوتراو لە زمان و لە خەیاڵدا.

«محەمەد ئۆزۆن» بە جۆرێک باس لە کایەی ڕۆشنبیریی کوردی دەکات کە زۆر لە هەوڵی سەرکردەیەکی سیاسیەوە نزیکە و دوورە لە هەوڵی کەسێک، خولیای ئەفراندن و داهێنانی هەبێت. ئەمەش وای لێدەکات بە شێوەیەک ڕەفتار لەگەڵ ئەدەبی کوردیدا بکات، وەک چۆن سەرکردەیەکی کورد مامەڵە لەگەڵ فەزای سیاسی کوردیدا دەکات.

ئەوەتا خۆی وەک سەرکردەیەکی جەماوەری نیشان دەدات و قسە بۆ خەڵکانێک دەکات کە ڕوی دەمیان لە بۆچون و مۆجیاری و ڕێنومایەکانیەتی: (ئومێدەوارم بتوانم لە داهاتوودا، گوزارشت لە خواست و ویستی ژنان و کرێکاران و جوتیاران و بێنەوایان بکەم. من قەرزارباری ئەوانم، بەڵام پێویستە ئەوانیش بزانن کە منیش لە خزمەتیاندام). هەر کەسێک دیقەت لەم وتانە بدات، دەست بەجێ تێدەگات دواجار ئەمانە هەر قسەن و هیچ ناگەیەنن. مانای چی ئەو گوزارشت لە خواست و ویستی کرێکاران و جوتیاران دەکات؟ ئایا ڕاپۆرتگەلێک دەربارەی بارودۆخی ئەوان دەنوسێت و دەیداتە ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ؟ ئایا هەڵمەتێکی چاکسازی دەست پێدەکات، لە پێناو چاککردنی هەلومەرجی ژیانیاندا؟ بەڵام بەو پێیەی ئەو (ڕۆماننوس) و(شاعیرە)، ئەوا بە زۆری مەبەستی ئەوەیە کە ئەو (ڕۆمان)ێک یان(چامە) یەک لە بارەیانەوە دەنوسێت و ئەوانیش دەبێت تۆزێک دان بە خۆیاندا بگرن، چونکە هێندە نابات لە فۆرم و دوتوێی (ڕۆمان) و (چامە)یەکدا، ئازادییان دەسگیر دەبێت و سەرفراز دەبن.

شتێک کە لە مەسەلەی «محەمەد ئۆزۆن»دا مایەی سەرسوڕمانە، ئەوەیە کە نوسەرێکی گەورە و گرانی وەک «یەشار کەمال»، چۆتە ڕیزی ئەوانەی ستایشی دەرکەوتنی (ڕۆماننوسێکی گەورەی کورد) دەکەن و بە باڵایدا هەڵدەدەن. «یەشار کەمال» بێ ئەوەی هیچ لە نوسینەکانی «ئۆزۆن» بخوێنێتەوەو بە پشت بەستن بەو شتانەی «ئۆزۆن» دەربارەی خۆی دەیانڵێت، دەکەوێتە ستایشکردن و دەسخۆشیکردن لە هەوڵ و بەرهەمەکانی هاوڕێکەی. لە ناو هاوڕێیاندا زۆر شتێکی باوە کە نوسەرێکی گەورە، پەنا بەرێتە بەر ئەوەی ستایشی زۆری ئەو شتانە بکات کە هاوڕێیەکی تازە پێگەیشتووی دەینوسێت. لە کاتێکدا ئەو نوسەرە مەزنە بە سادەیی و لە ڕوی خۆشەویستیەوە ئەو شتانە دەڵێت، کەچی نوسەرە تازە پێگەیشتووەکە ئەوە دەکاتە بەڵگەیەکی زیندوو، لەسەر دەگمەنی و نایابی ئەو شتانەی دەیاننوسێت.

ئەو قسەیەی «یەشار کەمال» دەبێتە چەکێکی حازر بەدەست و «محەمەد ئۆزۆن»، بە ڕوی ڕەخنەگرانیدا هەڵی دەبڕێت. بەهەرحاڵ نوسینی بە پێز و جوان، پێویستی بە گەواهیدانی هیچ کەس نییە. ئەم دەرگا و ئەو دەرگا وەکی دەرۆزەکەرێک ناگەڕێت، تا ڕەواج پەیدا بکات و بخوێنرێتەوە. ڕەنگە «یەشار کەمال» چەند برگەو لاپەڕەیەک، یان کۆی تێکستێکی بە زمانی تورکی خوێندبێتەوە (نازانم ئەگەر تارمایی خۆشەویستی کرابێت بە تورکی)، بەڵام وەک عادەتی خۆی لە وەسفکردنی کارەکانی «ئۆزۆن»دا ڕۆچووە. بۆ نمونە «عەبدال زەنکی» زۆر بە «هۆمیرۆس» دەچوێنێ! «هۆمیرۆس» جیهانی بە (ئەلیادە و ئۆدیسە) ڕازاندەوە، ئیتر «هۆمیرۆس» لە کوێ و «عەبدال زەنکی» لە کوێ، کە زۆربەی زۆری خەڵکی کوردستان خۆشیان نایناسن؟

نابێت ئەوەمان لە یاد بچێت کە «یەشار کەمال» چ توانایەکی ئەفسوناوی و میتۆلۆژی بە قارەمانی ڕۆمانەکانی دەبەخشێت (حەمەدۆک، سلێمانی بێ پشت و پەنا و گیانامرێت و.. هتد). وا

دیاره قەڵەمەکەی لە وەسفکردنی «ئۆزۆن»دا زۆر زیاتر لەوە ڕۆشتووە، تا ئەو ڕادەیەی بە هەریەک لە «پوشکین» و «گۆگۆڵ» بەراوردیان دەکات. ئەو «گۆگۆڵ» و پوشکین»ەی زمانێکی نوێ و ستایلێکی مۆدێرنیان لە شیعر و ڕۆماندا داهێنا. «یەشار کەمال» تەئکید لەوەش دەکاتەوە کە (تەنها گەورە نوسەران دەتوانن زمانێکی وا بێگەرد بخوڵقێنن). بۆچونێکی لەمجۆرە بۆ زمانێک کە «یەشار کەمال» خۆی پێی ناخوێنێتەوە، فەرامۆشکردنێکی ترسناکی واقیعە و ڕادەربڕینێکی بێ سەروبەرە لەسەر شتەکان.

«یەشار کەمال» لە کاتێکدا زمانی کوردی بەرز دەنرخێنێ و پیاهەڵدەدات (زمانی وڵاتی میسیۆپۆتامیا) وەکی خۆی دەڵێت، هاوکات سەرکۆنەی ئەو حاڵەتە دەکات کە نوسەرانی کورد حاشا لە ئەسڵی خۆیان دەکەن و بە تورکی دەنوسن، ئەوا لەناو ئەم جۆش و خرۆشە ویژدانیەدا، خۆی لە بیر دەچێت.

ئەگەر «ئۆزۆن» وەکی «یەشار کەمال» باسی دەکات، توانیبێتی بەو زمانە دەوڵەمەندە ئەو تابلۆ قەشەنگانە بنەخشێنێت، ئەوا مرۆڤ لەو هۆکارە دەپرسێت کە ڕێگە بە خودی «یەشار کەمال» خۆی نادات، تا بەو زمانە بنوسێت کە بە منداڵی فێری بووە. ڕەنگە «یەشار کەمال» لەو کاتەدا زۆر بە جۆش بوو بێت تا دەسگیرۆیی «ئۆزۆن» بکات کە گەنجێتی خۆی بیر هێناوەتەوە.

ئەگەر «یەشار کەمال» بە چارەکی ئەوەی «محەمەد ئۆزۆن» هەڵەی لە زمانی کوردیدا کردووە، ئەو لە زمانی تورکیدا بیکردایە، ئەوا خەڵکی تورکیا دەستبەرداری کتێبەکانی دەبوون و وازیان لە خوێندنەوەی دەهێنا.

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی (الحیاة)، ٢٠٠٧/١١/٧.

# بێشەی ئاژەڵان

ئیتالۆ کالڤینۆ
لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

ئیتالۆ کالڤینۆ (١٩٢٣-١٩٨٥) چیرۆکنووس و ڕۆژنامەوان و ڕۆماننووسی ئیتالیا لە کوبا لەدایک بووە، منداڵی و هەرزەکاری لە سان ریمو بووە، لە زانکۆی تۆرین خوێندویەتی و هەر لەوێ دەستی بە بڵاوکردنەوە کردووە. ئەدەبیاتی دوای شەڕی ئیتالیا سیاسەتبار بووەو تۆرین لەم لایەنەوە بە دیارترین جێگا ناوبراوە. کالڤینۆ پەیوەندیی لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی ئیتالیا بەست و بوو بە پەیامنێری ڕۆژنامەکەیان. سەرەتا نووسینی بە ستایلی نیوڕیالیزمی ئیتالیا دەستپێکرد. چیرۆکەکانی سارد و دوور لە دەمارگیریی باکگراوندیی شەڕبوو. یەکەم ڕۆمانی (ڕێگایەک بەرەو لانەی جاڵجاڵۆکەکان ١٩٤٧) باس لە بەرەنگاری کردنی فاشیزمە بە شێوازێکی زۆر ناتورالیستی. بەڵام کالڤینۆ زۆر خێرا ستایڵەکەی گۆڕی، بە بڵاوکردنەوەی (ڤیکونتی لەت بوو ١٩٥٢) و نووسینی کۆمەڵێک ڕۆمانی تەنزئامێز و خەیاڵی دەست پێکرد کە ئەوی کرد بە گەورەترین نووسەری ئیتاڵی سەردەمەکەمان. ئەم ڕۆمانە بووە مایەی دەست خۆشی لێکردنی ڕەخنەگران، ئەگەرچی چاپ کردنەکەی، لەبەرئەوەی بە ستایلی ڕیالیزم نەنووسرابوو، بوو بە هۆی ڕەخنەلێگرتنی پارتی کۆمۆنیست. سەرئەنجام ساڵی ١٩٦٥، لە سەردەمی هێرشی شۆرەویی بۆ سەر هەنگاریا، کالڤینۆ وازی لە ئەندامیەتی پارتی کۆمۆنیستی ئیتالیا هێنا. ڕۆمانی (بارۆنی سەر درەخت ١٩٥٧) و (خانەدانی نادیار ١٩٦٥) بەردەوام

بوون بوو لەسەر دنیای ئەفسانەیی کە کالڤینۆ بە دنیای «بەرەباب»ی ناودێر دەکرد، ئەو لە بەرهەمێکی وەک «بەرەبابمان ١٩٦٠» شێوازێکی کورت و خەستی لە چیرۆک گێڕانەوەدا لەبەرگرت کە لە نێوان نواندن و خەیاڵی رووتدا بوو. لە رۆمانی (ئەگەر شەوێک لە شەوانی زستان سەفەر کەرێک... ١٩٧٩) سنوری ئەزموونەکانی لە بواری چیرۆکنووسیدا تەواو تاقی کردەوە.

*****

لە سەردەمی گەمارۆدانی فاشیستەکاندا، بێشەڵان هیچی لە سەیرانگا کەمتر نەبوو، لە دەرەوەی شەقامەکان، لە نێو درەخت و دەوەنەکاندا، هەمیشە هاتوچۆکردنی ئەو خێزانانە دەبینرا کە گاو گوێرەکەیان دەدایە بەر، یان ئەو پیرێژنانەی پەتی ملی بزنێکیان ڕادەکێشاو، ئەو کیژۆڵانەی قازێکیان خستبووە ژێر هەنگڵیان، تەنانەت هەندێک کەروێشکەکانیشیان هێنابوو.

بۆ هەر کوێیەک دەچوویت، چەندە بێشەڵانەکە چڕتر بوایە زیاتر ڕوو بەڕووی گای ورگ زل و مانگای زەنگ لە مل دەبوویتەوە کە لە نشێویە بەردەڵانەکانەوە زۆر بە سەختی دەجووڵان. حاڵی بزنەکان باشتر بوو، لێ لەوانەیە ئێسترەکان لە هەموو ئەوانە خۆشحاڵتر بووبێتن کە ئەمە یەکەمجاریان بێت بتوانن بێ بار بجووڵێن و لە گەڵای درەختەکانی سەرەڕێ بلەوەڕێن. بەرازەکان لمۆزیان لە زەوی دەچەقاند و سەرتاپای لمۆزیان بە توێکڵی بەڕوو دەڕوشاند، مریشکەکان لەسەر لق و چڵی درەختەکان هەڵدەکورمان و سمۆرەیان دەترساند، کەروێشکەکان، کە دوای ساڵانێکی دیلیەتی لەبیریان چوبووەوە لانە بۆ خۆیان هەڵکەنن، پەنایان بۆ کلۆرە دارەکان دەبرد و لەوێدا هەندێک جار سمۆرەکان گازیان لێ دەگرتن.

ئەو بەیانیە، گوندیەک بە ناوی گیو دی فیکی، لە سووچێکی دووری بێشەڵانەکەدا خەریکی دارکۆکردنەوە بوو. هیچ ئاگای لەوە نەبوو لە ناو گوندەکەیدا چی روودەدات، لە ئێوارەی رۆژی پێشترەوە بۆ قارچک کۆکردنەوە لە گوندەکە هاتبووە دەرێ و شەو لەناو بێشەڵانەکەدا، لە کوخێکدا کە لە پاییزدا بۆ بەڕوو وشک کردنەوە بەکاردەهات، نووستبوو. لەو کاتەدا کە بە تەور کەوتبووە گیانی دارێکی وشکبوو، لە زرنگەزرینگی نادیاری زەنگۆڵەکان کە لە دوور و نزیکی بێشەڵانەکەوە دەهاتن سەری سووڕما، وازی لە داربڕین هێناو گوێی لە دەنگەکان گرت کە بەرەبەرە نزیک دەبوونەوە، هاوارێکی کرد. (ئۆهۆو..)

گیوا دی فیکی پیاوێکی وردیلەو کورتە باڵایەکی قەڵەو بوو. دەم و چاوی خڕ و پێستی ئەسمەری بە شەراب داگیرساوبوو، کڵاوێکی قووچی لەسەر دەکرد کە بە پەڕێکی قرقاوڵ ڕازاندبوویەوە، کراسێکی خاڵ گەورەی زەرد و بەسەریا هێلەکێکی دەستچنی لەبەردەکرد. پشتێنێکی سووری بە دەوری ورگە زلەکەیدا دەبەست بۆ ئەوەی پانتۆڵە مۆرە گوڵگوڵیەکەی لەپێی دانەکەنرێت.

وەڵامی هاوارەکە درایەوە (ئۆ هۆ..) و هاوڕێیەکی نزیکی لەنێو ئەو تاوێرە بەردانەوە کە بە گوڵە قەیفە داپۆشرابوون هاتە دەرێ. گوندیەکی سمێڵ بابڕ، کڵاوحەسیری لەسەرداو بزنێکی گەورەی ریش سپی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشا.

هاوڕێکەی وتی: «گیوا، لێرە چی دەکەیت؟ ئەڵمانیەکان چوونەتە ناو گوندەکەوەو خەریکن گەوڕەکان سەروبن بکەن».

گیوا دی فیکی هاواری کرد: «هەی دادو بێ داد! گاکەم —کوکی نیال — دەدۆزنەوەو لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن!»

هاوڕێکەی ئامۆژگاریی کرد: «پەلەکە، بەڵکو بتوانیت بیشاریتەوە، ئێمە کاتێک سەربازە ئەڵمانیەکانمان بینی کە دەیانویست لە دەربەندەکە تێپەڕن و ئێمە خێرا ڕامان کرد، لەوانەیە هێشتا نەگەیشتبنە ماڵی ئێوە»

گیوا تەورو سەبەتە قارچکی واز لێ هێناو بە پەشۆکاوی و خێرا بەڕێکەوت. کە بەناو بێشەڵانەکەدا دەڕۆشت، تووشی ریزێکی دوور و درێژی سۆنە بوو کە بە قیڕە قیڕ بەنێو قاچیدا دەهاتن و دەچوون، هەروەها ئەو ڕانە مەڕانەی کە بە چڕی تەکیاندابووە یەکەوە، دەڕۆیشتن و ڕێگایان لەم دەگرت. ئەو منداڵ و پیرێژنانەی دەبینی کە هاواریان دەکرد: «سەربازەکان گەیشتنە پەیکەری مریەمی پیرۆز! ماڵەکانی ئەوبەر پردەکە دەپشکنن! بینیمانن هێشتا نەگەیشتبوونە ناو گوندەکە، خەریکبوو لە دوا پێچەکە ڕەت دەبوون».

گیوا دی فیکی تا دەهات هەنگاوە کورتەکانی زیاتر هەڵدەگرت، لە لێژیەکاندا وەک تۆپ خل دەبووەوە، لە سەرەوژوورکەکانیشدا هەناسەبڕکێی پێ دەکەوت و دەتوت خەریکە دڵی لە دەمیەوە بێتە دەرێ.

گیوا ئەمەندە ڕایکرد تا گەیشتە سەر تۆپی گردۆڵکەیەک، لەوێوە گوندەکە دیاربوو، دەشتێکی بەرین و هەوایەکی خۆشی بەیانی. تەمتومانی دەوری تەپۆڵکەکە و لە نێویشیاندا گوندەکە دیار بوو، خانووی نزم و بەرز کە هەمووی لە بەرد و تاوێر دروستکرابوون و بەسەر یەکدا دەیانڕوانی. لەنێو ئەو تەمەدا، بە زمانی ئەڵمانی دەنگەدەنگ دەبیسترا، هەروەها گوێت لە دەنگی ئەو مشتەکۆڵانە دەبوو کە دەرگاکانیان پێ دەکوتا.

«هەی داد و بێداد! ئەڵمانەکان گەیشتنە ناو ماڵەکان!»

دەست و پێی گیوا دی فیکی کەوتبوە لەرزین، ئەم لەرزینەی دەستی زیاتر هی مەی خواردنەوە بوو، ئێستایش کە بیر لەوە دەکاتەوە هەرچی هەیەتی و نیەتی بریتییە لە گاکەی–کۆکی نیال– و خەریکە ئەویشی لەدەست دەچێت، ئێدی لەرزینەکەی زیاتر دەبوو. گیوا دی فیکی زۆر لەسەرخۆ ناوەڕاستی کێڵگەکانی قەدبڕ دەکرد، لەژێر چەڵەمەی ترێکاندا خۆی دەشاردەوە و هێدی هێدی لە گوندەکە نزیک دەکەوتەوە. ماڵە چکۆڵانەکەی دواخانووی گوند بوو. لە داوێنی تەپۆڵکەکە و لەنێو گەڵای سەوز و چڕی بۆتەی کولەکەکاندا، لەو شوێنەدا کە وردە وردە گوندەکە لەگەڵ زەوی سەوزەواتەکەدا دەبوون بەیەک. پێ دەچوو هێشتا ئەڵمانەکان نەگەیشتبێتنە ئەوێ.

گیوا لە کاتێکدا بە باشی سووسەی هەموو لایەکی دەکرد، گەیشتە ناو دێ. شەقامێکی چۆڵی بینی بۆنی یۆنجەی وشک و گەوڕی لێ دەهات کە ئەم پێیان ئاشنا بوو، لە ناوەڕاستی گوندەوە دەنگی تازە دەهات — دەنگی نائینسانی و دەنگی پیاکێشانی پاژنەی ئاسنین — ماڵەکەی خۆی بینی هێشتا دەرگاکەی نەکرابووەوە، دەرگای گەوڕەکەی تەنیشتیشی هەر بەسترابوو، هەروەها دەرگای ژوورەکانی سەر پلیکانە نابوودەکەی دەرەوە و ئەو ڕیزە ڕێحانانەی لەنێو ئامانی پڕ

لە خۆڵدا چانرابوون. دەنگێک لە ئاخوڕەکەوە بەرز بووەوە: «موو..» کوکی نیال هەستی بە نزیکبوونەوەی خاوەنەکەی کردبوو. گیوا لە خۆشیاندا سوور بووەوە. بەڵام لەژێر تاقێکەوە دەنگی پێ دەبیسترا. گیوا ورگە زلەکەی ڕاناو لە پەنایەکدا خۆی شاردەوە. کابرا ئەڵمانیەک بوو تەواو لە گوندیی دەچوو. مەچەکی دەست و گەردنی لە چاکەتە کورتەکەیەوە دەرپەڕیبوون. پێی زۆر زل و تفەنگەکەیشی لە قەد و قەوارەی خۆیدا بوو. لە هاوڕێکانی جیابووەوە بۆ ئەوەی شتێک بۆ خۆی پەیدا بکات، بێجگە لەمە، دیمەنی گوند و بۆنەکانی، ئەو شتانەی وەبیر دەهێناوە کە پێشتر پێیان ئاشنابوو. ئەڵمانیەکە هەناسەی قووڵی دەدا و بە ڕووی زەرد و بەرازیەکەی و لە ژێر کڵاوێکەوە کە تەپاندبوویە سەری لە دەوروبەری دەڕوانی. هەر لەو کاتەدا کوکی نیال بۆڕاندی، نەیدەزانی بۆ تا ئەو کاتە خاوەنەکەی نەگەیشتۆتە لای. لەشی سەربازە ئەڵمانیەکە لە بەرگە تەنگەکەیدا هاتە لەرزین و ڕاست بەرەو لای گەوڕەکە چوو. گیوا دی فیکی هەناسەی لە خۆی بڕی. ئەڵمانیەکە دڕندانە لەقەی بە دەرگاکەدا دەکێشا و دیاربوو زوو دەیشکاند. گیوا دی هێواش هێواش بە دەوری بەشی پشتەوەی خانوەکەدا گەڕا. چوە کادێنەکەو ئالیکەکەی ئەمدیو ئەودیو کرد. لەوێدا تفەنگە ڕاویە دوو لوولە کۆنەکەی و ریزێک فیشەکی شاردبووەوە. گیوا چەند فیشەکێکی خستە ناو تفەنگەکە. مەخزەنەکانیشی بە دەوری ورگیدا بەست، پاشان بێدەنگ ڕۆیشت، تفەنگەکەی هێنایە سەر پێ و لە پشت دەرگای گەوڕەکەوە خۆی حەشاردا.

ئەڵمانیەکە هاتە دەرێ و کوکی نیالی بە ڕەشمەیەک خستبوە دوای خۆی. کوکی نیال گایەکی سورو جوان و خاڵی ڕەشی تیابوو، گایەکی گەنج، میهرەبان و ئارام بوو، نەیدەویست ئەم زەلامە غەریبە لەگەڵ خۆیدا بیبات. گاکە نەدەجووڵاو ئەڵمانیەکە ناچار بوو جڵەوەکەی ڕابکێشێت. گیوا دی فیکی لەپشت دیوارێکەوە تەماشای دەکرد، دەبێت ئەوەیش بڵێین کە گیوا خراپترین تفەنگچی گوندەکە بوو. هەرگیز، تەنانەت بە هەڵەیش، نەیتوانیبوو سمۆرەیەک بپێکێت. کەروێشک ئەوە هەر هیچ. کە بەسەر چڵی درەختەکانەوە تەقەی لە ڕیشۆڵە دەکرد، ئەو باڵندانە لە جێگای خۆیان نەدەجووڵان. کەس لەگەڵیا نەدەچوە ڕاو، چونکە بەردەوام گریمانەی ئەوە هەبوو قوونیان بپێکێت. ئەو نەیدەتوانی نیشانە بگرێتەوە چونکە بەردەوام دەستی دەلەرزی. ئەمجارەیان نیشانەی گرتەوە، بەڵام دەستی دەلەرزی و لوولەی تفەنگەکەی لە هەوادا ئەملا و ئەولای کرد. ئەو هەوڵی دا دڵی ئەڵمانیەکە بپێکێت. بەڵام بێجگە لە کەفەڵی گاکە هیچی بۆ نەدەهاتە بەر قەرەوڵ. گیوا بە خۆی وت: «پەنا بە خوا: نەکا تەقە لە ئەڵمانی بکەم و کوکی نیال بکوژم؟» لە ئەنجامدا نەیوێرا تەقە بکات.

ئەڵمانی و گاکە زۆر لەسەرخۆ دەڕۆیشتن. گاکە هەستی بەوە دەکرد کە خاوەنەکەی لەو ناوەیە، بۆیە هەنگاوی نەدەنا. سەربازە ئەڵمانیەکە لەپڕێکدا زانی هاوڕێکانی گوندەکەیان چۆڵ کردووەو وردە وردە لەسەر جادەکەوە ون دەبن. گا سەرکێشەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا و هەوڵی ئەوەی بوو بە دەستەکەی بگات. گیوا لە دوورەوە بەدوایەوە بوو. خۆی لە پەناو پەسێو دەدا و جارناجارێک بە تفەنگە ڕاویەکەی نیشانەی دەگرت. وەلێ توانای نەبوو تفەنگەکە ڕێک بوەستێنێت. ئەڵمانی و گاکەیش هەمیشە ئەوەندە لە یەکدیەوە نزیک بوون کە نەیدەوێرا تەقە بکات. مانای وایە ئەو دەبێت بهێڵێت سەربازە ئەڵمانیەکە گاکەی بەرێت؟

سەربازە ئەڵمانیەکە بۆ گەیشتن بە دەستەکەی کە ئیتر ماوەیەک دوور کەوتبوونەوە، لە ناوەڕاستی بێشەڵانەکەوە قەدبڕی کرد. ئێستا گیوا ئاسانتر دەیتوانی خۆی لەناو درەختەکاندا بشارێتەوەو سووسەی بکات، بەڵکو ئەڵمانیەکە کەمەکێک لە گاکە دووربکەوێتەوەو گیوا بتوانێت بیپێکێت.

هەر ئەوەندەی کەوتنە ناو بێشەڵانەکەوە، ئیتر پێدەچوو ناچارکردنی کوکی نیال لەسەر ڕۆیشتن نەمابێت، لە کاتێکدا کە ئەڵمانیەکە بە تەواوی ئامادەگیی ئەوەی تیا بوو لەو جادانەدا کە سەری لێ دەرنەدەکردن گوم بێت، کەچی گاکە پێشی دەکەوت و لە هەر جێگایەکدا دەبوە دووڕێیان ئەو بڕیاری دەدا. زۆری نەبرد ئەڵمانیەکە لەوە گەیشت کە ئەمە قەدبڕکردنی جادەی سەرەکیی نیە، بەڵکو لە بێشەڵانێکی چڕدایە. لەڕاستیدا، ئەو و گاکە هەردووکیان ون بوو بوون.

گیوا دی فیکی کە ئەوەندە لووتی بەر چڵی درەخت کەوتبوو روشابوو، ئەوەندەیش کەوتبووە ناو ئاوەوە قاچی خووسابوو. لەنێو ئەو باڵندانەوە کە بەسەر چڵەکانەوە دەفڕین و، ئەو بۆقانەی لە گەناوەکاندا دەیانقیڕاند، ئەویش بەردەوام بەدوای ئەڵمانی و گاکەیەوە بوو. نیشانە گرتنەوە لەنێو درەختا، ئەو هەموو ڕێگری و ئەو کەفەڵە شەرابی و ڕەشەوە کە هەمیشە لەبەرچاویدا بوو، تا دەهات سەختتر دەبوو.

ئەڵمانیەکە هەراسان تەماشای بێشەڵانە چڕەکەی دەکرد و، لەوە نیگەران بوو کە دەبێت بە چ شێوەیەک لەوێ دەربازبێت. لە پڕێکدا لەناو دار و دەوەنێکەوە گوێی لە دەنگی خشەخشێک بوو، بەرازێکی سووری جوان لە ناوەڕاستی دەوەنەکەوە دەرپەڕی. ئەو لە وڵاتی خۆیدا، هیچ کاتێک بەرازی بەم سەرلێشێواویە لە بێشەڵاندا نەدیبوو، ڕەشمەی گاکەی بەرداو کەوتە دوای بەرازەکە. کوکی نیال هەر ئەوەندەی هەستی بە ئازادی کرد، غاریدایە نێو بێشەڵانەکەو هەستی بە دۆستایەتی دەوروبەری کرد.

ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو کە گیوا تەقەکەی بکات. ئەڵمانیەکە سەراسیمە کەوتبوە دوای بەرازەکە، دەیگرت و توند باوەشی پێدا دەکرد تا هێوری بکاتەوە، لێ بەرازەکە لە دەستی دەخزا و بۆی دەردەچوو.

کەمی مابوو گیوا تفەنگەکە بێنێتە سەرپێ کە سەر و کەلەی دوو منداڵ دەرکەوتن. کوریژگەیەک و کچۆڵەیەک کە کڵاوی خوری گوڵینکە داریان لەسەرداو، گۆرەوی درێژیان لەپێدابوو. دوو منداڵەکە بەکوڵ دەگریان، وتیان: «تووبی و خودا، گیوا، چاک نیشانی لێ بگرە، ئەگەر بەرازەکە بکوژیت، ئێمە هیچمان بۆ نامێنێتەوە!» گیوا دی فیکی دیسانەوە هەستی کرد کە تفەنگەی دەستی کەوتۆتە سەما. ئەو دڵێکی زۆر پڕ لە سۆزی هەبوو کە زوو بەزەیی تێ دەگەڕا، بەڵگەکەی ئەوە نەبوو کە ناچارە ئەڵمانیەکە بکوژێت، بەڵکو لەوە دەترسا گیانی بەرازەکەی ئەو دوو منداڵە هەژارە بخاتە مەترسیەوە.

ئەڵمانیەکە لەنێو تاوێرە بەرد و دەوەنەکاندا هەڵبەزو دابەزی بوو. بەرازەکەیشی توند گرتبوو کە ئەملاو ئەولای دەکرد و مرەی لێوە دەهات. لەپڕێکدا لە وەڵامی مرە مری بەرازەکە، دەنگی باعە باعێک بەرزبوەوەو بەرخێکی چکۆڵە لە ئەشکەوتێکەوە دەرپەڕی. ئەڵمانیەکە بەرازەکەی

بەرداو کەوتە دوای بەرخەکە. بەخۆی وت: «چ بێشەڵانێکی سەیرە لەناو دەوەنەکانیەوە بەراز دێتە دەرێ و لە ئەشکەوتەکانیەوە بەرخ!» بەرخەکە کە پڕ بەدەم دەیباعاند، ئەو قاچێکی گرت و وەک شوانی خوا دای بە شانیا و بەڕێکەوت. گیوا دی فیکی بە هێوریی دوای کەوتبوو، بە خۆی دەوت: «ئەمجارەیان لە دەستم قوتاری نابێت، ئیدی کاری لە کار ترازاوە» لەوەدابوو فیشەکێکی پێوەبنێت کە دەستێک لوولەی تفەنگەکەی وەرگێڕا. شوانێکی پیری ڕیش سپی بوو کە دەستی پاڕانەوەی بۆ درێژ کردبوو دەیوت: «گیوا، بەرخە چکۆلەکەم مەکوژە، ئەڵمانیەکە بکوژە، بەڵام بەرخە چکۆڵەکەی من مەکوژە، باش مشتی لێ بگرە، تەنیا ئەمجارەیان نیشانەکەت باش بپێکە!» بەڵام گیوا وا سەری لێ شێوا بوو تەنانەت پەلەپیتکەی تفەنگەکەی نەدەدۆزیەوە.

ئەڵمانیەکە بە درێژایی ڕۆیشتنی ناو بێشەڵانەکە تووشی شتی وا سەیر دەهات کە دەمی ببوو بە تەڵەی تەقیو: ئەو مریشکە ماڵیانەی بەسەر چڵەکانەوە نیشتبوونەوە، بێوڵە بەرازەکان کە لەنێو کلۆرە دارەکانەوە دەهاتنە دەرێ. بە کورتی کەشتیەکەی نووح بوو بۆ خۆی. قەلەموونێکی بینی بەسەر درەختێکی کاجەوە کلکی وەک چەتر هەڵدابوو. ئەڵمانیەکە یەکسەر دەستی درێژکرد بۆئەوەی بیگرێت. بەڵام قەلەموونەکە بازێکی داو هەر بەو جۆرەی کە چەتری کلکی کردبوەوە بەسەر چڵێکی بەرزترەوە نیشتەوە. ئەڵمانیەکە بەرخەکەی واز لێهێناو بە دار کاجەکەدا سەرکەوت. بەڵام دەگەیشتە لای هەر چڵێک قەلەموونەکە بە غەبغەبە سوور و داکەوتوەکەیەوە، زۆر ئارام و لەسەرخۆ دەچوە سەر چڵێکی بەرزتر و دەکەوتە پەڕ و باڵ دۆزین.

گیوا ڕۆیشت و لەژێر درەختێکدا وەستا، چڵێکی پڕ گەڵای خستە سەرسەری خۆی و دوانی تری خستە سەر هەردوو شانی و چڵێکیشی بە لوولەی تفەنگەکەیەوە بەست. بەڵام ژنێکی جوان و خرپن کە سەرپۆشێکی سووری بەسەر خۆیدا دابوو هاتە پێشێ و وتی: «گیوا، گوێ بگرە و بزانە چ دەڵێم، ئەگەر ئەڵمانیەکەت کوشت شووت پێدەکەم، ئەگەر قەلەموونەکە بکوژیت خۆم لە ناوت دەبەم!» گیوا کە هێشتا ژنی نەهێنابوو — هەرچەندە ئیدی گەنج نەبوو — بەڵام لە تەریقیدا وەک چەوەنەر سوور بوەوە. ئیتر تفەنگەکەی وەک شمشێر لەناو دەستیا جۆلانەی دەکرد.

ئەڵمانیەکە بەسەر درەختەکەدا سەرکەوت، گەیشتە چڵە بەرز و باریکەکان و لە ناکاودا یەکێک لە چڵەکان لەژێر پێیدا شکاو کەوتە خوارەوە. زۆری نەمابوو بکەوێت بەسەر کیوا دی فیکیدا، بەڵام ئەمجارەیان گیوا تەواو ئاگای لە خۆی بوو زوو بۆی دەرچوو، لێ هەموو ئەو شتانەی بەجێهێشت کە خۆی تیا شاردبوەوە. ئەڵمانیەکە کەوتە سەر چڵەکان و هیچی لێ نەهات.

ئەڵمانیەکە کە کەوتە سەر زەوی، لەسەر جادەکە کەروێشکێکی کێویی دی. لێ نا، کەروێشکی کێوی نەبوو، خڕ و قەڵەو و بە بیستنی دەنگ هەڵنەدەهات، بەڵکوو لە جێگای خۆیدا مت دەبوو، کەروێشکی ماڵی بوو، ئەڵمانیەکە هەردوو گوێی کەروێشکەکەی گرت و کەوتەوەڕێ.

کەروێشکە بەستەزمانەکە هێند تەقەلای داو ئەملاو ئەولای کرد ئەڵمانیەکە ناچار بوو دەستی بەرز بگرێت و بەملاو ئەولادا بسووڕێت بۆ ئەوەی نەهێڵێت بڕوات. بێشەڵانەکە پڕ بوو لە بۆرە بۆڕی گا، باعە باعی مەڕ و چەقەڵ و لوورەی ئاژەڵانی دی. هەر هەنگاوێک و شتێکی تازە دەردەکەوت: تووتیەک بەسەر چڵی دار ڕاشێکەوە و، سێ ماسیە سوورە لە کانییەکدا مەلەیان

دەکرد.

گیوا لەسەر بەرزترین چڵی پیرەدار بەڕوپەکەوە تەماشای سەمای ئەڵمانی و کەروێشکەکەی دەکرد، بەڵام پێکانی ئەڵمانیەکە کارێکی سەخت و گرانبوو. لەبەر ئەوەی کەروێشکەکە بەردەوام دەسووڕاو بەر نیشان نەدەکەوت. گیوا هەستی کرد یەکێک لایەکی هێلەکەکەی ڕادەکێشێت، کیژۆڵەیەک بوو پرچی هۆنرابووەوو دەم و چاوی پەڵە پەڵە بوو: «گیوا، تووخوا کەروێشکەکە مەکوژە، قەیدی نیە ئەڵمانیەکە بکوژیت.»

لەو نێوانەدا، ئەڵمانیەکە گەیشتبوە حەسارێک کە بە بەردی خۆڵەمێشی و گوڵە قەیفەی شین و سەوز داپۆشرابوو، تەنیا تاک و تەرای چەند چنارێکی لێ ڕوا بوو. هەڵدێرێکیشی لێ نزیکبوو. مریشکێک چنگی لە گەڵای وەریو و تیژی دار کاجێک دەگرت. هەر ئەوەندەی ئەڵمانیەکە کەوتە دوای مریشکەکە، کەروێشکەکە ڕای کرد. لاوازترین و پیرترین مریشک بوو کە گیوا تا ئەو کاتە بینیبێتی و مریشکی -گیرومینا- ی هەژارترین پیرێژنی گوندەکە بوو. ئەوا ئێستا مریشکەکە بە دەست ئەڵمانییەکەوەیە.

گیوا لەسەر بەردەکان ڕاکشا بوو تفەنگە ڕاویەکەی لە پاڵ پایە بەردێکدا دانابوو، لە مەتەرێزێکەوە لوولەی تفەنگەکەی ڕەت کردبوو. ئێستا بێ ترس دەیتوانی مشتی لێ بگرێت، ئەگەر ئەو مریشکە نابوودەیشی بکوشتایە هیچ مەبەستی نەبوو. بەڵام گیرومینای پیرێژن، کە خۆی لە چارۆکەیەکی کۆنەوە پێچابوو، هاتە پێشێ و بە زمانێکی قەناعەت پێکردنەوە دەستی بە قسان کرد: «گیوا، ئەمە زۆر خراپە ئەڵمانیەک مریشکی من ببات، لەم دنیایەدا هەمە و نیمە ئەو مریشکەیە، بەڵام لەوە خراپتر ئەوەیە تۆ مریشکەکەم بکوژیت».

گیوا لەبەرئەوەی لێپرسراویەتیەکی گرانی کەوتبوە ئەستۆ لە جاران زیاتر کەوتە لەرزین. بەڵام خۆی کۆکردەوەو پەنجەی بەپەلە پیتکەی تفەنگەکەدا نا.

ئەڵمانیەکە گوێی لە تەقەکە بوو، کلکی مریشکەکە کە بەدەستیەوە دەسووڕاو هەوڵی خۆ ڕزگارکردنی بوو بە بەرچاویەوە دیارنەما. بە فیشەکی دووەم باڵێکی مریشکەکە پەڕی، یانی ئەمە مریشکێکی ئەفسوناوی بوو کە جار جارە لە ناو دەستیدا دەتەقیەوەو پارچە پارچە دەبوو؟. تەقینەوەیەکی تر ڕوویدا و بە تەواویی پەڕ بە مریشکەکەوە نەماو ئامادەبوو بیبرژێنیت، کەچی بەو حاڵەیشەوە، هێشتا باڵەکەی تری ڕادەوەشاند. ئەڵمانیەکە کە لە ترسا وشک ببوو، لە ملەوە مریشکەکەی گرتبوو، دوور لە خۆیەوە ڕای گرتبوو.

چوارەم فیشەک گیوا ملی مریشکەکەی ڕاست لە ژێر دەستی ئەڵمانیەکە دا بڕی، هێشتا سەری مریشکەکە بە دەستی ئەڵمانیەکەوە مابوەوە و دەجووڵا، ئەڵمانیەکە سەرەکەی بەلایەکدا فڕێداو خۆی قووچاندی، لێ ئیدی توانای ئەوەینەبوو ڕێگا بدۆزێتەوە. هەڵدێرێکی بەردەڵان لەو نزیکانە بوو. دارمازوویەک لە پێشی هەڵدێرەکەدا ڕوا بوو. ئەڵمانیەکە لەسەر چڵی دارەکە پشیلەیەکی گوربەی بینی کە خۆی کووڕ کردبوو.

سەربازەکە ئیتر لە بینینی ئاژەڵە سەر لێ شێواوەکانی بێشەکە سەری سووڕ نەدەما. بۆ دڵدانەوە و لاواندن دەستی بۆ لای پشیلەکە درێژ کرد، پاشان پشت ملی گرت، وای زانی ئەم کارەی پێ خۆشە و دەنگی پرخاندنی لێ بەرز دەبێتەوە.

ماوەیەک بوو خەڵکی ناوچەکە بە دەست پشیلەیەکی کێویەوە کە باڵندەکانی دەکوشت و تەنانەت هەندێک جار پەلاماری کێڵگە پەلەوەریەکانی گوندەکەی دەدا بە تەنگ هاتبوون. ئەڵمانیەکە، کە چاوەڕێی ئەوە بوو دەنگی پرخە پرخی پشیلەکە بەرزبێتەوە. لە پڕێکدا بینی پشیلە تووکنەکە پەلاماریدا و هەستی کرد چنگی ئاژەڵەکە بە گۆشتی لەشیا دەڕواتە خوارێ. لەو کێشمە کێشەدا سەربازە ئەڵمانیەکە و ئاژەڵە دڕندەکە پێکەوە لەسەری هەڵدێرەکەوە بەرەو خوارەوە گلۆر بوونەوە.

بەم جۆرە خەڵکەکە لەسەر شەرەفی تەقە کەرێکی بێ توانای وەک گیوا ئاهەنگیان گێڕاو ئەویان بە گەورەترین جەنگاوەر و ڕاوچی گوندەکە دانا. بۆ گیرومیندای هەژاریش، بە کۆمەکی و پارەی خەڵکی گوند کۆمەڵێک جووجەڵەی تازە لە هێلکە دەرهاتوویان کڕی.

**سەرچاوە:**

کۆمەڵە چیرۆکی: معاملەی پرسود و داستانهای دیگر. انتشارات نیلوفر ١٣٨٥.

# چەند گێڕانەوەیەکی متمانەپێکراو دەربارەی کوشتن

مستەفا مەستور
لە فارسییەوە: جەبار سابیر

بەناخێرمان چووبووین وێنە بگرین. دوو هەفتە بەرلەوەی ئێمە بهێننە ئێرە هەواڵەکەم لە رۆژنامەکەتدا خوێندەوە. خۆزگە نەمخوێندبایەتەوە. منو ئەلیاس پێکەوە چووبووین. بە ئەلیاسم وت نەیەت. وتم حاڵی خراپ دەبێت. قبوڵی نەکرد. خۆت ئەلیاس دەناسی. لەو منداڵە کەللەڕەقو یەک قسانەیە. وتم خۆم وێنە دەگرمو خۆیشم لەگەڵ تەرەف قسە دەکەم، پێویست ناکات تۆ بێیت. وتی حەزئەکات بزانی تەرەف شێوەی چۆنە. وتی ئەیەوێ چاو ببڕێتە چاوی. وتی رەنگە دەستیشی لێبدەم. وتی ئەگەر هەیە سەیرترین مرۆڤ بێت کە ئەشێ لە تەواوی ژیاندا بیبینێتو هەرگیز حەزناکات ئەم هەلە لەدەست بدات. ئەمانە کتومت وشەکانی بوون. لەهەمان دەورانی زانکۆوە یەک قسەبوو. بیرتە بەهۆی سۆفییەوە — هەمان کچە چاویلکە لە چاوەکە، کە هەمیشە لە پۆلدا لەسەر کورسیەکانی پێشەوە دادەنیشتو ئەلیاس وای خەیاڵدەکرد کە تەرەف عاشقی بووە- سێ کاتژمێری تەواو لەبەر بەفرەکەدا لەبەردەم بەشی ناوخۆیی کچان بەپێی پەتی وەستا تا نەخۆشی دەردە سی گرت؟

چاکە، هەڵبەتە من لە زۆرێک لەو شتانەی ئەم دنیا هیچو پووچە تێناگەم. یەکێ لەو شتانە ئەم مەسەلەیەیە کە هەواڵەکەیت لە رۆژنامەکەتدا چاپکردووە. یەکێکی تریان رووداوێکە بەسەر ئەلیاسدا هات. ماوەیەکی زۆرە قەناعەتم بە خۆم کردووە، کە ئەقڵم نایبڕێ لەم دنیا هیچو پووچە تێبگەم. کە یارۆم بینی

پێموت: (لە روانگەی منەوە تۆ تەختەیەکت نوقسان نییە. یەعنی هیچ یەکێ لە ئێمە تەختەیەکی نوقسان نییەو ئەگەر قەراربێت کەسێ یا شتێ لەم دنیایەدا تەختەیەکی کەم بێت بە بۆچوونی من خودی ئەم دنیا هیچو پووچەیە. دنیایەکی هیچو پووچ بە یاسا هیچو پووچترەکانییەوە. وەختێ دنیا تەختەیەکی نوقسان بێت، ئەوکاتە هەر رووداوێک ئەگەری قەومانی هەیە.) پێموت: (بە بۆچوونی من تۆ هیچ شتێکت کەم نییە.) ددانەکانی ساغ بوون. سپیو ساغ. دەبێ بینیبێتت. دەستەکانیشی ساغ بوون. پێکانیشی. چاوانیشی. باشە هەڵبەتە باوکو دایکێکی تەواو باشی نەبوو، ئەمما لە هیچ کتێبێکدا نەنووسراوە ئەگەر کەسێ باوکو دایکێکی حسابی باشی نەبێت دەبێ دەست بۆ وەها کارێک بەرێت. نووسیویانە؟ جارێکیان بۆم نووسیبوویت کە هەر گەندەکارییەک لەم دنیایەدا هەیە لەژێر سەری مرۆڤەکاندایەو لە راستیدا هیچ گەندەکارییەک نەبووە مرۆڤەکان ئەنجامیان نەدابێت. دوێنێیش ئەمەم بە کیمرام وت. وتی حەق بە تۆیە. لە ریزی گەرماودا بووین کە ئەمەم پێوت. پاشان ئەم رووداوە بەسەر ئەلیاسدا هاتو منیان هێنایە ئەم شوێنە، تەواو وەزعم تێکچووبوو. بە تایبەت لە رۆژانی سەرەتادا. بەڵام پاشان لەگەڵ کیمرام ئاشنا بووم حاڵم باشتر بوو. کیمرام مرۆڤێکی باشە. لەگەڵ هەمووان هاورێیە. وتی بەڵێن دەدات بەر لە خۆرئاوابوون ئەم نامەیە بگەیەنێتە دەستت.

خەریکبوو دەموت هەر گەندەکارییەک کە لەم دنیایەدا هەیە لەژێر سەری مرۆڤدایە. هێشتایش باوەڕم بەم قسەیە هەیە، ئەمما ئەم بابەتە شتێک دەربارەی هیچو پووچ بوونی ئەم دنیایە ناگۆڕێت. لە راستیدا یەکێ لە دەلیلەکانی هیچو پووچ بوونی ئەم دنیایە ئەمەیە، کە مرۆڤەکان هەر هەڵەیەک- بەڕاستیو بە مانای راستەقینەی وشە (هەر هەڵەیەک) کە ویستبێتیان کردوویانە. گرەو دەکەم ئەگەر هەڵەیەک مابێتو نەیانکردبێت بەهۆی دڵسۆزیو شەرافەتو ئەمجۆرە شتانەوە نەبووە. بێگومان نەیانتوانیوە بیکەن. ئەمە شتێک نییە کە من تازە دۆزیبێتمەوە. هەزاران ساڵە کە هەر کەسێ زەرەیەک هۆشی هەبێت لەمە تێگەیشتووە. لەگەڵ ئەمەشدا بەڕاستی هەواڵی رۆژنامەکەت شتێکی سەیر بوو. مەبەستم ئەوەیە کە من سەرم سووڕما. ئەمە لە خۆیدا بەڕاستی، جۆرێک داهێنانە. مەبەستم کارێکە کە یارۆ کردوێتی. ئەگەر من سەد ساڵیش بیربکەمەوە بە ئەقڵمدا نەدەهات کە دەکرێ بەمجۆرەیش مرۆڤ بکوژیت.

وەختێ گەیشتینە بنکەی پۆلیسەکە یارۆ خەریکبوو نانی ئێوارەی دەخوارد. کەنسرۆو لۆبیا لەگەڵ پەتاتەی کوڵاوو سوورکراوە. ئەلیاس لە سەیری دەستەکانیدا توابۆوە. بەگوێمدا چرپاندی: (ئەمە گرنگترینو هاوکات سەیرترین دەستە کە دەتوانێ بوونی هەبێت.) ئەم نامەیە بۆ ئەوە نانووسم کە ئەم شتانەت بۆ روونبکەمەوە. ئەم شتانە زۆر پەیوەندی بە تۆوە نییە. ئەم نامەیە دەنووسم تا شتێکی گرنگتر بڵێم. تەنانەت ناپرسم: (لەبەرچی کەسێک کتوپڕ بڕیار دەدات کەسێکی تر بکوژێت؟) چونکە ئەم پرسیارە لەو پرسیارە قورسانەیە، کە هیچ کەس وەڵامێکی بۆی نییە. بەهۆی پارە یاخود عەشق، یان برسێتییەوە؟ هەڵبەتە پارەو برسێتیو عەشق دەلیلێکی خراپ نین، ئەمما ملیۆنان مرۆڤ هەن کە لەم وێرانەیەدا خەریکە لە برسا دەمرنو گیرفانیشیان بەتاڵەو یا لە عەشقدا شکستیان خواردووە، بەڵام بۆچی هیچ کامیان بەرێناکەون بۆ مرۆڤ کوشتن؟ کیمرام دەڵێ مرۆڤەکان بەو دەلیلە خەڵک دەکوژن تا شتی زیاتریان هەبێت، ئەمما من گومانم هەیە ئەم قسانە راستبن، چونکە رێگەی ئاسانتریش بۆ ئەم کارە هەیە. بە بۆچوونی من دەلیلی ئەم کارە- وەک زۆر کاری

تر- پەیوەندی بە ئێمەوە نییە. مەبەستم ئەوەیە، کە نابێت لە ناو مرۆڤەکاندا بۆ هۆکەی بگەڕێی. دەبێت گەر بۆ جارێکیش بووە بڕۆیتو بە دوای دەلیلی تردا بگەڕێیت. یەکێ لەو دەلیلانە ئەم دنیا هیچو پووچەیە. یانی بە بۆچوونی من مرۆڤەکان بەم دەلیلە مرۆڤ دەکوژن، چونکە ئەم دنیایە هیچو پووچەو دنیا بەم دەلیلە هیچو پووچە چونکە مرۆڤەکان دەتوانن وەک بنێشت جووین مرۆڤ بکوژن.

لێکۆڵەری بنکەی پۆلیسەکە وتی: (وەک بەرەی جەنگی لێهاتووە. بەیانی جەنازەیەک دەدۆزینەوە، نیوەڕۆ یەکێ، شەو یەکێ.) وەختێ خەریکبوو لێکۆڵینەوەی لە تەرەف دەکرد، ئەلیاس لەسەرخۆ بەگوێمدا چرپاندی: (چۆن دەشێ کەسێک مرۆڤ بکوژێو پاشان دانیشێ لۆبیاو پەتاتەی کوڵاو بخوات؟) ئەم ئەلیاسە گەر لە زانکۆ لەبری سینەما دەچووە رشتەی فەلسەفە، گرەو دەکەم دەبووە فەیلەسوفێکی مەحشەری. ئەگەر باش بیربکەیتەوە کە ئەمە یەکێ لە سەخترین پرسیارەکانی مێژووی مرۆڤایەتییە. ئەگەر هەزار فەیلەسووفیش عەقڵیان بخەنە سەر یەک ناتوانن وەڵامێکی بۆ بدۆزنەوەو بەڕاستی تێبگەن چۆن ئەشێ کەسێک مرۆڤ بکوژێتو دواتر دانیشێ لۆبیاو پەتاتەی کوڵاو بخوات. لەو رۆژەوە تا نهۆ زیاتر لە هەزار جار لە خۆم پرسیوە، بەڕاستی چۆن ئەشێ کەسێک مرۆڤ بکوژێو دواتر دانیشێ لۆبیاو پەتاتەی کوڵاو بخوات؟ تا ئێستا بیرت لەم پرسیارە کردۆتەوە؟ یەکێ لە دەلیلەکانی نووسینی ئەم نامەیە، ئەم پرسیارە بوو. پرسیاری گرنگتریش هەیە. هەڵبەتە ئەگەر (گرنگتر) لەم وێرانەیەدا هێشتا مانای هەبێت.

لێکۆڵەر کوپی چاکەی هەڵگرتو تۆزێکی لێخواردەوەو لەو یارۆیەی، کە شایانی نەفرەتی ئیبلیسیش نییە پرسی: (لەبەرچی ئەم کارەت کرد؟ بۆچی ئەوانەت کوشت؟) جۆرێک پرسیاری دەکرد وەک بڵێی خەریکبوو ناونیشانی ماڵی تەرەف یاخود تەمەنی لێدەپرسی. وەک بڵێی خەریکبوو دەیپرسی: (ئەمرۆ چەند شەممەیە؟) یا (نیوەڕۆ چیت خوارد؟)یا (جگەرە ناکێشی؟) یاشتێ لەم جۆرە. وای هەست دەکرد، وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بە ئاسانی پرسیارکردنییەتی. بەڕاستی دروست وەک پرسیاری پەیامنێری رۆژنامەکەت- وەک گەمژەترین مرۆڤی دنیا- لەپشت تەلەفۆنەکەوە لە منی کرد: (بە بۆچوونی تۆ بۆچی ئەلیاس ئەم کارەی کرد؟)

دەزانی تەرەف چی بە لێکۆڵەرەوەکە وت؟ لەڕاستیدا هیچی نەوتو تەنیا پرسیارەکەی ئەوی بە پرسیارێکی تر وەڵام دایەوە. وتی: (دەتوانم بڕۆم بۆ دەستشۆر؟) پۆلیسێک بردی بۆ دەستشۆرەکە. وەختێ گەڕایەوە دیسان هەمان پرسیاری ترسناکی دووبارە کردەوە: (لەبەرچی منداڵەکانت کوشت؟) ئەلیاس لەسەر زەوییەکە دانیشتبوو کامێراکەی لەسەر دەستەکانی پیاوکوژەکە زووم کردبوو. من کە جیاوازییەکم لە نێوان دەستەکانی ئەو و دەستەکانی لێکۆڵەرو دەستەکانی خۆمدا نەدەبینی. بەڕاستی نەمدەبینی. ئێستایش نایبینم. بە بۆچوونی من دەستی مرۆڤ پێشو پاش هەر کارێک ناگۆڕێت. تەنانەت گەر ئەم کارە کوشتنیش بێت. یارۆ وتی: (لەبەرئەوەی کە ماندوبیووم.) تێدەگەی؟ وتی: (ماندوبیووم.) بەڕاستی وەڵامەکەی بەزم بوو. دەتوانین ئەمە بە دەلیلو ئەنگێزەی مرۆڤەکان بۆ کوشتن زیاد بکەین. ماندوێتی. لێکۆڵەر پرسی: (لەچی؟ لەچی ماندوبیووی؟) ئەمجارە یارۆ لە کامێراکە ڕاما. خولەکێ بێدەنگ بوو پاشان وتی: (لە ژیان. لە ژنەکەم. لە منداڵەکانم. لە خۆم. پارەم نەبوو. نانم نەبوو.) وەختێ وردەکاری کوشتنی منداڵەکەی رووندەکردەوە ئەلیاس وەزعی تێکچوو.

کامێراکەی لەسەر مێزەکەی لێکۆڵەر داناو لەسەر کورسییەکە دانیشت. کابرا وتی بەیانی منداڵەکانی لەخەو هەستاندووەو پێی وتوون دەیەوێ بیانبات بۆ سینەما. وتی جلی تازەی لەبەرکردوونو قژی بۆ داهێناونو پاشان چاکەتی خوری لەبەرکردوون کە جەژنی ساڵی پار هاوسێکانیان دابوویانێو لەماڵ بردبوونییە دەرێ. هەردووکیان کوڕ بوون. هەشت ساڵەو دە ساڵە. وتی لە ڕێگا یەکێ لە منداڵەکان وتی دەبێ بڕۆینە سینەمایەک فیلمی تەڕەزان پیشان بداتو ئەو یەکەی تر وتی دەبێ فیلمی کینگ کنگ ببینێت. وتی منداڵەکان تەواو لەسەر ئەم بابەتە کردبوویانە چەلەحانێ. نازانم ئەم وردەکارییە چ بایەخێکی هەبوو کە ئەو لەعنەتییە پێداگری دەکرد هەموو ئەوانە بگێڕێتەوە. بەهەرحاڵ لەبری سینەما منداڵەکانی بردە ڕۆخی چەمەکە. بە منداڵەکان دەڵێ بەر لە سینەما دەیەوێ یارییان لەگەڵ بکات. بەو حەبلەی لەگەڵ خۆی هێناوێتی قاچی منداڵەکان دەبەستێتەوەو وردە وردە وردەبەرد دەڕژێتە گیرفانی منداڵەکانەوە. جۆرێک وتی: (وردە بەردم ڕشتە گیرفانیانەوە) وەک بڵێی شوکولاتەو کلۆ نەباتی رشتبێتە گیرفانی منداڵەکانەوە. وتی گیرفانی کراسو پانتۆڵو چاکەتی مەخمەڵی منداڵەکانی پڕکردبوو لە وردەبەرد. وتی منداڵەکان لەسەر وردەبەرد خستنە گیرفانەکانیانەوە پێشبڕکێیان کردبوو. وتی کە ئەم کارەی منداڵەکانی بینی بۆ ساتێ گریابوو ئەمما زوو بەسەر خۆیدا زاڵ ببوو. لێرەدا بوو کە ئەلیاس لە ژوورەکە چووە دەرێ. ئەو ساتە وام هەستکرد چووە لەناو ئۆتومبیلەکەیدا پاتری بۆ کامێراکەی بهێنێ. لێکۆڵەرەکە وتی: (وردەبەرد بۆچی؟)و پەرداخە ئاوی سەر مێزەکەی بەسەرەوەنا. پاشان بە پشتی دەستی لێوە تەڕەکانی سڕی. یارۆ وتی: (بۆئەوەی کە لەناو ئاوەکەدا بمێننەوە.) لێکۆڵەرەکە وتی: (وتت چی؟) وتی: (بۆ ئەوەی کە قورس بنو لە ناو ئاوەکەدا بمێننەوە.) لێکۆڵەر لە لاپەڕەی لێکۆڵینەوەکەیدا نووسی: (بۆئەوەی لە ئاوەکەدا بمێننەوە.) بەزەحمەت ئەم رستەیەی نووسی، چونکە قەڵەم جافەکەی مەرەکەبی تێدانەمابوو، ناچار بوو بۆ نووسینی ئەو ڕستەیە چەند جارێک قەڵەم جافەکە لە کاغەزەکە بخشێنێ.

جەستەی ئەلیاسمان لەناو دەستشۆری بنکەی پۆلیسەکەدا دۆزییەوە. دەماری دەستی چەپی خۆی بە چەقۆیەک کە لە چایخانەی بنکەکەدا هەڵیگرتبوو، بڕیبوو. وابزانم تەحەمولی نەکردبوو. بیردەکەمەوە ئەگەر کەسێک یەک زەڕە هیچو پووچ نەبێت دەبێ هەمان کار بکات کە ئەلیاس کردی، نە کارێک کە تۆ خەریکیت دەیکەیت. تۆ تەنیا کارێک کە کردت ئەوەبوو کە هەواڵی کوشتنی منداڵەکانت لە لاپەڕە هەژدەی ڕۆژنامەکەدا چاپکرد. هەرئەمە. یەعنی لاپەڕەیەکی باشتر لە لاپەڕە هەژدە نەبوو؟ یەعنی بەڕاستی تۆ وابیردەکەیتەوە کە هەواڵەکانی لاپەڕە یەکی ڕۆژنامەکەت لە هەواڵەکانی لاپەڕە هەژدە گرنگترن؟ قبوڵمە کە هەموو ڕۆژنامەکانی دنیا ئەم کارە دەکەن، ئەمما ئەمە تەواو هەمان شتێکە کە تا دەمی مەرگیش لە هۆکارەکەی تێناگەیت. بە بۆچوونی من بێ ئەرزشترین هەواڵی لاپەڕە هەژدە لە گرنگترین هەواڵێک کە لە لاپەڕە یەکداو بە فۆنتی حەفتاو دوو دەیکەیتە مانشێت گرنگترە. لامەزهەب یەعنی تەنانەت ریکلامی ساسی قارچکو مەقەڵی کەبابو یا چوزانم سەفەر بۆ ئیتالیاو مارماریس کە لە نیوەی بەشی خوارەوەی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکەت داتنابوو لە هەواڵی مردنی ئەو دوو منداڵە، ئەویش بەو وەزعەوە، گرنگترە؟ لەم دنیا وێران بووەدا ڕۆژی هەزاران دەمرنو هەموو ڕۆژنامەکانی دنیایش تەنیا کاریان ئەوەیە کە هەواڵی دانیشتنو نووستنی ئەم ڕێکپۆشە ترسناکانە لە لاپەڕەی یەکەمدا چاپ بکەن. وەختێ دەڵێم ئەم دنیایە

تەختەیەکی نوقسانە لەبەر ئەم شتانەیە . من کە بۆ هەواڵەکانی لاپەڕەی یەکەم تەواوی ڕۆژانی دنیا کەوەریش ورد ناکەم. تۆ ئەگەر زەڕەیەک لە ئەلیاس دەچووی دەبوو لەبری ئەوە هەواڵەکانی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکەت لەگەڵ لاپەڕە هەژدەدا دەگۆڕی. مرۆڤەکان بەردەوام خەریکن لە هەندەکی لاپەڕە هەژدەی ڕۆژنامەکاندا دەتوێنەوەو تۆیش لکاوی بە هەمەکی لاپەڕەی یەک؟ من تێناگەم تۆ دەتەوێ کەی لەم شتانە تێبگەیت؟ ئەمەیش یەکێکە لە نیشانەکانی هیچو پووچ بوونی ئەم وێران بووە کە هەمەکی لە هەندەکی گرنگتر بووە . من وەختێ وێنەی ئەم مرۆڤە ڕێکپۆشە ددان سپییانەی، کە زۆر جوان قسە دەکەنو ڕۆژی سەد جار شامپۆ لە قژیان هەڵدەسوون لە لاپەڕەی یەکەمدا دەبینم، هەر چوار پەلم دەکەونە لەرزین. بیردەکەمەوە ئەگەر نەفەرێک لەم ڕێکپۆشانە بێ بەڵگەو بە نیو خەتی نووسین ملیۆنەها کەس بکوژن، چی دەقەومێ؟ سوێند دەخۆم، ئاو لە ئاو ناگەڕێت. یەعنی مشتێ ڕێکپۆشی ددان سپی ئیتر وەک خۆتان لێناگەڕێن کە ڕووداوێک بقەومێ. لە ڕاستیدا بە کۆمەکی هەزاران یاسا کە هیچو پووچی وەک خۆیان نووسیویانە نەجاتیان دەبێ. ئەمما ئەگەر مرۆڤێک کە ڕێکپۆش نییە بە هەزاران دەلیل تەنیا نەفەرێک بکوژێت، بێ چوونو گەڕانەوە لە سێدارەی دەدەن. ئەلیاس لەمەڕ ترس لە مرۆڤەکان بیروباوەڕێکی سەرنج ڕاکێشی هەیە . جارێکیان پێی وتم لە هەر کەسێک کە کەمتر دەگری، زیاتر دەترسێ. وتی بە بۆچوونی ئەو ترسناکترین مرۆڤەکانی ئەم دنیا هیچو پووچە کەسانێکن کە تەنانەت جارێکیش نەگریاون. گرەو دەکەم ئەم ڕێکپۆشە هیچو پووچانە ئەگەر لە تەواوی تەمەنیاندا جارێک گریابن ئەو جارەیش زەمانێک بووە کە لە سکی دایکیان هاتوونەتە دەرێ.

کیمرام دەڵێ تا ئۆتومبیلەکە نەڕۆیشتووە پەلە بکەین. گەر ئۆتومبیلەکە کەوتە ڕێ، ئەمشەو نامەکە ناگاتە دەستت. ئەگەر ڕێت کەوتە بەهەشتی زەهرا لەلایەن منەوە مۆمێک بۆ ئەلیاس داگیرسێنە . بڕیارمداوە وەختێ حاڵم باش بوو لێرە چوومە دەرێ یەک ڕاست بڕۆم بۆ بەهەشتی زەهرا. دەمەوێ بە دەستەکانی خۆم مۆمێکی سەوزو درێژو جوان لەسەر بەردی گۆڕەکەی داگیرسێنم. لەو مۆمانەی کە لەسەر خوانی پەیمان بەستن دایدەگیرسێنن. دنیات چۆن بینی؟ ڕەنگیشە دوو مۆمی درێژی جوانی سەوز.

### سەرچاوە:

حکایت عشقی بی قاف بی شین بی نقطه

مجموعه داستان کوتاه

مصطفی مستور

چاپ چهارم

نشر چشمه

زمستان ۱۳۸۵، تهران

# ئەحمەد مەتەر، شاعیری خەندە تاڵەکان

حەسەن حوسێنی
لە فارسییەوە: سەروەر عومەر

**بەیانی ئەمڕۆ**
**زەنگی سەعات بێداری کردمەوەو**
**پێی وتم: ئەی کوڕی عەرەب**
**کاتی خەوە!**

لە خۆرئاوابوونەوە تا بەرەبەیان – وەک باوە– کاتی نووستنی جەستەیەو لە هەڵاتنی خۆرەوە تا ئاوابوونی – دیارە – کاتی خەوی رۆحە. بۆ دەربڕینی ئەم راستیە تاڵو ئازاراوییە، کە تەمەنی عەرەب بە تەواوەتی لە خەوی غەفڵەتدا تێئەپەڕێ، ئەحمەد مەتەر گەیشتۆتە باشترینو کورتترین شێوەی دەربڕین. ڕەخنەگرێکی هاوچەرخی عەرەب سەبارەت بەم شیعرەی ئەحمەد مەتەر دەنووسێت: «... شاعیر توانیویەتی لە رێگەی تەزووی کارەبایی شیعرەوە، پەیامی سیاسیی خۆی بە وەرگرەکەی بگەیەنێت. تەزوویەک بە پەستانێکی بەهێز کە لە نێوان ڤۆڵتاجی شیعریی ٢٢٠ تا ٣٤٠ لە هاتوچووندایە. ئەم ڤۆڵتاجە نەک هەر بەشی ئاگربەردان لە ڕۆحو گیانی مرۆڤ دەکات، بەڵکو دەتوانی زۆپایەکی کارەباییشی پێداگیرسێنیت[1].»

لە ناوجەرگەی کەساسی بازاڕی شیعر لە جیهانی عەرەبدا و لە دەهەمین پێشانگەی کتێب لە کوەیتدا، کە لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٤دا کرایەوە، کتێبێکی

بچووک، سەرسامییەکی گەورەی خوڵقاند. ناوی ئەم کتێبە لافیتەکانو شاعیرەکەشی ئەحمەد مەتەر شاعیری لاو و دەربەدەری عێراقی بوو. لەم پێشانگەیەدا زیاتر لە ٢٠٠٠ دانە لە کتێبی لافیتەکان فرۆشراو ئەم ژمارەیە لە جیهانی عەرەبدا، ژمارەیەکی بێ وێنەیە. ژمارەیەک کە تەنانەت کتێبەکانی نزار قەبانی — کە بە پرخوێنەرترین شاعیری عەرەب دائەنرێت — نەیتوانیوە لە پێشانگەیەکدا بگاتە ئەو ژمارەیە. ئەم ریکۆردە بێ وێنەیە، بۆ بڵاوکەرەوە، سوودێکی زۆر، بۆ خوێنەری عەرەب سەرسامیو سەرسوورمان و بۆ خودی شاعیریش، دوورخرانەوە لە کوەیتی لەگەڵ خۆی هێنا.

«لافیتەکان» کۆمەڵە شیعرێکی کورتن کە شاعیر، پێشتر رۆژانە لە رۆژنامەی «القبس»ی کوەیتیدا بڵاوی کردبوونەوە، چەند ساڵ دواتر، ئەم کتێبە لە لەندەن گەیشتە چاپی دووەمی و پاش ماوەیەکی کەم، بەرگی دووەمیشی بڵاوکرایەوە. هەنووکە ناوی ئەحمەد مەتەر بەهۆی ئەم دوو کۆمەڵە لافیتانەوە لە تەواوی کۆڕو کۆبوونەوە ئەدەبییەکانی عەرەبدا کەوتۆتە سەر زاری هونەرمەندان و، ئەوی وەک شاعیرێکی سیاسیی پلە یەک لەسەر ئاستی وڵاتە عەرەب زمانەکان، بە شیعر دۆستان، ناساندووە.

ئێمەش لێرەدا، بەرلەوەی بڕۆینە نێو قۆناغی هەڵدانەوەی بەرگی یەکەمو دووەمی لافیتەکانەوە، ئاماژە بە ناونانی ئەم شیعرانە بە لافیتەکان، ئەکەین. بەڕاست بۆچی ئەحمەد مەتەر ئەم ناوەی بۆ شیعرەکانی خۆی هەڵبژاردووە؟! بێگومان لە دیدگای ڕواڵەتیەوە، کورت بوونی ئەم شیعرانەو کورت بوونی ناوەرۆکی لافیتە لە جیهانی سیاسەتدا، جێگەی بایەخی شاعیر بووە. بەڵام لە دیدگای ناوەکییەوە، دەکرێ لایەنی دیکەی ئەم ناولێنانە ئەژمار بکرێت.

«شاکر النابلسی» لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی « نانێک لە ئاگرو گەنم» کە تایبەتە بە لێکۆڵینەوەی بەرهەمی دە شاعیری لاو و دیاری عەرەب و ئەحمەد مەتەریشی تێدایە، لەم بارەیەوە دەنووسێت: «من وەک خۆم حەزم لەم ناوەیە، ئەگەرچی لای هەندێک، ئەم ناوە ڕەهەندێکی سیاسیی-بازرگانی وەبیردێنێتەوە. بەڕای من ئەحمەد مەتەر لەبەر دوو هۆ ئەم ناوەی بۆ کتێبە شیعرییەکەی هەڵبژاردووە. یەکەم ئەوەی کە ئەم دیوانەو ناوەرۆکەکەی لە «ئەلف»ەوە تاکو «یا» سیاسییە. لافیتە لە دونیای سیاسەتی عەرەبدا مانای پۆزەتیڤ و نێگەتیڤی زۆری هەیە..وەک دەشزانین لە جیهانی عەرەبدا، هیچ سیاسەتێک بێ لافیتە نییە و هیچ لافیتەیەکیش بێ سیاسەت نییە. هۆی دووهەم ئەوەیە کە شاعیر ویستوویەتی بەم «لافیتانە» وەڵامێکی دابێتەوە بە لافیتە سیاسییەکانی عەرەب کە هەر ڕۆژە بە زمان، ڕەنگ، قەبارە و ئارایشتێکی تازەوە لە گۆشەیەکی وڵاتە عەرەبییەکاندا، هەڵدەواسرێن. وەک بڵێی شاعیر ئەیەوێ بە سیاسییەکانی عەرەب بڵێت: ئەمە لافیتەکانی من و ئەوەش لافیتەکانی ئێوە، لەم نێوەشدا خوێنەر سەربەست کامیان هەڵدەبژێرێت(٢).»

ئەحمەد مەتەر ئەم لافیتانە بە هەڵگری هزری تەقینەوەیی ئەزانێت. ئەو لە وەڵامی یەکێک لە هەواڵنێرانی عەرەبدا کە لێی ئەپرسێت: «تۆ جەنگاوەری یان شەهیدێکی زیندوو؟» ئەڵێت: «من جەنگاوەرێکم بە چەندین تۆن هزری تەقینەوەیی لە قوڵایی بوونمدا. هەموو ڕۆژێک بەم «هزرانەوە» خۆم ئەکێشم بە کۆشکی ستەمکاراندا تا خۆم و ئەوان بە یەکجاری بتەقێنمەوە. لەوانەشە ڕۆژێک لە دووبارەکردنەوەی ئەم کارە ماندوو ببم — ڕۆژێک کە بێکەڵکبوونی ئەم کارە بۆ من بسەلمێت- ئەو ڕۆژەش دوور نییە کە دواین شیعرم بە کامیۆنێک ماددەی تەقینەوە بهۆنمەوە(٣).» بەرگی دووەمی

لافیتەکان بەم نووسینەی خوارەوە بۆ یەکێک لە هاوڕێکانی ئیمزا ئەکات: «ئەمانە چەند لافیتەیەکی دیکەن لە خۆپیشاندانی هەمیشەیی مندا. لاشم گرنگ نییە کە دوای ئەم لافیتانە بژیم. ئەوەی بۆ من گرنگە ئەوەیە کە ئەم لافیتانە، لەدوای من درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن[٤].»

## شێوەو شێوازی شیعرەکانی مەتەر:

ئەحمەد مەتەر شاعیرێکی نوێخوازە و شێوەی شیعری ئەو بە گوزارشتێکی هەستپێکراو بۆ خوێنەری ئێرانی، شێوەیەکی نیماییە. بەم واتایە کە ئەحمەد مەتەر، مل بە «یەکسانبوونی نیوەدێڕ» لە شیعردا نادات، بەڵام کێشەی عەرووزی و هەروەها سوودوەرگرتنی بەجێ لە سەروا، بە هیچ شێوەیەک بەرنادات: «تێگەیشتنی من لە «ئازادیی» لە «شیعری ئازاد»دا، ئازادییە بۆ کەمکردنەوەی هەندێک لە کێشەکانی عەرووز، ئەو کاتەی ئەم کێشانە وەک زیادەیەک، ڕێگە لە ئازادی شیعر ئەگرن، هەروەها ئازادی بۆ زیادکردنی هەندێک کێش و دەرچوون لە سنووری ئەفاعیلی یەکسان، کاتێ هەست بکەم شیعرەکەم بەبێ ئەم ئەفاعیلە زیادانە، دووچاری کەموکورتی و تێکچوون ئەبێ[٥].»

تەکنیکی ئەحمەد مەتەر لە سوودوەرگرتن لە سەروای کارامەو پێویست لەم دوو شیعرە کورتەی خوارەوەدا، بە باشی دەرئەکەوێ:

صباح هذا اليوم  
ايقظني منبه الساعة  
وقال لي: يا ابن العرب  
قد حان وقت النوم!  
(شیعری «بێداریی»، لافیتەکان1، لا13)

صرخت: لا  
من شدة الألم  
لكن صدى صوتي  
خاف من الموت  
فارتد لي: نعم!  
(شیعری «زایەڵە»، لافیتەکان١ ، لا١٤)

شێوازی شیعری مەتەر بە شێوەیەکی پێگەشتووی شێوازی «نزار قەبانی» دائەنرێت. شێوازێک لەگەڵ هەلومەرجی ڕەوانبێژی دێرینی عەرەبیشدا کە؛ «باشترین قسە ئەوەیە کە کورت و پڕ واتا بێت» ئەگونجێت و هەمئاهەنگیی هەیە. شێوازێک کە خودی قەبانی ناوی «تەلەگرافە شیعر»ی لێناوە. بەڵام شایەنی باسە ئەگەرچی قەبانی «لەسەر شێوەو دەربڕینی زمانی شیعری مەتەر زۆرترین کاریگەریی هەبووە، بەڵام داخستنی فایلی داهێنانە تاکە کەسییەکانی ئەحمەد مەتەر بە بەستنەوەی شێوازی ئەو بە قەبانییەوە، کارێکی پەلەو بەدوورە لە وردبینیی و بیرتیژیی ڕەخنەگرانە،

بەتایبەتی کە ئەم دانەپاڵە شێوازییە، ئەکرێ لە زەینی خوێنەری ئاساییدا، جۆرێک هاوبەشی ناوەرۆکیش بە بیردا بێنێ. هاوبەشییەکی نەویستراو کە لە بنج و بناوانەوە نادروست دەرئەکەوێ. «د. رەووف شەحوری» لە ناساندنی شیعرێکدا لە بەرگی دووەمی لافیتەکاندا، کە لە «الوطن العربی»دا بڵاوبۆتەوە، ئەنووسێت: «ئەحمەد مەتەر شاعیرێکە لە ڕیزدا ناوەستێ و لە ئاپۆرەدا ون نابێ. لە عەرەبەکان ناچێ. نە دوکان ئەکاتەوە نە سوپەر مارکێت. کاڵای «هەزارویەک مۆدێل» نافرۆشێت. بە پێچەوانەوە، باق وبریقی کاڵاکان، کاغەز، دیارییو تاڵی ئاوریشمینی ڕەنگاوڕەنگ، فریوت نادات. لە کۆڕی «نان، بادە، حەشیشەو مانگ»دا، بۆ شیعری عاشقانە بانگهێشتت ناکات[٦].»

پڕئاشکرایە کە لەو دەربڕینانەی سەرەوەدا ئاڕاستەی تانەو پلار، ڕووی لە نزار قەبانی و ئەو شاعیرانەی دیکەیە کە لە پێڕی شیعری نزار قەبانیدا ئەگونجێنو ئاگاداری ئێمە لەم خاڵە کە قەبانی شیعرێکی هەیە بە ناوی «نان، حەشیشە و مانگ» ڕاستیی ئەم بانگەشەیە ئەسەلمێنێت.

بەڕای ئێمە شێوازی ئەحمەد مەتەر، شێوازێکی سادە و چڕوپڕە کە ئەکرێت بە «کاریکاتێریزمی شیعری» ناوزەد بکرێت. ئەحمەد مەتەر سەردەمانێک لە مەیدانی «کاریکاتێر»دا خۆی تاقیکردۆتەوە و لەگەڵ کاریکاتێریستی شەهیدی فەڵەستینی «ناجی العلی»دا هاوڕێیەتییەکی بەناوبانگو پڕ بەرهەمی هەبووە، لە تایبەتمەندی ئەم هونەرە لە شیعرەکانی خۆیدا زۆرترین سوودی وەرگرتووە. لەگەڵ ئەم جیاوازییەدا کە ئەگەر کاریکاتێریستەکان، لەسەر نەگونجانی ئەندامە پێکهێنەرەکانی ڕووخساری بابەتەکەی خۆیان کار ئەکەنو نەبوونی گونجاندن بۆ نموونە لە نێوان لوت و چاودا یان دەمو گۆناکان، ئەکەنە هەوێنی سەرەکی کارەکەیان و بە شێوەیەکی گشتی «ڕووخسار»ی بابەتەکە بە شێوەیەکی پێکەنیناوی دروست ئەکەنەوە، ئەحمەد مەتەر وەک شاعیرێکی وردبین و هەستیار «سروشت»ی بابەتەکانی خۆی دروستئەکاتەوەو دژئامێزییە مەعنەوییەکانی وتەو کردار و نەگونجانی سیما لەگەڵ سروشتدا بۆ ئەو ئیلهامبەخش و بزوێنەری نووسینی «لافیتە» تازەکانە.

هەروەها چیرۆکئامێز بوونی تانوپۆی شیعرەکانی مەتەر، تایبەتمەندیی شێوازی ئەوە. مەتەر لەم بوارەشدا سوودی لە ئەزموونی چیرۆکنووسینی سەردەمی لاوێتیی خۆی وەرگرتووە. زۆرێک لە شیعرەکانی مەتەر لە نوکتەی کورتی سیاسی ئەچن، ئەوەتا نوکتەکانیش سوودیان لە ڕەگەزەکانی چیرۆک وەرگرتووە.

ئەحمەد مەتەر بۆ خوێنەری شیعرەکانی چیرۆکی «تەویلە»یەک ئەگێڕێتەوە:

گایەک لە تەویلەکە هەڵات
گایەکە هەڵاتو
گوێرەکەکانی نێو تەویلەکە
وروژان
ئەگریان بۆ هەڵاتنی گەورەکەیان
لەسەر ئەم بابەتە
دادگاو.... کۆنگرە
پێکهێندرا
یەکێک وتی: قەزاوقەدەرە

ئەوی دی: لە دین دەرچووە

یەکێکی دی: بۆ دۆزەخ

هەندێکیش وتیان: دەرفەتێکی دیکەی پێبدەن

رەنگە بگەرێتەوە بۆ تەویلەکە

لە کۆتایی کۆنگرەکەشدا

شوێنی بەستنەوەکەیان بەشکردو...

بەشە جۆکەشیان ڕاگرت

***

لە دوای ساڵێک،

ڕووداوێکی سەیر ڕوویدا

گایەکە نەگەڕایەوە

بەڵام

تەویلەکە بەدوایدا ڕۆیشت!

(شیعری «گا و تەویلە»، لافیتەکان١ ، ل٤٤ )

ئەم چیرۆکە پێکەنیناوییە، هەمان چیرۆکی کامپ دیڤیدە، ئابڵوقەی ڕژێمی میسر لەلایەن وڵاتە عەرەبییەکانی دیکەوە و دواجار پەیوەندی کردنی ئەم ڕژێمانە بە «کەمپی» ناوبراوەوەیە.

لە شیعرێکی دیکەدا شاعیر باس لە یادگارییەکانی سەردەمی منداڵیی خۆی ئەکات:

کە منداڵ بووم

سندووقی یارییەکانم کردەوە

کورسییەکم دەرهێنا

بە زێڕ نەخشێنرابوو

بووکەڵەیەکی دارینی لەسەر بوو

شمشێرێکی قامیشی بەدەستەوەبوو

سەری بووکەڵەکەم نزم کردەوە

سەری بووکەڵەکەم بەرز کردەوە

لامبرد

دامنایەوە

لامبرد... دامنایەوە

تا ماندوو بووم

هیچ سکاڵایەکی لەدەست

ئارەزووە جۆراوجۆرەکانم نەکردو

تووڕەش نەبوو

کورسییەکەشی وەک خۆی لە ژێر دەستمدابوو

رازاوەو شكۆدارو... زەوتكراوبوو
كاتێک دامئەنا دائەمەزرا
كاتێک هەڵمئەگێڕایەوە هەڵئەگەڕایەوە!
دیمەنەكە دڵخۆشی كردم،
بەڵام باوكم
كاتێک ئەمەی بینی، ترساو
پەرێشان بوو
بووكەڵەكەی لە سندووقەكەدا
شاردەوە
گوێی ڕاكێشامو
گەڕایەوە!
تەمەنێک لە سەرسووڕماندا ژیام
كاتێک گەورەبووم
لە هۆكارەكەی تێگەیشتم
زانیم كە بووكەڵەكەم
سیمبولی تەواوی
دەسەڵاتدارانی عەرەب بووە!
(شیعری «سندووقی سەرسووڕهێنەرەكان»، لافیتەكان٢ ، لا١٠)

لافیتەیەكی دیكە، چیرۆكی ڕێوڕەسمی لەسێدارەدانێكی تابڵێی پێكەنیناوییە:
بە ناوی فەرمانڕەوای شكۆدارەوە
بڕیاریان دا بكوژی براكەم
لەدار بدەن
بەڵام پیاوكوژەكە كورتەباڵا بوو
جەلاد پرسی:
سەری ئەم پیاوە ناگاتە تەنافەكە
چارە چییە؟
دوای بیركردنەوەیەكی قووڵ
فەرمانڕەوا فەرمانی دا
من لەجیاتی ئەو بدەن لەدار
چونكە من باڵام بەرزتر بوو!
(شیعری «پیاوی گونجاو»، لافیتەكان٢ ، لا٦٩)

لە شیعرێكی دیكەدا بە وەسفی چیرۆكئامێزی چركەساتێک، لێو و زمانی بڕاوی عەرەب كە وەک

«ڕیخۆڵەکوێرە» لەلایەن دەسەڵاتە عەرەبییەکانەوە، نەشتەرگەریی بۆ کراوە. وەک ناسنامەی عەرەب، دێتە گۆ:

لە فڕۆکەخانەی وڵاتێکی بێگانە
پۆلیسی فڕۆکەخانە لێم ڕاما
-بەرلەوەی داوای پاسپۆرتەکەم لێبکات —
کاتێک زانیی لێو و زمانم نییە
چاوی داخست و بە ئاوازێکی داخدارەوە وتی:
خۆشهاتی... ئەی هاوڕێی عەرەبی من!
(شیعری «ناسنامە»، لافیتەکان٢ ، لا٦٨)

ئەگەر خوالێخۆشبوو سوهرابی سپهری لە شیعرە بەناوبانگەکەی خۆیدا «ناونیشان»، ئەدرەسێکی عاریفانەو سەرسامهێنەر ئەدات، ئەحمەد مەتەر لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا کە «ماڵی یار لە کوێیە» بە سوودوەرگرتن لەم چیرۆکە فۆلکلۆرییەی عەرەب، ناونیشانێکی تەواو پۆلیسیی ئەدات کە دۆخی قڕوقەپی زاڵی سەر وڵاتە عەرەبییەکان، بەتایبەتی وڵاتی عێراق، وێنە دەکێشێت:

ماڵی هاوڕێکەم ونکردبوو و
ناونیشانەکەیم لە ڕێبوارەکان پرسی
وتیان: بڕۆ بۆلای دەستەچەپ
لەپشت سەرتەوە چەند سیخوڕێک ئەبینی
لەنزیک یەکەم سیخوڕەوە ڕاوەستە
لێرەدا سیخورێک ئەبینی کە سەرقاڵی بۆسەدانانە
بڕۆ بەرەو ڕووی یەکەم سیخوڕ
لە بەرامبەر سیخوڕە بۆسەدانەرەکەوە
حەوت سیخوڕ بژمێرە...
پاشان ڕاوەستە
ماڵی هاوڕێکەت لەوپەڕی دەستەڕاستەوە
لەپشت سیخوڕی هەشتەمەوەیە!
(شیعری «نیشانەکانی سەر ڕێگا»، لافیتەکان١ ، لا١٢٥)

لە شیعرێکی دیکەدا، بەسەرهاتی خەونێک کە بینیویەتی‌و، ڕۆیشتنی بۆلای خەونلێکدەرەوە ئەگێڕێتەوە:

ڕۆیشتم بۆ لای خەونلێکدەرەوەو
پێم وت: گەورەم
لەخەودا بینیم
وەک مرۆڤ ئەژیمو

چواردەورم پڕە لە مرۆڤ
دەنگم لە گەرووما بوو
نان لە دەستمدا
بەڕێدا ئەڕۆیشتمو
کەس شوێنپێی هەڵنەئەگرتم!
بەدەنگی بەرز ڕایچڵەکاندم:
کوڕی خۆم تابۆیە
تۆ گاڵتەت بە قەدەر کردووە
کوڕی خۆم.... باش بخەوە
بەرلەوەی جێیبهێڵم
پەنجەی دەسەڵات
چوو بە گوێچکەمدا
سەرم کەوتە لەرینەوەو
...... تەقییەوە!
(شیعری «خەون» ، لافیتەکان١، لا ٩٨)

ژمارەی ئەو شیعرانەی کە هۆنینەوەیەکی چیرۆکییان هەیە لە بەرگی یەکەمو دووەمی لافیتەکاندا، کەم نییەو قسەکردن لەبارەیانەوە خۆی ڕەنگە ببێتە چیرۆکێکی درێژ. ئێمە بۆ ئەوەی هەودای باسەکەمان لەدەست دەرنەچێت هەر بەم چەند نموونەیە کۆتایی پێدێنینو خوێنەری ئارەزوومەند بۆ خودی کتێبەکان ئەگەڕێنینەوە.

تایبەتمەندییەکی دیکەی شێوازی ئەحمەد مەتەر، گرنگی دانیەتی بە هونەری ڕەوانبێژیی. گرنگیدانێک کە شیعری مەتەر لە شیعری نزار قەبانی جودا ئەکاتەوەو حەزی ئەو بۆچوونە نێو گۆشە نادیارەکانی زمانو سوود وەرگرتن لە هەلومەرجە ڕێزمانییەکانی زمانی عەرەبی، ئاشکرا ئەکات.

هونەری ڕەوانبێژی —بێژەیی و مەعنەوی— بە فراوانی لە شیعری مەتەردا بەرچاو ئەکەوێت و ئەم ئامادەگییە بەرفراوانە، بە جۆرێکە کە بە هیچ شێوەیەک، «توانانوێنی»و قورسی تێدا نییە. لە تەکنیکەکانی ڕەوانبێژی، مەتەر زیاتر حەزی لە ڕەگەزدۆزی، توانج پۆشیی، دیاریکردن (بەرجەستەکردن)و تیلنیشان، هەیە. بۆ نموونە، ئەم چەند شیعرە ئەهێنینەوە:

## ڕەگەزدۆزیی تەواو:

<u>قواعد</u>

بِدْعَةٌ
عِنْدَ ولاهِ الأَم
صارتْ قاعِدَهْ.
كُلُّهم يشتِمُ أمريكا.

وأمريكا
إذا ما نَهضوا للشَّتْمِ
تبقى قاعِدهْ.
فإذا ما قَعَدوا
تنهضُ أمريكا لتبنى
.. قاعِدهْ!

بیدعەت
لای کاربەدەستان بۆتە ڕێسا
هەموویان جنێو بە ئەمریکا ئەدەن
کاتێک ئەوان هەڵئەسن بۆ جنێودان
ئەمریکا دانیشتووە
کاتێکیش ئەوان دانیشتن
ئەمریکا هەڵئەسێ تاوەکو
... بنکەیەک دروستبکات!
(شیعری «بنکەکان» ، لافیتەکان١، لا ١٢٠)

لەم شیعرە کورتەدا، مەتەر بەشێوەیەکی زۆر جوان سوود لە واتای سێ لایەنیی وشەی «قاعیدە» وەرئەگرێتو ڕەگەزدۆزییەکی تەواوی بەدیهێناوە. لە شوێنێکدا «قاعیدە»ی بە واتای «ڕێسا»، لە جێگەیەکی دیکەدا بە واتای «دانیشتوو» و دواجاریش بە واتای «بنکە» بەکارهێناوە.

لە کۆتایی (شیعری «هونەرمەندی بەناوبانگ»دا، لافیتەکان١، لا٧٧) کە ڕەگەزەکانی هونەری شانۆ تیایدا، بۆتە ناوەرۆکەکەی» ئەڵێت:

فغاية القصور في الثورة
ان تعرض الثورة فى القصور

(ئەوپەڕی کەمتەرخەمی «قصور» لە شۆڕشدا، ئەوەیە کە شۆڕش لە کۆشەکاندا «قصور» نمایش بکرێت). رەگەزدۆزیی تەواوی وشەی «قصور» لە دوو ڕەهەندی واتایی خۆیدا، جێگەی مەبەستی شاعیر بووە.

جۆرەکانی دیکەی ڕەگەزدۆزیی لە شیعری مەتەردا زۆر بەرچاو ئەکەون:

پەڕجووەکان هەموو لە جەستەی مندان
من زیندووم
بەڵام پێستەکەم کفنمە!
....................
هەموو گوناهم ئەوەیە

لە زەمەنی کەرێتیدا
باوەڕم بە شیعر هێناوەو
باوەڕم بە جۆ «شعیر» نەهێناوە
(شیعری «زیندوو مردوو»، لافیتەکان١، لا ١٠٢)

هەروەها ئەم ڕەگەزدۆزییە، هەندێکجار لە ناونیشانی شیعرەکانیشدا بەرچاو ئەکەوێت، بەرگی دووەمی لافیتەکان، دوای «بیان الاول»، بە شیعرێک دەستپێئەکات بە ناونیشانی «ئینجیلی پۆلیس!» کە لەگەڵ «ئینجیلی پۆڵس»دا جۆرێک لە ڕەگەزدۆزی ناتەواو پێکئەهێنن. شاعیر لە شوێنەکانی دیکەشدا لە ڕەگەزدۆزی بێئاگا نەبووە:

اسير حيث اشتهي لكنني اسير.
«بۆهەر شوێنێک حەزم لێبێ ئەڕۆم، بەڵام دیلم»
یان
سەبرمان گرتو لە سەبری ئێمە «سەبرا» لەدایک بوو...

## توانج پۆشیی:

هونەری توانج پۆشیش لە شیعرەکانی مەتەردا، بەکارهێنانێکی ناسکو سیاسیی پەیدا ئەکات:

من يملك «القانون» في
اوطاننا
هو الذي يملك حق عزفه!
لە وڵاتەکانی ئێمەدا
ئەو کەسەی قانونی بەدەستە
هەر ئەو مافی ژەنینیی هەیە!
(شیعری «دادپەروەری»، لافیتەکان١، لا ١٥)

وشەی «قانون» بەدەر لە واتا ناسراوەکەی، واتای جۆرێک- ساز- یش ئەدات.

لە (شیعری «پزیشکیی بۆ تەندروستیت زیانی هەیە»، لافیتەکان٢، لا ١٩)دا، ئەڵێت:

هاوڕێیەکم هەیە
لە کۆلێژی پزیشکیی ئەخوێنێت
کاتێک سیخوڕەکە
لە لایەنگریی حیزبیی ئەو دڵنیا بوو
هات بۆ دەستگیرکردنی
ئەویش کاتێک جارێکیان بینیی
سەبارەت بە پێکهاتەی «شانە» ئەخوێنێتەوە!

لەم شیعرەدا دوو واتای فیزیۆلۆژیو سیاسی وشەی «شانە» جێگەی مەبەستی شاعیر بووە.

لە شیعرێکی دیکەدا، بەسەرهاتی وتارخوێنێکی مزگەوت ئەگێڕێتەوە کە لە وتارەکانی خۆیدا باس لە ئارامگرتن، گوێڕایەڵیی‌و ڕۆژو ئەکات، بەڵام لەبارەی «جیهاد»ەوە، یەک وشە بەسەر زمانیدا نایەت:

وحين ذكرنا
قال لنا: عليكم السلام!
کاتێک بیرمان خستەوە،
پێی وتین: عليكم السلام «ئاشتیتان لەسەر»
(شیعری «وتاربێژی سوڵتان»، لافیتەکان٢، لا ٦٠)

## دیاریکردن (بەرجەستەکردن):

هونەری بەرجەستەکردنیش لە شیعری مەتەردا، لە توخمە هەمەچەشنەکانی شێوەی دەربڕین‌و جۆراوجۆریی گۆشەنیگای شاعیرە.

لە نێوەندی خاشاکێکدا
تەرمێکم بینی، سیمای عەرەبەکانی هەبوو
داڵ و مارومێرووەکان لە دەوری کۆبووبوونەوە
لەسەرییەوە نیشانەیەک هەبوو
ئەیوت: ئەم مردارەوەبووە
پێشتر ناوی... کەرامەت بوو!
(شیعری «سروشتی بێدەنگ»، لافیتەکان١، لا٧)

شاعیر لە گۆشەیەکی وڵاتانی عەرەبیدا، سەرقاڵی پیاسەکردنە، تەنیایە. تەنها پێنج هەستەکەی لەگەڵیدان کە لەناکاو:

تەنیا ئەڕۆیشتم
ژیریی‌و بیستن‌و هزرەکانم لەگەڵمدا بوون،
روخسارەکان،
لە چواردەورم کۆبوونەوە
گەورەکەیان پێی وتن:
بیبەن.
پرسیم:
تاوانم چییە؟
پێم وترا:
کۆبوونەوەی گوماناوی!
(شیعری «تۆمەت»، لافیتەکان١، لا١٧)

## * چواندن:

چواندن بە شێوەی جۆراجۆر، یارمەتی ئەحمەد مەتر ئەدات بۆ دەربڕینی ئازارەکانی. لە شیعری «چەمانەوەی گوڵەگەنم»دا خۆی بە گوڵەگەنمێک ئەچوێنێت کە چەمانەوەکەی بەرهەمی پڕبوونییەتی:

بەڵێ... من لە ژێر شمشێری ڕەنجدا،
ئەچەمێمەوە
بەڵام بێدەنگییم هەراوزەنایەو
سەرشۆڕیی چەمانەوەم گەورەییە
من بۆیە هێندە ئەچەمێمەوە
هەتاوەکو بۆمب بچێنم!
(شیعری «چەمانەوەی گوڵەگەنم»، لافیتەکان١ ، لا١٠٨)

* «لێکچواندنی پەسەندکراو»یش لەم شیعرەی خوارەوەدا، بەکارهێنانێکی جوانی هەیە:

لە سەردەمی جاهلیدا
«بت»ەکان لە خورما بوون
کاتێک بەندەکان برسی ئەبوون
جەستەی پەرستراو دەبوو بە زەواد بۆیان
لە سەردەمی شارستانییەتدا،
بتەکان لە ڕۆژئاواوە
دێن بۆمان
بەڵام بە جلوبەرگی عەرەبییەوە
بە قسە خودا ئەپەرستێ
بانگەواز بۆ (جیهاد) ئەکاو
جنێو بە بتپەرستی ئەدا!
کاتێکیش تووڕەبوو
خێروبێری وڵات ئەخوا و
خۆی بە بەندەکان ئەڕازێنێتەوە!
***
هەزار ڕەحمەت لە سەردەمی جاهیلی
(شیعری «جاهیلی»، لافیتەکان١ ، لا١١٥)

## * تیلنیشان:

هونەری تیلنیشان (ئامارەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بۆ کەلەپوور) ئەکرێت بە تەرازووی پێوانی پاشخانی کەلتوری شاعیران دابنرێت. تیلنیشان بۆ ئایەتە قورئانییەکان، چیرۆکە قورئانییەکان،

چیرۆکە نەتەوەییو فۆلکلۆرییەکان، شیعری شاعیرانی پێشینو ...تاد. چەندینجار لە شیعرەکانی ئەحمەد مەتەردا بەرچاو ئەکەون. لە تیلنیشان بە ئایەتە قورئانییەکاندا، تا ئەو جێگایەی کە مەتەر، بە شێوەیەکی تەواو لە نێوان کەوانەدا ئەیهێنێتەوە، لە بەهێزیی شیعرەکانی خۆی زیاتر ئەکات:

لە قورئاندا خوێندمەوە:
«تبت یدا ابی لهب»
دەزگاکانی ڕاگەیاندن ڕایانگەیاند:
«بێدەنگیی لە زێڕە»
من هەژاریی خۆم خۆشویست... هەروا
ئەمخوێندەوە:
«وتب ما اغنی عنه ماله و ما کسب»
گەرووم بە تاوانی
بێ وێڵیی دەستگیر کرا
هەروەها قورئانیش
لەبەرئەوەی.... هانی دام بۆ
ئاژاوە!
(شیعری «بێ وێڵیی»، لافیتەکان ١، لا١١)

ئاماژەی مەتەر بە چیرۆکە قورئانییەکان، ئاماژەگەلێکی دڵنشینو کاریگەر ئامێزن:
ئەی ئیبراهیمی گەورەمان
خەنجەرەکەت تا دەسکەکەی بچەقێنەو
پاداشتی خۆت لە هاوەڵانی فیل بسێنە
......................................
ئەگەر سەری نەبڕی سەرت ئەبڕین،
چونکە ئەمە سەردەمێکی دیکەیە
کە تیایدا ئیسماعیل
دەبێتە قوربانی بۆ مەڕ!
(شیعری «خەوی ئیبراهیم»، لافیتەکان١ ، لا٥٠)

هەروەها ڕاڤە شاعیرانەکانی بۆ زاراوە قورئانییەکان- ئەگەرچی راڤەی ڕای تایبەتی خۆشی بن- ڕەنگە بە کەمێک لێبووردنو پشت بەستن بە «ئەوەی بۆ شاعیر ڕەوایە بۆ کەسی دیکە ڕەوا نییە»، بکرێت قەبوڵبکرێت. لەم بوارەدا، شاعیر ئەو خەڵکەی کە فەرمانڕەوایانی دواکەوتوو و وابەستەی عەرەب نە دینیان بۆ هێشتوونەتەوە نە دونیا، بە تەنز بە «گەلی نێوەند» ناویان ئەبات!

(شیعری «سەرەخۆشییەک لەسەر کارتی پیرۆزبایی»، لافیتەکان١ ، لا١٣٤)

لە ئاماژەدان بە چیرۆکە بەناوبانگو حیکایەتە دێرینەکان، چەند شیعرێک لە هەردوو کتێبەکەی ئەحمەد مەتەردا بەرچاو ئەکەون.

چاوەڕێی گەیشتنی من ئەکەن بە شارستانییەت،
تەواوی ڕێگاکان بێهودەن‌و
هەنگاوەکان خوازراون
لە نێوان ئێمە و شارستانییەتدا
هەزارویەک دەروازە هەیە
کە پڕن لە سەگ
ئەو سەگانەی بۆنی گومان ئەکەن
بێدەنگیی ئاماژە ئەبیستن‌و
کاتەکانی دەستبەتاڵیی
بە ملپەڕاندن بەسەر ئەبەن
من چۆن ئەگەمە مەنزڵ
لە کاتێکدا ئەوان لە هەموو ڕێگاکاندا
سەگەکان ئازاد ئەکەن‌و
بەردەکان ئەبەستنەوە!
(شیعری «دەروازەکانی شارستانییەت»، لافیتەکان١ ، ل٥٦)

بەشی کۆتایی ئەم شیعرە، بەیادهێنەرەوەی حیکایەتێکی ناسراوی گوڵستانی سەعدییە.
لە بەشێکیش لە (شیعری «پاڵەوانێتیی» لافیتەکان١ ، ل٩٤)دا، ئەڵێت:

وتی: ئەی پیاوەکان
دزێکم گرتووە،
وتیان: بیهێنە...
وتی: هێنانی ماندووم ئەکا
وتیان: دەستی لێهەڵگرەو....خۆت وەرە
وتی: ئەمەوێ وابکەم بەڵام
ئەو دەست لە من هەڵناگرێ!

ئەم شیعرەش بەیادهێنەرەوەی حیکایەتێکی کەم‌و زۆر ناسراوە، کە «جامی» لە (سبحەالابرار) و خوالێخۆشبوو، «حاجی مەلا ئەحمەدی نەراقی» لە مەسنەوی (تاقدیس)دا هەریەکەو بەجۆرێک گێڕاویانەتەوە.

هەڵبەتە دوور نییە ئەم دوو حیکایەتە سەرچاوەیەکی عەرەبییان هەبێت. بەڵام نابێت ئەوە لەبەرچاو نەگرین کە ئەحمەد مەتەر عێراقییەو شیعەو خەڵکی بەسرە. ئەم هۆکارانە ئەکرێت گومانی ئاشنایی مەتەر لەگەڵ زمانی فارسی‌و پەیوەندی ئەو لەگەڵ دەقە ئەدەبی-عیرفانییەکانی ئەدەبیاتی فارسی لە ئێمەدا بەهێز بکات.

لە شیعری ئەحمەد مەتەردا ئاماژە بۆ شیعری شاعیرانی عەرەب و کاریگەربوون بە ناوەرۆکەکانیان بە فراوانی ئەبینرێت. «لە شیعری ماڵێک و بیست ئاڵادا» (لافیتەکان ١، ل١١٢) بە ئاماژەدان بەو خاڵەی کە عەرەبەکان بەهۆی بەرفراوانی وڵاتەکانیانەوە، خێزانی گەورەیان پێکهێناوە کە بەسەر

دەرگای دانە دانەی ژوورەکانییەوە بیست ئاڵا-نیشانەی ناکۆکی- دانراوە، ئەنووسێت:

خێزانەکەمان گەورەیە

بەڵام گەورەبوونی «وەرەم»

... نیشانەی تەندروستی نییە!

ئەمە بەیادهێنەرەوەی بەیتێکە لە قەسیدەیەکی ناسراوی موتەنەبی، سەبارەت بە گلەیی‌و سکاڵا لە خۆبەشاعیرزانانی ئیرەییبەر و داخ لەدڵ، و بۆ پیاهەڵدان بە سیف الدولەی حەمدانیدا.

بەم سەربەیتە:

واحر قلباه ممن قبله شبم

و من بجسمی و حالی عنده سقم

بەیتی مەبەست لەو چامەیەدا، ئەمەی خوارەوەیە:

اعیذها نظرات منك صادقه

ان تحسب الشحم فمن شحمه ورم

لە ئاماژەدان بە شیعری شاعیرانی سەردەمی جاهیلیشدا، ئەحمەد مەتەر دەستێکی باڵای هەیە. موعەلەقەی ئیمروئولقەیس، شاعیری ناوداری سەردەمی جاهیلی، بەم نیوە بەیتە بەناوبانگە دەستپێئەکات:

قفا نبك من ذكری حبیب و منزل

ڕاوەستن تا بگریین بە یادی یار و دیاریی ئەو!

ئەحمەد مەتەر بە سەرنجێکی تەنزئامیز لەم نیوە بەیتەو بە شێوەیەکی ئازاراوی و وروژێنەر ئەڵێت:

ئەی خەڵکینە ڕاوەستن تا پێبکەنین

بەسەر ئەم چارەنووسەدا

سەرمان ونبوو و خەممان نەبوو

بەڵام کاتێک پێڵاوەکانمان ونکرد

لە چەلەحانێدا نقووم بووین!

(شیعری «کورتەبنە باڵابەرزەکان»، لافیتەکان٢ ، لا ٢١)

## ڕۆڵی ناوەرۆک لە شیعرەکانی ئەحمەد مەتەردا:

ناوەرۆک لە شیعری ئەحمەد مەتەردا، توخمێکە کە توخمەکانی دیکەی شیعری خستۆتە ژێر تیشکی خۆیەوە. ئەو باس لەو دەرد و ئازارە ئەکات کە چەوساوەکانی عەرەب ئەیبینن، لەم بارەیەوە قسەی زۆری هەیە. باسکردنی ئەم ئازارە نەوتراوانە کە شاعیر دەربڕینیانی کردۆتە دروشمی «لافیتەکان»ی خۆی، شوێنێک لە شیعرەکانیدا بۆ غەزەل و سەرگەرمیی ناهێڵێتەوە: «ئەگەر من

بە ستوونێکەوە ببەستنەوەو لە ژێر پێمدا ئاگر بکەنەوە، یەکەمین کارێک ئەوەیە هاوار بکەمو داوای یارمەتی بکەم یان تا ئەتوانم هەوڵی کوژاندنەوەی ئاگرەکە بدەم. باوەڕناکەم لەم حاڵەتەدا کەسێک چاوەڕێی ئەوە لە من بکات نەغمەی عاشقانە بچڕم و گۆرانیی «لەیلا» بڵێم. من لە نەتەوەیەکم کە بە ستوونێکەوە بەستراوەتەوەو ئاگر لە ژێرپێیدا بڵێسە ئەدا. بۆ من جێگەی شەرمەزارییە لەم بارودۆخەدا، دەم بکەمەوەو گۆرانیی بڵێم: بەهارەو هەوا زۆر خۆشە! بەڵام ئەگەر هەر بەڕاستی وابێت، لە چڕینی ئەم گۆرانییە باکم نییە[٧]».

مەتەر، شیعر وتن بە ئەرکی خودایی خۆی ئەزانێت لەگەڵ ناڕەزایی دەربڕین بەرامبەر هەلومەرجی نالەباری جیهانی عەرەبدا: «نووسین و شیعر وتن، بۆ من جۆرێک ناڕەزامەندییە لە دژی هەلومەرجی نالەباری جیهانی عەرەب. هەوڵدانێکە بۆ وەرگرتنەوەی بوونی ئینسانیی تالانکراوم. ئەمە لەو ڕووەوەیە کە خوداوەند منی بەدیهێنا، فەرمانی پێکردم کە بخوێنم، هەروەها بە قەڵەم فێری کردم تا بنووسم و بڵێم. من هەوڵ ئەدەم کە گۆڕەکەم بە «قەڵەم» هەڵدەمەوەو جەنازەکەم بەرلە ڕزین هەڵسێنمەوە تا بتوانم هاوار بکەمو لە هاوارمدا هاواری هەزاران زیندەبەچاڵکراوی دیکە جێبکەمەوە. لەبەرئەوەی من ئەزانم کە «وشە» پەرچووی ئەم نەتەوەیەیەو شیعر دەستو چاو و سییەکانی ئەم گەلەیە. شیعر پزیسکێکە کە فتیلەی ئەم بۆمبە دائەگیرسێنێت و شاعیر، فەرماندەیەکی لەخۆبردووە کە بۆ نەتەوەکەی خۆی گەواهیدەرو شەهیدێکە، نەوەک گۆرانیبێژێک کە پیشەی ڕەواندنەوەی خەمی دەروونی سوڵتانە بەدمەستەکان بێت[٨]».

هەرلەم بارەیەوە کە شاعیر بە دەنگێکی تووڕە، بێباوەڕیی خۆی سەبارەت بە شیعری شاعیرە بێئازارەکان ڕائەگەیەنێت و نەفرەت ئەکا لەو هونەرمەندانەی بە هونەرەکەیان، بازرگانی بە ئارەزوو و خەونەوە ئەکەنو «ماددەی هۆشبەر» بە نەوەی خۆیان ئەفرۆشن:

باوەڕم بە قەڵەمو
کاغەزەکان نەماوە
بێباوەڕم بەو ڕەوانبێژەی
ئاوس ئەبێتو نەزۆکە
بێباوەڕم بەو شیعرەی
ستەم ڕاناگرێتو
ویژدانەکان ناوروژێنی
........................
نەفرەتم لە هەموو ئەو شاعیرانە کرد...
کە گیسووی یار ئەبینن و
تەنافی دار نابینن!
(شیعری «بێباوەڕیو شۆڕش»، لافیتەکان٢، لا١٤)

گومانی تێدانییە ئەحمەد مەتەر بۆ ناوەرۆکی سیاسی-کۆمەڵایەتی، لە عەیاری ئەو ڕەگەزەی کە ئەهلی هونەر بە «گەوهەری شیعری» ناوزەدی ئەکەن، کەم ئەکاتەوە، لەبەرئەوە ئاساییە کە ئەو

دەستەیە لە خوێنەرانی شیعر کە دڵیان بە وێنە «سازگار»ەکانی شیعرەوە بەندەو بۆ نموونە لەگەڵ شێوازی شیعرەکانی «ئەدۆنیس»دا خوویانگرتووە، ئاساییە کە لە سەفەر بۆ دیاریی «لافیتەکان» هێندەش ڕەزامەند نەگەڕێنەوە، بەڕاستی ئەمەش شێوازێکە، کە لە نێوجەرگەی سنووربەزاندنی ئیسرائیلدا بۆ باشووری لوبنان و لەو کەشوهەوا تاریکو بریندارەدا، دیسان حەوسەڵەی سەرگەرمیت هەبێت و وەک «ئەدۆنیس» شیعری «پەتیی» بڵێیت:

هەوا، سەرپۆشی چیمەن

لە ئاستانەی شەو و ڕۆژدا، ئاوێنەکانی خۆی ئەشکێنێ تا خەوی لێبکەوێ

گوڵی سوور کەشتییەکی بچووکە لە زەریای هەوادا مەلە ئەکا

تەنها بەیەک سەرنشینەوە: بۆنی خۆش[١٠]

بەڵام ئەحمەد مەتەر بەهیچ شێوەیەک بەمە ڕازی نابێت کە ساتە شیعرییەکانی خۆی لە پێناوی وتنی شیعری «پەتیی»دا خەرج بکات. ئەو بە پێچەوانەی شاعیرانی دیکەی هاوچەرخی عەرەب کە تێئەکۆشن تا کەسێتیی خۆیان لە شیعرەکانیاندا ئاشکرا بکەن، لە هەوڵی ئەوەدایە تا «خۆی» لە شیعرەکانیدا بتوێنێتەوەو «من»ی تاک بگۆڕێت بۆ «من»ی کۆمەڵ و قسەکەری نەتەوەیەک بێت: «زۆر جوانە کە مرۆڤ، شاعیرێک بێت لە ڕاژەی نەتەوەیەکدا، نەوەک نوێنەری هۆزێکی تایبەت[١١]».

بوون بە شاعیری نەتەوەیەک، ڕاشکاوی، سادەبێژیی، بێپەروایی و بوێریی ئەوێت کە ئەحمەد مەتەر بە هەموو ئەم ڕێگایانەدا ڕۆیشتووە. «من باوەڕم هەیە کە شاعیر لە پێش ڕەخنەگرەوەیەو ڕەخنەگر ناتوانێت بەرلە پشکنین و وردبینی لە شیعری شاعیردا، بنەمای ڕا و تیۆری خۆی دابنێت. لەبەرئەوە من شیعری خۆم لەسەر بنەمای تیۆری ڕەخنەگران دانارێژم، بەڵکو ئەوە ڕەخنەگرەکانن ئەبێت تیۆری خۆیان لەسەر بنەمای شیعری من بینا بکەن».

ئەحمەد مەتەر لە شیعرەکانی خۆیدا، لە جیهانی سیاسەتو هونەری عەرەبدا ڕاستو چەپ ئەکوتێت. بەڵام ئەکرێ بوترێت کە بڕبڕەی پشتی ناوەرۆکەکانی ئەو، ناڕەزامەندییە لە دژی تاساندنی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا بەسەر وڵاتانی عەرەبیو ئاشکراکردنی سووربوونی ئەم تاساندنە، بەشێوازەکانی شیعری خۆی. خوێنەری بەویژدانی شیعرەکانی ئەحمەد مەتەر، بە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی دوو کتێبی شیعریی ئەم شاعیرە، ناتوانێت نکولی لە لێهاتوویيو مامۆستایی ئەو، لەم گۆڕەپانە مەعنەوییەدا بکات!

مرۆڤ لە وڵاتەکانی ئێمەدا

لە منداڵییەوە لە پێستی خۆیدا بەندکراوەو

لەژێر هەر دڵۆپە خوێنێکیدا

سەگێکی ڕاهێنراو خۆی حەشار داوە

....................................

مرۆڤ لە وڵاتەکانی ئێمەدا

هیچ نییە جگە لە فایلێک

کە بەرگەکەی پێستی مرۆڤە

ڕوو لەکوێکەین؟
(شیعری «ڕوو لەکوێکەین»، لافیتەکان١، لا١٣١)

سانسۆر — ئەم کابوسە بێبەزەیی و توندوتیژە — لەهەموو جێیەک وەک دیمەنی کەلتوری تاساندن، هەروەک سێبەر، شاعیر ڕاوئەنێ: شاعیر ئەڕوات بۆلای پزیشک. پزیشک هەرچی هەوڵ ئەدات تا سەری نەخۆشەکەی بەرزکاتەوە ناتوانێت. بە کورتی شاعیر، رازی بابەتەکە ئاشکرا ئەکات:
حەز ئەکەم سەرم بەرز ڕاگرم بەڵام ئەترسم ڕکابەرەکەم سانسۆری بکات!
(شیعری «نەخۆشیی»، لافیتەکان٢، لا٨)

سانسۆرێک کە لە بۆسەی کتێبی خوداوەندیشدا دانیشتووە: ئەگەر خوداوەند، کتێبەکەی خۆی نەدەپاراست، سانسۆرچییان لە قورئانیش جگە لە پێنج وشە، هیچی دیکەیان نەئەهێشتەوە، ئەو پێنج وشەیەش بریتین لە «قران کریم... صدق الله العظیم»!
(شیعری «بە کورتی»، لافیتەکان٢، لا ١١٣)

عەیاری تاساندن لەو کەشوهەوایەی کە شاعیر هەناسەی تیا ئەدا، هێندە بەرزە کە تایبەتیترین کردەوەکانی تاکەکەس و تەنانەت گوزارشتەکانیشی ئەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە: بەر لە دابەستنی نوێژ، پەیوەندی بە حکومەتەوە بکات و ڕاپۆرت لەسەر بارودۆخەکە بدات، هەر جۆرە پەیوەندییەک «لەگەڵ دەرەوە»دا جێگەی مەترسییە!
(شیعری «ڕاسپاردەکان»، لافیتەکان٢، لا١٧٤)

ئەم تاساندنە پۆلیسییە بە جۆرێکە کە تەنانەت یاسا فیزیاییەکانیش سەروژێر ئەکاتەوە:
لەتاو ئازار
هاوارم کرد: نا
بەڵام زایەڵەی دەنگم
لە ترسی مەرگ
بەرەولام گەڕایەوە: بەڵێ!
(شیعری «زایەڵە»، لافیتەکان ١، لا١٤)

بەڵێ وەک وتمان شیعری ئەحمەد مەتەر، سەکۆی هێرشێکی دادگەرانەیە بۆ سەر دیمەنەکانی ستەم، گەندەڵیو ساختەکاری و نادادپەروەریی لە جیهانی ستەمدیدەی عەرەبدا. لە تێڕوانینی شاعیر لەم بوارەدا، ئەو ڕابەرە فەلەستینییە کە بەردەوام بە پەنجەکانی نیشانەی سەرکەوتن پیشانی ئەم و ئەو ئەدات، بەیادهێنەرەوەی ژنێکی سۆزانییە کە بۆ نوێژی بەیانی ڕاوەستابێتو ئەو نەتەوەیەی کە «ئەبرەهە» ئەهێنێتە ناو کەعبەوە. خۆی هەناسەی گوناهە، گوناهێکی نەبەخشراوەو «ئەبرەهە» کەسێکە کە بەهۆی باوەڕی بە ئیسلامی ئەمریکایی، ئایەتێک سەبارەت بە بڕینی دەستی دز لە

قورئاندا ئەدۆزێتەوە. بەڵام ئەو ئایەتە زۆرانەی جیهاد بەو چاوانەی کە تەراخومەی ئەخلاقی کوێری کردوون، نابینێت. هەرئەم «ئەبرەهە»یە کە لە گەوجکردنی خەڵکانی عەرەبدا بە دروشمە بەڕواڵەت ئیسلامییەکان، شەو و رۆژ تێئەکۆشێت، بەڵام خۆی سەر لە کۆڵانە خراپەکانی پاریسو لەندەن دەرئەهێنێت. ئەحمەد مەتەر لە «سوڵتە»ی جیهانی عەرەبدا، جگە لە گەندەڵیو خراپی، هیچی نەدیوە. ئەو لەم ڕووەوە چەندین جار قریشکاندوویەتی کە: پەنا بۆ خودا ئەبەم لە سوڵتان!

«سوڵتە»یەک کە پەروەردەی داگیرکەر و خانەزای دونیاخۆرانە. سوڵتەیەک کە ئەحمەد مەتەر لە ئاشکراکردنی ناوەرۆکەکەیدا بەلاغەتی سیاسیی شیعریی ئەگاتە ئەندازەیەک کە جگە لە ئافەرینکردن، ڕێگایەکی دیکە لەبەردەم خوێنەرانی خۆیدا ناهێڵێتەوە:

خودایە ڕەگەزنامەی
ئەمریکیمان پێببخشە
تا لە وڵاتانی عەرەبیدا
بەسەربەرزی بژین!
(شیعری «کاروباری نێوخۆیی»، لافیتەکان ٢، لا١٦٢)

## پەراوێزەکان:

* تەواوی شیعرەکانی ئەحمەد مەتەر لەم بابەتەدا، لە هەردوو کتێبی «لافیتەکانی ١، چاپی دووەم، ١٩٨٧، لەندەن و لافیتەکان ٢، چاپی یەکەم، ١٩٨٧، لەندەن»ەوە، وەرگیراون. نووسەری ئەم بابەتە بە شێوەیەکی ئازاد شیعرەکانی وەرگێڕاوەو زیاتر مەبەستی گواستنەوەی ناوەرۆکی شیعرەکان بووە. بەڵام من لە وەرگێڕانی شیعرەکاندا گەڕاومەتەوە بۆ هەردوو کتێبی لافیتەکانو شیعرەکانم لە عەرەبییەوە، وەرگێڕاوە. -و. ک-.

١.شاکر النابلسی، رغیف النار والحنطه، المؤسسة العربیة للدراسات و النشر، ١٩٨٦، لا٢٤٧.
٢.هەمان سەرچاوە، لا٢٤٧.
٣.چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەحمەد مەتەر، «الوطن العربی»، ساڵی نۆهەم ژمارە ٤٣١، ١٩٨٥، لا ٥٤.
٤. رؤوف شحوری ، الشاعر الانتحاری، «الوطن العربی»، ژمارە ٢٩، ٥٥٥، ١٩٨٧، لا ٦٦.
٥. چاوپێکەتن لەگەڵ ئەحمەد مەتەر، رۆژنامەی «الصباح»، چاپی تونس، ١٩٨٦.
٦. رؤوف شحوری، الشاعر الانتحاری، «الوطن العربی»، ژمارە ٢٩، ٥٥٥، ١٩٨٧، لا ٦٦.
٧. شیخ ناصیف الیازجی، العرف الطیب فی شرح دیوان ابی الطیب، بەرگی یەکەم و دووەم، لا٣٤٢.
٨. چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەحمەد مەتەر، رۆژنامەی «الصباح»، چاپی تونس، ١٩٨٦.
٩. ادونیس، مدی الطفوله الجنوبیه، مدی الشعر، «الکفاح العربی»، ساڵی دوازدەهەم ژمارە ٣٥٠، ١٩٨٥، لا٥٠.
١٠. مانگنامەی«شعر»، چاپی میسر، ساڵی دەهەم، ژمارە ٣٨، ١٩٨٥.
١١. چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەحمەد مەتەر ، ڕۆژنامەی «الصباح»، چاپی تونس، ١٩٨٦.

## سەرچاوە:

مجله «کیهان فرهنگی» فروردین ١٣٦٧- شماره ٤٩ ، لا ٢٩- ٣٢.

# هەمیشە گەنج

## FOREVER YOUNG

بەشی یەکەم لە کتێبی گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەدۆنیسی باوکمدا

سازدانی : نینار ئەسبەر
لە سویدییەوە: هیوا قادر

**نینار:** قسەیەکی پێشینان هەیە، کە ڕەنگە قسەیەکی بێسەروبەریش بێت، قسەیەکە بەردەوام لە خەیاڵمدایە و ناتوانم تێیبگەم کە ئەڵێت: "ئاخ ئەگەر گەنجی بیزانیایە و ئەگەر پیریش بیتوانیایە"، پێتوایە مانای ئەم وشەیە کورتکراوەی ڕەورەوەی ژیان بێت؟ یان قسەیەکی بێسەروبەرە؟ ئایا ئەو شتە گرنگە چییە کاتێک کە ئینسان پیربوو ئیتر ناتوانێت بیکات، ئەی ئەوە چییە کە ئینسان ئەبێت لە گەنجیدا بیکات؟

**ئەدۆنیس:** من پێموایە گەنجی بەپیرییەوە و پیریش بەگەنجییەوە بە کۆمەڵێک شێوەی جیاواز پێکەوە گرێدراون. بەڵام زەحمەتیشە تۆ ئەم پرسیارە لە هەموو کەسێک بکەیت. ژیانی هەموو ئینسانێک بۆخۆی تایبەت و دانسقەیە. هەموو تاکێکیش خۆی ڕێگای ژیانی خۆی هەڵئەبژێرێت، ئیتر ژن بێت یان پیاو دواتر خۆی بڕیارئەدات کە بەو ڕێگایەدا بڕوات یان نا. بۆ ئەوەی ئینسانیش بتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارەی تۆ بداتەوە بەهەرحاڵ ئەبێت لەخۆی بپرسێت کە ئایا ژیانی ئەو بەهای چییە. یاخود چ بەهایەکی هەیە. ئەگەر ئەو کەسە ژیانی خۆی وەک درەختێک تێگەیشتبوو وە هیچ وەڵامێکیشی بەلاوە گرنگ نەبوو. ئەوا لەم حاڵەتەدا ئەو کەسە بەبێ هیچ ئیختیارێک لەدایکبووە، ئەو خۆی فڕێداوەتە ناو ئەم ژیانەوە و جۆرەژیانێک ئەژی کە لەسەر ڕێکەوت بەندە، ڕێکەوت و هەڵکەوتی لەخۆوەدروستبوو، وەک تۆوێک وایە کە بەدەم بای ژیانەوە بڕوات. بەڵام ئەگەر

هات و ئینسان بەپێچەوانەی ئەوەوە پرسیاری کرد لەوەی کە ئایا ژیانی بەهای هەیە، ئەوکات ئیتر ناتوانێت ئەوە فەرامۆشبکات کە ئەو بۆخۆی بەرپرسیارە بەرامبەر بە ژیان. ئەو کاتیش هەوڵئەدات ژیان جوان بکات، ئەمەش وا لەو ئینسانە ئەکات ئازادتر بێت و ژیانیشی کاریگەری لەسەر دنیا هەبێت. لێرەوە ئیتر دۆخەکە بە یەکجاری ئەگۆڕێت.

بەلای منەوە گرنگترین شتێک کە بمەوێت هێمای بۆ بکەم ئەوەیە ئەبێ هانی ئینسان بدرێت ئازادانە ژیانی خۆی رێکبخات، هەروەها بۆ ئەم کارەش نابێت دەستبخرێتە ژیانییەوە. چ جۆرە ژیانێکیش هەڵئەبژێرێت، ئەوەیان پەیوەندی بەکەسایەتی ئینسانەکە خۆیەوە هەیە. لەم لایەنەشەوە ئەوەی پەیوەندی بە شێوەژیانی خۆمەوە هەبێت دیارە هەر بەم شێوەیەیە، بەهەرحاڵێک من لەبەر ئەوە نانووسم کە ژیانم بەهای نییە. ئەمەش پەیوەندی بەوەوە هەیە کە نووسین بوارێکی وای بۆ من خولقاندووە تا لەخۆم بگەم و ئەو دنیایەشی کە تیایدا ئەژیم باشتری بکەم. نووسین بوارێکی وای بۆڕەخساندووم باشتر بژیم، سنوورەکانم فراوانتربکەم، بەدوای وێنەیەکی جیاوازدا بگەڕێم یان ئەندێشەیەکی وا بخەمەڕوو کە ڕەنگبێت یارمەتیدەربێت بۆ ئەو کەسانەی مەیلی ئەوەیان هەیە ئەو ئەندێشانە کاریان تێبکات. ئەمەش بۆ من بەهانەیەکە کە لەئێستادا بتوانم بڵێم گەنجی و پیری هەردووکیان پێکەوەن و ئەمسەر و ئەوسەری یەک پشتوێنن. پشتوێنی بێ خەوشیش ئەو پشتوێنەیە کە بە مەرگ کۆتایی دێت. بەڵام هەندێک جاریش بە مەرگ کۆتایی نایەت لەبەر ئەوەی "داهێنەر" کە ئەمرێت بەرهەم و کارەکەی دوای خۆی ئەمێنێتەوە، ئەویش وەک نووسین، مۆسیقا، بیر و... چەندانی کایەی تر. بەرهەمی ئەو ئینسانانە ئاوێتەی بزاوتی ژیان ئەبێت. هەموو بیریارە گەورەکان، فەیلەسوفەکان، شاعیرەکان و وێنەکێشەکان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا مردوون، بەڵام بەرهەمەکانیان بەردەوام لەگەڵ ئێمەدا ئەژین. ئەوان بەجەستە مردوون، بەڵام تا ئێستاش ئەوان لەگەڵماندان. ئێمە شیعرەکان و نووسینەکانی ئەوان ئەخوێنینەوە، گوێ لە مۆسیقاکانیان ئەگرین، ئەمەش مانای ئەوەیە ئەوان دانووسانمان لەگەڵ ئەکەن، یارمەتیمان ئەدەن و وامان لێئەکەن باشتر تێبگەین.

پێش هەرشت ژیان خۆی خەلقکردن و توانایەکە بۆ داهێنان. هەروەها سروشتیش هەمیشە داهێنانی تازە ئەهێنێتەکایەوە. ئەگەر لێکۆڵینەوە لەسەر ڕووەکەکان، گوڵەکان، ڕووبارەکان، لافاوەکان و بورکانەکان بکەیت جوڵەیەکی بەردەوام و گۆڕانێکی بەردەوامیان تیادا ئەبینین. ژیانی ئینسانیش لەو گۆڕانانە ئەچێت. مەبەستی سەرەکی من ئەوەیە بڵێم، ئینسان ئەبێت بەوپێیە توانای خۆی بەکاربهێنیت بۆ داهێنانی ئەو شتانەی کە لەخۆی گەورەترن. هەر ئەمەشە وادەکات ئینسان لەناو بوونەوەرەکانی تردا جیاوازبێت، چونکە بوونەوەرەکانی تر توانای ئەوەیان نییە خۆیان لە سروشت جیابکەنەوە، لەبەر ئەم هۆیەشە کە ناتوانن مێژوویەکیان هەبێت، بەڵام بەپێچەوانەوە ئینسان ئەتوانێت خۆی لە سروشت جیابکاتەوە، تەنانەت بەشێوەیەکی ئەبستراکتیش ئەتوانێت خۆی لە خۆی جیابکاتەوە. ئینسان ئەتوانێت هۆگری سروشتبێت و لەهەمان کاتیشدا خولقێنەری مێژووی خۆی بێت. گرنگترین شتێک بەلای منەوە ئەوەیە کە ژیانێک پڕاوپڕ بژیت و بەردەوامبیت لە داهێنان، تا ژیان باشتر بکەیت. بەتایبەتی ئینسان جاری واهەیە لەماوەی ژیانیدا چەند جارێک ئەمرێت، دیارە باشترە گەر بێت و ئینسان تەنها جارێک بمرێت. ئینسان هەیە ئەمرێت کاتێک کە دووچاری خەمی گەورە، یان برسێتی و خیانەت و دەستەوسانی و چەندان شتی تر ئەبێت، بەڵام

ئینسانیش هەیە ئەتوانێت چەند جارێک لە دایکبێتەوە، لەڕێگای گەڕانی بەردەوام بەدوای ئەگەری داهێناندا.

**نینار:** بەڵام لەنێوان گەنجی و پیریدا هیچ جیاوازییەک هەیە کە پەیوەندی بەم مەسەلەیەوە هەبێت؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر، کاتێک کە پەیوەندی بە داهێنانەوە بێت هیچ جیاوازییەک نییە.

**نینار:** هەروەها ئەمەش بۆخۆی پرسیاری بەردەوامییە؟

**ئەدۆنیس:** وایە، بەڵام هەندێک جیاوازی هەیە. بەشێوەیەک لە شێوەکان پیری وامان لێئەکات کامڵتربین، ئەمەش مانای ئەوەیە لەهەمان کاتدا ئەمانگەڕێنێتەوە بۆ منداڵی. هەردوو سەری پشتوێنەکە بەیەکەوە گرێدراوە. مەبەستم ئەوەیە بڵێم لەدایکبوون بۆ خۆی بەجێهێشتنی مردنە. بۆیە پیریش لەوسەرەوە ئینسان بەرەو مردن ئەباتەوە، زیاتر لە خۆی نزیک ئەکاتەوە، لەو سەرەتایە نزیک ئەبێتەوە کە هەیبووە. مردن ڕوانگەیەکی ناو ژیان و پیریشە، هەروەها جۆرێکی جیاوازیشە لەمنداڵی.

**نینار:** تۆ وتت ئەگەر ئینسان داهێنەربێت و لەدوای خۆی بەرهەمەکانی جێبهێڵێت جۆرێکە لە نەمردن، چونکە بەرهەمەکانی لە ئێمەدا ئەژین، بەڵام بۆ من هیچ گرنگ نییە کە کارەکانم دوای خۆم بژین یان نا، لەبەرئەوەی تازە من مردووم و لەگەڵ ئەو کەسانەدا نیم کە ئەژین. ئەمە وەک بەجێهێشتنی منداڵ وایە دوای خۆت. ئینسانەکان بەشێوەیەکی گشتی گوێنادەنە ئەم قسانە، منداڵیش ئەخەنەوە بۆ ئەوەی وەچەیان بمێنێت و ئەوانیش وەک پێش خۆیان بەردەوام بن.

**ئەدۆنیس:** وایە، بەڵام خستنەوەی منداڵ شتێکی ترە. من دواتر زیاتر قسە لەسەر ئەمە ئەکەم، بەڵام ئەمەوێت یەکەمجار چەند ڕستەیەکی کۆتایی لەسەر مەرگ و بەرهەمی زیندوو بڵێم. لەڕاستیدا لەنێوان ژیانی بیریارێک یان هونەرمەندێک و کارەکانیدا، ئەکرێت ئاستەنگێک دروستبێت بۆ لێتێگەیشتن. ئینسان ناتوانێت جیاوازییەک لەنێوانیاندا دابنێت و بەتەواوەتی تێیان بگات. بۆ نموونە تۆ ئەگەر لەگەڵ کەسێکی داهێنەری وەک پیکاسۆدا بژیت، ناتوانیت لەهەموو جۆری کارەکانی بگەیت، لەبەر ئەوەی ئینسان قوربانیی دەستی هەندێک لەو ئاستەنگانەی وەک دڵپیسی، ئیرەیی و بیری کێبەرکێکردن و ڕقە لەبەرامبەر ئەو داهێنەرانەدا تا ئەوکاتەی لەژیاندان.

**نینار:** باشە بۆچی ئینسان ناتوانێت مەودایەک بەئەندازەی پێویست لەنێوان داهێنەر و کارەکانیدا وەرگرێت؟

**ئەدۆنیس:** کاتێک کە هونەرمەندێک ئەمرێت ئەوسا ئینسان ئەتوانێت باشتر لە کارەکانی بگات، چونکە ئەوکاتە هەموو ڕوپۆشەکان ئەکەون و ئەوەی ئەمێنێتەوە کارەکەیەتی. هەندێک جار مەرگ دەسەڵاتی ئەوەی هەیەکە ڕووناکی زیاتر بخاتە سەر کەسایەتی هونەرمەندەکە و کارەکانی.

**نینار:** مەبەستت ئەوەیە کە بڵێیت ئەبێت ئێمە چاوەڕوانبکەین تا ئەو هونەرمەندە گەورە و داهێنەرانە ئەمرن، ئەوسا بتوانین بەتەواوەتی لە کارەکانیان بگەین؟

**ئەدۆنیس:** ئەمە بێمانایی یاسای ژیانە. ژیان ململانێیەکە و بەهێزەکان لاوازەکان ئەخۆن، وەک لە سروشتدا هەیە. لە سروشتدا هیچ یاسایەکی ئەخلاقی نییە کە ئاراستەی شتەکان بکات. لەڕاستیدا هیچ یاسایەکی ئەخلاقی ڕوونیش بۆ ژیانی ئینسانەکان نییە، ئەگەرچی ئینسانەکان لە تەقەلایەکی گەورەدان تا یاسایەکی ئاوا بخەنەڕوو، بەڵام هەمیشە ئەمە سەرینەگرتووە و زۆرینەش بەم ڕاستییە ئەزانن.

**نینار:** تۆ پێتوایە کەسێکی وەک تۆ کە باوکمیت، ئەتوانیت لەناو ئەم کێبەرکێیەدا بمێنیتەوە؟ چونکە وەک ئاشکرایە دنیای عەرەبی لەناو کێشەی زۆر جدی و گەورەدا ئەژی وەک کێشەی کۆمەڵایەتی، سیاسی، دینی و ڕۆشنبیریی کە گیرۆدەی دەستی بێ عەقڵی و وێرانکاریی توندڕەوی ئیسلامییە؟ تۆ سیمبولێکی ئومێدیت بۆ من ـ پەناگایەکیت دژ بەو گەندەڵییەی لە وڵاتانی عەرەبیدا هەیە و ئەو ئیسلامە توندڕەوەی، تەنها هەوڵی گەیشتنییەتی بەو ئامانجەی کە ببێتە دەسەڵاتێکی دانپیانراو. ئەگەر تۆ نەبویتایە، ئەترسام زۆر ئاسان و بێچەندوچوون ببومایە بەئیسلامیی! من تا ئەوەندە دڵنیانیم کە ئایا ئەوەندە بەهێز ئەبووم بمتوانیایە خۆم ڕووبەڕووی ئیسلام ببمەوە، یاخود خۆمی لێلابدەم یان تێیبگەم. ئەو هەستکردن بەئازایەتیەشم هی ئەوەیە کە لە ئەوروپا ئەژیم، بەچاوپۆشی لەو توندڕەوییە شێتانەیەی کە لە لەندەن ڕێگای پێدراوە، تا ئەو قسە ترسناکانە بکات، یان ئەو کچانەی پاریس کە بەڕەهاییەوە ئەیانەوێت لەچک بپۆشن، ئەوانەی ئەیانەوێت خۆیان بە پێوەندەکانی خۆیانەوە بەندبکەن، لەکاتێکدا کچانی تر لە وڵاتانی عەرەبی ـ ئیسلامیدا، هەندێک جار دووچاری ڕیسکی لەدەستدانی ژیانی خۆیان ئەبنەوە، هەوڵ بۆ ئەوە ئەدەن کە خۆیان لەژێر جلوبەرگەکانیاندا نەشارنەوەو بەو جۆرە پێوەندانەوە نەمێننەوە کە پێیانەوەیە. لەخودی ئەوروپاشدا بەشێکی زۆر لەو فەندەمەنتالیستانە هەن. دیارە مەبەستم بزوتنەوە ڕاستڕەوەکانی ئەوروپایە، بەڵام خۆشبەختانە ئەوروپا یاسا و ڕێسای خۆی هەیە و دەوڵەت لە وڵاتەکانیدا بەهێزە. فەرەنسا وڵاتێکی سێکیولارە ـ تەمەنا ئەکەم تا ئەبەد وا بمێنێتەوە!، هەروەها وڵاتێکی دیموکراتیشە. سەرباری هەموو ئەو شتانەی لەسەر ئەم حاڵەی ئێستا ئەوترێت، من تێیدا هەست بەدڵنیایی ئەکەم.

**ئەدۆنیس:** لەحاڵی حازردا، ئا. بەڵام گەر تۆ سەیری مێژووی ئەوروپا بکەیت، بەکۆمەڵی سەردەمی تاریکدا تێپەڕیوە کە یاسا تێیدا سەروەرنەبووە و ئارامی تێدا نەبووە، لەهەمان ئەو سەردەمانەدا عەرەب زۆر لەوان پێشکەوتووتربوون. دیارە مێژوو لەسەر گۆڕانی سیاسی و کۆمەڵایەتی بنیاتئەنرێت. سەرباری ئەوەی ئەمڕۆ بزاوتی فەندەمەنتالیستیش بەهێزە، بەڵام تۆ ناتوانیت باوەڕ بەوەبهێنیت کەلەدوارۆژیشدا هەروا ئەمێنێتەوە، بەوەی کە فەندەمەنتالیست لەدوارۆژدا وابەهێز ئەمێنێتەوە. تۆ ناتوانیت تەنها بڵێیت کە بزاوتی فەندەمەنتالیست بەهێزە، بێ ئەوەی باسی ئەوەش نەکەیت کەتین و گۆڕێکی زۆریش هەیە، کار بۆ ئەوە ئەکات کە کۆمەڵگە ئاووهەوایەکی سازگارتر هەڵمژێت جیاواز لەوەی کە هەیە، ئەگەرچی لەحاڵی حازردا ئەو هێزانە لاوازن تا بتوانن ئەو کاریگەرییەیان هەبێت.

**نینار:** ئایا گۆڕانی هێندە جیاواز و گەورە لەئارادا نییە کە دەستی بۆ ڕابکێشیت؟

**ئەدۆنیس:** هیچ بەدیلێکی تر نییە جگە لە گۆڕان، بەڵام تائێستا بەرەی ئۆپۆزیسیون دژ بەفەندەمەنتالیست ئۆرگانیزە نەکراوە، هەروەها لاوازە و زۆریش بێ دەربەستە. لەلایەکی تریشەوە لاوازی خودی کۆمەڵگە و لاوازی دەسەڵاتی دەوڵەت، ئەو تێگەیشتنەیان دروستکردووە کە گوایە فەندەمەنتالیست زۆر زاڵە و لەهەموو شوێنێک بوونی هەیە، بەڵام لەڕاستیدا وانییە. ئەگەرچی لە ئەمڕۆی وڵاتانی عەرەبیدا دژایەتیکردنی فەندەمەنتالیست زۆر لاوازە، تا ئەو ڕادەیەی لەجێی نەبووانە. ئەمەش لەوانەیە پەیوەندی بەوەوە هەبێت کە ڕەوشی کۆمەڵگە ڕوو لە خراپییە، هەم لەڕووی ئابووری و هەم لەڕووی هەژاری ڕۆشنبیرییەوە. ئەمەش هۆکارێکی مێژوویی لە پشتە کە لەڕاستیدا ڕژێمەکان و دیکتاتۆرەکان دەسەڵاتیان لە تاکەکان و بیروباوەڕیان و جەستەو خەونەکانیان سەندۆتەوە، لەم حاڵەتەدا تاکەکان بەهەموو شێوەیەک هەستئەکەن کە دەستیان بەستراوە و بەندکراون، بەڵام ئەم حاڵەتە هەروا تاسەر نامێنێت.

بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ وەڵامی پرسیارەکەت کە ئایا کەسێکی وەک من کە باوکی تۆم ئەتوانم لەم حاڵەتەدا بژیم، من پێمولیە ژیان بۆ خۆی جۆرێکە لە دەستبەرداربوون و سنووربەزاندن بۆ هەر کەسێک بێڕەچاوکردنی ئەوەی کە ئەو کەسە چەندە گرنگ و "گەورە"یە، ئیتر ئەو کەسە باوکی تۆبێت، هاوڕێیەک بێت، سەرۆکی وڵاتەکەت بێت یان شاعیرێک بێت. ژیان بەسەر هەموو ئەمانە و ئەو "گەورانە"ی ناو مێژووشدا تێپەڕیوە.

**نینار:** ژیان ئەوانی بەجێهێشتووە، بەڵام...

**ئەدۆنیس:** بەڵێ، لەڕووی فیزیکییەوە.

**نینار:** وایە.

**ئەدۆنیس:** ژیان هەرگیز ناوەستێت و بەزیندوێتی ئەمێنێتەوە. باوکێک شاهیدی مەرگی باوکی خۆی ئەبێت، ڕەنگە شاهیدی مەرگی کوڕەکەشی بێت. ئینسان ئەبێت مەرگ وەک بەشێک لە ژیان قبوڵبکات. کە باوکم بمرێت من لەبەرخاتری ئەو ناتوانم لەگەڵیدا بمرم، بەپێچەوانەوە ئەبێت من هێز و گوڕی ئەو وەربگرم و دوای ئەو نموونەیەی ئەو بکەوم، وەک ئەو کۆشش بکەم و لەژیاندا مانایەک بەخەباتی ئەو ببەخشم. گەر منیش لەگەڵ مەرگی ئەودا بمرم، هیچ سودێک بەکەس ناگەیەنێت. هێزی ئینسانیش لەمەدایە. ئینسان بەشێکە لەمێژوو، تەنانەت ئەکرێت لە مێژووش باڵادەستربێت.

**نینار:** مەبەستت لەوە چییە کە ئەڵێیت ئەبێت من ڕووبەڕوو ببمەوە، یاخود بەو سەروەختە ڕەشانەدا بچمەوە؟ پێتوایە کە ئەم قسەیەت "بەهانە"یەکی دروستبێت؟

**ئەدۆنیس:** تۆ باسی خۆت ئەکەیت؟

**نینار:** بێگومان.

**ئەدۆنیس:** ئەوەی پەیوەندی بەتۆ و نەوەی تۆوە هەبێت. ئەبێت بتوانن هێزی خۆتان لە

ئارەزووەکانتاندا پیشانبدەن و بتوانن خۆتان بن و هەوڵبدەن بەو شێوەیە بمێننەوە، کەسێک لاوازبێت ناتوانێت هەوڵبدات و ڕۆڵێکی وای لەناو کۆمەڵگەدا هەبێت مانایەک ببەخشێت. بۆیە ئەبێت کاربکات و جێیەک بۆخۆی بنیاتبنێت. مەرجی ئەمەش ئەوەیە کە بچیتە ناو کۆمەڵگەوە یان ناو پەیوەندییەکەوە لە دەوروبەری خۆتدا. ئینسانێک کە هیچ بەرهەم نەهێنێت، ئینسانێکە بوونی نییە . ئەمەش هۆیەکە بۆ ئەوەی کە هەستبکەیت توانایەکت هەیە بۆ بەرهەمهێنانی شتێک، هەست ئەکەیت کە شتێک بە پێشکەوتنی دنیا ئەبەخشیت، کۆمەکێک بە ئاوەدانکردنەوەی دنیا ئەبەخشیت. توانای تۆ لێرەوە سەرچاوە ئەگرێت و هیچ کەسێک ناتوانێت لێت زەوتبکات، هیچ کەسێکیش ناتوانێت تۆ تووشی نادڵنیایی بکات.

**نیشار**: تۆ ئێستا ئەتوانیت بیهێنیتە بەرچاوی خۆت کە باوکت لەژیاندایە؟ ئەتوانیت بیبینی لە دێکەی خۆیدا ئەژی و لەوێ قسە لەگەڵ خەڵکیدا ئەکات؟ یاخود لەشام ئەژی؟ گەروابێت ئەوا پێت وایە کاردانەوەی ئەو چۆن ئەبێت دژ بە دەسەڵاتدارانی سوریا، پیش هەرشت دژ بەو توندڕەوییە ئیسلامییەی لەوێ هەیە، لەکاتێکدا بەهۆی ئەو حیکمەت و زانیارییە زۆرەی سەبارەت بە قورئان و کلتوری عەرەبی هەیبووە وەکو شێخێک ناسراوە؟

**ئەدۆنیس**: باوکم لەمندا ئەژی، ئەگەرچی من هەرگیز بەڕاستی ئەوم وەک خۆی نەناسیوە . من ماڵی خۆمانم زۆر بەمنداڵی بەجێهێشت و باوکیشم بەگەنجی مرد. واتا من لەوێ نەبووم، بەڵام زۆرباشم لەبیرە کە ئەو هەرگیز بۆ هیچ کارێک ڕاینەسپاردووم تا بیکەم، بەڵام زۆرجار ئامۆژگاری ئەکردم هەمیشە پێش کردنی یان بڕیاردانی هەرچ کارێک، باش بیربکەمەوە . ئەو پێی ئەوتم " کاتێک بیرت لەو شتە کردەوە کە ئەبێت بیکەیت ئەوسا بڕیاربدە، بەڵام هەرگیز شتێک مەکە تا پێشتر باش بیرت لێنەکردبێتەوە". ئەمەش ئەوەبوو کە من هەوڵم ئەدا لە"ئەروەد"ی خوشکتی بگەیەنم. ئەو ڕۆژێک هات بۆ لام و باسی ئەوەی بۆ کردم کە ئەیەوێت بچێت بۆ ئاهەنگێک. ئەوکات من پێموت: "من دژی ئەو ئارەزووەی تۆ ناوەستمەوە، بەڵام من ئەمەوێت پێش ئەوەی لەگەڵیان بچیت بۆ ئەوێ، لەگەڵیان بژیت، تابزانی ئەوان کێن، گوێ لە تێڕوانینیان بگریت و بزانیت چی ئەکەن، ئەو کاتەش بڕیاری خۆت بدە کە زۆر لەوە زیاترت زانی کە ئەم قسانە مانای چین". دوای چەند مانگێک هاتەوە بۆ لام وتی: "من قەناعەتم پێیان نەبوو بۆیە بڕیارمدا کە پەشیمان ببمەوە و نەچم!".

من تا ئێستاش گیرۆدەی ئەو پەیوەندییەم کە لەگەڵ باوکمدا هەمبووە. هەرگیز نەمتوانی بەتەواوەتی بیناسم، کاتێکیش کە مرد نەگریام، نازانم بۆچی، تا کاتیش زۆرتر دەڕوات، من زیاتر بیری لێئەکەمەوە، زۆر زیاتریش ئارەزووی ئەوە ئەکەم بۆ خۆم بگریم، چونکە هەست ئەکەم کە ئەو تا چ ڕادەیەک هاوڕێیەکی نزیکم بووە. لەڕاستیدا ئەو زیاتر هاوڕێم بوو وەک لەوەی باوکم بێت. ئەو پیاوێکی توند و تیژ بوو، بەڵام لە ڕاستیدا وەک هاوڕێیەکی میهرەبانیش وابوو. بەڵام ئەم هەستەی کە ئێستا هەمە بەر لە مردنی ئەو نەمبوو، ئەمەشە ئەوەیە کە تورەم ئەکات! من ئەمڕۆ زور سوپاسی ئەکەم و وەفام بۆ ئەو ڕووناکییە هەیە کە لەوەوە وەرمگرتووە و وای لێکردم تێیبگەم. ئەگەرچی من باسی ئەو ناکەم، بەڵام ئەو لەناومدا ئەژی. هەندێک جار هەوڵئەدەم ئەوم بیربکەوێتەوە و وەک ئینسانێک بیری لێبکەمەوە، بیر لەو دۆستایەتییەی بکەمەوە کە هەیبوو. ئەو لێرەدایە لەگەڵ

من. لەگەڵ ئەوەی من لەگەڵ هەڵوێست و بیروباوەڕیشیدا نیم، بەڵام لە هەندێک لایەنی قوڵ و پڕ ئەنگێزدا لەگەڵیدام. ئەمەش هێزم ئەداتێ، وا لە من ئەکات کە پرسیار لەسەر زۆر لایەن بکەم و زیرەک بم لە هەڵبژاردنمدا. ئەو لەناومدا وەک ڕووناکییەک وایە. قەتیش روناکی ناو ناخ ناکوژێتەوە. بەپێچەوانەوە تا ژیانی من هەڵکشاوتربێت، ئەو رووناکییە درەوشاوەتر و بەهێزتر ئەسوتێت. سەیرە من هەندێک شتی ئەوم لەبیرچۆتەوە: وێنە و تەنانەت سیماشی، بەڵام دواهەمین وێنەی ئەوم هەرگیز لە بیرناچێتەوە. وەک ئەوە وایە ئێستا بەرامبەرم وەستابێت. ئەبوو ئەو ئەمڕۆ چی بکردایە؟ پێموایە ئەو لە ماڵەکەی خۆیدا دائەنیشت و ئەیخوێندەوە، خۆ ڕەنگە بیشینووسییایە، چونکە ئەو خۆی شاعیر بوو. ئەو خەسڵەتە جیاوازەی کە ئەو بەخشی بەمن، لە هێزی کەسایەتی خۆیەوە بوو. ئەو بەهێزبوو و سەری بۆ کەسیش دانەئەنەواند. هەندێک جار ئەو تەنها کەسێک بوو کە ئەیوێرا، ڕەخنە لە بەڕێوبەری پارێزگا یان سیاسییەک یان دەسەڵاتدارێک بگرێت. کاتێک هەمووان ڕازیئەبوون ڕەزامەندیان بۆ دەسەڵاتداران پیشان ئەدا، ئەو لەماڵەوە وەک دەربڕینی ناڕەحەتی یان ناڕەزاییەک ئەمایەوە و نەئەهاتە دەرێ.

ڕۆژێکیان سەرۆک کۆماری ئەو سەروەختە، "شوکری القوتلی"[1] هات بۆ دێکەمان. کاتێک من و خەڵکانی تری دێ وەستابووین بۆ پێشوازیکردنی، شیعرێکم ئامادەکردبوو کە خۆم نووسیبووم و ڕێگەی ئەوەشیان پێدابووم لەبەردەمیدا بیخوێنمەوە. شیعرێکی پێشوازیکردن بوو، بەڵام لە شیعرەکەمدا داوای ئەوەم لێکردبوو کە یارمەتیمبدات بچمە قوتابخانە و بخوێنم. من ئەو دەمە تەمەنی سیانزەساڵیم پڕنەکردبووەوە. باوکم ئەیزانی من چیم نووسیوە، بەڵام هیچ شتێکی نەکرد تا ڕێملێبگرێت. لەگەڵ ئەوەی ئەوانەی کە ئەم ئاهەنگی بەخێرهاتنەیان سازکردبوو "شۆڕشگێڕانی جەبلی"[2] بوون کە بەهیچ شێوەیەک باوکمیان خۆش نەئەویست، چونکە ئەو هیچ حەزی لێیان نەبوو، ئەو بەمنی وت: "بچۆ بۆ ئەوێ، بڕۆ خوا ئاگادارت بێت و سەرکەوتووبیت، بەڵام من نامەوێت بەشداربم و بێم بۆ ئەوێ". من هیچ کات ئەم جۆرە شتانەم بیرناچنەوە. تا ئێستاش من ناتوانم لەدەست ودڵ فراوانی ئەو تێبگەم، لەو حیکمەت پیشاندانانەی و ئەو حورمەتگرتنەی ئەو بۆ من و ئەو شتانەی کە ئەمویست.

**نینار:** ئەوان ئەویان کردبوو بەشێخ، ئایە ئەمە چۆن بوو؟

**ئەدۆنیس:** لەڕاستیدا لەبەر تەمەن و ڕەچەڵەکی خێزانەکەی ئەویان نەکردبوو بەشێخ، بەڵکە لەبەر دانایی خۆی بوو. ئەو ئینسانێکی زۆر ژیربوو، زۆر زانا و تێگەیشتوو بوو. لەبەر ئەو زانست و چاکییەی کە هەیبوو کرابوو بە شێخ.

**نینار:** کێ ئەوی کردبوو بەشێخ؟

**ئەدۆنیس:** پیاو ماقوڵان و مەلا و کەسە تێگەیشتووەکانی ئەوێ.

**نینار:** ماوەیەکی هێندە لەمەوبەر نەبوو تۆ کۆپلەیەک شیعری "ابو علاء المعري"[٣] بۆ خوێندمەوە کە داوا لەڕێبوارێک ئەکات سوکتر بەسەر زەویدا بڕوات، بۆ ئەوەی پێبەسەر مێش و مەگەزی سەر زەوییەکەدا نەنێت.

**ئەدۆنیس:** "تۆ کە ئەڕۆیت، سوک هەنگاوبنێ و بە ئەسپایی بڕۆ، چونکە تۆ وا خەریکی ئەو خاکە ئەشێلیت کە بە جەستەی ئینسانەکان چنراوە..."

**نینار:** ئاوها، کەواتە ئەو باسی ئینسان ئەکات. من پێموابوو باس لەئاژەڵ و مێروو بکات.

**ئەدۆنیس:** نەخێر، مەبەستی ئەو ئینسانە.

**نینار:** من لەڕاستیدا وا تێینەگەیشتبووم، چونکە تۆ ئەو کات کە ئەو کۆپلەیەت خوێندەوە لەگەڵ هاورێکانت لە "کیف ریا" لە لوبنان خەریکی نانخواردنی نیوەڕۆبوویت. ئێمە باسی ئاژەڵمان ئەکرد و من وتم ڕقم زۆر لە بەشێکی ئەو نەریتییە دینییە ئەبێتەوە، نموونەی بەقوربانیکردنی مەڕم هێنایەوە لە جەژنی قورباندا، هەروەها ئەوکات باسی ڕقی خۆم کرد لەو ئینسانانەی وڵاتی ـ نامیبیا ـ لە ئەفەریقا کە وەک باس ئەکەن، ئەڵێن ژیانی خۆیان تەرخانکردووە بۆ ڕاوکردن لەناو حەسارەکاندا.

**ئەدۆنیس:** ئەو جۆری ڕاوکردنە چۆنە؟

**نینار:** هەندێک خاوەن سەرمایە لە نامیبیا هەن کە خاوەنی ناوچە کێوییەکانن و سەرنجی زۆر لە ئاژەڵەکانی وەک شێر، زەرافە، کەڵەکێوی، فیل ڕائەکێشن تا بێنە ئەو ناوچانەوەی کە هی ئەوانە بۆئەوەی پارەیان پێ پەیدابکەن، ئەویش بە ڕێگەدان بە ملیاردێرەکان، بەقەبالەی پانزەهەزار دۆلار تا لەو ناوچانەدا ڕاوبکەن. ئەو ڕاوچییە تەممەلانە بەچکەشێرەکان ئەگرن و لە حەسارێکدا دایان ئەنێن، بۆ ئەوەی شێرە دایکەکان مەجبور بکەن بێن بۆ لای بەچکەکانیان. کاتێک کە شێرەکان دێن بۆ ئەوەی بەچکەکانیان ڕزگاربکەن، ڕاوچییەکان چەند مەترێک لەولاتر لەناو جێبەکانیانەوە بەخۆیان و تفەنگە دووربین لەسەر و پێشکەوتووەکانیانەوە دەوەستن، یەک لەدوای یەک چوار پێنج فیشەک ئەنێن بەشێرەکەوە. بەو حاڵەشەوە شێرەدایکەکە هەوڵی ڕزگارکردنی بەچکەکانیان ئەدات. ڕاوچییەکان سەرلەنوێ دەستئەکەنەوە بە تەقەکردن لێی! کوشتنوبڕینێکی سەرتاسەرییە! بەم شێوەیە هەمان شت لەگەڵ فیلەکان و زەرافەکانیشدا ئەکەن.

"هیشام شرابی"[٤] ئەڵێت گەر یەکەمجار ئینسانەکان توانیان دەست لە کوشتنی ئاژەڵەکان هەڵبگرن و نەیانخۆن، ئەوسا ئیتر ئەتوانن باس لە ئینسانییەت بکەن. ئەی وانییە، تۆ ئەڵێی چی؟

من بەشبەحاڵی خۆم ئاژەڵ و درەختم خۆشئەوێت. ئەمەش ڕەنگە پەیوەندی بە بەیروت و

جەنگەوە هەبێت. تا پانزە ساڵیم نەمتوانیوە ئاژەڵ لە نزیکەوە ببینم لە تەلەفزیۆن و سینەمادا نەبێت، ئا، بیرمە جارێک گوێرەکەیەکم بینی کاتێک کە چوین بۆ دێیەک بۆ میوانداری! بەڵام تەنها ئاژەڵێک توانیبێتم لە بەیروت بیبینم، هەر مریشک بووە ئەویش بەسەربڕاوی لای مریشکفرۆشەکان! هەروەها ئەو شەڕە کەڵەشێرانەی کە لە ماڵە دراوسێکانی پشتی ماڵی خۆمانەوە ئەکرا. ئەو خەڵکانە لەسەر زەوییەکی بچکۆلە ئەژیان و لەسەر ئەو خاکە بەخوێن سوورە، ماڵێکی دوو نهۆمی بچوکیان دروست کردبوو. بێگومان بێ بوونی مۆڵەتی خانوو دروستکردن و بەشێوەیەکی زۆر کاتی، چەند ساڵێک بوو لەویادا مابوونەوە. بالکۆنی ژوورەکەی من ڕێک بەرامبەر ئەو پارچە زەویانە بوو. هەموو یەک شەممانێک کەڵەشێرەکانیان ئەهێنایەدەرەوە و خەڵکانی تریش بەخۆیان و کەڵەشێرەکانیانەوە ئەهاتن و دەست ئەکرا بەشەڕەکەڵەشێر. گوێم لەهاوار و قوقەیان بوو بەبێ ئەوەی بتوانم هیچ شتێک بکەم. ئەو کەڵەشێرەی ئەبەزی بە سەروپۆپنەی خوێناوییەوە بەرەو لای خاوەنەکەی ڕایئەکرد، بەڵام خاوەنەکەی کە هەم پارەو هەم ئابڕووی دۆڕاندبوو، ئەو کەڵەشێرە فەقیرەی لەوێدا سەرئەبڕی! هەروەها بێگومان ئەو مەڕانەشم ئەبینی لە ئاهەنگەکاندا سەرئەبڕان. کە بە سەیارە بەلایاندا تێئەپەڕێم ئەمبینین چۆن بەسترابوونەوە و ژمارەیان لەسەر نووسرابوو. لەوێدا خواردنیان ئەدانێ و منداڵانیش یان بەردیان تێئەگرتن، یان دەستیان پیادا ئەهێنان.

من پێموایە بەهۆی ئەو ڕەفتارە وەحشیانەی کە بەرامبەر ئاژەڵان کراوە، شتێک لە ناوەوەمدا شکاوە. هەروەها چاوپۆشیکردن لەو هەموو پشیلانەی کە ئەکران بەژێر سەیارەوە و شەویلاگەیان ئەشکا و چاویشیان تا ئەوکاتە زەقەی ئەهات! هەر هۆی ئەم ڕاستییە تاڵەشە کە تۆ باڵدارێک چییە نابینیت بەئاسمانەوە بفڕێت یان بەسەر درەختێکەوە نیشتبێتەوە، تەنها ئەوکاتانە نەبێت کە بەکوڵاویی لەقاپەکاندان.

بەدرێژایی زستانان، ئەو دەمانەی ئێواران تەقەکردن ڕائەگیرا و پێش ئەوەی سەرلەنوێ گەرمتر دەست پێبکاتەوە و تا نیوەشەو بەردەوام بێت، من لە ماڵە وێرانکراو و چۆڵکراوەکاندا بەئاستەم گوێم لە نوزەنوزێک ئەبوو. سەرەتا بیرم لەوە ئەکردەوە بۆ ئەو دەنگانە ئاوا ئەنوزێنن، بەڵام هەرزوو دواتر تێگەیشتم کەئەوە دەنگی ئەو بەچکە پشیلانەن کە بەدوای دایکەکانیاندا ئەگەڕان ـ ئەو بەچکەپشیلانە زۆر ترساو و برسی بوون، ئەو دەنگانە دەنگی ئەو پشیلانە بوون بەدوای بەچکەکانیاندا ئەگەڕان کە لەناو ئەو تاریکییەدا زنوقیان چوبوو. ئەو جۆرە میاواندن و نوزەنوزکردنانە، هیچ پەیوەندی بەمیاواندنی کاتی زاوزێیانەوە نەبوو. من ئەمویست ئەو پشیلانە بپارێزم و دڵیان بدەمەوە، چونکە ئەمتوانی تێیان بگەم و هەست بەو پەشێوییەیان بکەم. من خۆم پەژارەیی خۆمم هەبوو. ئەترسام بکوژرێم، یان هیچ نا دایک و باوکم بکوژرێن. بۆیە دایکم شەوان لەگەڵم ئەهاتەخوارەوە بۆ ئەوەی خوردنیان بدەمێ، نانی چەور و پەنیریان بدەمێ. هەتائێستاش کە ئەگەڕێمەوە بۆ بەیروت و پشیلەکان لەسەر شەقامەکان ئەبینم، هەمان ترس لە چاویاندا ئەبینمەوە کاتێک کەبە نێوان سەیارەکاندا ئەڕۆن و ئەیانەوێت بەسەر شەقامەکاندا بپەڕنەوە، پشیلەکان زندوقیان چووە. چاوەکانیان پڕن لەنیگەرانی، گوێچکەکانیان بەرەو پشتەوەچووە و هەمیشە سەیری چەپ و ڕاستی خۆیان ئەکەن بۆ ئەوەی زوو پەناگایەکی ئارام بدۆزنەوە. کاتێک کە ئەیانبینم ئەمەوێت بگریم، چونکە ئەتوانم خۆم بخەمە جێی ئەوان و بزانم کە لەسەریاندا چی ئەگوزەرێت. ئەمە ژیان نییە ئەم ئاژەڵانە هەیانە، تا بتوانن بۆخۆیان

ژیان بکەن و ئازادانە بژین.

بەقەد خۆم توندوتیژیم بینیوە. دیارە ئینسانم بینیوە مردووە، هاوڕێم گوللەباران کراوە، کوژراوە یان بۆمبوو و نارنجۆک مردووە، خەڵکی تۆقێنراو و منداڵی بریندارم بینیوە، بەڵام سوپاس بۆ ئەو هاریکاریانەی نێوان خێزانەکان و دراوسێکان لەکاتی جەنگدا، تەنانەت ئەو ڕێبوارە نەناسانەی دەستی یارمەتیان درێژئەکرد بۆ ئەو منداڵانەی کە دایک وباوکیان کوژرابوون یان دیارنەمابوون. منداڵەکان ئەپارێزران و تا ئەوپەڕی تواناش دڵنەوایی ئەکران، من زۆر دوای ئەوە تێگەیشتم کە ئەوە وەهمە ئینسان پێیوابێت لەکاتی جەنگدا ئەتوانێت ئینسانەکان بپارێزێت، دیارە ئەم حاڵەتەش هیچ جیاوازییەکی بۆ پیر و منداڵ نییە.

ئەمە دۆخێکی پڕ لە توندوتیژی وای خولقاند وایکرد زۆر لە منداڵان یاری بەجەنگ بکەن. باوکەکان ئەوەیان بۆ منداڵەکان ڕوون ئەکردەوە کە بۆچی بەرکەوتنی تۆپێک بەسەر سەقفی ماڵێکدا، دەنگێکی ئاوا کاسکەری لێ بەرز ئەبێتەوە، هەروەها منداڵەکانیان هۆشیارئەکردەوە بەوەی کە هەریەک لەو زرمە گەورانەی لەساتی تەقینەوەکان و دوای تەقینەوەکان بەرزئەبووەوە، ئەیتوانی منداڵێک یان گەورەیەک راتەکێنێت و بیدات بەدیواردا، یان مۆبیلەیەک یان پەنجەرەیەک بشکێنێت. ئەو دووکەڵانەشی کە لە هەموو ئەو شتانە هەڵئەستا و ئەو هەوایەی پڕبوو لە گازی تەقینەوەکان زۆر زەحمەتبوو تیایدا هەناسەبدەیت، بەڵام ئەوەی بەهەمیشەیی منی ناڕەحەت ئەکرد پشیلەکان بوون! نازانم چۆن بتوانم ئەمە ڕوون بکەمەوە؟

من ئارەزوو و خوویەکی عاقڵانەم هەبوو بۆ نزیکبوونەوەم لە ئاژەڵ، تا بتوانم ئارامیان بدەمێ و نەهێڵم لەبرساندا بمرن. پشیلەم هەبوون، بەڵام زۆرینەی کات مریشکم هەبوو. کاتێک کە گەورە ئەبوون مەجبوربووم دەستبەرداریان بم، ئەوەش وای لێئەکردم لەداخا نەخۆشبکەوم. ئەمویست بیانندێرم بۆ شوێنێک، بەڵام نەمئەزانی بۆ کوێ، بۆ لای کەسێک "بەڵام نەمئەزانی کێ"، کەسێک کولانەی مریشکی هەبێت و مریشکەکانم بتوانن لەگەڵ مریشکی تردابن! هەمووان درۆیان لەگەڵ ئەکردم کە ئەیانووت ئەیانێرین بۆ لای مریشکی تر و سەریان نابڕین تا خۆیان مردنێکی ئاسایی ئەمرن، بەڵام زۆر باش ئەمزانی کە ژیانی ئەوان لەسەر قاپی ئەوانە کۆتایی دێت کە ئەهاتن و مریشکەکانیان ئەبرد. من هیچ چارەیەکی تریشم نەبوو لەوەزیاتر. بیرمە مریشکێکی بچکۆلەم هەبوو زۆر هۆگریبووم و خۆشمئەویست. پێش ئەوەی کەسێک بێت و بۆخۆی بیبات من نینۆکەکانیم بەبۆیەی نینۆکی سوور بۆیەکرد، بۆ ئەوەی دڵنیابم کە دواتر لە چونمدا بۆ ئەو ماڵانە بتوانم بیناسمەوە! هەروەها من کرمی ئاوریشمم هەبوو! قبوڵکردنی من بۆ مەرگی کرمەئاوریشمیەکان زۆر شتی فێرکردم. بیرمە سەرەتا هەستم زۆر بە ناڕەحەتی کرد، تا ئەوکاتەی کە کرمە ئاوریشمەکانم بینی کە ئەتروکان و گوێم لە کرمەکرمی خواردنی ئەو گەڵا توواندە بوو کە بۆم کڕیبوون.

لەڕاستیدا ئێمە ئەمڕۆ پێویست ناکات هەوڵ بۆ سروشت بدەین تا بژی، چونکە ئێمە دەسەڵاتمان بەسەر سروشتدا هەیە. بۆیە پێویستە بیپارێزین نەک بیشێوێنین. ئەزانم بەو زووانە لەپێناوی پارە و قازانجدا، کارێکی وا ئەکەن کە ئینسان بکەوێتە فرۆشتنی کەوڵی دایک و باوکیشی، بەڵام من هەمیشە هەوڵمداوە گەشبینانە بڕوانم و خاوەنی ئەو ئومێدەبم کە هەموو ئینسانەکان پیاوکوژنین. (گاڵتەئەکەم!).

**ئەدۆنیس:** ڕاستە شتی وا مەترسیدارە، من لەو لایەنەوە لەگەڵتم، بەڵام خۆ ئینسانیش خەریکی کوشتنی یەکترییە! هەڵوێستت بەرامبەر بەئاژەڵ زۆر ڕاستە و منیش هەمان هەڵوێستی تۆم هەیە. من پێموایە ئەبێت ئێمە شەڕی ئەو ئینسانانانە بکەین کە ئاژەڵەکان و سروشت ئازار ئەدەن و ئەشێوێنن، بەڵام تۆ ئەزانیت کە قوربانیکردن شتێکە بەجۆرێک لە جۆرەکان، هەموو مرۆڤایەتی بەشدارە تیایدا. لە ڕابردوودا جوانترین منداڵی کچ کراوە بەقوربانی. هەرچۆنێک بێت ئەبێت ئەو جۆرە عورف و عادەتانە نەهێڵرێت.

**نینار:** وایە. بۆ ئەوەی ئەو نەریتانە نەپارێزرێن و نەهێڵرێت بەردەوام بن.

**ئەدۆنیس:** بێگومان ئەبێت نەهێڵین بەردەوامبن و ئاژەڵان بپارێزرێن، بەڵام هەندێک جار ڕاوکردن باشە بۆئەوەی ئەو جۆری ئاژەڵانە بتوانن بمێننەوە. گەشەکردنی بێ سنووری هەندێک جۆری ئاژەڵ سروشت تێکئەدات، بەڵام ئەبێت هەمیشە سووربین لەسەر ئەوەی کە نابێت ئاژەڵ ئازاربدرێت یان بکوژرێت تەنها لەبەر خۆشی. بەهەرحاڵێک ئەوە نەریتێکی ئیسلامیشە کە ئەبێت ئاژەڵان بپارێزرێن.

**نینار:** جا وایە؟

**ئەدۆنیس:** ئەبو عەلای ئەلمعەری شاعیرێکی "ڤیگیتاریان" سەوزەخۆربووە. لەبەر حورمەت و عەشقی بۆ ئاژەڵ، هیچ گۆشتێکی نەخواردووە.

**نینار:** دینە یەکتاییەکان (یەک خواییەکان)، چۆن سەیری ئاژەڵیان کردووە؟ ئایا واسەیرکراون کە ئەوانە خەلقەندەی خودان و ڕێی بە ئینسانەکان داوە بیانخۆن؟

**ئەدۆنیس:** لەڕاستیدا ڕێگەیان پێدراوە کە ئاژەڵ بەخێوبکەن، بۆئەوەی پێستەکانیان بەکاربهێنن و گۆشتیان بخۆن. تا ئەو ڕادەیەی واتێگەیەنراون ئاژەڵەکان جۆرێکن لەپاداشتی خودا بۆ ئەوان.

**نینار:** هەر لەوکاتی نانخواردنی نیوەڕۆیەی کە بۆم باسکردیت، یەکێک لە هاوڕێکانت وتی دەبێ بەر لە هەرشتێ ئینسان پارێزگاری لەئاژەڵ بکات و واز لەخواردنیان بهێنێت، ئەوسا بۆی هەیەبێت و باس لەمرۆڤایەتی بوونی خۆی بکات.

**ئەدۆنیس:** ئەمەئەو هەڵوێستەیە کە ئەبێت بەرگری لێبکرێت، بەڵام ڕووشئەدات کە ئەمە بەتەواوەتی پیادەنەکرێت. دانیشتوانی سەر زەوی تا بێت زیاد ئەکات و لە دواڕۆژێکی نزیکدا، بەشێکی زۆری بەدەست کەم ئاوی و خواردنەوە ئەناڵێنێت. جیهان لەبەردەمی کێشەیەکی گەورەدایە،. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە لە هەندێک وڵاتدا یاسا هەیە پشتگیری لەم جۆرە بەکارهێنانە ئەکات. سەرچاوە سروشتییەکان تابێت زیاتر و زیاتر بنەبڕئەبن، ئەمەش لەڕاستیدا کێشەیەکی زۆر جدییە.

**نینار:** بۆ تۆ پێتوایە ئەوە هۆی کەمی سەرچاوە سروشتییەکانە وایکردووە کە ئەم کێشانە دروستبن! من پێموانییە، چونکە ئەوە وڵاتە دەوڵەمەندەکان و دەستەڵاتدارە گەورەکانن، جەنگ

بەرپائەکەن بۆ ئەوەی دەسەلاتی خۆیان بەسەر ئەو وڵاتانەدا بسەپێنن کە لاوازترن لەخۆیان و ئەوەی ئەشیانەوێت لێیان بسەنن، ئیتر ئەو شتەی ئەیانەوێت گرنگ نییە ئاو، نەوت، یان سەرچاوە سروشتییەکان بێت. ئەم جۆرە جەنگانە لە سەرتاپای مێژووی مرۆڤایەتیدا هەبووە. ئەمەش پەیوەندی بەوەوە نییە ئایا سەرچاوەکان بەشێئەکەن یان نا. دیارە لەهەندێک حاڵەتدا ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی هەندێک یاسای توونید بێتەئاراوە بۆ پاشەکەوتکردنی وزە. لەحاڵی حازردا زۆر لەوڵاتە گەورەکان بەدەست کەمی ئاوەوە ئەناڵێنن و دزی لە وڵاتە دراوسێکانیان ئەکەن. هەمووان ئەیانەوێت مرۆڤایەتی بژی، بەلام ئەی بۆچی نایانەوێت یاسایەک دەربکەن بۆ ئەوەی پارێزگاری لەمانەوەی وەچەی ئاژەڵەکانیش بکات.

**ئەدۆنیس:** ئاژەڵیش بونەوەریکی زیندووە و ژیانیش لەهەموو ئەو شێوانەیدا کە هەیە ئەبێت بپارێزرێت. لە هەموو جێیەکدا لەو جۆرە ئینسانانە هەن کە موبالەغە بەمەوە ئەکەن. بۆ نموونە هەندێک جۆری ڕووەک ناخۆن، چونکە بەخەیاڵی ئەوان ئەو ڕووەکانە تەنها هەندێک ئاژەڵی تایبەت ئەیانخۆن. بەدەرلەوەش من لە شوێنێکدا خوێندمەوە گوایە هەندێک رووەک هەیە، هەندێک پەیوەندی تایبەتی لەگەڵ ئەو کەسە یان ئەو کەسانەدا هەیە کە ئەیانڕوێنن و پەروەردەیان ئەکەن. ڕووەک خۆی لەگەڵ ئەو دەستەدا ڕائەهێنێت کەئاوی ئەدات. هەندێک ڕووەکیش هەن دووچاری پەژموردەیی ئەبن و وردەوردە وشک ئەبن، گەربێت و دەستێکی تر بێت و ئاویان بدات.

**نینار:** من تەواو باوەڕم بەمە هەیە! کاتێک پێویستبکات بۆ چەند ڕۆژێک بچم بۆ شوێنێک، پیش ئەوە بەچەند ڕۆژێک بە ڕووەکەکانی ماڵەکەم ئەڵێم، بەلام ئەگەر پەلەمبێت ئەوا بەتەنها لەگەڵ درەختی مۆزەکەمدا قسەئەکەم. پێی ئەڵێم کە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک سەفەر ئەکەم. داری مۆزەکەش ڕائەسپێرم لەبری من ئاگای لە ڕووەکەکانی تری ماڵەکەبێت! چەند ساڵێک لەوەوبەر لە کەناڵی "دیسکەڤەری" پیشانیدا، گەر درەختێک دووچاری زیان لێکەوتن ببێتەوە ئەوا سیگناڵێکی تەنگانە بۆ درەختەکانی تر ئەنێرێت!

**ئەدۆنیس:** هەندێک ڕووەکی گۆشتخۆریش هەیە! ئەم جۆرە ڕووەکانە خۆیان ئەکەنەوە و چاوەڕوانی نێچیرێک ئەبن، بۆ نموونە پەپوولەیەک گەر نزیکیان بێتەوە. هەر کە نێچیرەکە بنیشێتەوە بەسەریانەوە خێرا قووتی ئەیەن! بەلام پرسیارەکە ئەوەیە ئایە ئەم شێوە مردنەش جۆرێک نییە لەژیان خۆی. مردنی لوشدان یان کوشتن بەشێکن لەپرۆسەی سروشت، بەلام سەرباری هەموو ئەمانەش من ئەڵێم ئەبێت ئینسان هەمیشە هەموو شتێک بکات بۆ ئەوەی خۆی بەدوور بگرێت لە کوشتنی بوونەوەرێک کە ژیانی تێدایە.

**نینار:** منیش پێموایە. ئەگەر ئینسان پەپولەیەک بەبێ هیچ هۆیەک بکوژێت، بی هیچ مەرامێک تەنها هەر بۆخۆشی بیکوژیت، ئەوا ئەگەری ئەوە لەسەر خۆی ئەخاتە سەرپشت کە بتوانێت ئینسانێکیش تەنها هەر بۆ خۆشی بکوژێت! بەلام دیارە پێچەوانەی ئەمەش ڕاست نییە کەگوایە: ئەگەر ئینسان میهرەبانبێت بەرامبەر ئاژەڵ، ئەوا بەهەمان شێوەش بەرامبەر ئینسانەکانیش میهرەبان ئەبێت.

**نینار:** پەیوەندی تۆ لەگەڵ برا و خوشکەکانتا چۆن بوو؟ ئایا پەیوەندیت لەگەڵیاندا ئاسان بوو یاخود پێتوایە بەهۆی شیعرەکانتەوە بۆشاییەک لەنێوانتاندا دروستبووە؟ ئایە ئەو بۆشاییە بۆ ئەوان بۆتە هۆی دروستبوونی مەودایەک لەنێوانتاندا؟

**ئەدۆنیس:** ئەبێت من جیاوازییەک لەنێوان براکانم و خوشکەکانم، هەروەها ئامۆزاکانم و خێزانەکەمدا دابنێم. من خزمێکی زۆرم هەیە کە قەت نەمبینیوون و نایانناسم. بۆیە پەیوەندی من بەوانەوە پەیوەندییەکی ڕەسمیانەیە، هەروەک پەیوەندی من بەهەموو ئەو کەسانەی ترەوە کە ئەیانناسم. پەیوەندی و بینینی من و خوشک و براکانیشم زۆر لەوە جیاوازتر نییە. من لەگەڵیاندا ژیاوم و پەیوەندییەکی گەرموگوڕ و پڕ لە خۆشەویستی بەیەکمان ئەبەستێتەوە. هەرکاتێکیش هەستم بە ساردییەک کردبێت لەگەڵیاندا و زانیبێتم پێویستی بە چاککردنەوە هەیە کردوومە، چونکە ئەوان بەشێکن لەژیانی من. ئەگەرچی هیچ پەیوەندییەکی "ڕۆشنبیری"یشمان لەگەڵ یەکتریدا نییە و حەزیش بە شیعرەکانم ناکەن، بەڵام من بەرامبەریان بەرپرسیارم لەبەر هیچ نا لەبەر ئەو ڕاستییە سادەیەی کە دایکمان یەکە. من هەوڵئەدەم بەشێک لەخۆم و ئەو توانایەی کە هەمە پێیان ببەخشم، تا یارمەتیان بدەم ڕوبەڕووی ژیانی خۆیان ببنەوە و فێرببن. بۆ دایک و باوکم و کەسە نزیکەکانیشم بەهەمان شێوە.

**نینار:** ئەوەی پەیوەندی بەمنەوە هەبووبێت لەم لایەنەوە، ئەوە بوو کە زۆر زەحمەتبوو بۆ من بتوانم لەو خانەوادەیەدا جێی خۆم بکەمەوە. ماوەیەک هەوڵمدا خۆم بگونجێنم. ناچاربووم هەندێک شت قبوڵبکەم، دەنا نەئەکرا لەگەڵیان هەڵکەم. دەبوو هەمیشە ئاگام لەخۆم بێت نەبا یەکێکیان بریندار بکەم. تا ئەمڕۆش هەستەکەم کە ناتوانم هەموو شتێکیان لەگەڵدا بەشبکەم. دەبێت ئەم باجەش بدەم بەهۆی ئەو جۆرە دوورەپەرێزییەی کەوتۆتە نێوانمانەوە. بەڵام لەلایەکی ترەوە هاوڕێکانم زۆر دەستگیرۆیان کردم. هەندێک لە هاوڕێکانم بەشێکی ڕاستەقینەی خێزانەکەمن، ئەو کەسانەی کە خۆم هەڵمبژاردوون و حەزم لێیانە و ئاگام لێیانە، دیارە هەندێک جاریش هەڵئەکەوێت کە دەستبەرداریان ئەبم.

**ئەدۆنیس:** ئەمە لەبەر ئەوەیە کە تۆ نایانناسیت! تۆ هەرگیز لەگەڵیاندا نەژیاویت و زوو زووش نەتبینیوون. پێموایە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا، ئەو تێڕوانینەت لەسەریان ئەگۆڕێت. تا زیاتر بژیت، زیاتر هەستئەکەیت شتێکت نوقسانە: وڵات، دێ، باوانت. ئەوان بەشێکن لە تۆ. بەڵام لەم هەنوکەیەدا و لەبەر ئەوەی بەم شێوەیە ئەژیت و پێشتریش بەشێوەیەکی تر ژیاویت، ژیان مەودایەکی لە نێوان تۆ و ئەواندا دروستکردووە، بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا ئەم بۆچوونانەت گۆڕانی بەسەردا دێت.

**نینار:** مەبەستت ئەوەیە من ئیتر هیچ چارەیەکم نییە؟چونکە ئەمە هەر خۆی وایە و ناکرێت بەجۆرێکی جیاوازتر بێت؟

**ئەدۆنیس:** من پێموایە لە ڕوویەکەوە باشە کە تۆ ئەو ئینسانانانە لەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەدا ببینیت، مەبەستم ئەوەیە بڵێم لەم پەیوەندییەیدا کە هەریەکەمان بەشێکی پێکدێنین. هەربۆیەشە زۆر گرنگە بیان ناسین، بزانین چۆن بیرئەکەنەوە، چۆن ئەژین، هەروەها بیانبینین.

**نینار:** ڕاستە، بۆ نا، بەڵام تەنها لەو حاڵەتەدا کە ئەو ژیانی لادێنشینییەی تێیدا ژیاون لەدەستیان نەدابێت! ژینگەکەیان نەبووبێتە شارێکی کۆنکرێتی بێدرەخت! سەرباری ئەمەش من لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا نیم کە ئینسان ئەبێت هەمیشە بگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتووە، چونکە من پێموایە ئینسان هەمیشە وەک ئینسان لە گەشەکردندایە و دنیای تایبەت بەخۆی دروست ئەکات.

**ئەدۆنیس:** کاتێک من ئەڵێم گرنگە ئینسان بگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی یەکەمی کە لێوەی هاتووە، مەبەستم ئەوەنییە هەر ئەبێت لەوێ بمێنێتەوە. پێش لەسەر ئەوە داناگرم کە ئینسان هەر ئەبێت بگەڕێتەوە بۆ ئەوێ و بچێتەوە ناو ئەو ژیانەی ئەوێ. بەپێچەوانەوە پێویستە ئینسان هەمیشە دنیای نوێ بنیاتبنێت، لای کەم بەردەوام ئەو قەناعەتەی هەبێت ئەتوانێت ئەو بەشێک بێت لە دروستکەری دنیا. ئەو گەڕانەوەیەی من باسی ئەکەم ئەتوانێت یارمەتیمان بدات بۆ تێگەیشتن، لەو مەودایەی نێوان ئێمە و ئەو شوێنەی لێوەی هاتووین. هەر بەو جۆرەش ئەتوانێت یاریدەدەرێکی گەورەبێت کاتێک ئەمانەوێت خۆمان بناسین. لەهەمان کاتیشدا ئەو "گەڕانەوەیە" ئەبێتە کەرەستەیەک بۆ بنیاتنانی دنیایەکی نوێ، وەک ئەوەی جۆرێک "گەڕانەوە"بێت بەرەو دواڕۆژ!

**نینار:** من ئەمڕۆ بێجگە لە تۆ خێزانێکی ترم هەیە کە لە ئەرواد و دایکم پێکهاتوون، ئێستا هاوڕێ زۆر نزیکەکانم بوونەتە خێزانی من.

**ئەدۆنیس:** من پێموانییە هاوڕێکانت بتوانن قەرەبووی خێزانی خۆت بۆ بکەنەوە، بەڵام کاتێک ئەوان ئەتوانن وەک خێزانی تۆیان لێبێت کە هاودەم و هاوڕێ و دۆستت بن. تۆ حەز بەو شتانە ئەکەیت کە ئەوان ئەیکەن، هەر بەو هۆیەشەوەیە پەیوەندییەکی گیانی و ڕۆشنبیریت لەگەڵیان دروستکردووە، بەڵام هەندێک شت هەن کە گرێدراون بەجەستە و مێژوو خوێنەوە و هیچ پەیوەندییەکیان بەهاوڕێیەتییەوە نییە. شتێک هەیە کە تۆ ناتوانیت لەڕێی فێربوونەوە بیزانیت، بەڵکە دەبێت تۆ خۆبەخۆی خۆت تێیبگەیت.

**نینار:** ئا ڕەنگەوابێت، بەڵام لە ئێستادا من پێموایە هاوڕێیەتی ئەلتەرناتیڤێکی ئەو شتە بێت کە تۆ باسی ئەکەیت. ئاخر من چۆن بتوانم هەستی هاوبەشیم هەبێت لەگەڵ ئەو ئینسانانەدا کە هیچ شتێک لەنێوانماندا نییە پێکمانەوە ببەستێت، ئیتر ئەو شتە قەناعەتبێت یاخود لەیەکچوونی شێوەی ژیان بێت؟

**ئەدۆنیس:** ئەمە پەیوەندی بەو شتانەوە نییە کە باسیان ئەکەیت. خەڵک هەن هەمان قەناعەتی تۆیان هەیە، بەڵام سەرباری ئەوەش حەزناکەن ژیانێک بژین کە تۆ هەتە. من زۆر خەڵک ئەناسم هەمان ئەو قەناعەتانەی منیان هەیە، بەڵام بۆ نموونە من هەرگیز ناتوانم ژیانیک بژیم کە ئەوان هەیانە.

**نینار:** من تێئەگەم مەبەستت چییە، بۆ نموونە تۆ ناتەوێت خواردن لەگەڵ کەسانێکدا بخۆیت لەبەرئەوەی "سەنگینن" یاخود هاویارنین لەگەڵت. کاتێک تۆ هەمان قەناعەتی کەسێکی ترت هەبێت، نیشانەی ئەوەنییە کە تۆ لە هەموو شتێکدا لەگەڵیدا هاویاریت. پێموایە ئەو رێکەوتنە شتی زۆر زیاتری لەوەئەوێت. من پێموانییە لەگەڵ هەموو کەسێکدا بتوانیت ببیت بەهاوڕێ. کاتێک تۆ بڕیار ئەدەیت لەگەڵ کەسێکدا ببیت بەهاوڕێ کە بزانیت زۆر شتی هاوبەشتان لەگەڵ یەکتریدا هەیە. بۆ نموونە لەگەڵ ئەوانەدا ئەتوانیت ببیت بەهاوڕێ کە لەڕووی جەستەییەوە تەواو ئارامبیت لەگەڵیاندا، ئەوانەی کە ئەتوانیت بیروباوەڕتیان لەگەڵدا بگۆڕیتەوە، ئەوانەی هەمان پرنسیپی ژیانیان هەیە کەتۆ هەتە، بتوانیت لەگەڵیاندا ئاهەنگ سازبکەیت و هەست بە دۆستایەتیان بکەیت. ئەمە ئەو پرسیارەیە کە سەبارەت بەو تێکەڵبوونە دەکرێت.

**ئەدۆنیس:** تۆ خانەوادەکەی خۆت بۆ نموونە لەلادێ وەرگرە. ئەوان تەمسیلی بەشێکی گەورەی شێوە ژیانێک ئەکەن کە تۆ پێویستە تێیبگەیت، ئەمەش ئەزموونێکی ژیانە کە دەکرێت بۆ تۆ زۆر دەوڵەمەندبێت.

**نینار:** من بەهەموو شێوەیەک لەمەدا لەگەڵتام؟

**ئەدۆنیس:** ئەم خێزانە، لە حاڵەتی تۆدا دایک و باوکت، بەشێک لە ژیانی تۆ پیکدێنن کە دەکرێت تۆ دەوڵەمەند بکەن، سەرباری بایەخ نەدان بەو ڕاستییە کە ئەوان بەڕێکەوت بوونەتە دایک وباوکی تۆ. هیچ کەسێکی تر ناتوانێت جگە لەوان ئەو جۆرە هەستەت پێببەخشێت. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە تۆ ئەبێت هەوڵ بدەیت ئەوان بناسیت بۆ ئەوەی خۆت باشتر بناسیت. تۆ هەرگیز ناتوانی لەو مەودایە بگەیت کە تۆ لەوان جیائەکاتەوە، هەروەها لەو پشتوێنەش بگەیت کە تۆ لەوان نزیک ئەکاتەوە، ئەگەر لەڕاستیدا تۆ نەتەوێت ئەوان بناسیت.

**نینار:** وایە من ئەمەوێت خۆم بەئەندامەکانی خێزانەکەمەوە ببەستمەوە: هەندێک لە ئامۆزاکانم و کچ و کوڕەکانیان کە لە دەرەوەی وڵات ئەخوێنن وەک: مەروان، مەدا و ئەلیدا. ئەوانیش ئەو ئازاری دورکەوتنەوەیە لە هاورێکانیان و دووری لەوڵات و کلتوری خۆیان چەشتووە. من هەست بەنزیکییان ئەکەم، چونکە منیش وەک ئەوانم بەسەرهاتووە.

**ئەدۆنیس:** وایە، بەڵام تۆ ئەمە لەڕووی هەستیاری خۆت و هەڵوێستی خۆتەوە سەیرئەکەیت. تۆ بۆیە لێیان تێئەگەیت، چونکە ئەوانیش وەکو تۆ وان.

**نینار:** بێشک.

**ئەدۆنیس:** بەڵام ئەمە هەمیشە وانییە. ئەمە پرسیاری ئەو پێکەوەبوونە سەرپێییەیە، نەک پێکەوەبوونێکی لەدڵەوە هەڵقوڵاو. پێویستە ئینسان شتەکان لە ڕوویەکی قوڵترەوە ببینێت. تۆ ئەو شوێنەت بەجێهێشتووە کە لێوەی هاتوویت و سەرقاڵی ئەوەیت شتێکی تایبەت لە دەرەوەی ئەوەوە دروستبکەیت، بەڵام ئەوان سەرقاڵی دروستکردنی شتێکی ترن لە دەرەوەی هەمان ئەو شوێنەوە، لەگەڵ ئەوەی کە ئێوە جیاوازیشن لەیەکتری.

**نینار:** باشە، بەڵام کاتێک کە تۆ ئەڵێیت ئێمە جیاوازین سەرباری ئەوەی هەموومان یەک ئەزموونی ژیان و پێکەوەیشمان هەیە، ئەی تۆ چی بەو ئینسانانە ئەڵێیت کە وەک من وان و هیچ ئەزمونێکی ژیان و پێکەوەییان لەگەڵ یەکتریدا نەبووە؟

**ئەدۆنیس:** ئەو ئەزموونی ژیانە هاوبەشەی کە هەتانە تۆ بۆلای ئەوان ڕائەکێشێت، چونکە دڵنیات ئەکاتەوە لەخۆت و ئەو هەستەشت تیادروست ئەکات کە ئەوان لەتۆ ئەچن.

**نینار:** بێگومان، وایە.

**ئەدۆنیس:** ئەوانیش وەک تۆ وان. ئەوانیش ئەوێیان بەجێهێشتووە، بەڵام بۆ هەمیشەنا. ڕۆژێک دێت ئەوان ئەگەڕێنەوە، ئەوکاتە چی ڕووئەدات؟

**نینار:** ئەو ئەزموونی ژیانەی کە پێکەوە هەمانبووە ئەمێنێتەوە.

**ئەدۆنیس:** بەهەرحاڵ ئەوان ئەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی لەوڵاتی خۆیان بژین، ئەوکاتە تۆ چی ئەکەیت؟

**نینار:** شتێک هەیە کە تۆ نابێت بیرت بچێت. کاتێک ئینسان سەفەر ئەکات یان لە دەرەوەی وڵات ئەژی گۆڕانی بەسەردا دێت، لایەنی کەم ئێمەومانان کە ئارەزووی ئەوەمان هەیە بگۆڕێین و باشیش درک بەو گۆڕانە ئەکەین. پرسیار ئەکەین، شتی نوێ ئەبینین، ئەزمونی نوێ پەیدائەکەین، گەورەئەبین و ئەگۆڕێین. من تائێستا ئاوا ژیاوم. ڕەنگە ئەم حاڵەتە جیاوازبێت کاتێک کە حەڤدەساڵم، بەڵام هەستئەکەم بەردەوام ئەزمونی نوێ فێرئەبم و هەروەها درکیشم بەوەکردووە کە ئەو شتانەی تا ئێستا بەخشیومن گرنگبوون. ئەوەی لە فەرەنسا ئەزموونم کردووە ـ دیارە لە شوێنێکی تریش بوایە هەر ئەمتوانی ئاوا جیاواز ئەزموونی بکەم ـ کە ئاوا وەک ئێستا زۆر کاریگەربێت. من بووم بە کەسێکی تر ـ ڕەنگیشە هەر هەمان کەسیش بم، بەڵام زۆر پشودرێژترم و ئارەزوویەکی زۆریشم هەیە بۆ حەزکردن لەخواردنی خۆش.

تۆ ئەتەوێت من لەگەڵ کەسانی خێزانەکەمدا باسی چی بکەم کە هەر زۆر کەم ئەیانبینم؟ من ئەتوانم گوێیان لیبگرم، بەڵام هەر زوو هەست بەتەنهایی ئەکەم لەگەڵیاندا. لادێ شتێک بوو زۆر تازەبوو بۆ من، زۆر نوێ و سەیروسەمەرەش بوو لەهەمان کاتدا. هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا هەستم زۆر بەنزیکی سروشت و ئاژەڵ و ڕووەکەکانی ئەوێ کرد. ئەگەرچی سەبارەت بەمە قسەم لەگەڵ کردن. سەرباری ئەوەش هەر زوو هەستم بە سنوورێک کرد، ئەوەش سنووری ئەوان بوو لەبەردەم مندا وەک هەمان ئەو سنوورەی من بۆ ئەوان. بۆ نموونە من هەرگیز باسی خۆمم لەلای ئەوان نەکردووە، تەنانەت باسی شێوە تێگەیشتنی خۆشم نەکردووە لەسەر ژیان، هەروەها باسی ئاژەڵ و خۆشەویستی و تەنانەت شتە گشتییەکانیشم لەلا نەکردوون.

**ئەدۆنیس:** ئایە پێتوایە ئەوە گرنگ بێت؟ کە باسی خۆت لای ئەوان بکەیت؟

**نینار:** بێگومان. دەنا بەتەواوەتی هەست بەتەنهایی ئەکەم.

**ئەدۆنیس:** من بۆخۆم زۆر تێکەڵ بەبراو خوشکەکانم نابم. ئەوان شێوە بیرکردنەوەی خۆیان هەیە و منیش هی خۆم.

**نینار:** وایە. بەتەواوەتی ئەمە ئەو شتەبوو کە من ئەمویست بیڵێم! لە بیرتنەچێت تۆ زۆرکەم باسی خۆت ئەکەیت، بەڵکە هەر باسی سیاسەت و شیعر ئەکەیت. تۆ زۆر لەبارەی خۆتەوە نادوێیت، ڕەنگە هۆی ئەوەبێت کە هەرچیت هەیە بە شیعرەکانت ئەیانڵێیت، ڕەنگیشە هیچ پێویستییەکت بەوەنەبێت کە بیڵێیت. من کە سەیرت ئەکەم هەست بەبوونی هەیبەتێک ئەکەم تیاتدا، ئامادەبوونێکە کە بێدەنگی ئەدات بەشوێن. تۆ پێویست ناکات یەک وشە چییە بڵێیت. لایەنی کەم ئەوکاتانە نا کە ئەتەوێت شیعرەکانت بخوێنیتەوە. تۆ لەوییایت و ئەمەش بۆخۆی بەسە!

ئەوەتا خەڵکانی دێ دێن بۆلات، سەردانت ئەکەن. جار جارە تۆ کۆپلەیەک شیعریان بۆ ئەخوێنیتەوە یان سەرنجێکی خۆتیان پێئەڵێیت، هەر ئەمەندە بۆخۆی بەسە و کاریگەری خۆی هەیە. سیحری ئامادەیی تۆ و لایەنی سەرنجڕاکێشانت بەشەکەی تر تەواو ئەکات. تۆ حاڵەتێکی دانسقەیت. بەڵام بۆ من بەهەمان ئەو شێوەیەی ئەوان نیت.

**ئەدۆنیس:** ئەوەش لەگەڵ کاتدا خۆی دێت.

**نینار:** ڕەنگەوابێت. ڕەنگە بایەخدانەکانی منیش گۆڕانی بەسەردابێت.

**ئەدۆنیس:** من پێموایە هەر ئێستا گۆڕانی بەسەردا هاتووە، چونکە تۆ ناتوانیت حەز بەژیانی ڕۆژێکی ناو لادێ بکەیت.

**نینار:** من حەزم لەلادێیە. بەڵام ئەمە ئەوە نییە کە من باسی ئەکەم.

**ئەدۆنیس:** ئەگەر لەژێر درەختەکاندا دابنیشیت و بتەوێت دیقەتی سروشت بدەیت بەلایەنی کەمەوە سێ ڕۆژێک ئەخایەنێت تا وردەوردە باڵدارەکان ئەبینیت، تێئەگەیت کە چۆن هێلانەکانیان دروست ئەکەن، گوێت لە ورشەی با ئەبێت، ئاسمان و ئەستێرەکان ئەبینیت کە ئەدرەوشێنەوە. ئەبینیت چۆن درەختەکان لەپاڵ یەکدا گەورە ئەبن، بەبێ ئەوەی لەیەک بچن. هەندێکیان چڵ دەرئەکەن، هەندێکیان ململانێ ئەکەن. ئەبینیت درەختێک ئاوی درەختیکی تر ئەخواتەوە کە پێویستی بە ئاوە. ئەوان پێکەوە ئەژین و وێنەیەکی سادەی کۆمەڵگەی ئێمە پیشان ئەدەن. ئەوانیش وەک ئینسانەکان وان کە لەبەردەم مێزێکی ڕازاوەدا دانیشتوون و ئەو خواردنانە تێئەکەن کە ئەیانەوێت. وات لێدێت کە هەست بەهێمنی سروشت و شەو بکەیت. ئەو تەنهاییە بۆ لای سروشت و زەوی و گەردوونت کێش ئەکات. ئەمە زۆر لەوەزیاترە کە شار ئەیبەخشێت. شار لەناو ڕەحمی پیشەسازیدا ئەژی نەک لەناو سروشتدا. بەڵام مرۆڤ پێویستی بەسروشتە. منیش کە یەکەمجار چوومە شاری گەورەوە هەمان هەستی تۆم هەبوو، تورەئەبووم بەوەی کە ئەبێت بگەڕێمەوە بۆ لادێ. پێموابوو ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ لادێ وەکو ئەوە وایە مەجبوربکرێم سەردانی گۆڕێک بکەم! بەڵام لەگەڵ کاتدا ئەو هەستەم پێچەوانە کەوتەوە. ئێستا کەشارێکی گەورە بەجێدێڵم و ئەگەڕێمەوە ناو سروشت، هەست ئەکەم تازە لە سەردانی گۆڕێک گەڕاومەتەوە.

## چەند دەقەیەک دوای ئەوە

**نینار:** تۆ زیاتر باسی پەیوەندی خۆت و خوشک و براکانتم بۆ بکە. ئایا ئەوان هیچ ئیرەییت پێنابەن؟ ئەی تۆ ئیرەیی بەوان نابەیت؟ قەت شەڕ ئەکەن لەگەڵ یەکتریدا؟ تۆ چۆن لەگەڵیان هەڵسوکەوت ئەکەیت؟ تۆ وەک سەری گەورەی خێزانەکە ڕەفتارئەکەیت یان وەک منداڵێکی بەناز؟
**ئەدۆنیس:** هەم واش و هەم واش؟

**نینار:** ئەوکات چیت ئەکرد؟ لەکێڵگەدا کارت ئەکرد؟ نەنکم ئەیووت کە مەزاجێکی توڕە و تڕۆت هەبووە، هەر لەخۆتەوە هەڵچویت و دەهریبوویت. هەروا لەختوخوڕایی بنچکەکانت لە ڕەگوڕیشەوە هەڵکێشاوە.
**ئەدۆنیس:** ئۆی، من هیچ شتێکی ئەو سەروەختەم بیرنەماوە.

**نینار:** ئایا ئەتوانیت شتێک سەبارەت بەساڵانی هەژاری خۆتم باس بکەیت؟ من ئەزانم کە تۆ تاڵاوی ئەو ڕۆژانەت زۆر چەشتووە و پەژارەیی ئەو ڕۆژانەشت بۆ ئێمە باسکردووە. لەبیرمە کە تازە ئەبوومە یانزە و دوانزەساڵ بەوە منت ئەترساند کە ئەتووت گەر بهاتایە و کارم نەکردایە ئەوا ڕیسکی ئەوە هەبوو لە کۆتاییدا بکەومە سەر جادە و هیچ کەسێکیشت نەبووە بتوانێت یارمەتیم بدات: نە باوک و دایکم، نە خوشکەکانم، تەنانەت هاورێکانیشم. تا ئەمڕۆش من ئەو دڵەلەرزین و نائارامییە ئەژیم. بێگومان تا ئێستاش هەرگیز ئەو هەستکردنانە نەیانتوانی ببنە یارمەتیدەر بۆ من. بۆ نموونە هەرگیز وایان لێنەکردووم کە وەک شێتێک دەستبکەم بەکار، بۆ ئەوەی پارە پەیدابکەم یاخود بۆ ئەوەی خۆم لە کێشەکانی ژیان بپارێزم. ئەمانە بەجۆرێک لە جۆرەکان ئەو هەستە پاکانەبوون، بەڵام لەهەمانکاتیشدا پەکخەربوون. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەو ڕێگایەی من هەڵمبژارد هەرگیز گەرەنتی ئەوەی نەدامێ ئاسودەیی مادیی و ئارامیم پێبەخشێت.
کەوایە ئێستا بۆم باسکە- ڕەنگە تەنها هەر ئەم جارەش بێت باسی بکەیت، زۆر بەوردی باسی ئەو پەژارەییەی خۆتم بۆ بکە کە هەرگیز نەتوانی ڕزگارت بێت لەدەستی.
**ئەدۆنیس:** بۆ من زۆر زەحمەتە باسی ئەوەبکەم. ئەوەشی کە پێشتر باسمکردووە بۆتە بناغەیەک بۆ ئەزموونەکانی ژیانی خۆم.

**نینار:** پێتوانییە ژیان لە دەرەوەی وڵات شانسێکبێت کە ئینسان دەستی ئەکەوێت؟ سەرباری هەموو دەردەسەرییەکانی خۆی: هەستکردنێکی قوڵ بەتانهایی، بیرکردنی ئاسوودەی منداڵی، هەروەها دوای لەدەستدانی هەموو ئەو شتانەی کە ڕۆژانێک سادە و لەبەرچاوبوون. کێشمەکێش و دواتر چاوکردنەوە لە دنیایەکی تر و زمانێکی نوێی تردا، لە کلتورێکی جیاوازتردا و لەگەڵ دەموچاوی تازەتردا. من پێموایە کە ئەمە شانسێکە بۆ ئینسان گەربێت و تێیبگات و تاقیبکاتەوە. پێموایە لەمە زەحمەتر ئەوەیە هەست بەوەبکەیت کە لەوڵاتەکەی خۆت و لەناو زمانەکەی خۆتدا پەناهەندەیت،

پێموایە ئەمەیان ڕەنگە ببێتە هۆی خۆکوژی یان نەخۆشی تێکچوونی هەستەکان.

**ئەدۆنیس:** تۆ ڕاستئەکەیت مەنفا زۆر بەسود و بنیاتنەرە. هونەرمەندان، بیریاران، شاعیران، هەموو ئەوانەی شتێکیان هەیە بیڵێن، لەکاتی پێویستدا شتێکی نوێیان بنیاتناوە، هەمیشە ئەوانە لەناو جۆرێک لە جۆرەکانی مەنفادا ژیاون. ئەوانە لە کۆمەڵگەی خۆیان و زمانی دایکی خۆیاندا پەناهەندەبوون. بۆ ئەوەی داهێنەربیت ئەبێت بەردەوام هەوڵبدەیت لە زمان و ڕەنگدا بەرە و پێشەوە بڕۆیت. لەم گۆشەنیگایەوە داهێنان پەناهەندەبوونێکە بۆخۆی. ئەوەی داهێنان ئەکات هەمیشە لە مەنفادا خۆی ئەدۆزێتەوە. هەرلەبەر ئەوەشە ئەوانەی داهێنەرن، هەرگیز ناتوانن لەدەست پەناهەندەیی خۆیان ڕزگاریان بێت. ئەوانە پەناهەندەیی لەناویاندایە. دیارە ئەمە بۆ هەندێک توێژی تری ناو کۆمەڵگە جیاوازە: بۆ نموونە بۆ کرێکارێکی سوری یان لوبنانی، یان بۆ بازرگانێک کە چووەتە ئەمەریکا. ئەو ئەتوانێت بیست تا سی ساڵ لە دووری دێکەی خۆی بژی، بەڵام بەردەوامیش خەون بە گەڕانەوەوە ئەبینێت بۆ وڵاتەکەی خۆی. ئەو هەرگیز ڕێ بەخۆی نادات ئاوێتەی ئەو کۆمەڵگەیە بێت کە ئەوی گرتۆتە خۆی.

**نینار:** وایە، ڕەنگە ئەو تەنانەت بتوانێت سوریایەک یان لوبنانێک لەسەر خاکی ئەمەریکا بۆخۆی دروستبکات، یان هەرچ وڵاتێکی تر.

**ئەدۆنیس:** بێگومان. هەر لەبەر ئەمەشە کە مەنفا چیتر ئەو گرنگییەی نییە. ئەوەی ڕقی لە "مەنفا"یە ئینسانێکە گرنگ نییە کە ژن بێت یان پیاو ئەبوو نەهاتایە بۆ مەنفا. هەستکردن بەوەی کە پەناهەندەیت هەستێکی زۆر قورسە و هەموو کەس نییەتی، تەنانەت وەک هەر هەستێکی جیای ئاسایی تریش نییە.

**نینار:** بەتایبەت لەحاڵێکدا گەر ئەو هەستە پەیوەندی بە وڵات، یان بە زمان و جەستەی خۆتەوەبێت. کەوایە تۆ ئێستا لەکوێی سوورگوونبوونی خۆتدایت؟

**ئەدۆنیس:** بەدرێژایی ژیانم من ئەو هەستەم هەبووە بەوەی کە ئەو ڕێگەیەی من هەڵمبژاردووە ڕێگای مەنفایە. هەر لەو کاتەوەی کە لە سوریا بووم هەستم ئەکرد پەناهەندەم: من لەگەڵ دێکەمدا هەستم بەمەنفی بوون ئەکرد، هەروەها لەگەڵ کۆمەڵگە و ئەدەب و ساتەکانی بیرکردنەوەدا. من هەمیشە چوومەتە پەراوێزەوە نەک چوبێتمە ناو چەقەوە، بەڵکە لە پەراوێزدابووم، هەر لەبەر ئەمەشە توانیوومە شتێک بکەم جیاوازبێت. بەهەمانشێوە ئەمە پەیوەندی بەچۆنییەتی جوڵەی فیزیکی منەوە هەبووە: لە دێوە بۆ شار، لە شارەوە بۆ پایتەخت، لە شامەوە بۆ بەیروت. تەنانەت تائەوەی کە لە هەرێمێکی لوبنانەوە ئەچووم بۆ هەرێمێکی تر، لەمماڵەوە بۆ ئەو ماڵ. سەرتاپای ژیانی من سەفەرێکی درێژە لەم مەنفاوە بۆ ئەو مەنفا. هەر ئەم مەنفایەش ئەم زمانەی منی دروستکردووە کە زمانی عەرەبییە. من خۆم لەمەنفای ئەم دورگەی زمانی عەرەبییەدا دۆزیوەتەوە کە لەناو جیهاندایە.

**نینار:** ئەی بەرەو کوێ ئەڕۆیت؟

**ئەدۆنیس:** بەرەو ئەو شوێنەی کە بتوانم شتێکی تر بکەم. بەرەو پێکەوەگرێدانی ئەو پەیوەندییانەی کە یارمەتیم ئەدەن شتێکی جیاوازبکەم: شتێک باو نەبێت، شتێک کە بەپێچەوانەی لافاوەوە بڕوات.

## پەراوێزەکان:

١-شوکری القوتلی: لەدایکبووی ساڵی (١٨٩١ ـ ١٩٦٧) یەکەم سەرۆکی کۆماری سوریابوو لەدوای سەربەخۆی کە کۆتایی بەدەسەڵاتی ئینتیدابی فەرەنسا (١٩٤٣ ـ ١٩٤٩) هێنا کرابوو بەسەرۆک. لەساڵی ١٩٥٥ دا هەڵبژێرا و تا ساڵی ١٩٥٨ بەسەرۆک کۆماری مایەوە.

٢-جەبلی: شارێکی بچکۆلەیە لەسەر کەنار دەریای سوریایە، نزیکترین شارۆچکەیە لەدێکەی ئەدۆنیسەوە.

٣-ابو علاء المعري: (٩٧٣ ـ ١٠٥٧) شاعیرێکی سورییە و خەڵکی شاری "المرە"یە نزیک بە حەڵەب، لە چوارساڵییەوە کوێربووە، بەوە ناسراوە کە ڕەخنەی لەدیین گرتووە. من ئەو دێڕە شیعرەم لەدەقە سویدییەکەوە کردووە بەکوردی نەک لە عەرەبییەوە.

٤-هیشام شرابی: بیریارێکی فەلەستینییە لە ئەمەریکا نیشتەجێبووە و زۆر بابەتی لەسەر باوکسالاری کۆمەڵگەی عەرەبی نووسیوە. لەساڵی ٢٠٠٥ لەبەیروت کۆچی دوایی کردووە.

## سەرچاوە:

Samtal med min far, Adonis
Ninar Esber
Översättning av Carl G Liungman
Alhambra ٢٠٠٧

# له مەرگ ناترسم

## وتووێژی INDEPENDENT لەگەڵ ئێلکساندر سولژنیتسین

لە فارسییەوە: مستەفا زاهیدی

**ئێلکساندر سولژنیتسین*، یاخی، زیندانی، شاعیر و قارەمان، ئەو وەسفە تراژیکانەی سولژنیتسین لە ئوردووگاکانی کاری زۆرە ملێ (ستالین) لە کتێبەکانی خۆیدا دەیخاتە روو لەکاتی بڵاوبوونەوەیانەوە تا ئەمڕۆ وەک بەشێک لە قووڵترین و کامڵترین بەرهەمەکانی ئەدەبی مۆدێرن دەژمێردرێن. هاوینی رابردوو کاتێک کە نەخۆش بوو بڕیاری دا چاوێک بە رابردووی سەرسووڕهێنەریدا بخشێنێ. سولژنیتسین لەگەڵ کریسچن نیف و ماتیاس شێپ دەستی کردووە بە گفتوگۆ و ئێستا ئیتر ئەو لە ناوماندا نییە.**

* ئێلکساندر ئیساویویچ! کە ئێمە هاتینە ژوورەوە تۆمان دی سەرقاڵی کارکردنی. وا دیارە تەنانەت لە تەمەنی ٨٨ ساڵیدا هێشتا هەست دەکەی پێویستت بە کارکردن هەیە، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی لەبەر دۆخی تەندروستیت تەنانەت ناتوانی لەماڵەوە رێ بکەی. ئێوە ئەم هێز و وره لە کوێوە دێنن؟

– من هەموو دەم ئەو وره دەروونیەم بوە، لە سەرەتای لەدایک بوونمەوە. هەموو دەم هەوڵم داوە بە تەواوەتی خۆم تەرخان بکەم بۆ کارەکانم، کار و هەوڵدان. ئێوە لە کتێبەکەتاندا بە ناوی «ساڵە ئەمریکاییەکانی من» دەیهێننەوە یادی خۆتان سەردەمانێک تەنانەت لە کاتی رێکردن لە جەنگەڵ دەتاننووسی. ئەو کاتەی لە گولاگ بووم هەندێ جار لەسەر دیوارە بەردییەکان دەمنووسی. لەسەر لەتە کاغەز دەمنووسی، دواتر نووسینەکانم لەبەر دەکرد و ئەو لەتە کاغەزانەم لەناو دەبرد.

* هێزی دەروونیتان تەنانەت ئەو کاتانەی  تووشی دۆش داماوی دەبوون لەناو نەدەچوو؟
– زۆر جار لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە: سەرەنجام هەرچی بێت تەواو دەبێت. بەم دواتر کارەکان زۆر باش  دەردەچوون. وەک ئەوەی خێری تێدا بووبێت.

* لام وا نییە مانگی فێبروەری ١٩٤٥ ئەو کاتەی لەلایەن هێزەکانی پۆلیسەوە لە رۆژئاوای رووسیا دەستگیر کرای وەها بۆچوونێکت بووبێت. لەو نامانەدا کە لە بەرەکانی شەڕەوە دەتناردەوە بە خراپە باسی ستالینت دەکرد، هەڵبەت لەبەر ئەم شتە ٨ ساڵ لە ئوردوگای کاری زۆرە ملێدا زیندانی کرای.
– ئەم زیندانە کەوتبوە باشووری «وێرمدیت»ەوە. تازە لە گەمارۆی ئەڵمانییەکان رزگارمان ببوو و خەریک بوو بەرەو «کانیگزبێرگ» (کالینینگرادی ئێستا) دەڕۆیشتین دەستگیر کرام. من هەموو کات مرۆڤێکی گەشبین بووم و وەفادار بووم بۆ روانگەکانم و بەپێی ئەو بۆچوون و باوەڕانە کارم دەکرد.

* چ روانگەیەک؟
– هەڵبەت روانگەکانم بە تێپەربوونی کات گۆڕاون. بەڵام هەمیشە باوەڕم بە کارێ بووە کە کردوومەو هیچ کات بە پێچەوانەی ویژدانم کارم نەکردووە.

* ئێوە بە درێژایی تەمەنتان داواتان لە بەرپرسەکان کردووە داوای لێبوردن بکەن بە بۆنەی کوژرانی چەندین میلیۆن کەس لە گولاک و ترسی کۆمۆنیزم. ئاخۆ کەسێک خواستەکانی ئێوەی لەبەرچاو گرتووە.
– من ئیتر خووم بەوە راستییەوە گرتووە کە سیاسییە مۆدێرنەکان ئامادە نین لەبەرچاوی هەمووان هەست بە پەشیمانی و داوای لێبوردن بکەن.

* ڤلادیمێر پووتین دەڵێت رووخانی یەکیەتی سۆڤیەت گەورەترین کارەساتی ژیۆپۆلتیک بوو لە سەدەی بیستەمدا و ئێستا ئیتر کاتی ئەوە هاتووە خۆخواردنەوەی مازۆخسیتی دەربارەی رابردوو بنێینە لاوە، بەتایبەت وەک پووتین دەڵێت «دنیای دەرەوە» هەوڵی ئەوەیەتی جۆرێ پەشیمانی بێ یاساو لەناو خەڵکی رووسیادا بەرهەم بهێنێ. ئاخۆ ئەم وتانە یارمەتییەک نییە بۆ ئەوانەی دەیانەوێ خەڵکی رووسیا هەموو رووداوەکانی سەردەمی یەکیەتی سۆڤیەت لەبیر بکەن؟
– ئێستا هەموو دونیا بە شێوەیەکی زیاتر لە جاران رووبەڕووی ئەم نیگەرانیە بۆتەوە کە ئاخۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەک تاقە هێزی دونیا دوای ئەو گۆڕانە ژیۆپۆلتیکیانە بووە بە تەنها هێز، چۆن دەوری خۆی لە بەڕێوەبردندا دەگێڕێ. سەبارەت بەوەی «خۆخۆری دەربارەی رابردوو» یش بەداخەوە تێکهەڵکێشکردنی لە «سۆڤیەت» و «رووسیا» کە من زۆر جار لە دەیەی ١٩٧٠ دژی قسەم کردووە، هێشتا لە رۆژئاوا یان ئەو ولاتانەی پێشتر سۆسیالیستی بوون یان کۆمارەکانی

یەکیەتی سۆڤیەت، لەناو نەچووە. بەرەی بە تەمەنتری سیاسییەکان لە وڵاتانی سۆسیالیستی ئامادە نەبوون داوای لێبوردن بکەن، لە کاتێکدا بەرەی نوێی سیاسیەکان تەنها خۆشحاڵ بوون بەوەی کە ناڕەزایەتی و گلەیی و گازەندە دەکات و ئەوانی تر تۆمەتبار دەکات، کە هەڵبەت مۆسکۆی ئەمڕۆ ئامانجێکی ئاسانە بۆ تۆمەتەکانی ئەوان. ئەو سیاسیە نوێیانە وەها هەڵسوکەوت دەکەن وەک ئەوەی قارەمانانە خۆیان ئازاد کردبێ و ئێستا ژیانێکی نوێیان دەست پێکردوە، لە کاتێکدا مۆسکۆ هەر کۆمۆنیست ماوەتەوە. بەمەشەوە، من بە جورئەتەوە هیوادارم ئەم قوناغە نەخۆش و ناساغە زۆر زوو کۆتایی پێ بێ و هەموو ئەو خەڵکانەی لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی کۆمۆنیستیدا ژیاون لەوە بگەن کە کۆمۆنیزم بەرپرسی دروست بوونی ئەو لاپەڕە رەش و زۆر تاڵانەی مێژوویانە، بەتایبەت خەڵکی روسیا.

ئەگەر ئێمە هەمووومان بمانتوانیایە بە شێوەیەکی عاقڵانە لە مێژوو بڕوانین، ئیتر ئەم روانینە نۆستالۆژیکەمان بۆ رابردووی یەکیەتی سۆڤیەت نەدەبوو، ئەم روانینە نۆستالۆژیکە لە بەشێک لە کۆمەڵگای ئێمە کە کۆمۆنیزم کەمتر کاریگەری بووە لە سەریان باوە. ئەگەر روانینێکی عاقڵانەمان بۆ رابردوو هەبوایە ئیتر وڵاتانی ئەوروپای رۆژئاواو هەروەها یەکیەتی سۆڤیەتی کۆن پێویستیان بەوە نەدەبوو بۆ دۆزینەوەی هۆکاری بەدبەختی و چارەرەشیان چاو لە مێژووی رووسیا بکەن. نابێت کردەوە شەیتانیەکانی تاک تاکی رێبەرانی سیاسی یان رژێمەکان بە هەڵەی خودی خەڵکی روسیا و وڵاتەکەیان بزانرێت. نابێ ئەم پرسە گرێ بدەینەوە بە «دەروونناسی نەخۆش»ی رووسەکانەوە، وەک چۆن بەزۆری لە رۆژئاوا ئەم کارە دەکرێ. سەرجەم رژێمە دەسەڵاتدارەکان لە روسیا تەنها دەتوانن بە خولقاندنی کەشوهەوای ترس و خەفەقان درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن. دەبێ ئێمە تێبگەین کە ئەو کاتەی خەڵک بە شێوەیەکی خوازارو و جیدی دان بە گوناهی خۆیاندا دەنێن، دەتوانن دڵنیا بن لە دەرمانی نەتەوەیەک. لۆمەکردنی بەردەوام لەلایەن دونیای دەرەوە، ئەنجامی پێچەوانەی لێ دەکەوێتەوە.

* ئەوەی کەسێ دان بە گوناهی خۆیدا بنێ بەو مانایەیە ئەو کەسە زانیاری و ئاگاهی تەواوی هەیە لەسەر رابردووی خۆی. بەمەشەوە مێژوونووسان گلەیی و گازەندەی ئەوەیان هەیە ئەرشیڤەکانی مۆسکۆ بە پێچەوانەی ساڵانی دەیەی ١٩٩٠ لەبەردەستدا نییە.

– ئەم پرسە پرسێکی ئاڵۆزە. گومان لەوەدا نییە لە بیست ساڵی رابردوودا شۆڕشێک لە ئەرشیڤەکانی رووسیا رووی داوە. هەزاران فایل هەڵدراونەتەوە، لێکۆڵەران لە ئێستادا دەستیان بە هەزاران بەڵگە دەگات کە پێشتر نهێنی بوون. سەدان نامە کە ئەم بەڵگانە دەیخەنە بەردەم جەماوەر، ئێستا بڵاوبوونەتەوە یان خەریکە ئامادە دەکرێن بۆ بڵاوبوونەوە. لە تەنیشت بەڵگە نهێنییەکانی دەیەی ١٩٩٠دا، زۆر بەڵگەی تر هەبوون کە هیچکات نەدەکەوتنە ناو بەڵگە نهێنی و پۆلین بەندی کراوەکانەوە. دەربارەی چەند ساڵی رابردووش دەبێ ئەوە بڵێم کەس نەیتوانیوە سەرپێچی بکات لە قۆناغەکانی ئاشکرا کردنی بەڵگەکان. بەداخەوە ئەم رەوتە درێژخایەنتر لەوەیە مرۆڤ بیری لێ دەکاتەوە، بەدەر لەمانەش، فایلەکانی گرنگترین ئەرشیڤەکانی وڵات، واتە «ئەرشیڤەکانی نەتەوەیی فێدراسیۆنی رووسیا» (گاف)، راست وەک ساڵەکانی ١٩٩٠ لەبەردەستدایە. هاوڵاتیان و لێکۆڵەران

دەتوانن دەستیان بەم بەڵگانە بگات. (گاف) لە ماوەی ساڵەکانی ٢٠٠٤ بۆ ٢٠٠٥ مێژووی ٧ بەرگی گۆلاگ ستالینی بڵاوکردەوە. من هاوکاریانم دەکرد لە بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبەدا و دڵنیاتان دەکەمەوە ئەم کتێبە چەند بەرگییە لەوپەڕی ئێعتبار و باوەڕپێکراویدایە. لێکۆڵەران لە هەموو شوێنەکانی جیهان ئەم کتێبە بە کتێبێکی بەهادار دەزانن.

* نزیکەی ٩٠ ساڵ لەوەو پێش، روسیا دوو جار لەرزا، جارێ بە شۆڕشی فێبریە و جارێ بە شۆڕشی ئۆکتۆبەر. ئەم دوو رووداوە وەک مۆتیڤێک لە کارەکانی تۆدا ئامادەیە. چەند مانگ لەوەوپێش هەمدیسان جەختت کردەوە لەسەر بۆچوونی خۆت: کۆمۆنیزم بەرهەمی رژێمە سیاسیەکانی پێشتری رووسیا نەبوو، شۆڕشی بۆلشۆڤیک تەنها ئەندامی لاوازبوونی دەسەڵاتی «کرێنێسکی» بوو لە ساڵی ١٩١٧دا. ئەگەر کەسێک بیەوێ بەم شێوەیە بیر بکاتەوە، کەواتە دەبێ بڵێت لنینیش بە شێوەیەکی کتوپڕ هاتە سەر کار و بە پشتیوانی ئەڵمانەکان دەسەڵاتی رووسیای بەدەستەوە گرت. ئاخۆ ئێمە بە باشی لە مەبەستی تۆ تێگەیشتووین؟

– نها. تەنها مرۆڤێکی جیاواز و هەڵکەوتە دەتوانێ هەل بقۆزێتەوە بۆ واقیع. لینین و ترۆتسکی دوو کەسی سیاسی زۆر وریا و زرینگ بوون کە لە ماوەیەکی کورتدا کەڵکیان لە لاوازییەکانی دەوڵەتی کرێنێسکی وەرگرت. بەڵام ئیزن بدەن قسەیەکی ئێوە راست بکەمەوە، «شۆڕشی ئۆکتۆبەر» تەنها ئەفسانەیەک بوو کە دروستکراوی براوەکانە، واتە بەلشەڤیکەکان، ناوەندە پێشەنگەکانی رۆژئاوا بەتەواوی ئەم ئەفسانەیان وەرگرتووە. ٢٥ی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ کوودەتایەکی پڕ لە توندوتیژی ٢٤ کاتژمێری لە پێترۆگراد رووی دا. ئەم کوودەتایە گەڵاڵەکەی بە شێوەیەکی وردبینانە لەلایەن ترۆتسکییەوە دارێژرابوو، لنینیش لەم ناوەدا خۆی شاردبۆوە هەتا بە تاوانی خیانەت دادگایی نەکرێت. ئەوەی ئێمە وەک «شۆڕشی ١٩١٧»ی رووسیا دەیناسین، لەڕاستیدا شۆڕشی فێبروەریە؟ هۆکارەکانی روودانی ئەم شۆڕشە دەگەڕێتەوە بۆ هەل و مەرجی بەر لە شۆڕشی رووسیا، من هیچکات هیچ شتێکم نەوتوە جگە لەمە. شۆڕشی فێبروەری رەگەکانی قووڵە، من لە «چەرخی رەش»دا باسم لەم شتە کردوە. خاڵێکی جێگای سەرنج لەم ناوەندا بێ باوەڕی دوو لایەنی دەسەڵاتداران و کۆمەڵگای خوێندەوار بوو بە یەکتر بۆ ماوەیەکی درێژ، بێ باوەڕییەکی تاڵ کە هیچ چەشنە رێگاچارەیەکی بنیاتنەری بۆ وڵات نەهێشت. هەڵبەت بەرپرسیارێتی گەورە دەکەوێتە ئەستۆی بەرپرسەکان. بۆ ئەو کاتەی کەشیتییەک نوقم دەبێ کەسێک هەیە بەرپرس بێت جگە لە کەشتیوان؟ کەواتە دەکرێ بڵێین شۆڕشی فێبروەری لەڕاستییدا ئەنجام و بەرهەمی رژێمە پێشترەکانی رووسیا بوو. بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە لنین لەخۆڕا و بە رێکەوت هاتۆتە سەر کار، یان ئەوەی دەوری ئابووری ئیمپراتۆر «ویلهێلم» بێ بایەخ و کەم بووە. لە رەوتی شۆڕشی ئۆکتۆبەردا هیچ شتێک سروشتی نەبوو بۆ رووسیا. بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەم شۆڕشە پشتی رووسیای شکاند. ترسی سوور، حەزی رێبەرەکانی بۆ ئەوەی رووسیا لە خوێندا بگەوزێنن یەکەمین و سەرەتاییترین هۆکاری سەلمێنەری شۆڕشی ئۆکتۆبەرە.

* ئێوە لە شوێنێک وتووتانە رووسیا دەبێ دان بە مێژووی رەشی لەئاست مرۆڤایەتیدا بنێ.

ئاخۆ رووسەکان ئەزموونی پێویستیان لەو دوو شۆڕشە و ئەنجامەکانی وەرگرتووە .

– ورده ورده خەریکن ئەزموون وەردەگرن. ژمارەیەکی زۆری کتێب و فیلم دەربارەی مێژووی سەدەی بیست بڵاوبۆتەوەو دروست کراوە کە خۆی ئاماژە بۆ پێویستییەکی زۆر کە لەم بوارەدا هەیە . لەم دواییەدا، تەلەفیزیۆنی دەوڵەتی رووسیا زنجیرە بەرنامەیەکی بڵاوکردەوە کە بەپێی کارەکانی «ڤارالام شالامۆف» سازکرابوون، بەم زنجیرە بەرنامەدا زۆر راستی تراژیک و دڵتەزێن لە ئۆردووگاکانی ستالین خرایە روو. ئەم بەرنامە شتێکی رووکەش و رواڵەتی نەبوو. لە فێبرورەری ۲۰۰۷ەوە تا ئێستا پێم سەیرە وتارەکەی من دەربارەی شۆڕشی فێبرورەری کە هەمدیسان چاپ بۆتەوە، ئەم هەموو باسە گەرم و گوڕەی لێ کەوتۆتەوە . بەڵام من خۆشحاڵم بە دیتنی ئەو هەمووە روانگە و باوەڕە جیاوازانە، چونکە ئەم فرە چەشنییە لە باوەڕ و بۆچوونەکاندا دەرخەری ئەوەیە خەڵکی رووسیا دەیانەوێ لە رابردووی خۆیان بگەن، لەبەر ئەوەی داهاتوو بێ رابردوو هیچ مانایەکی نییە .

* سەردەمی دەسەڵاتداری پووتین لەگەڵ دەسەڵاتداری یلتسین و گۆرباچۆف چۆن بەراورد دەکرێ؟

– دوڵەتی گۆرباچۆف بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر لە باری سیاسییەوە بەرامبەر بە وڵات ساویلکەو بێ ئەزموون و نابەرپرس بوو. حکومەتی گۆرباچۆف حکومەت نەبوو بەڵکو پشتکردن بوو لە دەسەڵات بێ ئەوەی بیری لێ کرابێتەوە . ئەو پێداهەڵدانەی رۆژئاواییەکان پێیاندا هەڵدەدا تا دەهات ئەوی زیاتر لەوە دڵنیا دەکردەوە رێگایەکی دروستی هەڵبژاردووە . بەڵام ئێزن بدەن لێرەدا زۆر روون و ئاشکرا بیهێنینەوە یاد کە بە پێچەوانەی ئەو ئیدیعا و بانگەشانەی دەکرا، ئەوە گورباچۆف بوو بۆ یەکەم جار ئازادی رادەربڕینی بۆ وڵاتەکەی بە دیاری هێنا نەک یلتسین. یلتسینیش کە بە دەسەڵات گەیشت نابەرپرس بوو بەرامبەر بە ژیانی خەڵکی رووسیا، بەڵام بە شێوەیەکی تر. یلتسین کە زۆر بە پەلە دەیویست خاوەنداریێتی تایبەت جێگای خاوەنداریێتی دەوڵەتی بگرێتەوە، دەستی کرد بە فرۆشتنی چەندین بیلیۆن دۆلار میراتی نەتەوەیی رووسیا. یلتسین کە دەیویست پشتیوانی رێبەرانی ناوچەکە بۆ لای خۆی راکێشێ، پرسی جیایی خوازی هێنایە بەر باس و یاساگەلێکی پەسەند کرد کە ئەنجامەکەی بوو بە رووخانی دەوڵەتی رووسیا. ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی رووسیا بێبەری بێت لەو دەور و کاریگەرییەی هەوڵی دەدا پێی بگات و بوو بەهۆی لاوازبوونی پێگەی خۆی لە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی. هەڵبەت هەموو ئەمانە بارەقەڵا و پێداهەڵدانی لەلایەن رۆژئاواوە لەگەڵ بوو. پووتین وڵاتێکی تاڵانکراوی سەرگەردانی بە خەڵکانێکی هەژار و بێ هێواوە بە میرات پێگەیشت. پووتین دەستی کرد بە گونجاوترین و عاقڵانەترین کار. واتە بونیادنانەوەی ئارام و هەنگاو بە هەنگاو. هەڵبەت کەس دەستبەجێ بە هەوڵەکانی پووتینی نەزانی، تەنانەت هەوڵەکانیشی بە هەند وەرنەگیرا و بەباشی باسی نەکرا. بەهەر حاڵ زۆر ئەستەمە بتوانین بە درێژایی مێژوو نموونەگەلێک بدۆزینەوە کە وڵاتێک بۆ بونیادنانەوەو بە دەستهێنانەوەی هێزی رابردووی خۆی هەنگاوی ئارام هەڵبگرێ و وڵاتانی تر نێوانیان خۆش بێـت لەگەڵی.

* ئێستا ئەم بابەتە روون و ئاشکرایە کە سەقامگیر بوونی رووسیا بەکەڵکە بۆ رۆژئاواش.

بەڵام شتێک بە لای ئێمەوە جێگای سەرنج و تێڕامانە، ئەو کاتەی باس لە شێوەی گونجاوی بەڕێوەبردنی وڵات لە رووسیا دەکەین تۆ هەموو کات لایەنگری ئۆتۆنۆمی مەدەنیت، ئەمەش لەگەڵ نموونەی رۆژئاواییدا بەراورد دەکەی. بەڵام دوای ٧ ساڵ لە حکوومەتی پووتین، ئێمە راست خاڵی بەرامبەری ئەم دیاردەیە دەبینین. هێز لە دەستەکانی سەرۆک کۆماردا قەتیس ماوەو هەموو شتێک گرێ دراوەتەوە بەوەوە.

– بەڵێ، من هەموو کات پێداگریم کردووە لەسەر ئەوەی سیستەمی ئەتۆنۆمی لۆکاڵی بەکەڵکی روسیا دێت، بەڵام هیچکات ئەم نموونەیەم لەگەڵ دیمۆکراسی رۆژئاوایی بەراورد نەکردووە، بە پێچەوانەوە هەموو کات هەوڵی ئەوەم داوە بە نموونە هێنانەوە لە سیستەمی خۆبەڕێوەبردنی لۆکاڵی کاریگەر لە سویسرا و نیوئینگڵەند، هاونیشتمانانم رازی بکەم بەوەی ئەم سیستەمە بە کەڵکە بۆ رووسیا. ئێوە لە پرسیارەکەتاندا پرسی خۆبەڕێوەبردنی لۆکاڵیتان ئاڵۆز کرد. ئۆتۆنۆمی لۆکاڵ تەنها لە ئاستی گشتی خەڵکدا ئەگەری دامەزراندنی هەیە، یانی ئەو کاتەی خەڵک بەرپرسە هەڵبژێردراوەکانی خۆیان بناسن و تەنها چەند دەسەڵاتدارێکی ناوچەیی دەسەڵاتداری بکەن بەسەریاندا. لە سەردەمی دەسەڵاتداری یلتسیندا ئەم حاکمانە هەبوون، بەڵام دڵیان بەوە خۆش بوو هاوکاری دەکەن لە سەرکوتکردنی ئۆتۆنۆمییە لۆکاڵییەکان یان دەوڵەتە فێدڕاڵەکان. هەموو نیگەرانی و دڵەڕاوکێی من پێشکەوتنی زۆر ئارام و لەسەرخۆی ئۆتۆنۆمی لۆکاڵی بوو. بەڵام بەهەرحاڵ ئەم پرسە دەستی پێکرد. لە سەردەمی یلتسیندا، ئۆتۆنۆمی لۆکاڵی قەدەغە بوو، لە حاڵێکدا بە هۆی سیستەمی «هێزی ئاسۆیی» لە سەردەمی پووتین، زۆربەی زۆری بڕیاردانەکان کەوتۆتە ئەستۆی هەموو جەماوەر. بەداخەوە رەوتی ئۆتۆنۆمی لۆکاڵی بە شێوەیەکی سیستماتیک بەڕێوە نەچووە. بەڵام دژایەتی لەگەڵ ناکرێ.

* بوونی بۆچوونە جیاوازەکان بۆ پێشکەوتنی هەر وڵاتێک بەشێوەیەکی تەندروست، پێویستە. تۆ بەزەحمەت دەتوانی کەسێکی بیر جیاواز بدۆزیتەوە جگە لە کۆمۆنیستەکان. کە تۆ دەڵێی :» ناکرێ بڵێین هیچ دژایەتییەک لەم بارەوە بوونی نییە» رەنگە مەبەستتان حیزبە دیمۆکراتیکەکانی دەیەی ١٩٩٠ بێت. بەڵام ئەگەر بێ هیچ دەمارگرژی و پێش داوەرییەک چاو لەم دۆخە بکەین دەبینین پێوەرەکانی ژیان لە دەیەی ١٩٩٠ بە خێرایی دادەبەزێ. ئەم بابەتە کاریگەری نیگەتیڤی هەیە لەسەر سێ لەسەر چواری بنەماڵە رووسیەکان، ئەم رووداوانەش لەژێر چەتری دیموکراسیدا روویداو بەناوی دیموکراسییەوە کرا. هەر بۆیە دەبێ بڵێین تا ڕادەیەک جێگای سەرسووڕمانە ئیتر خەڵک لەژێر چەتری ئەم ناوەدا خۆپیشاندان ساز نادەن.

– ئێستا رێبەرانی ئەم حیزبانە تەنانەت ناتوانن لەسەر ئەوە بەیەک بگەن چۆن پلە ئیدارییەکان لە دەوڵەتێکی چەشنە سێبەر، لە نێوان خۆیاندا دابەش بکەن. جێگای داخە ئێستاکەش ناڕەزایەتییەکی بەربڵاو و گشتگیر لە روسیا نییە. پەرەسەندنی ناڕەزایەتی و ناڕازی بوون پێویستی بە کات و ئەزموونی زیاتر هەیە.

* لە دوایین وتووێژماندا تۆ رەخنەت لە یاساکانی هەڵبژاردنی نوێنەرانی «دۆما»ی دەوڵەتی

گرت، تەنها لەبەرئەوەی نیوەی ئەو نوێنەرانە لە ژینگەی هەڵبژاردنی خۆیاندا هەڵنەدەبژێردران، لە حاڵێکدا نیوەکەی تریان بە شێوەیەکی بەرچاو ئامادە بوون. دوای ئەو ریفۆرمەی لەلایەن پووتینەوە لە باری هەڵبژاردنەکاندا ئەنجام درا، ئێستا ئیتر شتێک نییە پێی بوترێ «ژینگەی هەڵبژاردن». ئاخۆ ئەمە هەنگاوێک نییە بۆ دواوە.

– بەڵێ، ئەمە کارێکی هەڵەیە. من هەموو دەم رەخنەم لە «حیزبگەرایی و پەرلەمانگەرایی» گرتووە. من لایەنگری هەڵبژاردنی لیستی کراوەم کە لەودا نوێنەرانی راستەقینەی خەڵک هەڵبژێردرێن، ئەو کەسانەی لە ناوچەکانی خۆیان وەڵام دەرەوەن و ئەگەر کارکردنیان جێگای رەزامەندی نەبوو زۆر بە ئاسانی لەسەر کار لادەبرێن. من لە دروست بوونی گرووپەکان بەپێی بنەما ئابووری و سەندیکایی و ناوچەیی و فێرکاری و پێشەییەکان دەگەم و رێزم هەیە بۆ ئەم جۆرە ئیش کردنە، بەڵام من لام وایە هیچ شتێکی حیزبە سیاسییەکان رێکخراو نییە. ئەو پێوەندییەی کە هاندەرەکەی سیاسییە دەکرێ لەرزۆک بێت و زۆربەی کاتیش هاندەری خۆویستی لەگەڵە. لیۆن ترۆتسکی لە وتەیەکیدا لە شۆڕشی ئۆکتۆبەردا زۆر بە باشی باسی لەم بابەتە کردووە. ترۆتێسکی دەڵێت:» ئەو حیزبەی هەوڵنادا بە دەسەلات بگات بە کەڵکی هیچ نایەت» ئێمە خەریکین باس لەوە دەکەین حیزبێک تەنانەت بە نرخی پێشێل کردنی مافی خەڵکانی تریش بێت، بە شوێن گەیشتن بە بەرژوەندییەوەیە. دەکرێ ئەم رووداوە روویدات، گواستنەوەی هێز چ بە شێوەیەکی ئاشتییانە بێت یان بە پێچەوانەوە. دەنگدان بە حیزبە بێ کردەکان و بەرنامەکانیان ئەڵتەرناتیڤێکی هەڵەیە بۆ تەنها رێگای دروستی هەڵبژاردنی نوێنەرانی خەڵک. دەنگدان لەلایەن خەڵکانێکی حەقیقییەوە بە نوێنەرانێکی حەقیقی، ئەم خاڵە مەبەستی ئۆتۆنۆمی لۆکاڵییە.

* سەرەڕای داهاتی زۆری دەوڵەت لە رێگای فرشتنی نەوت و گازەوە، هەروەها پەرەسەندنی چینی مامناوەند، شەقڵێکی گەورە و قووڵ کەوتۆتە نێوان هەژار و دەوڵەمەند. دەبێ چ بکرێ بۆ باشتر بوونی ئەم دۆخە؟

– من لام وایە، شەقڵی نێوان هەژارو دەوڵەمەند دیاردەیەکی تەواو مەترسیدارە و پێویستە زۆر زوو لەلایەن دەوڵەتەوە گرنگی پێ بدرێ. هەرچەندە لە سەردەمی یلتسیندا بەشێکی زۆر لە داهات و سەرمایە لە رێگای تاڵان کردنەوە پاشەکەوت کرا. تەنها رێگای عاقڵانە و گونجاو بۆ چاکتربوونی ئەم دۆخە ئەوەیە بە شوێن بازرگانی زۆر گەورە نەکەوین، بەڵکوو ئیزن بدەین بازرگانییە مامناوەند و بچووکەکان دەرفەتی دەرکەوتنیان ببێت. ئەمە بەو مانایە هاوڵاتیان و بازرگانە وردەکان لە بەرامبەر یاسای دیکتاتۆری و گەندەڵیدا پارێزراو بوون.

* بەم دواییانە پێوەندی نێوان روسیا و رۆژئاوا تا رادەیەک روو لە ساردییە، ئەمە بۆچی دەگەڕێتەوە؟ جیهانی رۆژئاوا چ کێشەیەکی هەیە لە تێگەیشتن لە روسیا؟

– گرنگترین هۆکارەکان هۆکاری دەروونناسین، واتە رووبەڕوو بوونەوەی هیوا پووچەکان لەگەڵ واقیع. ئەم رووداوە چ لە روسیا و چ لە رۆژئاوا رووی دا. ساڵی ١٩٩٤ کە گەڕامەوە بۆ روسیا، رۆژئاوا و دەوڵەتە رۆژئاواییەکان لە روسیا دەپەرەستران. ئەمەش لەبەر ئەوە نەبوو خەڵکی روسیا زانیاری

تەواویان لەبارەی رۆژئاواوە هەبێت یان لە رووی وشیارییەوە هەڵیبژێرن، هۆکاری ئەم شتە دەگەڕایەوە بۆ بێزاری خەڵکی روسیا لە رژێمی بەلشەڤیکی و پروپاگەندەی دژە رۆژئاوایی ئەم رژێمە. ئەو کاتەی هێزەکانی (ناتۆ) بە شێوەیەکی بێ رەحمانە سربستانیان بۆمباران کرد، کەش و هەواش گۆڕا. ئەم بۆمبارانە هەموو چینەکانی کۆمەڵگای روسیای تووشی شۆک کرد. کە ناتۆ پانتایی کاریگەریی خۆی بەربڵاوتر کردەوەو کۆمارییەکانی سۆڤییەتی هێنایە نێو چوارچێوەی خۆیەوە، دۆخەکە خراپتر بوو. ئەم راستییە لەبارەی «ئۆکرانیا»وە زۆر دڵتەزێن بوو، ئۆکرانیا وڵاتێک بوو نزیک بوونی لە رووسیا بە هۆی پێوەندییە بنەماڵەیی و خێزانییەکان لە نێوان دەیان میلیۆن ئینسانادا پێناسە دەکرێ. دەکرا هێڵێکی جیاکەرەوە بکێشرێ، واتە لەڕاستییدا جۆرێک جەمسەری نیزامی، پێوەندی نێوان ئەو بنەماڵانە نەهێڵدرێ. کە وایە ئەو وێنایەی لە بارەی رۆژئاواوە (شۆڤالیەی دیمۆکراسی) لە نێوان خەڵکی رووسیادا هەبوو، جێگای خۆی دا بە باوەڕێکی دڵساردانە کە پراگماتیزم کە زۆربەی کات رەش بین و خۆویستە، لە ناوەندی روانگەی رۆژئاوادایە. ئەم بابەتە بۆ بەشێکی زۆر لە رووسیەکان جۆرێ بێ هیوایی تەواو و رووخانی باوەڕەکان بوو. لە هەمانکاتدا رۆژئاوا سەرگەرمی سەرکەوتنی بوو لە جەنگی ساردا، ١٥ساڵ بێ سەرەو بەرەیی سەردەمی دەسەڵاتدارێتی گۆرباچۆف و یلتسینی دەبینی. ئیتر هەمووان زۆر ئاسان باوەڕیان بەوە کردبوو رووسیا بووە بە وڵاتێکی جیهانی سێهەم و بە جیهانی سێهەم دەمێنێتەوە. ئەو کاتەی بەشێک لە هێز و دەسەڵاتی رابردووی بەدەست هێنایەوە، پەرچەکرداری جیهانی رۆژئاوا- رەنگە بێئەوەی بە خۆی بزانێ و بەهۆی ترسی رابردووەوە- تۆقا بوو. رۆژئاوا بە دیتنی ئەم شتە کەوتەوە یادی یەکیەتی سۆڤیەتی کۆن.

ئەمە زۆر خراپە. بەڵام تەنانەت بەر لەوەش رۆژئاوا خۆی فریو دابوو- یان رەنگە لەبەر ئاسوودەیی خۆی واقیعی لەبەرچاو نەگرتبێ- چونکە رووسیای بە دیمۆکراسی تازە پێگەیشتوو دەزانی، لەکاتێکدا هیچ شتێک بەناوی دیمۆکراسی لە رووسیا بوونی نەبوو. هێشتا رووسیا نەبووە بە وڵاتێکی دیمۆکراتیک. لە ئێستادا تەنها خەریکی پرۆڤەکردنی دیمۆکراسییە. زۆر ئاسان دەکرێ لیستەیەک لە سەرپێچی و سڕینەوەو هەڵەکان لە رووسیا بخرێتە بەردەست بەڵام ئایا دوای رووداوی ١١ی سێپتەمبەر رووسیا دەستی هاوکاری بۆ رۆژئاوا رانەکێشا؟ تەنها جۆرێ گرفتی دەروونی یان جۆرێ ترسی کورتبینانە، دەتوانێ وەڵامی ئەوە بداتەوە کە بۆچی رۆژئاوا دەستی هاوکاری رووسیای دایە دواوە. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تەنها ئەو کاتەی کەوتە دۆخێکی قەیراناوییەوە یارمەتییە زۆر گرنگەکانی رووسیای لە ئەفغانستان وەرگرت. لە ئەورووپاش ئەو بانگەشانەی دەربارەی رووسیا دەکرێ تا رادەیەک دیار و بەرچاوە. بەهۆی ترس و دڵەڕاوکێی رۆژئاواییەکانەوەیە دەربارەی وزە. ئاخۆ بۆ رووسیا ئەمە بەرەکەتێک نییە کە رۆژئاوای خستۆتە لاوە؟ من لە دوایین وتووێژمدا لەگەڵ یەکێک لە بڵاوکراوە رۆژئاواییەکان بەر لە گەڕانەوەم بۆ رووسیا (وتووێژ لەگەڵ گۆڤاری فۆربین لە ساڵی ١٩٩٤) وتم: «دەکرێ لە سەدەی بیست و یەکەمدا سەردەمانێک ببینین کە چ ئەورووپا و چ ئەمریکا پێویستی زۆریان دەبێ بە هاوکاری لەگەڵ رووسیا»

* لاتان وایە ئەدەبی رووسیا لە چ دۆخێکدایە؟

- سەردەمی گۆڕانە خێرا و بنەڕەتییەکان هیچکات لە بەرژوەندی ئەدەبدا نییە. بەرهەمە دیارە

ئەدەبییەکان بە زۆری و هەموو کات لە سەردەمی سەقامیگریدا دەخولقێن، جا چ سەردەمی باش بێ یان خراپ. ئەدەبی مۆدێرنی رووسیاش لەم یاسایە بەدەر نییە.

خوێنەری خوێندەواری ئەمڕۆیی زیاتر هۆگری ئەو بەرهەمانەیە کە گێڕانەوەیی (داستانی) نین. بەڵام لام وایە بابەتی لە چەشنی عەدالەت و ویژدان شتێک نییە بە تێپەڕبوونی کات تووشی گۆڕان بێ و هەموو دەم لە لوتکە و بنەمای ئەدەبی رووسیادا دەمێننەوە؟، بە شێوەک دەکرێ لەو رێگاوە کۆمەڵگا وشیار بکرێتەوە.

* ساڵی ١٩٨٧ وتت قسە کردن لە بەرامبەر جەماوەر دەربارەی ئایین بە لاتەوە کارێکی دژوارە. باوەڕ بەلای ئێوەوە چ مانایەکی هەیە؟

– من لام وایە، باوەڕ بنەما و کۆڵەکەی ژیانی مرۆڤە.

* لە مەرگ دەترسی؟

– نا. کە گەنج بووم مەرگی ناوادەی باوکم ژیانمی خستە ژێر چەتری خۆیەوە- دەترسام بەرلەوەی هەموو گەڵاڵە ئەدەبییەکان بە بەر بگەن بمرم. بەڵام لە تەمەنی ٣٠ تا ٤٠ ساڵیمدا روانینم دەربارەی مەرگ بە تەواوەتی هاوکات بوو لەگەڵ ئارامی و هاوسەنگی. من لام وایە مەرگ دیاردەیەکی سروشتییە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک خاڵی کۆتایی نییە.

* بەهەرحاڵ هیوادارین ساڵانێکی زۆر سەرقاڵی داهێنانی بەرهەمی تر بیت.

– نا... نا... هیوایەکی وەهام بۆ مەخوازە. ئەمەندە بەسە.

## پەراوێز:

* ئێلکساندر سولژنیتسین(دیسەمبەری ١٩١٨ –٣ی ئووتی ٢٠٠٨) نووسەری ناوداری رووسیا و براوەی خەڵاتی نۆبێلی ئەدەبی ساڵی ١٩٧٠. سۆلژنتسین بوە هۆی پەردەداماڵین لە تاوان و جینایەتەکانی ستالین لە رۆمانەکانیدا، ٢٠ ساڵ دوورخرایەوە و چەندین ساڵ لە ئوردووگای کاری زۆرە ملێدا بوو. دوو رۆمانی کۆمەڵە دوورگەکانی گۆلاک و رۆژێ لە ژیانی ئیڤان دینی سیویچ دیارترین بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە ناودارەیە. (و-ک)

## سەرچاوە:

http://www.dibache.com/text.asp?cat=٨&id=٢٢٢٩

# هەڵبژاردەیەك لە دوا ئاخاوتن لەگەڵ

# محەمەد ئەلماغوتدا

ئامادەکردنی: عەبدە وازن
لە عەرەبییەوە: عیسا چیایی

* بۆچی لە سەرەتای ژیانی ئەدەبیتدا وەکو زۆربەی شاعیرانی هاوچەرخ هەوڵت نەدا چامەیەکی ئەستوونی کێش و سەروادار بنووسی؟

**ماغوت**: من هەوڵم نەدەدا چامەیەکی ئەستونی و سەروادار بنووسم، چونکە بڕوام بە چامەی ئەستوونی نییە، من کەسێکی سەرسەخت و خۆڕەس و خێرام. خەمەکانم ڕێگایان پێ نەدەدام بەدوای سەروادا بگەڕێم. من کەسێکی هەلاتو و برسی و دەربەدەربووم، لە حەشارگەو پەنایەک دەگەڕام بمگرێتە خۆی. کاتێکم نەبوو بۆ کێش و سەروا ..( جوێن بە سەروا دەدات)

* جێگە دەستی شیعریی تۆ بەڕوونی لە بەرهەمی زۆرێک لە شاعیرە لاوەکاندا دەردەکەوێ.

**ماغوت**: ئەمە دڵخۆشم دەکا، شتێکی جوانە کە کاریگەریی چامەکانم بە شاعیرە لاوەکانەوە دەبینم، من بەخشینم لە وەرگرتنم زۆرتربوو.

*هەست بەچی دەکەیت کاتێ شیعرەکانت دەبینی وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی بێگانە؟

**ماغوت**: بەلای منەوە ئەوە هیچ شتێک ناگەیەنێ، خودی ناوبانگیش لای من هیچ ناگەیەنێ و من هیچ زمانێکی بێگانەش نازانم.

* بەڵام شاعیران هەمیشە لە بواری وەرگێڕانەوە هەوڵی بەجیهانی بوون دەدەن !

**ماغوت:** بەجیهانیی بوون لای من هیچ ناگەیەنێ، بۆنمونە ڕەنگە ئەو شتە بەلای ئەدۆنیسەوە گرنگ بێت، پاشـــان دەڵێم هەر قەسابێک بە سەربڕینی ژنەکەی دەتوانێ ببێتە جیهانی. ئەم شێوازە وەک ڕێگایەک بۆ بەجیهانیبوون پێشنیاری دەکەم.

*چیت لەبیرماوە، دەربارەی منداڵێتیی بەدبەختی خۆت لە گوندی سەلمیە؟

**ماغوت:** من لە گوندی ســـەلمیە لەدایک بووم و بە هەرزەکاریش هەر لەوێ بووم، خەونی من ئەوە بـــوو کچـــە مامێ یان خاڵێکم بخوازم و منداڵ بخەمەوە. ئەمە خەونـــی ڕۆژانی گەنجی من بوو. بەڵام چارەنووسم وای کرد کە سەنیە بخوازم.

* ئەی لەبارەی پارتی نەتەوەیی چی دەڵێی؟

**ماغوت:** بەبێ ئەوەی پرانســـیپەکەی بخوێنمەوە چوومە ڕیزی پارتی نەتەوەییەوە، من گەنجێکی هەژار بووم و پێویســـتیم بەوە بوو کە بچمە کۆمەڵێکەوە. گوندەکەی ئێمە (سەلمیە) سەرشار بوو بە بیروباوەڕی پارتایەتی. دوو پارت هەبوو لەوێندەر: پارتی نەتەوەیی و پارتی بوژانەوە. من پارتی نەتەوەییـــم هەڵبژارد چونکە لەماڵمانەوە نزیک بوو. لە بارەگاکەشـــیدا ســـوپایەک هەبوو، یەعنی کـــەش و هەواکـــەی گەرم و گوڕ بوو، لەکاتێکـــدا بارەگای پارتی بوژاندنەوە ســـۆپای تیا نەبوو، لە کۆبوونەوەکاندا خەوم دەهات و باوێشکم دەدا. بیرم دێ ئەوان باسی ئاکاری باشی پارتایەتیان دەکرد من بیرم لە سەرین دەکردەوە. کە سەرما تەواو دەبوو من لە کۆبوونەوەکان هەڵدەهاتم.

جارێـــک داوایان لێ کـــردم ئابوونە کۆبکەمەوە، منیش بەشـــی کڕینی پانتۆڵێکـــم کۆکردەوە و هەڵاتم.

* ئایا هەست بە پەشیمانی دەکەیت کە خوێندنت تەواو نەکرد و بەو خوێندەواریە کەمەوە تێکەڵ بە ژیان بوویت؟

**ماغوت:** هەســـت بە پەشـــیمانی دەکەم لەبەرئەوەی فێری خوێندنەوە و نووسین بووم. ئارەزووی ئەوەم دەکرد هەر ئەو گەنجە نەخوێندەوارە بایەم کە مەڕی دەلەوەڕاند و لە گونددا ژیانێکی ڕووناک و قەرەجیانە دەژیا.

* ئەی لە شاعیرانی گۆڤاری (شیعر) کێت خۆشدەویست؟

**ماغوت:** ئونسی ئەلحاج هاوڕێی هەمیشەییمە. ئەو ئارەزوەیم خۆش دەوێ کە بۆ تێکدان هەیەتی، ئەمەش بەهرەیە. شەوقی ئەبیشەقرام زۆر خۆش دەوێ. کەش و هەوا منداڵییەکەی و زمانە تازەکەیم خۆشدەوێ. جارێکیان لە زانکۆی ئەمریکی کۆڕێکی هاوبەشیان بۆ من و شەوقی ئەبیشەقرا ڕێکخست و بەدر شـــاکر سەیابیش ئامادەبوو. شـــەوقی ئەودەم شیعری ئەستوونی دەنووسی، بەڵام دەنگی کز بوو لەکاتێکدا دەنگی من گەورە بوو دەنگی دەدایەوە، هەرکاتێ شەوقی دەگەیشتە سەری سەرواکە

شـــەمەندەفەرێک تێدەپەڕی و فیتەی شەمەندەفەرەکە بەســـەریدا زاڵ دەبوو. کە کۆڕەکە تەواو بوو سەیاب پێی وت: ماغوت تۆی دا بەزەویدا، شەوقیش لە وەڵامدا وتی : ئەوە شەمەندەفەرەکە بوو.

* لـــە شەســـتەکاندا زۆرانبازیـــەک هەبوو لەنێوان گۆڤاری (شـــیعر) و(ئـــاداب)دا بۆچی داتشکاندەوە بەلای (شیعر)دا و بەرهەمت لە (ئاداب)دا بڵاونەکردەوە؟

**ماغـوت:** گۆڤاری (ئاداب) ویســـتی گفتوگۆم لەگەڵدا بـــکا داوای لێ کردم کە چامەیەک دەربارەی جەماڵ عەبدولناسر بنووسم سوهێل ئیدریسی پێی وتم لە یەکەم لاپەڕەدا بڵاوی دەکەینەوە بێگومان منیش ڕەتم کردەوە . من بەزیانی شـــیعر هیچ گفتوگۆیەکم نییە. عەبدولناسریش دوای مردنی خۆشم ویست. کە لە ژیاندا بوو، لە دیمەشق و لە ڕۆژنامەی (الصدی العام) چەند نووسینێکم لەدژی ئەو نووسی.

* بـــەڵام تـــۆ لەماڵدا لەبارێکی گۆشـــەگیرییدا دەژیت! ئایا تۆ بەرگەی ئەم گۆشـــەگیریە دەگریت؟

**ماغوت:** دەتوانم دەســـاڵ بەتەنیا دابنیشم، قســـە لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەکەم، من بوونەوەرێکم گۆشەگیریم بەلاوە باشترە لە خۆرئاوادا هەست بە خەمۆکی دەکەم و دێوارانیش لەگەڵمایە .

* بەلای تۆوە ئیلتیزام لە شیعردا چی دەگەیەنێت؟

**ماغوت:** من شـــاعیری بەرەنگاریم، بەڵام نەک بە شـــێوازی شـــاعیرەکانی ســـەر مەنبەر ئەوانەی دەقیرێنن و هاوار دەکەن. شیعر بەرەنگارییە . کەسی بەرەنگاریش کە دەچێتە هەر پشتیرێ یان هەر گەڕەکێکەوە بانگەواز بۆ خەڵک دەدا. ئەوەی لە شـــیعردا بۆم دەستەبەر نەبێ هەوڵ دەدەم لە بواری شانۆ و نوسین وسیناریۆوە بەدەستی بێنم، من خوێنەرم خۆش دەوێ و بازرگانی بەسەرەوە ناکەم. من هەمیشە حەزدەکەم ببەخشەم لەوەی وەرگرم.


**سەرچاوە:**

گۆڤاری ئەلمەلامح

ژمارە یەکەم،ساڵی یەکەم، ئۆکتۆبەری ٢٠٠٦

لاپەڕە (١٠٣- ١٠٥)

## گفتوگۆیەك لە نێوان

# "موحسین مەخمەڵباف" و "فرنەر هێرتسوگ"دا

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**

**فرنەر هێرتسوگ:** من بەرلەوەی بە سینەمای ئێرانی ئاشنابم، ئاشنایەتیم لەگەڵ شیعری ئێرانیدا هەبوو. کلتوری ئێرانی تەمەنی پێنج یان شەش هەزارساڵێک دەبێت، کەچی تەمەنی لە ئەڵمانیادا لە چەند سەد ساڵێک تێپەڕ ناکات. کلتوری ئەڵەمانی توێژە سەهۆڵێکی تەنکە کە ئەستوریەکەی چەند سانتیمەترێکە و سەر ئاوی زەریایەکی پان و پۆڕ کەوتووە، لەبەرئەوە بە ئاسانی درز دەبات بەر بەریەت لەژێریەوە سەر دەرێنێت! لە سەردەمی منداڵیمدا و ئەو کاتەی دەسەڵات بە دەست نازییەکانەوە بوو، هەستم بەمە کرد.

**موحسین مەخمەڵباف:** من تێڕوانینێکی کەم بۆ کلتوری ئەڵەمانی هەیە. پێمواية لەلایەک خاوەنی ترادسیۆنێکی بەهێزی فەلسەفیەو لەلایەکی دیکەش خەسڵەتێکی دەمارگیرانەی هەیە. ئەم دەمارگیریەش لە پاشخانی کلتوری وڵاتی ئەڵەمانیا خۆیەوە، سەردەردێنێت. گەر سەرنج بدەیت ئەڵەمانەکان چۆن چۆنی پابەندی ڕێساکانی هاتوچۆن، تێدەگەیت کە دیسپلینی کۆمەڵایەتی چ ڕۆڵێکی گەورە لە کلتوری ئەواندا دەگێڕێت. هەر ئەم دیسپلینە کۆمەڵایەتیەشە وا لە خەڵک دەکات شوێن سەرکردە بکەون، هەر بە هۆی ئەم دیسپلینەشەوە توانرا بە ماوەیەکی کورت و دوای جەنگی جیهانی کەرتی پیشەسازی لە ئەڵەمانیادا ببوژێنرێتەوە. «هتلەر» و «ڕەزا شا» لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا، بنەمای پەیوەندی و هاوکاری نێوانیان، لەسەر بنەمای نەژادی نێوان ئێرانیەکان

و ئەڵەمانەکان دارِشتبوو. لەبەرئەوە ناکرێت بڵێین ئەڵەمانیا خاوەنی کلتورێکی کۆن نییە، چونکە ئەڵەمانیا کلتورێکی زۆر دێرینی هەیە. گرنگترین خەسڵەتی ئەم کلتورەش کۆنترۆڵ و دیسپلینە. ئەم دیسپلینەش لە ڕووی فیکریەوە لە فەلسەفەدا خۆی بەیاندەکات، هەروەها لەو ئابوریە پێشکەوتووەشدا دەیبینین کە لە ژیانی کۆمەڵگەدا هەیە، لە بواری سیاسیشدا لە فۆرمی فاشیزم و دەمارگیری و ڕەگەزپەرستیدا دەردەکەوێت، ئەمەش «هتلەر»ی گەیاندە دەسەلات. «هتلەر» قارەمان و سیمبولی ڕووە نێگەتیڤەکەی ئەو کلتورەیە، بەڵام هونەری ئەڵەمانی بەرز دەنرخێنین بەو پێیەی ڕویەکی پۆزەتیڤانەی ئەو کلتورەیە.

**فرنەر هێرتسوگ:** ڕاستەکەی.. سیاستوانەکان پەیوەندی نێوان میللەتەکانمانیان، خراپ بەکارهێنا. من دڵنیام پەیوەندی و کاریگەری زۆر کۆن لە نێوان هەردوو میللەتدا هەبووە، لێ سەردانم بۆ ئێران کرانەوەی ئاسۆیەکی گەورە بوو لە بەردەممدا. تەنانەت لە ناو ئێرانیەسادەو خاکیەکانیشدا، هەستم بەو خانەدانی و شکۆمەندیە کرد کە بەشێوەیەکی ڕەمزی لە «تەختی» پاڵەوانە بەناوبانگەکەتان لە زۆران بازیدا بەرجەستە بوو. شکۆمەندی و مەزنی ڕۆح بەشێکن لە شارستانیەتی ئێوە. گەر بمەوێت نمونەیەکی جوامێری و پیاوەتی بێنمەوە، ئەوا باسی «تەختی»م ئەکرد، کە ڕێگەی بەخۆی نەدا هەلی شکانی دەستی زۆرانبازی (........)* بقۆزێتەوە، لە یەکێک لە پاڵەوانیە نێو دەوڵەتیەکاندا. ئەمە خەسڵەتی کلتوری ئێوەیە کە لەسەر ڕێزگرتن و شکۆمەندی مرۆڤ دامەزراوە.

**موحسین مەخمەڵباف:** زۆرانبازی یەکێکە لەو وەرزشانەی گەنجانی ئێران حەزیان پێیەتی. ئەوان تەنها بۆ خاتری بەهێزکردنی جوامێری لە ناخی خۆیاندا، فێری ئەو وەرزشە دەبن، بۆ ئەوەی بتوانن لە کاتی دڵنیابونیشیان لەسەرکەوتن، دەستبەرداری چێژ و خۆشی سەرکەوتن بن.

**فرنەر هێرتسوگ:** هەروەها بەو سادەو ساکاریەش سەرسامم کە ئێرانیەکان قسەکردنی پێ دەستپێدەکەن، لەگەڵ ئەو گەرم و گوڕیەی لە گفتوگۆکردندا نیشانی دەدەن. بۆ نمونە لە یەکێک لە بازاڕەکانی شاری ئەسفەهاندا، هەموو ئەوانەی بینیمن و قسەم لەگەڵ کردن، بۆ هەموو پرسیارێک وەڵامێکی حازر بە دەستم وەردەگرت، بە پێچەوانەی ئەڵەمانیاوە کە خەڵک دەیەوێت تا بۆی دەکرێت بە کورتی وەڵامت بداتەوە. جارێکیان ویستم لە بازاڕی ئەسفەهاندا شتێک بکڕم، کە سەیرمکرد پارەی ئێرانیم پێ نییە و دەشم زانی نرخی (مارک)ی ئەڵەمانی لەو ڕۆژەدا بەرزترە لە ڕۆژی پێشوتر، بەڵام نرخەکەیم بە تەواوەتی نەدەزانی. دوای ئەوەی شتەکەم کڕی و ویستم بڕۆم، کابرای دوکاندار جانتایەکی چەرمی دامێ، بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو فەرقەی لە نرخی گۆڕینەوەی مارکدا هەبوو. ئەمەش بۆ خۆی خەسڵەتێکی دیکەی جوامێریەو بەشێکە لە کلتوری ئێوە.

**موحسین مەخمەڵباف:** ئەمە تێبینیەکی بەجێیە. دوای مردنی یەکێک لە هاوڕێکانم، هەموو هاوڕێکانی هەستان بە یارمەتیدانی خانەوادەکەی. لە کاتێکدا ئێمە دەبیستین لە خۆرئاوا — هەندێ جار- لاشەی ئەو مرۆڤانە بە مردویی دەدۆزنەوە کە تەنها بوون و کاتێک پێیان دەزانن کە بۆ گەنیان دەگاتە ماڵە دراوسێکان. ئەو کات شارەوانی هەڵدەستێت بە ناشتنیان، بەبێ هیچ یارمەتیدانێکی هاوڕێکانی یان خانەوادەی مردووەکە. پێموایە ئەمە جیاوازی نێوان کلتورەکان نیشان دەدات. وا

دیاره ئێوه به دەست تەنهاییەوە دەناڵێنن، له کاتێکدا ئێمه به دەست بێسەروبەری و فەوزاوە گیرۆدەین.

**فرنەر هێرتسوگ:** کارەکتەری ئەو گەنجەی له فیلمی (کلاکێتی نزیک)ی «کیارۆستەمی»دا که خۆی دەکات به تۆ، زۆر سەرنجی ڕاکێشام و هەستمکرد شاعیر بێت نەک قۆڵبڕ و تەڵەکەباز. ئەو کەسه به دوای شتێکدا دەگەڕێت بیکاته هونەرمەند. گەر ڕوبدات له ئەڵەمانیا کەسێکی فێڵباز خۆی وا نیشان بدات که ئەو «فرنەر هێرتسوگ»ە، ئەوا بێ سێ و دوو بۆت دەردەکەوێت ئەو کەسه تەڵەکەبازێکی گەمژەیه بێ سێ و دوو، بەڵام ئەو کارەکتەره له (کلاکێتی نزیک)دا، سەیر دەکەیت شانازی دەکات، لەبەر ئەوەی خەڵک وا مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن وەک ئەوەی تۆ بیت.

**موحسین مەخمەڵباف:** «کیا ڕۆستەمی» دەڵێت: (درکم به هێزی ڕۆحیی ئەم کەسه کرد)، بۆ نمونه توانی قەناعەت به خێزانێک بهێنێت به بیانوی ئامادەکردنی شوێنێک بۆ وێنەگرتن، بچێته ماڵەکەیانەوە. سەروەختێک «کیا ڕۆستەمی» له زیندان هێنایه دەرێ و هێنایەوە هەمان ماڵ، بۆ سەر لەنوێ وێنەگرتنەوەی ڕووداوەکە، ئەو گەنجه به ئەندامانی ئەو خێزانەی پێشتر فێڵی لێکردبوون دەڵێت: (دوا جار توانیم ئەو کاسته سینەماییه بێنم و وەعدەکەی خۆم بەجێ گەیاند).

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانم جیاوازی نێوان خەڵک له خۆرهەڵات و خۆرئاوا، بەمجۆره دیاری بکەم:

له خۆرئاوا سستم ئاڵۆز و دژواره، لێ کەینونەی مرۆڤ ساده و ساکاره و خاوەنی بەهرەو لێهاتوی پێویسته، بۆ جێبەجێکردن و ڕایکردنی ئەرکه زۆر ساده و دیاریکراوەکان. هەر یەکێک لەم ئەرک و وەزیفانەش بەشێکه له ئامێرێکی ئاڵۆز. «چارلی چاپلن» زۆر لێهاتوانه ئەمەی نیشان دەدا. له خۆرهەڵات سستم سادەیه، بەڵام کەینونەی ئینسانی ئاڵۆز و دژواره. مرۆڤی خۆرئاوایی بەدیدگایەکی زانستی – دۆگماتیستی سەیری دنیا دەکات، له کاتێکدا دیدگای مرۆڤ له خۆرهەڵات بۆ جیهان، زۆر شاعیرانه و عاریفانه و فەلسەفیانەیه. تۆ بۆ خۆت دەتوانیت لەمه دڵنیا بیت و درکی پێبکەیت.

هەر ئەوەندەت دەوێت کێت بینی بیدوێنه، ئیتر بەرگدرو بوو یان دوکاندار یان هەر کەسێکی تر. سینەما کارانی لای ئێمه – بەجۆرێک له جۆرەکان–، هەر بەم شێوەن. له ناو ئەوانەدا کەسانێک هەن سیناریۆ بۆ فیلم دەنوسن و دەرهێنانی بۆ دەکەن و کاری دیکۆر و جلوبەرگیش هەر خۆیان پێی هەڵدەستن، هەندێ جاریش ڕۆڵی تێدا دەبینن و مۆسیقاکەشی بۆ دەنوسن. به کورتیەکەی ئەوان له هەموو پیشەیەکدا لێهاتوو و دەست ڕەنگینن و له نێو ماڵی خۆشیاندا به هەمان شێوه ڕەفتار دەکەن. مرۆڤی ئێرانی له ماوەی ژیانیدا پەنجا ئیش دەگۆڕێت، ماڵەکەشی پێویستی به هەر دەسکاریەک هەبێت دەیکات. سەروەختێکیش بڕیاری خوێندن و خوێندنەوە دەدات، بەبێ جیاوازی هەرچی شتێکی بەردەست کەوێت دەیخوێنێتەوە. له کاتێکدا مرۆڤ له خۆرئاوا، هەموو ژیانی له خوێندنی جۆرێکی دیاریکراو له جۆرەکانی هونەردا بەسەردەبات. دوای ئەو کەسانی دی دێن تا ئەوەی ئەو دەستی پێکردبوو تەواوی بکەن. بەڕای من ئەمەشە وا دەکات مرۆڤ له خۆرئاوادا ژیانێکی پڕاوپڕ بژی، بەڵام له خۆرهەڵاتدا ژیانێکی بەرفراوان و هەمه لایەن ئەزمون بکات. ئێمه بەر لەوەی بمرین، دەتوانین چەندین جۆر ژیان ئەزمون بکەین، بەڵام ئێوه لەسەر یەک ستایلی ژیانکردن بەردەوام

دەبن تا دەیگەیەننە ئەنجام. ئەم دوو ستایلی ژیانکردنە باشی و خراپی خۆیانیان هەیە، بەڵام با بگەڕێینەوە سەر سینەمای ئێرانی و بزانین ئەو فیلمانە چین کە بینیوتن؟

**فرنەر هێرتسوگ:** هەردوو فیلمی (دیمەنی نزیک) و (بەڵام ژیان هەر بەردەوامە)ی «کیا ڕۆستەمی»م بینی، هەستدەکەم کارەکتەرێکی بەهێز لە پشت ئەم فیلمانەوەیە. لە فیلمەکانی تۆش، (جارێکیان لە سینەما) و (پاسکیل سوار) و (پۆستە چی)م بینیووە. لە هەموویان زیاتر بە (پاسکیل سوار) سەرسام بووم، پێشتر لە نامەیەکدا ئەمەم بۆ نوسیبوی. فیلمی (جارێکیان لە سینەما)دا، چامەیەکی ستایش و پیاهەڵدانە بە شکۆمەندی سینەمادا بە شێوەیەکی گشتی، نەک تەنها هەر سینەمای ئێرانی. لە (پۆستەچی)دا زۆر سەرسام بووم بەو چۆنیەتیەی کە وێنای مردنت کردبوو. لەو باوەڕەدا نیم پێشتر شتی لەو جۆرەم بینی بێت. پێموایە لە هەموو جێیەک خەڵکی فیلمی (پۆستە چیان) پێ پەسەند بێت و بە چاکی لێی حاڵی بن، لەبەرئەوەی ڕەنگە هەموو مرۆڤێک بە ئەزموونێکدا تێپەڕی بێت کە پەیوەندی بە مردنەوە هەبێت. هەر لە یەکەم دیمەنی فیلمەکەوە کە منداڵەکە ڕادەستی خانەوادەیەکی دەوڵەمەند دەکرێت، بەو هیوایەی لە داهاتودا بەختەوەر بێت، تێدەگەین کە ڕۆحی ئەو منداڵە خەریکە دەمرێت.

**موحسین مەخمەڵباف:** چ شتێک لە سینەمای ئێرانیدا جوانەو سەرنجتان ڕادەکێشێت، ناوەڕۆکەکەی یان شێوازە تەعبیریەکەی؟

**فرنەر هێرتسوگ:** هەردووکیان. لە سینەمای ئێرانیشدا هاوسەنگیەک لە نێوان ئەو دوانەدا هەیە. مرۆڤ کە سەیری فیلمەکانت دەکات، تێدەگات کە خۆت خۆت فێرکردووە و سینەمایەکی تایبەت بە خۆت و زمانێکی سینەمایی تایبەتت داهێناوە. بینەر کە فیلمی (پۆستەچی) دەبینێت، پێویستی بەوە نییە زمانی فارسی بزانیت یاخود لە ڕێی ژێر نوسی فیلمەکەوە حاڵی بێت، لەبەرئەوەی زمانی شیعری تۆ زمانێکی یۆنیڤێرسالیە.

**موحسین مەخمەڵباف:** ڕۆژنامەکانی لای خۆمان سەرکەوتویی سینەمای ئێرانی لە ڤیستیڤاڵە نێو دەوڵەتیەکاندا، بۆ ئەوە دەگێڕنەوە کە فیلمەکانمان باس لە هەژاری و نەخوێندەواری دەکات و ئەو شتانە نیشان دەدات. تۆ لەمبارەوە دەڵێیت چی؟

**فرنەر هێرتسوگ:** سەروەختێک سەیری (دیمەنی نزیک) دەکەم، بیر لە نەداری و دەستکورتی ئەو کەسانە ناکەمەوە کە تۆ نیشانی دەدەیت، بەڵکو تەنها بیر لە ناخی ئەو مرۆڤە دەکەمەوە. بۆ من ڕەفتاری ئەو کارەکتەرە بە ڕێز و جوامێریەوە، ڕەمزێکە بۆ شکۆمەندی نەتەوەیەک و کلتوری ئەو نەتەوەیە. ئەمەش زۆر بە چاکی لە فیلمەکەدا دیارە. بۆیە پێویستە گوێ بۆ ئەو جۆرە تۆمەتانە نەگریت و ئاوڕیان لێنەدەیتەوە. «کیرۆساوا»ش لە یابان، ڕووبەڕوی ئەمجۆرە تۆمەتانە دەبێتەوە. لە ڕاستیدا نەوەی نوێی سینەماکارانی ئێران، «عومەر خەیام» و «فیردەوسی» ئەمڕۆمانن. ئێوە شاعیرانی ئەم ڕۆژگارەن. گەیشتنی فیلمەکانی ئێوەش بۆ وڵاتانی دەرەوەی ئێران، بۆ خۆی دیالۆگێکی کلتوری شیعرییە لە نێوان عاشقانی جوانی سەرجەم گەلانی دنیادا.

**موحسین مەخمەڵباف:** بەبۆنەی ئەوەی کە باسی یابانت کرد، دوو ساڵ لەمەوبەر بەشداری ڤیستڤاڵێکی سینەمایم کرد لەوێ. فیلمی (پاسکیلسوار)یان نمایشکرد، دوای تەواو بوونی نمایشەکە چاوم بە ڕۆژنامەنوسانی یابان کەوت و لێیان پرسیم لە سینەماکارانی یابانی کێم بە دڵە. کاتێک باسم لە «کیرۆساوا» و «ئۆدزو» و «کۆبایاسی» کرد، سەیر بوو بەلایانەوە و دەیانپرسی: (ئەوانە کێن؟). سەروەختێک پرسیاری ئەوەم لە ڕێکخەرانی ڤیستڤاڵەکە کرد و سەرسوڕمانی خۆم بۆ باسکردن لەوەی ڕۆژنامەنوسانی یابان لە چاکترین دەرهێنەرانی سینەمایی وڵاتەکەیان بێئاگان، بۆم دەرکەوت کە ڕێکخەرانی ڤیستڤاڵەکە خۆشیان ئەو دەرهێنەرانە ناناسن. دوای نمایشکردنی فیلمی (پاسکیل سوار)، چوومە سەرەوە تا سوپاسی بینەران بکەم بەرامبەر بەو پێشوازیە گەرمەی لە فیلمەکەیانکردم، پاشان دەردەدڵی خۆم لە بێئاگایی ڕۆژنامەنوسانکرد بۆ ئامادەبووان و پرسیم: (چۆن دەبێت دەرهێنەرێکی گەورەی وەک کیرۆساوا لە وڵاتێکی دەوڵەمەندی وەک یاباندا، بەرهەمهێنەرێکی بۆ فیلمەکانی دەست نەکەوێت؟). کارێک کەوا دەکات سینەماکارانی ئەوروپایی پارەی بۆ کۆ بکەنەوە تا پرۆژەی تازەی خۆی بە ئەنجام بگەیەنێت، بەڵام لێرەشدا دەرکەوت کە کەس لە ئامادەبوان «کیرۆساوا» ناناسێت. تا دواجار مێژوونوسێکی بواری سینەما پەیدا بوو، دەستی کرد بە قسەکردن دەربارەی «کۆبایاسی» و»ئۆدزۆ»، وەها باسی دەکردن وەک ئەوەی دوو دایناسۆربن لەوانەی بەسەرچون و ئاسەواریان نەماوە. ئەو مێژوونوسە وتی: (ئۆدزۆ مردووە و کۆبایاسیش خەریکی دەرهێنانی زنجیرەیەکی تەلەفزیۆنیە، بۆ خاتری پەیداکردنی بژێوی ژیانی). هەستێکی پڕ لە شەرم و بێتاقەتی ئامادەبوانی هۆڵەکەی داگرت، کارێک کە ناچاری کردم داوای لێبوردنیان لێبکەم، لەوەی ئەو دەرهێنەرە مەزنانە دەناسم. پێموتن: (لە وڵاتەکەی منیشدا هەروایە، هونەرمەندانێکی زۆر گەورەمان هەیە کە لە دەرەوەدا زۆر لەوە ناسراوتر و بەناوبانگترن وەک لە وڵاتەکەی خۆیاندا..).

بەڵام من حەز دەکەم باسی بەرهەمەکانی خۆتمان بۆ بکەیت. ژمارەی ئەو فیلمانەی دەرت هێناون چەندن، تەنانەت کورتە فیلمەکانیش؟

**فرنەر هێرتسوگ:** بیرم نییە، لەبەرئەوەی نەمبژاردوون.

**موحسین مەخمەڵباف:** شتێکی سیرە، ئێمە هەر فیلمێک دەیکەین، دەبێتە شتێکی گرنگ لە ژیانماندا، لەبەرئەوە ژمارەی فیلمەکانمان دەزانین و لە بیرمانە. تەنها شتێک کە ناژمێرێن ئەو سیناریۆیانەیە کە سانسۆر دەکرێن و ئەو پرۆژانەیە کە سەر ناگرێت، بەڵام ئەو شتانەی بە ئاکام دەگات دەیانبژێرین، لە پێناو ئەوەی زیاتر بڕوامان بە خۆمان بێت و بۆ خاتری ئەوەی ئومێد پەیدا بکەین بەوەی شتێک لە سینەمادا بکەین.

**فرنەر هێرتسوگ:** منیش هەروەها پێویستم بەوەیە، بێ دابڕان و بە بەردەوامی کار لە سینەمادا بکەم. من ئەگەرچی فیلم گەلێکی زۆرم کردووە و نەمبژاردوون، بەڵام هەمیشە لە ناو لە مێشکمدا ئامادەن. من لەم ڕووەوە بە خەڵکی هەندێ هۆز و تیرەی ئەفریقایی دەچم کە دەزانن تەنها تا (دە) بژمێرن، بەڵام بە تەنها سەیرکردنێک بۆ ڕانێکی شەسەت سەری، دەست بەجێ دەزانن چ ئاژەڵێکیان

دیارنەماوە. فیلم گەلێک هەن هێشتا تەواوم نەکردون و بە ئەنجامم نەگەیاندون، هەندێکیان درامی و هەندێکی کەشیان دیکۆمێنتەرین (کورت و درێژ)، لەبەرئەوەی هەلومەرج لە بار نەبووە بۆ بە ئەنجام گەیاندنیان. بەڵام هیوادارم ڕۆژێک بێت و هەموویان تەواو بکەم. هەروەها فیلمێکم هەیە تا ئێستا نیشان نەدراوە، ئەوە دووەم فیلممە، نامەوێت تا لە ژیاندا مابم نامەوێت نمایش بکرێت، لەبەرئەوەی زۆر دڵڕەقانەیە. لەم فیلمە دیکۆمنتێریەدا منداڵان یاری بە کەڵەشێرێک دەکەن و ئازاری دەدەن، سەرەنجام کەڵەشێرەکە لە بەردەم کامێرادا مردار دەبێتەوە. شایەنی باسە لە سەروەختی وێنەگرتندا کۆنترۆڵم بەسەرخۆمدا نەما. منداڵانیش دەکرێت زۆر دڵڕەق و زبربن. پێش چەند ڕۆژێک تەلەفزیۆن هەواڵێکی وێنەیی لەسەر دوو منداڵ بڵاوکردەوە، یەکێکیان یانزە ساڵ و ئەوی دیکەشیان دوانزە ساڵ، ئەوەندەیان لە منداڵێکی دووساڵان دابوو تا کوشتبویان.

کامێرایەکی شاراوە وێنەی ئەوەی گرتبوو کە چۆن ئەو دوو تاوانبارە بچکۆلە قوربانیەکەیان بۆ لای وێستگەی شەمەندەفەرەکە ڕادەکێشن، تا بە بەرچاوی خەڵکەوە دەکەونە گیانی و ئەو خەڵکەش کەسێکیان نا جوڵێت. ئەگەرچی ئەو دیمەنانەی گیراون بێدەنگن، بەڵام دیارە کە هاواری منداڵەکە دەگاتە دوور. ئەوەی جێی داخە ئەوەیە کە مرۆڤی ئەم سەردەمە، بە وێنەی توندوتیژی ڕاهاتووەو بەرهەڵستی و ڕەتدانەوەشی لە بەرامبەریدا لاواز بووە. ئەمە هەر تەنها پەیوەندی بە شاشەو میدیای بینراوەوە نییە، بەڵکو لەوەش زیاتر تێدەپەڕێنێ بۆ ناو ژیان خۆشی. ئەو کامێرە شاراوەیە ئەوەی نیشاندااین، چۆن ئەو خەڵکانەی لە نزیک وێستگەی ئەو شەمەندەفەرەدا خەریکی شت کڕین بوون، بەلایانەوە سەیر نەبوو دوو مێرمنداڵ منداڵێکی بچوک بەدوای خۆیاندا ڕاکێشن و بە سەختی و دڵڕەقانە بەربنە گیانی.

**موحسین مەخمەڵباف:** دەکرێت ئەم مۆدێلە لە پەیوەندی بەسەر پەیوەندی، نێوان وڵاتانی زلهێز و گچکەشدا گشتگیر بکرێت. وڵاتانی زلهێز وەها هەڵسوکەوت لەگەڵ وڵاتانی بچوکدا دەکەن، وەک هەڵسوکەوتی ئەو دوو مێردمنداڵە لەگەڵ ئەو منداڵە بچکۆلەیەدا.

**فرنەر هێرتسوگ:** بەڵێ وایە، مێژووی فارس پڕیەتی لە هێرش و پەلاماری ڕۆمان و تورک و مەگۆلیەکان...

**موحسین مەخمەڵباف:** هەروەها هێرش و پەلاماری عێراقی و بەریتانی و ئەمریکایی. ئێستا ستایلێکی نەرم و نیانتر و هاوچەرخانەتری هێرش و پەلامار هەیە کە تەواوی ئەوروپاییەکان پەیڕەوی دەکەن، تەنانەت لەم ئان و ساتەشدا کە وەک دۆست و هاوڕێ مامەڵە دەکەین، کەچی ئەوان پەلکێشمان دەکەن و وەک چۆن منداڵی بچوک پەلکێش دەکرێت و لە باڵی دەنەون.

«سوهرابی سپهەری» لە قەسیدەیەکیدا دەڵێت: (با ئاوەکە لیخن نەکەین، پێدەچێت لە خوارەوە، کۆترێک ئاو بخواتەوە). یەکێک لە ڕەخنەگرە بەناوبانگەکانی ئێران «سپهەری» بەوە تاوانبار کرد کە وەک منداڵێک لەگەڵ کۆتردا یاری دەکات، ئەمە لە کاتێکدا ئەمریکا بە ناپاڵم لە ڤێتنام دەدات. «سپهەری» وەڵامێکی نەرم و لەسەرخۆی ئەو ڕەخنەگرەی دابووەو دەڵێت: (هاوڕێی ئازیز، من بڕوام وایە ئینسانەکان تا فێرنەبن ڕێز لە هەموو زیندەوەرێک بگرن، ئەوا لەسەر خەم ساردیان دەرهەق بە قەتڵ و عامی ڤێتنامیەکان و شوێنەکانی دیش، بەردەوام دەبن).

«سپهەری» هیچ کاتێک شیعری بۆ هیچ دەسەڵات و حوکمڕانێک نەنوسیووە، لێ هەرگیز ڕۆڵی نەیاری دەسەڵات و ڕژێمیشی وازی نەکردووە. شیعرەکانی ئەو لە دەرەوەی دنیای سیاسەتە، ئەو باس لە خۆشەویستی و ئەڤین دەکات. هەنوکە کە گەل لە توندوتیژی تەواو بوو، ئیتر ئاوڕ لە «سپهەری» دەداتەوە، بە مەبەستی تازەکردنەوەی ڕۆح و ویژدانی. شیعرەکانی ئەو کاریگەری لەسەر چەند نەوەیەکی ئێران بەجێ هێشت. یەکێک لە هاوڕێکانم سەری لە ماڵی «سپهەری» دا بوو. لەسەروەختی قسەکردنیاندا قالۆنچەیەک لێیان نزیک دەبێتەوەو هاوڕێکەم هەوڵدەدات پێی پیا بنێت، بەڵام «سپهەری» ڕێی لێدەگرێت و پێی دەڵێت: (نا هاوڕێ، تەنها مافی ئەوەت هەیە بەو قالۆنچەیە بڵێیت، نامەوێت لەم ژوورەدا بت بینم). کاتێک هاوڕێکەم قالۆنچەکە دەگرێت و لە پەنجەرەوە فڕێ دەداتە دەرەوە، «سپهەری» دەست بە گریان دەکات و دەڵێت: (ڕەنگە ئێستا قاچی شکا بێت. ئەبێت چی بەسەر بێت؟ لە دنیای قالۆنچەکاندا کەسی تێدا نییە دەست و قاچ بگرێتەوە. ڕەنگە ئەو قالۆنچەیە دایکی کۆمەڵە قالۆنچەیەک بێت و ئەوان چاوەڕێی گەڕانەوەی بن).

ئەڵبەتە ئەمە سەیرکردنێکی زۆر شیعریانەیە. گەر خەڵک و خوا خەمی تینوێتی کۆترێک و قاچی قالۆنچەیەکیان ببوایە، ئەم هەموو توندوتیژیەمان نەدەبینی. من پێموایە ئێمە بە پەیڕەوکردنی توندوتیژی لە دژی ئاژەڵان دەستمان پێکرد و پاشان ئەمەمان گواستەوە بۆ پەیڕەوکردنی لە دژی مرۆڤیش. ئەڵەمانەکان بە بیانوی پاراستنی تەندروستی و پاک و تەمیزییەوە، دەستیانکردن بە قەڵاچۆکردنی سەگە بەرەڵاکان. ئەمەش هەنگاوی یەکەم بوو بۆ خنکاندن و سوتاندنی مرۆڤ لە ژوورەکانی گازدا. مێژوونوسان بیریان چووە باسی شەڕ لە دژی سەگەکان بکەن، هەروەها دەرونناسانیش کاریگەری ئەو قەتڵ و عامەیان لەسەر دڵ و دەرونی ئەڵەمانەکان فەرامۆش کردووە. ئەو سەردەم و ڕۆژگارە، سەردەم و ڕۆژگاری پێشکەوتن و بەرەو پێش چوون بوو لە بواری پزیشکیدا. خەمی گەورەی خەڵکیش خۆپاراستن بوو لە دەرد و بەڵای سەگ. کەس ئەوەی بە جدی نەگرت کە ڕەنگە سەر شێتی مرۆڤ چ گۆبەندێک بنێتەوە. توندوتیژی لە دژی ئاژەڵ و منداڵ، هەروەها توندوتیژی لە سینەما و تەلەفزیۆن، بنەمای دڕندایەتی ئەم سەردەمە هاوچەرخەی ئێستامانن کە لە دەرەوە بە شارستانیەت ڕوکەش کراوە. بە داخەوە هیچ کەسیش لە هەوڵی ئەوەدا نییە، تا ئاستێک بۆ ئەم دڕندایەتیە دابنێت.

دەمویست فیلمێک لەسەر کچە بچکۆلەکەم دروست بکەم، کە دەیەوێت بەهۆی ئامێری کارەباییەوە مێش و مەگەز نەهێڵێت. بە کوشتن و توندوتیژی ڕاهاتوین. هەر شتێک ئیسراحەتمان لێ تێک بدات، هەوڵدەدەین بە ئاسانترین شێوە لەناوی بەرین. وەک ئەو قەڵاچۆکردنە فیزیکیەی لە دژی مێش و مەگەز پەیڕەو دەکرێت.

**فرنەر هێرتسوگ:** لەسەر وەختی دووەم جەنگی جیهانیدا و کاتێک لەشکری هاوپەیمانان هاتنە ئەڵەمانیا، توندوتیژی زیادی کرد. لەو کاتەدا هەم فاشیەکان و هەم هاوپەیمانان، توندوتیژیان بەکاردەهێنا. تەنانەت شەپۆلی توندوتیژی گەیشتە ئەو گوندە چەپەک و دورە دەستەش کە منی تێدا دەژیام. ئەم توندوتیژییە ئامێر و ئامرازی تایبەتی خۆی هەبوو. من کە ئەو کات تەمەنم چواردە ساڵان بوو، بۆمبی دەستیم هەبوو یاریم پێدەکرد. منداڵانی دیکەش یاریان بەو دەمانچە و چەکانە

دەكرد كە لە ناو ڕووبارەكەدا دەیان دۆزینەوە. ئەو چەک و تفاقانەی كاریان دەكرد و بە كەڵكی تەقەكردن دەهاتن و پڕی فیشەک بوون. ئەو منداڵانەی لە خۆمان گەورەتر بوون، فێریان دەكردین چۆن گوللە بە باڵندەوە بنێین. جارێكیان فیشەكێكم لە تفەنگێكەوە تەقاند، بەڵام وا ڕای تەكاندم دامی بە زەویدا. لەو كاتەدا دایكم بەرەو ڕووم هات و ئافرەتێكی گورج و گۆڵ و بەهیمەت بوو، نەلێ دام و نەسەرزەنشتی كردم — بە پێچەوانەی ئەوەی من چاوەڕێم دەكرد-، بەڵكو تفەنگەكەی هەڵگرت و چوو لەو بەرەوە پارچە تەختەیەكی لەسەر بەردێک دانا و گوللەیەكی پێوەنا، پارچەی تەختەكە چوو بە ئاسماندا، پاشان وتی: (چەک ئاوا دەكات، لەبەر ئەوە نابێت چەک نە لە تەختەو نە لە مرۆڤ بەرز بكەیتەوە)، ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە نەک چەک، بگرە دەستیشم لە كەس بەرز نەكردۆتەوە.

**موحسین مەخمەلباف**: كاتێک خەڵک كوشتەی توندوتیژی بن و خوی پێوە بگرن، ئەوا بەردەوام ئامێر و ئامرازی پێویستی بۆ دەدۆزنەوە. بە دارو تێلا دەست پێدەكەن تا دەگەنە بەكارهێنانی چەک و تفەنگ. سینەما یەكێكە لەو ئامرازانە، بەڵام سینەمای شیعری دەتوانێت ببێتە یارمەتی دەرێک بە هەست و نیەتە باشەكان. هار كاتێک بزنسمان و بازرگانەكان دەستیان بەسەر سینەمادا گرت، ئەوا بەكاردەهێنرێت بۆ گۆڕینی توندوتیژی بۆ ڕەفتارێكی یاسایی. دوای شۆڕش زۆرینەی سینەماكاران لە ئێران، ڕێگەیان نەدا لە فیلمەكانیاندا ڕەواج بە توندوتیژی بدرێت. كاتێک لە ڤیستڤاڵی ڕۆتەردامدا بەشداریم كرد، زانیم كە (سی) كەناڵی تەلەفزیۆنی هەیە و دەتوانم لە ژوورەكەم لە ئوتێلەكەدا بیان بینم. من ئەوەم بە دەسكەوتێكی گەورە و گرنگ دەبینی، بەڵام كاتێک دەستمكرد بە سەیركردنی كەناڵەكان، دەبینم لانی كەم دەدانەیان دیمەنی توندوتیژی پەخش دەكەن، یەكێک ئازاری ئەوی دی دەدات و یەكێكی تر خەریكی كوشتنە. دەیان كەناڵی دی دیمەنی سێكسی و بۆنۆگرافی نیشان دەدەن، هەرچی كەناڵەكانی دیكەشە، مشتومڕ و باس و خواس پەخش دەكات لە مەڕ كاریگەری توندوتیژی و پەیوەندی سێكسی لەسەر دڵ و دەروونی مرۆڤ. بەمجۆرە ئەو سی كەناڵە بەم شتانەوە سەرقاڵ بوون.

**فرنەر هێرتسوگ**: بەڕاستی ئەوە مایەی شەرمە. ئەوەی لە تەلەفزیۆن دەیبینین، بەڵگەی ئەوەیە كە ئەو پەتایە زۆر بە قوڵی لەناو كۆمەڵگەی خۆرئاوایدا بلاو بۆتەوە (مەبەستی پەتای توندوتیژیە، و. كوردی). ئەوەی ڕاستی بێت تەلەفزیۆن بۆ خۆی دوژمنی یەكەمی مرۆڤایەتیە. مرۆڤ كاتێک فیلمێكی چاک لە سینەما دەبینێت، ڕووی دەگەشێتەوەو خۆشی بە دەموچاویەوە دیارە، بەڵام كاتێک سەیری پرۆگرامەكانی تەلەفزیۆن دەكات، ئەوا هەست بە تەنهایی و خەمۆكی دەكات، ئەمەش بە ڕوخساریەوە دەبینرێت.

**موحسین مەخمەلباف**: گەر وامان دانا سینەما بریتیە لە هونەر و بزنس و پیشەسازی، ئەوا دەكرێت بڵێین سینەمای خۆرئاوا سێكس و توندوتیژی دەفرۆشێت و سینەمای هیندی خەون دەفرۆشێت، بەڵام سینەمای ئێرانی دەیەوێت شیعر هەناردە بكات.

**فرنەر هێرتسوگ**: بەڵێ ئەمە ئەو شتەیە كە بینەر لە فیلمەكانی تۆ و «كیا ڕۆستەمی»دا هەستی پێدەكات. ئەو شیعرەی ئێوە لە سینەمادا دەیخوڵقێنن، هەر بە تەنها ناگەڕێتەوە بۆ وڵاتەكەی

خۆتان، بەڵکو سنورە جوگرافیەکان دەبەزێنێت. گەورەترین کێشەی ئێمە لە ئەوروپادا ئەوەیە کە بە دەستی خۆمان، کلتورمان وێراندەکەین و تەنانەت زمانەکەشمان وێران دەکەین. لە ئەڵەمانیادا تەنها لە ٧٪ هاوڵاتیان سەیری سینەمای ئەڵەمانی دەکەن. جۆرێکی زۆر لە زیندەوەران و دارستان و دیمەنە سورشتیەکان تیاچون و فەوتان. من بۆ خۆم (بۆ نمونە) نامەوێت لە دنیایەکدا بژیم کە شێری تێدا نەبێت، تۆش شێریت «مەخمەڵباف».

**موحسین مەخمەڵباف:** منیش وەک تۆ دڵگرانم بە نەمان و لەناوچونی ئاژەڵان، بۆ نمونە شێر.

**فرنەر هێرتسوگ:** بەڵام تۆ شێری «مەخمەڵباف»، ئومێدەواریشم دوا شێر نەبیت لەم جەنگەڵەدا.

**موحسین مەخمەڵباف:** با موجامەلەکردن بخەینە ئەو لاوە، من دەمەوێت وردەکاری فیلمی داهاتوت بزانم.

**موحسین مەخمەڵباف:** ئەمەوێت فیلمێک دروست بکەم دەربارەی داگیرکردنی مەکسیک لەلایەن ئیسپانیەکانەوە، بەڵام لە ڕوانگەی هندیە سورەکانەوە. سیناریۆکەیم نوسیووەو «گابرێل گارسیا مارکیز»یش ئامادەیی خۆی نیشان داوە بۆ هاریکاریکردن. «مارکیز» نوسەرێکی مەزنە و بە چاکی ئاشنای سینەمایە. داوەتی کردوم تا لەگەڵیدا بەشداری لیژنەی هەڵسەنگاندن بکەم لە ڤێستیڤاڵی کۆڵۆمبیا. من بەر لە بیست و نۆ ساڵ بڕیارمدا بەشداری لیژنەکانی هەڵسەنگاندن نەکەم، دوای ئەزمونێک لە یەکێک لە ڤێستێڤاڵەکاندا، بەڵام کاتێک «مارکیز» داوەتی کردم ڕازی بوم.

**موحسین مەخمەڵباف:** «کۆبۆلا» بۆچی حەزدەکات لە بەرهەم هێنانی فیلمەکەتدا بەشدار بێت؟

**فرنەر هێرتسوگ:** ئەوە پێشنیاری ئەو بوو. من هەمیشە فیلمەکانم خۆم بەرهەمیان دێنم، بەڵام ئەم پڕۆژەیە پڕۆژەیەکی گەورەیە و بەشداری کردنی «کۆبۆلا» بۆ من بەسودە.

**موحسین مەخمەڵباف:** بۆچی پڕۆژەکە ئەوەندە زۆری تێدەچێت؟

**فرنەر هێرتسوگ:** تێچونی زۆر لەوە زیاترە کە گیرفانی من دەرەقەتی بێت. ئەسپێکی زۆر و جلوبەرگی جۆراو جۆر. شاری مەکسیک کاتی خۆی لەسەر ئاو بوو، بۆیە دەبێت وەها دروستی بکەمەوە.

**موحسین مەخمەڵباف:** حەز بەوە ناکەیت فیلمێک لە ئێراندا وێنە بگری؟

**فرنەر هێرتسوگ:** ئەگەر «تەختی» بمایە و زمانی فارسیم بزانیایە، حەزمدەکرد.

**موحسین مەخمەڵباف:** ئەی فیلمێکی دیکۆمێنتەری؟ حەزناکەیت مێژوی پێنج شەش هەزار ساڵێکی ئەو شارستانیەتە بپشکنیت کە گرنگی پێدەدەیت؟

**فرنەر هێرتسوگ:** بەڵام ئەوە کارێکی قورس و گرانە. فیلمێکی دیکۆمێنتەری لەسەر هۆزە

کۆچەریەکانی ناو ئێران، لەو کاتەشدا هەر کێشەی زمانم دەبێت و پێویستم بە یارمەتی تۆ دەبێت.. ئەی تۆ ئێستا بە چییەوە سەرقاڵیت؟

**موحسین مەخمەڵباف:** ئەم ساڵ دەمەوێت دەست بە دروستکردنی فیلمێکی نوێ بکەم. چوار سیناریۆم پێشکەش کرد، بەڵام تەنها لەسەر پێنجەم ڕازی بوون.

**فێرنەر هێرتسوگ:** بابەتەکەی چییە؟

**موحسین مەخمەڵباف:** چیرۆکێکە ڕوداوەکانی لە هندستاندایەو باس لە دوو منداڵ دەکات لە ڕێی گۆڕینەوەی نان بە گوڵ دەژین، تەنانەت هەندێ جاریش گوڵ بە بلیتی سینەما دەگۆڕنەوە. واتە ئەو دوو منداڵە دەستبەرداری پارە دەبن لە ژیانیاندا، پارە وەک ئامرازێک بۆ ئاڵوێرد و خەریکی ئاڵوێردی سروشتین. دەکرێت ئەوەی ئەوان دەیکەن، ناو بنێین پیشەی ئاڵوێردکردن بە گوڵ. ئەم دوو منداڵە بیری ئەو شاعیرانەمان دەخەنەوە کە لەسەر شەقامەکاندا شیعر لەبەر دوکان و کۆگاندا دەخوێننەوە، بۆ پەیداکردنی نان و ئاوی ڕۆژانەیان.

**فرنەر هێرتسوگ:** ئەمە چیرۆکێکی ڕاستەقینەیە، یاخود بەرهەمی خەیاڵە؟

**موحسین مەخمەڵباف:** بەر لە چەند ساڵێک، خەریکی بەرهەم هێنانی فیلمێک بووم و زۆر جار بۆ نان خواردن دەچومە چێشتخانەیەک. جارێکیان منداڵێکم بینی گوڵی بۆ خاوەن چێشتخانەکە هێناو لە بری ئەوە داوای خواردنی کرد. ڕۆژانی دواتر هەمان شت دوبارە بووەوە. بیرۆکەی ئەم فیلمە لێرەوە دروست بوو لە لام.

**فرنەر هێرتسوگ:** کەواتە بۆچی دەبێت فیلمەکە لە هندستان وێنە بگیرێت؟

**موحسین مەخمەڵباف:** ڕوداوی زۆرم لە دەوری بابەتە سەرەکیەکەی فیلمەکە کۆکردۆتەوە. دواجاریش هەستمکرد دەمەوێت فیلمەکە لە کەش و هەوایەکی تایبەتدا وێنە بگرم، وەک فەزای هندستان یاخود بەنگەلادیش. تەنانەت سیناریۆکەشیم نوسی و بڵاومکردەوە. پاشان سەردانی هندستانم کرد بۆ دیاریکردنی ئەو جێگایانەی وێنەیان تێدا دەگرم. لە ماوەی سەعات و نیوێکدا کە ماوەی نێوان فڕۆکەخانەیە بۆ شاری بۆمبای، ملیۆنێک مرۆڤم بینی لە کەناری شارەکەدا دەژین. قەڵەباڵغیەکی زۆر لە پیاو و ژن و منداڵ و تەنانەت سەگیش. خەڵکی عەورەتی خۆیان بە پارچە پەڕۆیەک دادەپۆشن و خواردن لەسەر لەپی دەستیان هەڵدەگرن، لەبەر ئەوەی هیچ قاپ و قاچاخێک شک نابەن، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرینەی ئەو خەڵکە بە تایبەتیش منداڵەکانیان، گۆرانی دەڵێن و سەما دەکەن. نەمتوانی لە هۆکاری ئەو دڵخۆشیە تێبگەم، تا لێم پرسین: (ئەو بەختەوەریەیان هۆی چییە؟)، لە وەڵامدا پێیان وتم: (ئەوانە بڕوایان وایە دوای مردن دێنەوە بۆ ئەم ژیانە و هەر کەسێکیش لەم ژیانەدا ڕازی و بەختەوەر بێت، جارێکی تر کە گەڕایەوە بە دەوڵەمەندی دێتەوە). منیش پێم وتن: (ئەوان ئێستا دەوڵەمەندن، چونکە دەوڵەمەندە ڕاستەقینەکان، لەگەڵ هەموو ئەو سەروەت و سامانەی هەیانە، بەدبەخت و دڵتەنگن). بەختەوەری هەستێکە ڕاستەوخۆ دەرگیری پارەو سامانی مادی نییە، ئەگینا ئەو ڕێژە زۆرە لە خەمۆکی و خۆکوشتن لە کۆمەڵگە زۆر پێشکەوتوەکان لە ڕوی مادیەوە،

نەدەبینرا. ئەو فیلمەی من کاری تێدا دەکەم دەوڵەمەندی بەرامبەر بە هەژاری دانانێت، بەڵکو باس لە ڕزگاربوون دەکات لەبیرو بۆچونە باوەکان (ڕزگاربون لەو بیروبۆچونانەی لەسەر دەوڵەمەندی و پارەداری هەن)، باس لە نهێنی ڕازی بونی ڕۆحی لە ژیان دەکات کەشێکی لێڵ و ناڕۆشن لە خۆ دەگرێت و دەکرێت ناوی بنێین، لێڵی و ناڕۆشنی هەژاران.

دوای گەڕانەوەم لە هند، سەر لەنوێ سیناریۆکەم نوسیەوە و بووبە چیرۆکێک دەربارەی ئەو هەژار و نەدارانەی، بەختەوەریان پشت بە عەدالەتی کۆمەڵایەتی نابەستێت، بەڵکو پشت ئەستورە بە فەلسەفەی ژیان. هەروەها کە لە هند بووم دیمەنێکی دیکە کاری تێکردم، ئەوەشم خستە ناو سیناریۆکەوە. ئەوە لە گرتوخانەیەکی چاکسازیدا بوو، ئەو گرتوخانەیە بۆ ئەو مێرد منداڵانە بوو کە بەهۆی ئەنجامدانی تاوانێکەوە زیندانی کرابوون. کاتێک لە پاسەوانەکەم پرسی پسولەیەک لە کوێ بێنم تا پێی بچمە ژوورەوە، وەڵامی دامەوە کە پێویست بەوە ناکات و هەموو کەس دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی بچێتە ژورەوە. کە چوومە ژوورەوە سەرم سوڕما، کاتێک زانیم هیچ کەس لەوانەی لەوێدان نایانەوێت ئەو شوێنە جێ بێڵن، لەبەر ئەوەی بە زیندانی نازانن. ئەوانەی لەوێدان ڕۆژی سێ جار نان دەخۆن و ژیانیان زۆر لە گوزەرانی پێشوتریان لەسەر شەقامەکان خۆشترە. نزیک بەو گرتوخانەی چاکسازیە، کۆمەڵە منداڵێکم بینی ژمارەیان خۆی لە سێ سەد کوڕ و کچ دەدا و تەمەنیان لە خوار هەژدە ساڵانەوە بوو، سەرقاڵی پێشبڕکێی ڕاکردن بوون. هەر جارەو لە پێشبڕکێیەکی سەدمەتریدا شەش کەسیان بەشدار دەبوو، بەڵام لەو شوێنەدا هیچ بینەر و هاندەرێکم نەبینی، چەپڵە بۆ براوەکان لێبدەن. ئەو پێشبڕکێیە بۆ ئەو گەنجانە دەرفەتێک بوو بۆ ئەزمونکردنی توانا تایبەتیەکانی خۆیان، هەر کەسەشیان شایەد بوو بەسەر بردنەوەو دۆڕاندنی خۆیەوە. لە نێوان ئەوانەدا کچێکم بینی تەمەنی لە شەش ساڵ زیاتر نەبوو، دیار بوو لەگەڵ خوشکە گەورەکەی هاتبوو. کاتێک خوشکەکەی دەستی بە ڕاکردن کرد، کچە بچکۆلەکە دەستی بە پاڕانەوە کرد تا خوشکەکەی بیباتەوە. واش دەرچوو، خوشکەکەی پێشبڕکێکەی بردەوە و منداڵەکە بۆ ئەوە سوپاسی ئاسمانی کرد. پاشان کەوتە پاڕانەوەو دۆعا کردن بۆ پێشبڕکێکارێکی دیکە، ئەویش بردیەوە.. ئەم دیمەنانە جگە لە من و خوا کەسی کەی نەیبینی. ئەڵبەت ئەمەیە وێنەی ئیمانی ڕاستەقینە کە لە تاقیکردنەوەدا سەرکەوتوو بوو. مرۆڤ ئەگەرچی بڕواداریش بێت، ئەگەر وەڵامی لای خواوە دەسگیر نەبێت، ئەوا گومان لە بونی خواو لە ڕاست و دروستی ئاینەکەشی دەکات. لە فیلمەکەمدا باس لە ستایلێکی تایبەتی عیرفانی هندی دەکەم کەبوو بە ئیلهام بەخشی «سوهرابی سوبهەری» و هانی دا بۆ ئافەرۆزکردنی ڕەشبینی، ڕەشبینیەک کە لەو سەردەمەدا لە ناو شاعیرانی ئێرانیدا باو بوو.

**فرنەر هێرتسوگ:** پێدەچێت تۆ ئەزمونێکی گەورەت دەسگیر بوو بێت. من پێموایە سینەما لە زۆر ڕووەوە بە وەرزش دەچێت. لە مێژوی هونەردا شاعیر و هونەرمەند نابینیت کە لە هەمان کاتیشدا وەرزشکاربن، بەڵام سینەماکار دەبێت وەرزشەوان بێت. دوای بینینی فیلمەکانت، گومانم نەما لەوەی کە تۆ بە سروشتی خۆت وەرزشەوانیت.

**موحسین مەخمەڵباف:** وایە.. بەهۆی لێدانمەوە بۆ ماوەی ساڵو نیوێک ڕاکردنم کرد. بەهۆی لێدان و سزادانی زیندانەوە ماوەی ساڵ و نیوێک دەشەلیم، دواجار ئەو شەلینەم بە ڕاکردن چارە کرد.

**فرنەر هێرتسوگ:** من لە تەمەنی منداڵیمدا وەرزشی خلیسکانی سەر بەفرم کردووە، ئەویش وەرزشێکی ترسناکە. ئێمە بەسەر چاڵی زۆر قوڵدا بازمان دەدا. لە حاڵەتی ئاسایدا مرۆڤ سەر دەبات بۆ دواوە، بەڵام ئێمە سەرمان بۆ خوارەوە شۆڕدەکردەوە، وەک یەکێک بیەوێت مەلە بکات، بۆ خۆلادان لە فشاری هەوا، وەک ئەوەی یەکێکمان هەوڵی خۆکوشتن بدات بە بازدانی لەو بەرزاییانەوە، بەڵام لە بڕیارەکەی پاشگەز دەبێتەوە کاتێک دەزانێت کەس بەهانای نایەت. ئەمە لەو کەسانە ڕوودەدات کە دەیانەوێت فیلم بکەن. تۆمادامەکی توشی ئەم کارە بوویت، کەس یارمەتیت نادات. پێویستە لەسەرت بەسەر هەموو ترس و کۆسپەکاندا زاڵ بیت و پرۆژەکەت بگەیەنیتە ئەنجام. بە شێوەیەکی گشتی گەرنەتوانی پەلاماری پۆلیس بدەیت، ئەوا نابیتە سینەماکارێکی باش.

**موحسین مەخمەلباف:** زاڵبون بەسەر جەهل و زانیندا بەهۆی ڕۆشنبیرییەوە، زۆر ئاسانترە لە پەلاماردانی پۆلیس و چەککردنی.

## پەراوێز:

* لە دەقە عەرەبییەکەدا ناوی ئەو وڵاتە دەرنەچووبو، لەبەر ئەوە ناچاربووین بە بەتاڵی جێی بهێڵین.

## سەرچاوە:

گۆڤاری (المدى).

# لە ئوستوورەوە تاکوو تراژیدیای فەلسەفە

## وتووێژ لەگەڵ موراد فەرهادپوور

لە فارسییەوە: مەنسور تەیفووری

کە باسی فەلسەفە دەکرێ، لە پڕ بیرمان بۆ لای یۆنان دەگەڕێتەوە کە تێیدا بۆ یەکەمجار بیری فەلسەفی لە نەریت و بیری ئوستوورەیی جیادەبێتەوە. بەڕای تۆ، چ هەل و مەرجێک لە یۆنان رەخسا و وایکرد لە هەناوی بیری ئوستوورەییەوە بیری فەلسەفی سەرهەڵبدات؟

یاکووب بۆرکهارت، لە بواری ژیارسازیدا باسی سێ هۆکار یان فاکتەر دەکات:

١-دەوڵەت،

٢-کولتوور،

٣-ئایین.

بۆرکهارت گەشەی ژیار یان شارستانیەتەکان بە پێی ئەم سێ فاکتەرە لێکدەداتەوە. سەبارەت بە یۆنان، خاڵی سەرەکی، قێک دیارکەوتنی هۆکاری کولتوورە، بەراورد بە دوو هۆکارەکەی دیکە؛ بە تایبەتیش پرسی دەوڵەت و لاوازیی پرسی دەوری دەوڵەت لە درووستبوونی ژیاری یۆنانیدا.

وەک دەزانین، یۆنان چ کات دەوڵەتێکی ناوەندیی نەبوو، بەڵکوو لە کۆمەڵێک دەوڵەت —شار پێکهاتبوو کە هەر کامیان سەربەخۆیی کولتووری و سیاسییان هەبوو. هەلومەرجی جوگرافیایی یۆنانیش ئەم فرەچەشنی و بێناوەندییەی بەهێزتر دەکردەوە: بوونی کۆمەڵە دوورگە و دوورگەی بچووک ،کە هاوکاتی ئەگەری

پێوەندیی و پێکگەشتن سەربەخۆ و جۆیش بوون؛ هەروەها نزیکی لە دەریا (هۆکارێکی جوگرافیایی دیکە بوو) کە کولتووری سەفەر و دەریاوانیی لەگەڵ خۆی دەهێنا؛ (هۆکارێکی جوگرافیایی دیکەش کە لە سەرکوتکاریی سیستمی رۆژهەڵاتی دووری دەخستنەوە) نەبوونی کشتوکاڵی چەقداری خاوەن سیستمی ئاودێریکردنی ناوەندی بوو، واتە ئەو هۆکارەی لە وڵاتە وشکەکانی وەک ئێران وایکرد سیستمی ئابووری بەشێوەی ناوەندیی و لە ژێر چاودێریی دەوڵەتدا کارەکەی بکات. لە ڕاستیدا، نەبوونی ئەم ناوەنددارییە جوگرافیایی، ئابووری و سیاسیە لە یۆنان، وایکرد دەوری دەوڵەت لە دروستبوونی ژیار یان شارستانییەتی یۆناندا زۆر کاڵ و کەم ببێتەوە.وەکی تر، ئایینی یۆنانی بەشێک بوو لە کولتووری یۆنانی و هیچ کات هۆکارێکی سەربەخۆ نەبووە لە کولتوور و ژیانی رۆژانەی یۆنانی، بەڵکوو کۆمەڵێک بۆنە و دابی جۆراو جۆر بوو کە لەگەڵ هەموو لایەنێکی ژیان تێکەڵ ببوو. بەم پێیەش، لە یۆناندا کولتوور توخمی سەرەکیی دروستبوونی شوناسە و لێرەوەشە کە ئەوەی یۆنانی لە نایۆنانی جوێدەکاتەوە، زمانە. یۆنانیەکان بەپێی زمانی یۆنانی لە شوناسی هاوبەشیان دەگەشتن، هەڵبەت رەنگدانەوەی ئەم زمانە لە ئوستوورە و هەندێ دەقدا، بە تایبەت حەماسەکانی ئیلیاد و ئۆدیسەدا، دەبینرێ. ئەم کولتوورە، کەلەپووری هاوبەشی دەوڵەت — شارە جۆراوجۆرە یۆنانیەکان بوو، هەروەها هەندێ بۆنەی هاوبەشی وەک پێشبڕکێی وەرزشیی ئۆلەمپیک یان کێبڕکێی نێوان تراژێدنووسەکان. گرنگایەتیی زمان لە شێوەگیریی شوناسی یۆنانیدا، لە وشەی بەربەردا رەنگدەداتەوە. یۆنانی بە نایۆنانییان دەگوت بەربەر. واتە زمانی کەسانی نایۆنانی وەک دەنگێکی بێ مانا یان بەربەر سەیر دەکرا و بیانیەکان بە زمان جوێدەکرانەوە بەربەر یان وەحشی لای یۆنانیەکان ئەو کەسانەن کە بە یۆنانی قسە ناکەن و قسەکردنیان لە دەنگێکی بێمانا دەکات. بەم شێوە، ژیاری یۆنان هەر لە سەرەتاوە بەپێی هۆکاری کولتوور دامەزراوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

## ❊ هۆکاری کولتوور وەک توخمی دیاریکەر لە ژیاری یۆناندا، چ کاریگەرییەکی دیکەی هەبووە؟

–نەبوونی دەوڵەتی ناوەندی یان لاوازکردنەوەی دەوری دەوڵەت، ڕێگەی بۆ دەرکەوتنی شتێک بە ناوی وشیاریی رەخنەگرانە و رسکانی تاکایەتی کردەوە. مادامیش کەسان دەیانتوانی لە دەوڵەت — شارێکەوە بچنە دەوڵەت شارێکی دیکە، زۆر لە دەوڵەت — شارەکەی خۆیان نەدەترسان، چونکوو هەمیشە ئەگەری چوون بۆ دەوڵەت — شارێکی دیکە هەبوو، ئەو دیسپۆتیزمەی بە «دیسپۆتیزمی رۆژهەڵاتی» ناسراوە لە یۆنان درووست نەبوو. لە بنەڕەتیشدا، دەوڵەت — شارەکانی یۆنان، لە بواری قەبارەو هێزی سەربازییەوە ئەوەندە گەورە نەبوون کە ئەو شێوەیەی سەرکوتکارییان پێ رێکبخرێ. کۆی ئەم هۆکارانە، وایکرد لە یەکێک لەم دەوڵەت–شارانەدا ئەزموونێکی ریزپەڕ و دەگمەن دەرکەوێ، ئەزموونێک کە، بە جۆرێک، ئەورۆکەش لە هەندێ لایەنەوە نموونەی نییە.

واتە ئەزموونی دیمۆکراسیی بەشداریانە. ئەم دیمۆکراسیە بەشدارانە، لە ڕاستیدا ناوکۆیی سەرەکیی دەرکەوتنی سەردەمی زێڕینی کولتووری یۆنان بوو، کە لە چەندین شێوەدا خۆی دەردەخست.

ترازێدیا و نەریتی ترازێدیانووسی یەکێکە لەم شێوانە. فەلسەفە و گوتاری ئەقڵانی، دەرکەوتەیەکی دیکەیەتی و، لە پاڵ ئەمانەشدا هونەری یۆنانی هەیە کە بریتین لە تەلارسازی و پەیکەرتاشی. هەڵبەت شێوەی دیکەی گوتاری ئەقڵانیش، وەک مێژوو، لەم خولەدا دەردەکەون. تۆسیدۆد کە لەسەر جەنگە ناوخۆییەکانی یۆنان نووسیویەتی و، پاش ئەو هیرۆدۆتی مێژوونووس لە یەکەم شێوەکانی دەرکەوتنی رامانی ئەقڵانین لە پرسە کۆمەڵایەتیەکان. بە تایبەت ئەو مێژووەی تۆسیدۆد نووسیویەتی تا ئێستەیش بێ نموونەیە. بەم شێوە، دەبینین ئەم ئەقڵانیەتە خۆی لە بونیادی سیاسیی یۆناندا دەردەخات، هەر ئەو شتەی پریکلس دەرکەوتەیەتی. هەموو ئەمانەش جۆرێکی وشیارانە ئەزموون کراوە، واتە یۆنانی ئاگایان لەو جیایی و جیاوازیەی نێوان خۆیان و کەسانی دیکە هەبووە، ئەمەش بە ئاشکرا لەو نامیلکەدا کە تۆسیدید لە زمانی پریکلیسەوە نووسیویەتی، دەبینرێ. لەو نامیلکەدا پەنجە خراوەتە سەر ئەم جیاییە (distinction). ئەمە ناوکۆییەکی گشتیە دەکرێ تێیدا دەرکەوتنی فەلسەفە لە یۆنان و بە تایبەت، پێوەندیی لەگەڵ دیمۆکراسی، هەڵبسەنگێندرێت.

*** یۆنانی، پێش چوونە نێو سەردەمی فەلسەفە، لە رێگەی بیری ئوستوورەییەوە سەیری جیهان و مرۆڤ و بوونیان دەکرد و، دواتریش رامانی فەلسەفی لە هەناوی ئوستوورەوە گەشەی کرد. دەتوانین باسی دوو جۆر ئەقڵانییەت، ئەقڵانییەتی ئوستوورەیی و ئەقڵانیەتی فەلسەفی بکەین، جیاوازیی ئەم دوو ئەقڵانییەتە چییە؟**

–رەنگە نەتوانین لێرەدا رێک وشەی ئەقڵ بەکاربێنین، بۆیە پێم باشترە ئەقڵ بۆ گوتاری فەلسەفی بەکار بهێنم. بەڵام گومانی تێدا نییە کە ئوستوورەش هەوڵێک بووە بۆ رێککردنی جیهان و کردنی مانا بە بەریدا، تا ئەو ئاستەی کە ئەم هەوڵە خۆی لە چوارچێوەی گێڕانەوەیەکدا کە خاوەن دەستوور و رێکێتی (order) ناوکییە و بۆ دەستوورێکی ئەقڵانی دەگەڕێ، پیشان دەدا. بەم پێیەش ئوستوورە، بە جۆرێک، هەوڵێکی ئەقڵانییە بۆ زاڵبوون بەسەر جیهانی دەوروپشتدا و تێگەشتن لێی. لەم لایەنەشەوە، ئوستوورە، خاڵی دەسپێکی فەلسەفەیە. رەنگە گەر رەخنەگرانە سەیری ئەم پرسە بکەین، واتە گەر ئوستوورە و فەلسەفەش وەک دابەزاندنی جیهانی دەرەوە بۆ زەینی مرۆیی سەیر بکەین، لێکچوونی ئوستوورە و فەلسەفە ئاشکراتر دەرکەوێ. لە هەردوو نموونەکەدا ئاگامان لێیە مرۆڤ بۆ راکردن لە نەناسراو و زاڵبوون بەسەر ترس لە سروشتی نەناسراودا، هەوڵدەدات ئەم نەناسراوە دەرەکی و ناوەکیە (سروشتی دەرەکی و ناوەکی) رێکبخات و مانادار بکات. بۆ ئەوەی بتوانێ بەرگەی بگرێ. ئەمە بە مانایەک خاڵی دەسپێکی ئەقڵە و لە ڕاستیدا دەسپێکی کەرەستانی (instrumentalization) ئەقڵ، واتە ئەو جێگەی ئەقڵ وەک کەرەستەیەک دەخرێتە خزمەتی پاراستنی خودەوە و، لەمە بەدوایە کە پێوەندیی لەگەڵ سروشت لایەنێکی تەواو کەرەستەیی، توندوتیژ و پەلاماردەرانە لەخۆ دەگرێ. گەر هەنگاوێک لە ئوستوورەوە بەرەو دواتر هەڵبگرین و بگەینە ئەو سەردەمەی کە جادوو شێوەی سەرەکیی کولتوورییە، هێشتا جیاکاریی لە نێوان ئەقڵ و دەستووردا نەکرابوو و هەموویان لە چوارچێوەی یەک گشتێتیدا (جادوو) بوون. جادوو تا ڕادەیەکی زۆر تەعبیر لە جۆرێک پێکەوە گونجانی مرۆڤ و سروشت دەکات؛ شێوەکاریی مرۆڤی ئەشکەوتنشین، سروشت هێماین و دەرهەست ناکاتەوە. کەچی لە قۆناغی پاش جادوودا

ئاگامان لە دابڕانی وێنە لە وشە و دەرهەستبوونەوەی وێنە و وشەیە. لە جادوودا، جۆرێک تەبایی لە نێوان مرۆڤ و سروشتدا هەیە، لە کاتێکدا قۆناغی دواتر، واتە قۆناغی animism، هەنگاو بۆ پێدانی گشتێتی دەنرێ. لە جادوودا بیرکردنەوەی دەرهەست (abstract)و گشتێتی پێدان نابینین، بۆیە پێوەندیی مرۆڤ و سروشتیش توندوتیژیی تێدا نییە. لە قۆناغی ئانیمیسمدا، یەکەم هەنگاو بۆ زاڵبوون بەسەر سروشتدا لە ڕێگەی داسەپاندنی چەمکە گشتیەکانەوە دەبینرێ. یەکەم چەمک، چەمکی گیانی گشتیە، کە تەنانەت تا ئەمڕۆش ریشەی سەرەکیی ئوستوورە و فەلسەفەشە. واتە گشتێتی پێدان و زاڵبوون بەسەر سروشتی دەرەکیدا لە ڕێگەی چەمکە دەرهەستەکانەوە. ئەم چەمکانە، سەرەتا شێوەیەکی گێڕانەوەییان (ئوستوورەیی) هەیە و پاشان قۆناغ لە دوای قۆناغ دەرهەستتر و ئەزموونکارانەتر دەبنەوە، کە بەرە بەرە دەگەنە فەلسەفە، میتافیزیک و پاشان بە تەکنۆلۆژیا و زانستی نوێ دەگەین کە تێیدا جیهان بە تەواوی تەسلیمی زەینی مرۆڤ دەبێ. ئەوەی بندەستی ئێمەیە، لە ڕێگەی ئەقلانییەتی کەرەستەییەوە، دەستەمۆ و پێملی مرۆڤ بووە. دەتوانین شوێنی ئەم بزوتنە لە جادووەوە بۆ ئوستوورە و پاشان بۆ فەلسەفە و ئا ئەوڕۆکە بگرین. لەم بزوتنەدا ئەقلانییەت سەرهەڵدەدات و هەڵبەت ئەم بزوتنە شوناسێکی دیالێکتیکی هەیە. واتە لە لایەکەوە تەعبیرە لە دابڕانی مرۆڤ لە سروشت، واتە ئەو شتەی مرۆڤ دەکاتە مرۆڤ و لەبەر ئەمەش لە ئوستوورەکاندا ئاگامان لە جۆرێک ترسە لە گەڕانەوە بۆ سروشت و بوون و بە حەیوان. بۆ نموونە، لە ئوستوورەی ئۆلیسدا دەبینین جادووگەر هاوڕێکانی ئەو دەکاتە بەراز. ئەقڵ، لە ڕاستیدا، جۆرێک دابڕانە لەم قۆناغە حەیوانی و سروشتییە، بەڵام حاڵەتە دیالێکتیکیەکەیەتی. مادامیش ئەم دابڕان و هەڵکەندرانە توندوتیژی و پەلاماری لەگەڵ بووە و ئەقڵیش دەبێتە کەرەستەی توندوتیژی بەرامبەر سروشتی ناوەوە و دەرەوە، جۆرێکی ناکۆکیش، ئەنجامێکی پێچەوانەی لێدەکەوێتەوە. هەر ئەو ئەقڵەی بڕیارە مرۆڤ لە سروشت داببڕێ و لە دۆخی حەیوانی رزگاری بکات، بە کردەوە بەرەو وەحشییەت دەیبات. وەکی تر، کۆمەڵگاش کە بڕیارە لە سروشت جوێ ببێتەوە، بە کردەوە خۆی دەبێتە سروشتێکی دووهەمین، کە دیسان یاساکانی لە دەرەوەی دەسەڵاتی مرۆڤە و ڕێک وەک سروشت بابەتێتیەکی نامۆیە کە ئێمە تەنیا کۆیلە و بندەستی ئەوین. یاسای کۆمەڵایەتیش، هەر وەک یاسا سروشتیەکان حوکمی ئێمە دەکەن. لێرەشدا ئاگامان لە دیالێکتیکێکە: لە لایەکەوە، هاوکاتی دابڕان لە سروشت، هەوڵێکە بۆ دروستکردنی وتووێژێک لەگەڵ سروشت، بۆیە دەتوانین بڵێین گونجان (ی سرووشت و مرۆڤ) مانای ئەو جێگەی هاوکاتی سەربەخۆیی جۆرێک هارمۆنی و هاوبەشی و نزیکیش هەیە. بەڵام لەلایەکی دیکەوە، هەر لە هەوڵ بۆ ئەم پێوەندیگرتنەدا، ئەقڵ کەرەستەیی دەبێتەوەو پێوەندیەکەی زەبر و زەنگاوی دەبێ، بەم پێیەش، مرۆڤ لە پرۆسەی زاڵبوون بەسەر سروشتدا، گیرۆدەی دەسکرد و کەرستەکانی دەستی خۆی دەبێ. کەواتە گەشەی ئەقڵ دوو لایەنی هەیە: لایەنی مرۆیی و لایەنی توندوتیژ و، ئەم دوو لایەنەش پێکەوەن. لێرەوەش دەتوانین بڵێین، چ لە فەلسەفە و چ لە ئوستوورەدا، هەوڵێک بۆ ئاگاداربوونەوە لە خود وەک بەشێک لە سروشت و ڕێکەوتن لەگەڵی و شێوەی توندوتیژانەی زاڵبوون بەسەر سروشتدا هەیە. لە راستیدا جۆرێک دیالێکتیکی نێوان ئەشق و ترسە. ترس لە سروشت، ئەقڵ دەکاتە کەرستە و ئێمە بەرەو توندوتیژیی و سەرکوتی سروشتی ناوەوە و دەرەوە پاڵدەنێ و، ئەشق بۆ سروشتیش، بەرەو جۆرێک

وتووێژ و هەڵس و کەوتی لاساییکارانە (mimetic) دەمانبات، کە ڕەنگە باشترین نموونەکەی یاری بێت.

## * میکانیزمی یاری چییە؟

-یاری ئەو شێوەیەی هەڵس و کەوتی مرۆڤە توندوتیژیی تێدا نییە، شێوەیەکە لە پێوەندیگرتن و وتووێژ کە تێیدا ترس و دەستکاری نابینی، یاری شوێنێکە ڕێسا، دەستوور و شێوەی هەیە، بەڵام هیچ یەک لەمانە کەرەستەیی توندوتیژ و داسەپاو نین، بەڵکوو خۆبەخۆ و تێکەڵ بە شادی و ئازادین، بەم پێیەشە یاری دەکرێ وەک سەر نموونەیەک بۆ هەڵسەنگاندنی شێوەکانی دیکەی ڕەفتاری مرۆیی سەیر بکرێ، واتە جێگەیەک کە هەموو توخمەکانی هەڵس و کەوتی مرۆیی ئامادەیە، کەچی نەک لە شێوەی توندوتیژ و سەرکوتکراویدا. یاری ئەقڵانییەتی تایبەت بە خۆی هەیە، بەڵام ئەم ئەقڵانییەتە چیدی ئەو ئەقڵانییەتە کەرەستەیی و تێکەڵ بە توندوتیژییە نییە. بەرێکەوت، ئەم یارییە بە تەواوی لەگەڵ ئەو جادووەدا کە سەرەتا ئاماژەمان بۆ کرد، تێکەڵ بووە. لە ڕاستیدا، بۆنەی جادوویی، جۆرێک یاری بووە. بەهەرحاڵ وەرچەرخانی ئەقڵ کە دەیتوانی بەشێوەی یاریی پێشبکەوێ، کەرەستەیی بۆوە و توندوتیژاویی پێشکەوت و ئەنجامەکەشی بوو بە ئەمەی کە کۆمەڵگای مرۆیی لە سەرەتاوە تێکەڵ بە دەسەڵات، توندوتیژی و بەخۆنامۆیی بووە.

## * بەرای ئێوە کام هۆکار وایان کرد میکانیزمی ئازادانەی یاری لە نێو ئەقڵانییەتی مرۆییدا دانەمەزرێ؟

-مادام، بە مانایەک، ئێمە تەنیا یەک مرۆڤایەتیمان هەبووە و ئەویش هەر ئەم ڕێچکەی گرتووە، ناتوانم بە وردی بڵێم گەر ئەم ڕێچکە نەگیرابا، چی ڕوویدەدا. لە هەرحاڵدا، بە داخەوە مرۆڤایەتی بە جۆرێک پێشکەوتووە کە تێیدا ئەقڵ وەک بەشێک لە هێزی دەروونی و زەینیی مرۆڤ کەرەستەیی بۆتەوە، لەبەر ئەوەی کە ئەقڵ زادەی خولی ترسە. زانی ئەقڵ لە ناخی ترسەوە، بە باشترین شێوە لە کتێبی ڕەچەڵەکناسیی ئەخلاقی فردریش نیچەدا وێنەکێشراوە. لەو کتێبەدا باسکراوە کە چۆن مرۆڤ لە نێو سروشت هەڵکەندرا و بوونەوەرێکی خاوەن توانای ناسین و بیرکردنەوە چۆن بەدیهات و، لەم نێوەدا دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکان چۆن سەریانهەڵدا و سەرکوتی غەریزە چۆن دەستی پێکرد و.. باسی زیاتر لەم کتێبە، لە دەرکەوتنی فەلسەفە لە یۆنان دوورمان دەخاتەوە.

## * چۆن لە وڵاتانی دیکە، بۆ نموونە ئێران، ئوستوورە ناگۆڕێت بۆ فەلسەفە، چۆن لەم شوێنانە ئەم گۆڕانە روونادات؟

-تا ئێستە لە دوو ئاستدا باسمان کردووە، ئاستێک بەراوردی کولتوورە جیاوازەکان و، لە ئاستێکی گشتیتردا باسی پرسی ئەقڵ و پێوەندیی بە گۆڕانی چەشنی مرۆڤەوە. ئێستەش دێینەوە سەر ئاستی بەراوردی کولتوورەکان.

بەڵام، لام وایە دەکرێ پردێک لە نێوان ئەم دوو ئاستەدا لێبدەین، چونکوو هۆکارێکی ڕسکانی وشیاریی و ئاگایی رەخنەگرانە، پێوەندیی نێوان خود و ئەویدییە. ئەم پرسە کە لە هەموو

کولتوورەکاندا هەیە، شتێکی گشتییە، کە پێوەندیی بە چەشنی مرۆڤەوە هەیە. لە ڕاستیدا، هۆیەکی کەرەستانی ئەقڵ ئەمەیە کە کۆمەڵگا دۆخی سیستمی دەسەڵاتی وەرگرتووە و ئێمە لە فەزای ئەقڵانییەتی یاری و ئازادی و گونجانی نێوان کەسان دوور کەوتینەوە، هەر ئەمەش تێکچوونی پێوەندیی خود و ئەویدییە، واتە جێگەیەک کە چیدی ئەویدی دەگۆڕێ بۆ شت یان بابەتێک و، لە ئەنجامیشدا پێوەندیی ئەقڵانیی من لەگەڵ ئەویدیش دۆخێکی کەرستەیی وەردەگرێ؛ واتە، من ئەویدیی وەک شتێک دەخەمە ژێر دەسەڵاتی خۆم، لە باتی ئەوەی ئاگایی هەر دوو لا بتوانن جۆرێکی دوولایەنە و بە پێی دیالێکتیکێکی ئازاد پەرە بستێنێ. کەواتە، خاڵی گرنگ ئەمەیە کاتێ کەسانی دیکە وەک شت سەیر دەکەین، بەرەو کەرەستاندن دەڕۆین. ئێستە پرسەکە ئەمەیە بزانین شێوە جۆراوجۆرەکانی پێوەندیی خود و ئەویدی چ کاریگەرییەکی لەسەر کولتوورەکان داناوە و چ زەمینەیەکی بۆ دەرکەوتنی ئەقڵانییەت و گەشەی دیمۆکراسی و ئازادی و، لە دواییدا رسکانی وشیاریی ڕەخنەگرانە خۆش کردووە. گەر بۆ لای یۆنان بگەڕێینەوە، ئەو خاڵەی دەکرێ جەختی لەسەر بکەینەوە، پێوەندیی خود و ئەویدییە. لەم بوارەشدا، پرسی سەرەکی دۆزینەوەی ئەویدیی ناوازەیە. خودی مرۆڤ لە وتووێژ لەگەڵ ئەویدیدا شێوەڕێژ دەبێ و هەر بەم پێیەش شوناسی ئەم ئەویدییە ناوازە، دیاریکەری ئەو نوقسانەیە کە بە شێوەی شت دەردەکەوێ. بۆ نموونە، بۆ گەلی جوو، ئەم ئەویدییە ناوازە خودا بوو. لەبەر ئەمەش لای جووەکان ئایین دەوری سەرەکی دەگێڕا و وشیاری و ئاگایەتی جوو لە ڕێگەی وتووێژ لەگەڵ خوداوە شێوەگیر دەبوو. لە یۆنان، بە تایبەت لە خولی حەماسیدا، ئەم ئەویدییە ناوازەیە مەرگە. بەم بۆنەوەش دەبینین تاکایەتی قارەمانەکانی حەماسە لەسەر بنچینەی ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ مەرگ شێوەگیر دەبێ و لە ڕاستیدا، لێرەدا وتووێژ لەگەڵ مەرگ بەردەوام دەبێ و، ڕۆدن تسوایگ وتەنی ، بە پلەی یەکەم بەشێوەی وتووێژ لەگەڵ ئەشق دەردەکەوێ. ئەشق مانای ئەویدی، بەڵام ئەو ئەویدیە ڕەهایە، مەرگە. لە حەماسەشدا ئاگامان لەم وەرچەرخانەیە کە خودی قارەمان بە پلەی یەکەم لە ڕووبەڕوبونەوە لەگەڵ ئەشقدا بەخەبەر دێت، بەڵام لە دایکبوون و وشیاربونەوەی حەقیقی ئەو کاتەیە تێدەگات ئەشق دەمامکێکە لەسەر سیمای مەرگ. بەم پێیە، شوناسی قارەمانی حەماسیش بەم جۆرە شێوەگیر دەبێ. بەهاکانی قارەمانی حەماسی چ نییە جگە ڕێز، کەرامەت و شەرافەتی قارەمانیی خۆی، هەمان ناو و بەدناوی، ئامادەشە هەموو شتێک بۆ پاراستنی ئابڕوو و ناوەکەی قوربانی بکات و ناوی نەزڕێ. ئەم پاراستنی ناوەش چ نییە جگە ململانێ لەگەڵ مەرگ. ئەو شتەی دەتوانی لە جەنگ لەگەڵ مەرگدا بیپارێزی، ڕێزی قارەمانێتی و ناو و نیشانە. کەوابوو تاکایەتیی قارەمانی حەماسی لە دەوری پاراستنی ناوی خۆی شێوەگیر دەبێ. کەوابوو، لە سەردەمی حەماسیدا، لەگەڵ وەها خودێک ڕوبەڕووین.

## * ئەم «من»ە حەماسیە چۆن دەگۆڕێ بۆ تراژێدیا کە مرۆڤی تراژیکی بەدوادا دێت و لە دواییدا خود و مرۆی فەلسەفی شێوەگیر دەبێ؟

-دەتوانین بڵێین لە یۆنان جۆرێک جێگۆڕکێ ڕوودەدات و ئەو ئەویدییە ناوازە دەگۆڕێت. مردن جێگە بۆ دەوڵەت-شار چۆڵ دەکات. خود و تاکایەتی، چیدی نەک بەرامبەر بە مەرگ، بەڵکوو بەرامبەر دەوڵەت —شار، واتە کۆمەڵگا، شێوەگیر دەبێ. بۆیە خود، خۆیەتی و تاکایەتیی، تایبەت بە

قارەمانان نییە و هەموو کەس دەتوانێ هەیبێ. لە کاتێکدا، لە خولی حەماسیدا، تەنیا هەندێ کەس دەیانتوانی خاوەن خۆیەتی و تاکایەتی بن، گەر بڕیار بێ هەمووان ئاشیل بن، دیارە جەنگی ترۆی روویندەدەدا. لە راستیدا تراژێدیا ئەو شێوەیە کە تاکایەتی مرۆڤی یۆنانی لە وتووێژ لەگەڵ مەرگەوە بەرەو وتووێژ لەگەڵ دەوڵەت —شار دەگوێزێتەوە. تراژێدیا تاکی یۆنانی بەرەو خەرەندی نەبوون دەبات و لەگەڵ مەرگی رەها رووبەڕووی دەکاتەوە، پاشانیش لە ناخی ئەم مردنەوە، سەر لەنوێ شێوەیەکی نوێی ژیان دەخوڵقێنێ کە بەزۆری دەگەڕێتەوە بۆ سەر رێکخستنی نوێی کۆمەڵگا. هەر ئەمەشە لە تراژێدیاکاندا، لە نێوان پێداویستیە فەردیەکان و پێداویستیە کۆییەکاندا ناکۆکی دەبیندرێ، واتە لە نێوان یاسا و ڕێساکانی بنەماڵە و یاسا و ڕێساکانی قۆناغی دامەزرانی دەوڵەتدا جیاوازییەکی بنچینەیی هەیە — وەک کێشەی نێوان ئانتیگوونێ و کرێئۆن. بەم پێیە دەتوانین بڵێین، تراژێدیا مرۆڤی یۆنانی پاش بردن بۆ لێواری نەبوون، بەرەو ئاگۆرا (Agora) یان گۆڕەپانی شار دەگێڕێتەوە، واتە بەرەو ئەو جێگەی ژیان هەیە و مرۆڤ تێیدا ژیانیان رێکدەخەن، بەرەو شوێنی وتووێژ. بە ڕێکەوت، هەر لەم ئاگۆراشدایە سوقرات خەریکی لێدوان و دانانی فەلسەفەیە. مرۆڤی فەلسەفیش، بە مانایەک، هەر لەم رێچکەدا شێوەگیر دەبێ.

## * مرۆڤی فەلسەفی هەر ئەو ڕێگەی بڕیوە کە تراژیدیا پێواویەتی؟

-نا! رەنگە کێشەکەی نیچەش هەر لەسەر ئەمە بێ. ئەمەی کە سوقرات و ئەفلاتوون ئەو رەشبینیە تراژیکەیان بە جۆرێک ئەقڵی دەرهەست شاردەوە و وێنەیەکی وەهمکرد و گەشبینانەیان لە جیهان بەدەستەوەدا. لە هەر حاڵدا، بێگومان تراژێدیا رێگەی بۆ دەرکەوتنی شێوەیەک لە تاکایەتی خۆش کرد، کە بەرامبەرەکەی ئەویدی یان دەوڵەت– شارەکەی خۆی بوو. ئەم پرسە، بە گشتی، هەر ئەو ناوکۆیەیە تێیدا دیمۆکراسیی بەشداریانەی ئاتێن شێوەگیر دەبێ و فەلسەفەش — واتە ئاکادیمیای ئەفلاتوون و لیسیۆنی ئەرەستوو لە ئاتێن درووست کران. ئەگەرچی هەردووکیان جنێویان بە دیمۆکراسیی یۆنان دەدا، بەڵام جگە ئاتێن چ شوێنێکیان بۆ دەربڕینی ئازادانەی بیروڕاکانیان نەدۆزییەوە. لە ڕاستیدا، دیمۆکراسی ئاتێن ڕێگەی کردەوە فەلسەفە دامەزراوەیی ببێتەوە و، بەکردەوە فەلسەفە، واتە وتووێژ لەگەڵ ئەویدی و وتووێژ لە مەیدانی (سەرەکیی دەوڵەت —شار و لە کەشی کۆیی و کۆمەڵایەتی یان هەمان ئاگیۆرادا) هەلی بۆ ڕەخسا. بەم پێیە، دیمۆکراسیی ئاتێن مەرجی پێویست و بنچینەیی کۆی گوتاری ئەقڵانییە، کە لە شێوەی فەلسەفەدا دەرکەوت و دواتریش بەردەوام بوو.

## سەرنج:

ئەم وەرگێڕانە، بەشێکی ئەم وتووێژەی لە خۆ گرتووەو، هۆیەکەشی ئەوەیە دواتر پرسیارەکان دێتە سەر باسی هۆی بەدینەهاتنی گوتاری و ئەقڵانییەتی فەلسەفی لەم ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و بە تایبەت ئێرانی کۆن و نوێ، کە لە وەڵامدا نووسەر ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە سێکوچکەی ئایین، کولتوور و دەوڵەتدا، کە یاکوب بۆرکهارت باسی دەکات، لە وڵاتانی وەک ئێران و لە کۆر رۆژهەڵاتی ناوەراست، دەوڵەت یان هەمان دەسەڵات دەکەوێتە سەرەوەی سێکوچکەکە و ئەمەش وا دەکات دەوڵەت و دەسەڵات لە هەموو شتێکدا ناوەند بێت و هەموو شتێک بۆ ئەو بگێردرێتەوە،ئەمەش بە جورێک بیری هەمان حوکمی مارکسمان دەخاتەوە دەربارەی سەرکوتکاریی رۆژهەڵاتی کە بەندە بە دەسەڵاتەوە و لەمەشدا جوگرافیا و بەسرانەوەی ژیان بە سەرچاوەکانی ئاوەوە هۆکارێکی گەورەبوونی دەوڵەتن، واتە دەوڵەت وەک خاوەنی سەرچاوەکان و دابەشکاریشیان. دیارە ئەم سەرنجانە دەتوانێت لە سەر کۆمەڵگای کوردیش راست بێت و جۆری ژیانی ئێمەشی پێ لێکبدرێتەوە، بە تایبەت کە پرسی دەسەڵات تا ئێستاش لە چەقی گوتاری ئێمە و سەرجەم وڵاتان و کولتوورەکانی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەراستدایە .وەرگێڕی کوردی

## سەرچاوە:


گستره اسطوره، گفتگو، محمد رضا ارشاد، هرمس، اول، ٨٢، ١٤٥-١٢٩ .

## خورخێ لویس بۆرخیس

# نووسەرە ئەوروپییەکەی تاراوگە

ڕیچارد کیرنی
لە ئینگلیزییەوە: دیار عەزیز شەریف

**خۆرخی لویس بۆرخیس (١٨٩٩–١٩٨٦) نووسەرو شاعیرو ڕەخنەگری ئەرژەنتینی. لە کتێبەکانی «حەوت شەو»و «خەونی پڵنگەکان»و «ڕاپۆرتی دکتۆر برودی»و «لێپێچینەوەکانی تر»و «کتێبی بوونەوەرە خەیاڵکراوەکان»و «پێچو پەناکان».**

**بۆرخیس لەتافی لاویدا هەمیشە سوربوو لەسەر گرنگی گەشتە بەردەوامەکانی بۆ دەرەوەی ئەرژەنتین، بەتایبەتی دانیشتنی کاتی لە شاری ژنێڤ (١٩١٤–١٩٢١)، ئەو شوێنەی بۆ یەکەمجار هەریەکە لە کۆنرادو بودلیرو جۆییسی تێدا دۆزییەوەو بەگوێرەی وەسفی ئەو چووە ڕیزی «نوێگەری ئەدەبی جیهانی».**

**کیرنی**: پێموایە کاتێکی گونجاو بێت، مادامەکی تۆ لێرەیت لە دبلن بۆ بەشداریکردنت لە فیستیڤاڵی سەدساڵەی جۆیس، تاوەکو دەکرێت بە قسەکردن لەبارەی پێوەندی ئەدەبیت لەگەڵ جۆیس دەست پێبکەیت. لە ١٩٢٥ ئەوەت ڕاگەیاند شانازی بەخۆتەوە دەکەیت کە دەبیتە (یەکەم سەرکێشی ئیسپانی کە چووبیتە نێو جیهانی جیمس جۆیس)ەوە. چۆن وەسفی ئەو سەرکێشییە بۆ نێو جیهانی جۆیسو ئەدەبی ئەوروپی مۆدێرن دەکەیت؟

**بۆرخیس**: با بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای بیستەکان. هاوڕێیەکم چاپی یەکەمی ڕۆمانی یۆلیسیسی پێدام کە تازە لەلایەن سیلیڤیا بیتش لە پاریس چاپکرابوو.

زۆر بەجوانی پەڕە بەپەڕە کتێبەکەم خوێندەوە، بێگومان تێینەگەیشتم. بەهەرحاڵ، لە سەرەتاوە بۆم دەرکەوت کە لەبەردەم کتێبێکی بەپێچو پەنای نائاسادام. بەڵام کتێبێکی چۆن چۆنی؟ پرسیارم لەخۆم کرد. هەر کاتێک بیرم لە یۆلیسیس دەکردەوە، ئەوا کەسایەتییەکانی یەکەم- ستیڤنو بلوم یان مولی- نەیاندەهەژاندم، بەڵکو ئەو وشانە هەژاندمیان کە ئەو کەسایەتیانەیان بەرهەمهێنابوو. ئەمەش قەناعەتی پێهێنام کە جۆیس بەپلەی یەکەم شاعیر بوو. ئەو لە پەخشان شیعری دروست دەکرد. کەشفکردنەی دواترم بۆ هەڵسانەوەی فینیگانو poems penyeach ئەو ڕایەی لا چەسپاندم. کاتێک لە ڕۆماننووسانی وەکو تۆلستۆیو کۆنراد یان دیکنز ڕادەمێنم، ئەوا بیر لە کاراکتەر یان گرێچنە بەهێزەکانیان دەکەمەوە، بیر لەو مەسەلەیە دەکەمەوە کە چیرۆکەکانیان پێکدێنێت. بەڵام لەگەڵ جۆیس، دیقەت دەدەمە  فۆرمەڵەکردنو وشەکانی زمان خۆی، لەسەر ئەو ڕستە مۆسیقییەی هەرگیز لەیاد ناکرێتو لە هەوڵ و کۆششدایە، بۆ گەیشتن بە حاڵەتی شیعر. ئێستا دوای تێپەڕبوونی شەست ساڵ بەسەر یەکەم دیداری چاوەڕواننەکراوم لەگەڵ جۆیسدا، بە چاوخشاندنەوە بە نووسینەکانم، دەبێ دان بەو ڕاستییەدا بنێم کە من بەردەوام بەشداریم لە شەیدابوونی جۆیس لەگەڵ وشەدا کردووە، خۆم بەردەوامبووم لە ئیشکردن لەسەر زمانەکەم لە چوارچێوەی شێوازێکی شیعری. لە ناوەڕۆکدا، بەکارهێنانی فرەمانای وشەکانو چێژوەرگرتن لە دەنگدانەوەی بنەچەی گۆکردنەکانو لەرینەوە ناکۆتاکانیان. کاراکتەرەکانم هیچ نین جگە لە بەهانەیەک بۆ گەمەکردن بە وشەکان، بۆ چوونە نێو جیهانی خەیاڵیی زمان. ئەوە خولیای جۆیس بوو بۆ زمان کە وای لێدەکات نووسەرێکی زۆر قورس دەرکەوێت، ئەوە ئەگەر وەرگێڕانی ئەستەمیش نەبێت، بەتایبەت بۆ زمانی ئیسپانی، وەک ئەوەی من لەکاتی وەرگێڕانی پارچەیەکی لەگەڵ خۆدوانی مولی لەساڵی ١٩٢٥ ئەوەم کەشفکرد. من وادەبینم وەرگێڕانی جۆیس بۆ ئیسپانی یان زمانە دەرکەوتووەکانی لاتینی تا ئەمڕۆکەش زۆر زەحمەت بێت. وشەکانی پێکهاتەیەکی هارمۆنییان هەیە کە بەباشترین شێوە لەگەڵ زمانەکانی ئەنگلۆساکسۆنی یان ئەڵمانی تەبادێنەوە. جۆیس بۆ بەرهەمهێنانی شیعر پەخشانی بەکارهێنا، پێموایە دەبێ سەرجەمی کارەکانی وەک شیعر بخوێندرێتەوە.

**هینی**: من پرسیاری ئەوەم لا دروست بووە کە چ شتێک ئەو جیاوازییە دروست دەکات لەنێوان بەکارهێنانی زمان لای جۆیس لە شیعرەکانی، میوزیکی چامبێر بە نموونە، لەگەڵ بەکارهێنانی زمان لە کاری پەخشانەکانی، پۆرتێرێت یان یولیوس بەنموونە. ئەوە بۆ من ئەوە دەردەخات کە جۆیس بە پلەی یەکەم وەک جۆرێک لە باسکەر لە زمان نزیک دەبێتەوە، ئەو خزمەتکارییە گوێڕایەڵییەی زمان دەهێڵێتەوە، هەروەها ئەو تێبینیە بەدەنگی بەرز دەخوێنێتەوە کە لە ئەدەب وەریدەگرێت. لە کاتێکدا لە پەخشاندا  شتێک بەرەڵادەبێتو لەڕێیەکی تر سەرهەڵدەداتەوە. لەکاتێکدا جۆیس هەوڵی دەدا ڕاستەوخۆ لە شیعر نزیک ببێتەوە، ئەوا ئەوەی پیشان دەدا کە تووشی تەنگو چەڵەمە بووە. سەربازی ئەمەش بوونی شاعیرێکی یاخی داهێنەر لەناوەوەیدا توانای ئەوەی پێبەخشیبوو کە گەمە بە پەخشان بکات، بەشێوەیەک کە لەپێشدا فۆرمی داهێنەرانەی بەو جۆرە بەدی نەکراوە.

**کیرنی**: لە وتارێکتا لە ساڵی ١٩٤١ ستایشی شێوازی نووسینی جۆیس دەکەیت، بەوەی (چاکترین لاپەڕەگەلێک کە تائێستا لەبارەی ستایلی نووسین نووسرابێت). ئایا پێتوایە جۆیس کاریگەری بەسەر شێوازی نووسینتەوە بووبێت وەک نووسەرێک؟

**بۆرخیس:** ئەو شێوازە بوێرەی کە جۆیس لە نووسینی یۆلیسیس گرتیەبەر، بەوەی هەر بەشێک یان ئەڵقەیەکی بەپێی ستایلێکی جیاواز نووسی، تووشی شۆکی کردم. کارەکانم هەروەها ستایلی جیاجیای تێدا بەکارهاتووە، بەڵام دڵنیانیم لەوەی، بەهەرحاڵ، کە کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆ هەبوو بێت. لە حاڵەتی بوونی ئەو کاریگەرییەش، ئەوا لە نائاگاییەوە بووە. هەرچی ئەو نووسەرانەی کاریگەرییەکی ئەدەبی ئاگایانەیان بەسەرمەوە هەبووە، ئەوە ستیڤنسونو تشیسترتونو کیبلنگو برناردشۆ بوونە. ئەوانە خاوەنی ئەو بەرهەمانەن کە لە ڕۆژگاری گەنجێتیمدا، ئەو دەمەی لە بۆینس ئایرس دەژیام خوێندومنەتەوە. کاتێکی زۆرم لە کتێبخانەکەی باوکم بردە سەر کە ژمارەیەک کتێبی ئینگلیزی گرنگی تێدابوو. منداڵیم بە خەونبینین بەو داهێنەرانە بردەسەر، لەگەڵ کیبلنگ لە هیند، لەگەڵ کولیرج لە ئیکسانادو، لەگەڵ دیکنز لە لەندەن ژیام. ڕەنگە ئەو شوێنە یەکەم ئەزموونی ئەدەبی من بوو بێت وەک سەرکێشییەک لە نێو هەمەجۆرییەکی ناکۆتای ستایلەکان. کتێبخانەکە لە عەقڵێک دەچوو کە خاوەنی زۆر زمان بێت. لەوساوە خووم بە کتێبخانەکانەوە گرت (هەروەکو ئەو حاڵەتەم لەگەڵ زۆربەی کەسایەتییە خەیاڵییەکاندا هەیە). کارێکی زۆرم لە کتێبخانەی بۆینس ئایرسی نیشتیمانی کرد کەوا زیاتر لە نۆسەد هەزار کتێبی لەخۆوەگرتبوو، بەڵام ئەو ساڵەی لەوێ کرامە بەڕێوەبەر– ١٩٥٥، دوای ڕووخانی بیرون– ساڵی لەدەستدانی چاوەکانم بوو. من لەوێدا، بە کتێب دەوردرابووم کەچی لە توانامدا نەبوو بیانخوێنمەوە. هەندێکجار خۆم دەخەمە ئەو بارەی کە ئێستاش توانای بینینم هەیەو، ئەو مەسەلەیەش تائێستا بەردەوامە، خۆم دەخەمە نێو ئەو کتێبخانە ئەم کتێبخانەو کتێب دەکڕمو لەو وەهمەدام کە توانای خوێندنەوەم تێدایە. کەچی ئاستەنگەکە لەوێوە دەبینم کاتێک قسە لەسەر کاریگەریی (نووسینم) دەکرێ، چوون خۆم بەنووسەر دانانێم. من بابەتێک بەوپەڕی بەپێزی نانووسمو هەرچیش بنوسم توانای ئەوەم نییە جارێکی تر بیخوێنمەوە. هەرگیز ئەو شتانەی لەسەر کارەکانم نووسراون نەمخوێندوونەتەوە. کتێبخانەکەم خاڵییە لەو کۆمێنتانەی لەسەر نووسینەکانم نووسراون. هەرچەندە وەک بۆی دەچم نێوبانگم دەرکردوەو نووسینم بووەتە شوێنی پرسیارکردن. بێگومان هەڵەیەک لەئارادایە، هەمیشە بەخۆم دەڵێم، ڕەنگە خەڵک لەوەدا هەڵەبن بەوەی کە من کەسێکی ترم، نووسەرێکی ترم؟

**کیرنی:** ڕەنگە ئەوە بۆرخیس بوو بێت کارەکانتی نووسیبێتەوە نەوەک تۆ؟

**بۆرخیس:** بەڕاستی ڕەنگە هەروا بێت! ڕەنگە ئێمە دوو کەس بووبین...بەلای کەمی. شەرمنو پیاوێکی ئاسایی، ئەویتریش خۆشنوود...قسەکەر..پیاوێکی جەماوەری.

**کیرنی:** لە (ترادسیۆنو نووسەری ئەرژەنتینی)دا وتوتە نووسەرێکی لە (دەرەوەی ڕەوتی کولتووری زاڵو باو). هەروەها جۆیس ڕایەکی لەمجۆرەی هەیە ئەو کاتەی وەسفی (ماڵو، خاکی بابو باپیرانو، کڵێسا) بە تۆڕێکی کۆتو بەندئامێز دەکات کە هەوڵی دەربازبوونی لێ دەدات، یان ئەوەی وای لە ستیڤن کرد دان بەوەدابنێت کە ئەو ساتەی لە ماڵەوە زمانی ئینگلیزی بەکاردێنن، هەست بەنامۆبوون دەکات، بەوەی لە کاتی نووسین یان قسەپێکردنی هیچ نامێنێتەوە جگە لە ئێشو ئازار (نەبوونی ئارامی ڕۆحی) نەبێت. ئایا بە ئەزموونی نامۆبوونی کولتووری یان پۆست کۆلۆنیالیدا تێپەڕیویت لە ساتەوەختی بەکارهێنانی زمانی ئیسپانی؟

**بۆرخیس:** ئەوە مەسەلەیەکی تەندروستە کە من، وەک ئەرژەنتینییەک، هەست بە بوونی ئەو

مەودایە بکەم کە لە ڕەوتی ئیسپانی زاڵ جیامدەکاتەوە. لە ئەرژەنتین لەدایکبوومو هۆگرییەکی زۆرم بۆ کولتووری ئینگلیزیو فەرەنسی هەبوو وەک ئەوەی لەگەڵ کولتووری ئیسپانیشدا هەمبوو. لەبەرئەوە خۆم بە کەسێکی نامۆ دەبینم، چونکە تەنانەت سەبارەت بە ئیسپانیش، ئەو زمانەی کە لە شوێنگەیەکی نامونتەمییەوە پێی دەنووسم، ئەوە لەپێشدا خۆی کەوتۆتە پەراوێزی ترادسیۆنی ئەدەبی ئەوروپی باو.

**هینی:** پێتوایە شتگەلێکی وەکو ترادسیۆنی ئیسپانی-ئەمریکی لەئارادا بێت، قبوڵکردنی واقیعەکە بەوەی هەموو ترادسیۆنێک بەر لە سەرهەڵدانو دەرکەوتنی دەبێ شوێنی بیرلێکردنەوە بێت؟

**بۆرخیس:** گۆڕانی بیرۆکەی ترادسیۆن بۆ کردەیەکی متمانەپێکراو مەسەلەیەکی دروستە. خەیاڵەکانمان دەگۆڕێتو هەموو کات ڕابردوو بەرهەمدێنێتەوە. بەهەرحاڵ دەبێ دان بەوەدابنێم کە من هەرگیز زۆر قەناعەتم بە بیرۆکەی ترادسیۆنی ئیسپانی-ئەمریکی نەبووە. بۆ نموونە ئەو کاتەی سەفەری مەکسیکم کرد، ئەوا بەکولتورو ئەدەبە دەوڵەمەندەکەیان گەشامەوە، بەڵام هەستم بەوە کرد کە هیچ شتێکی هاوبەشم لەگەڵیدا نییە. نەمتوانی لێکچوونێک لەگەڵ پەرستنیان بۆ ڕابردووی هیندی بەدی بکەم. ئەرژەنتینو ئۆروگوای لە زۆربەی وڵاتانی لاتینی-ئەمریکی جیاوازن، لەبەرئەوەی هەردووکیان نمایندەی تێکەڵەیەک لە کولتووری ئیسپانیو ئیتالیو پورتوگالی دەکەن کە بەهۆیەوە کەشێکی ستایلی ئەوروپییانەی زۆرتری دروستکردووە. بۆ نموونە زۆربەی وشە ڕەشۆکی یان ڕەمەکییەکانمان لە ئەرژەنتین لە بنەچەدا ئیتالین. من خۆم لە ڕەچەڵەکێکی پورتوگالیو، ئیسپانو، جولەکەو، ئینگلیزەوە هاتووم. هەروەکو ئینگلیز خۆیان، وەک ئەوەی لۆرد تێنیسون ئاماژەی پێدەدا، هیچ نین جگە لە تێکەڵەیەک لە ڕەگەزەکان: (ئێمەی ساکسۆنی Saxson و کیلتیون Celt و دانیون Dane). هیچ ئەتنییەک یان نەتەوەیەکی بێگەرد نییە، تەنانەت ئەگەر ئەو بێگەردییە هەشبووبێت، ئەوا خەیاڵکردن ئەو قاڵبەی تێپەڕاندووە. لەبەر ئەم هۆیە دەڵێم نەتەوەو ئەدەب دوو دوژمنی سروشتیی یەکترین. من بڕوام بەبوونی کولتوورێکی ئەرژەنتینی تایبەت نییە کە بکرێ ناوی بنێین (لاتینی-ئەمریکی) یان (ئیسپانی-ئەمریکی). ئەمریکییە ڕاستەقینەکان هیندییەکان خۆیانن، ئەوانی تر ئەوروپین. لەبەرئەمە، ڕێگام بدە خۆم بە نووسەرێکی ئەوروپی لە تاراوگە دابنێم. نە ئیسپانیو نە ئەمریکی نیمو، هەروەها نە ئیسپانی-ئەمریکیم، بەڵکو من ئەوروپییەکی تاراوگەییم.

**هینی:** تی ئێس ئەلیوت قسە لەسەر (عەقڵی گشتگری ئەوروپی) دەکات. ئایا هەست دەکەیت کە تۆ شتێکت لەو عەقڵە بە میرات بۆ مابێتەوە لەڕێی لادان لە زمانی ئیسپانی؟

**بۆرخیس:** لە ئەرژەنتین، ئێمە لایەنگیرییەکی تایبەتیمان بۆ هیچ جۆرە کولتوورێکی ئەوروپی نییە. ئێمە ئەتوانین لە ژمارەیەک -لەپێشدا وتوشمە- زمانو کولتووری ئەوروپی جیاواز ئەوە بەدەستبێنین، تەنانەت لە (عەقڵی هەمەکی ئەوروپی)، ئەگەر ئەو عەقڵە بوونی هەبێت. بەڵام، دروست بەهۆی ئەو مەوداییەی کە لە ئەوروپا جیاماندەکاتەوە، ئەوا ئێمە خاوەن ئازادی کولتوور یان خەیاڵین کە توانای ئەوەمان هەیە لەودیو ئەوروپاوە بڕوانین، لە ئاسیاو کولتوورەکانی تریش.

**کیرنی:** هەروەکو لە نووسینە ئەدەبییەکانت واتکردووە کە ئاماژەیەکی زۆر بە وانەکانی سۆفیزمی بودایيو ڕۆژهەڵاتی دوور دەدەیت.

**بۆرخیس:** ڕەنگە ئینتیما بۆ کولتوورێکی (نیشتیمانی) تێکەڵاو هۆکارێک نەبێت بۆ هەژاری بەقەد ئەوەی ئاماژەیەکە بۆ دەوڵەمەندی. من، بەو مانایە، نووسەرێکی (جیهانیم) لە بۆینس ئایرس دادەنیشم. بابو باپیرانم لە گەلو ڕەگەزی جۆراوجۆرو هەمەڕەنگەوە هاتوون-وەک ئاماژەم پێدا-، هەروەکو زۆربەی گەنجێتیم بە گەڕیدەیی لە ئەوروپا بەسەربرد، بەتایبەت لە ژنێڤو، مەدریدو، لەندەن کە لەوێدا زمانی نوێی جیاواز فێربووم: ئەڵمانیو، ئینگلیزی کۆنو، لاتینی. ئەو ڕاهێنانە پلورالیزمەی ئینتیما نیشتیمانییەکان توانای ئەوەی پێدام یاری بە وشەکان بکەم وەکو ئەوەی بووکەشووشەیەکی قەشەنگ بێتو، بەپێی وەسفەکەی براونگ بچمە نێو (گەمەی گەورەی زمان).

**هینی:** من جۆشو خرۆشێکی زۆر لەوە بەدی دەکەم کە نقومبوونت لەنێو ژمارەیەک زمان لە سەرەتای منداڵیت، بەتایبەتی زمانی ئیسپانیو ئینگلیزی ئەو هەستەی بەرامبەر بە زمان پێدایت کە وەک بووکەشووشەیەک بێت.

**بۆرخیس:** سەبارەت بەخودی خۆم، درک بەوە دەکەم بەوەی خووگرتنم بە وشەکان بەشێوەیەکی توند گرێدراوە بە فێربوونی لاتینیم لەتافی لاویدا، هەروەها چۆنیەتی گواستنەوەی وشەکانو گۆڕانی لەنێوان زمانەکاندا، ڕیشەی لاتینیو، توێژینەوەی بنەچەو مێژووی دراما-پێمواپە، لەسەر ڕۆشنایی ئەمە، هەموو ئەو گۆڕانە سەیرو بەردەوامانەی گۆکردنی وشە لای جۆیس بەشێوەیەکی قووڵ گرێدراوی پەروەردە کلاسیکییە تەقلیدییەکەیەتی.

**کیرنی:** ئایا نووسەرێکی تر هەیە، لەپاڵ جۆیس، بەتایبەت پێیان سەرسام بوویت؟

**بۆرخیس:** ئەو کاتەی تازە پێڕادەگەیشتم لە بۆینس ئایرس «جەوهەری ئەبسینیزم»ی جۆرج برناردشۆم خوێندەوە. ئەو کتێبەی وا کاریگەری بەسەرمەوە جێهێشت، کە هەڵسام چووم هەموو شانۆگەری و وتارەکانیم خوێندەوە، ئینجا بۆم دەرکەوت کە نووسەرێکی قووڵی فەلسەفیم دۆزیوەتەوە، کەسێک باوەڕێکی پتەوی بە هێزی گۆڕانی شێوەکانی ویستو عەقڵەوە هەیە. برناردشۆ خاوەن هەستێکی ئیرلەندی تایبەت بە خۆشییەکی پوچگەرایانە و پێکەنینئامێز بوو. هەروەها ئۆسکار وایلد کە نووسەرێکی تری ئیرلەندییە توانایەکی بێوێنەی هەبوو لەسەر ئاوێتەکردنی گاڵتەئامێزیو پوچگەرایەتی بە قووڵایی هزریی. ڕاستە هەندێک پارچەو تێکستی زیادەو بریقەداری نووسیوە، بەڵام من بڕوام بەوە هەیە کە هەر وشەیەک ئەو نوسیویەتی ڕاستە...

**کیرنی:** جارێکیان وایلد وتویەتی (ڕاستی لە ئەدەب ئەوەیە کە پێچەوانەکەشی ڕاستە).

**بۆرخیس:** بەڵێ، ڕێک ئەمە ئەوەیە کە من لەڕێی حەقیقەتی گاڵتەجاڕییەوە مەبەستم بوو، حەقیقەتی ئەدەب لەوەدایە کە توانای ناساندنی وێنە دژکارو بازنەییەکانی واقیعی هەیە. لەبەر ئەم هۆیە دەڵێم هەر وشەیەک کە وایلد نووسیویەتی ڕاستە. من هەروەها بڕوام بە حەقیقەتی گاڵتەجاڕی هەیە. ڕەنگە مەسەلەکە تەنیا ڕێکەوت نەبوویێت کە یەکەم سەرکێشی ئەدەبیم وەک گەنجێک، وەرگێڕانی چیرۆکە خورافییەکانی وایلد بوو. بەڵام لێرەدا ئیرلەندییەکی تریش هەیە کە خەیاڵدانی لە زووەوە ڕۆشنکردوومەتەوە ئەویش جۆرج مورە. مور جۆرێکی نوێی لە کتێب داهێنا، شێوازێکی نوێ لە نووسینی چیرۆک، شێوازێکی پشتبەستوو بە قسەو ئاخاوتنەکانی نێو ئەو چیرۆکانەی کە وا لەسەر شەقامەکان گوێی بۆ شلدەکردنو دواتر بۆ نێو فۆرمێکی ئەدەبی دەیگواستنەوە. من ئەمە لەو فێربووم.

**کیرنی:** ئەی لەبارەی بیکیتەوە-ڕەنگە ئەو نزیکترین شوێنکەوتووی ئەدەبی ئیرلەندی جۆیس بێت؟ لەوەیە بەشداری ئەو خولیایەی لەگەڵ نووسینی کاری ئەدەبی تۆ کردبێت کە لە پێچەڵپێچێکی خود-پشکنیراوەی عەقڵ دەچێت، چەشنی هاودژییەکی چەند بارەبووەوەی هەتا هەتایی خودە؟

**بۆرخیس:** سامۆئیل بیکیت بێزارکەرە. من لە چاوەڕوانی گۆدۆکەیم بینی، ئەوەش بۆ من بەس بوو. پێموایە کارێکی زۆر هەژارە. لەبەرچی هەراسانمان دەکات مادام گۆدۆ هەرگیز نایەت؟ ئەوە شتێکی وەڕسکەرە. من دوای ئەوە حەزی ئەوەم نەما بەردەوامبم لەسەر خوێندنەوەی ڕۆمانەکانی.

**کیرنی:** کارەکانت لێوان لێوە لە ئاماژەو ڕەنگدانەوە میتافیزیکیەکان...پێوەندی تۆ بە فەلسەفەوە چییە؟

**بۆرخیس:** شۆبنهاوەر سەبارەت بە خۆم فەیلەسوفێکی زۆر مەزنە. ئەو هێزی خەیاڵی ناو هزرەکان دەزانیێ، بێگومان، من لەگەڵ برناردشۆدا لەم باوەڕەدا بەشدارم. ئەو دوو پیاوە، شۆبنهاوەرو شۆ، هەڵسان بەئاشکراکردنی ئەو لێکجوداکردنەوە فریودەرەی کە لەنێوان نووسەرو بیرمەنددا هەیە. فەیلەسوفێکی تر کە سەرچاوەیەکی بەهێزی ڕووناکیم بوو ئەوە جۆرج بێرکلی-ئیرلەندییەکی ترە! بێرکلی درکی بەوە کرد کە میتافیزیکا، وەک بەرهەمێک، عەقڵێکی داهێنەرانەیە نەک شیعر. بێرکلی تەنیا بەندەیەکی هزر نەبوو، وەک زۆربەی فەیلەسوفەکان. ئەفلاتونو هزرمەندەکانی پێش سوکراتیش لۆژیکی فەلسەفیو ئەفسانەگەرایی شیعری بەیکەوە گرێدراون بەجۆرێک گرێدراون کە ئەستەمە لەیەکتری جیابکرێنەوە، هەروەها ئەوانە دوو هاوبەشن یەک ئەوی تر تەواو دەکات. ئەفلاتون توانی هەردووکیان کۆبکاتەوە. بەڵام جیهانی خۆرئاوا، دوای ئەفلاتون، وا دیارە دژی ئەم چالاکیانەیە، بەڕوونی ئەوەیە ئێمە یان خەون دەبینین یان ئەقڵانین، بەڵگەکان بەکاردەهێنین یان خواستنەکان، لەکاتێکدا حەقیقەتەکە ئەوەیە ئێمە هەردووکیان لەیەک کاتدا بەکاردەهێنین. ژمارەیەکی زۆری بیرمەندە داخراوو سۆفییەکان بەڕووی ئەم دژکارییە وەستانەوە، بەڵام کاتێکی زۆر تێپەڕی بەر لە سەرهەڵدانی میسالیەتی مۆدێرن لای بێرکلیو، تشلنگو، شۆبنهاوەرو، برادلی (کە لە پێشەکی کتێبە نایابەکەیدا ڕوخسار و واقیع زۆر ستایشی کردبووم و وەک بیرمەندێک هەژماری کردبووم!) ئەو فەیلەسوفانە جارێکی تر بەشێوەیەکی ڕوونو ئاشکرا درکیان بە پشت بەستنیان بە هێزی داهێنەرو ئەفرێنەری عەقڵ کرد.

**کیرنی:** چۆن بوویتە بایەخ پێدەری میتافیزیکیای بێرکلی؟

**بۆرخیس:** باوکم بە فەلسەفەی بێرکلی ئاشنای کردم ئەو کاتەی لە تەمەنی دە ساڵیدا بووم. فێری ئەوەی کردم کە بیربکەمەوە بەرلەوەی بتوانم بەشێوەیەکی دروست بخوێنمەوە یان بنووسم. مامۆستای دەروونناسی بوو، لەسەر ئەوە ڕاهاتبوو کە هەر شەوە وانەیەکی فەلسەفیی پێدەدام. باشم لەیادە چۆن یەکەمجار میتافیزیکای ئایدیالیستی بێرکلی پیێ ئاشناکردم، بەتایبەت ئەو ڕێبازەی کە دەڵێت جیهانی ماددی یان ئەزموونگەری بونیادنراو لەسەر تێبینیکردنو هەڵبژاردن ئەوە دۆزینەوەی عەقڵێکی داهێنەرە: بوونت واتە درکپێکردنی هەستەوەرەکان. ڕۆژێکیان، دوای نان خواردن، باوکم پرتەقاڵێکی بەدەستەوە گرتبوو لێی پرسیم: (ڕەنگی ئەو میوەیە چییە؟) وەڵاممدایەوەو وتم (پرتەقاڵی). بەردەوامبوو: (ئایا بوونی ئەو ڕەنگە لەنێو پرتەقاڵەکەدایە یان لەنێو درکپێکردنی هەستیی تۆیە بۆی؟)، دواتر (تامو چێژەکەی- ئایا لەنێو پرتەقاڵەکە خۆیدایە

یان لەنێو هەستەوەری زمانتدایە کە وای لێدەکات بەتام بێت؟). ئەمە دەرخستنی شتێک بوو بۆ من: دنیای دەرەوە ئەوەیە کە ئێمە درکی پێدەکەین یان ئەوەیە کە خەیاڵی بۆ دەکەین ببێت. ئەو جیهانە بەشێوەیەکی سەربەخۆو جیا لە عەقڵمان بوونی نییە. لەو ڕۆژەوە بۆم دەرکەوت، واقیعو خەیاڵ هەریەکەیان بە ئەوی ترەوە گرێدراوە، تەنانەت بیرە تایبەتەکانیشمان خەیاڵگەلێکی ئەفرێنراون. من هەمیشە باوەڕم بەوە هەبووە کە میتافیزیکاو ئایینو ئەدەب هەموویان یەک سەرچاوەی هاوبەشیان هەیە.

**کیرنی**: بێرکلی لەسەر ئەوە سوورە کە نابێت میسالیەتەکەی تێکەڵ بە ئەزموونگەری بەریتانی بکرێت، هەروەکو ئەو ناڕازییە لە لۆک (ئێمەی ئیرلەندی بەشێوەیەکی تر بیردەکەینەوە). کەچیییتس خۆشحاڵە بەو گوتەیە بەوەی (لەدایکبوونی هزری نەتەوەییە). ئایا لەو باوەڕەدایت دۆزینەوەی پێشوەختت بۆ هێزی داهێنەری عەقڵ کە گونجاوە لەگەڵ سەرسامبوونت بە نووسەرو بیرمەندە ئیرلەندییەکانی وەکو بێرکلیو، شۆو، جۆیس کە هەڵساون بەهەمان دۆزینەوە، تەنیا ڕێککەوتێکی خۆش بوو بێت؟ چۆن ئەو وەرگرتنە هاوبەشە لێکدەدەیتەوە؟

**بۆرخیس**: لەوانەیە هیچ شتێک ڕێککەوت نەبێت؟ گشت ڕێککەوتەکان ملکەچی یاسایەکی نادیارن، یان کەشفکردنی مەبەستێکی تەمومژاوین؟ پرنسیپی گەڕانەوەی هەتاهەتایی؟ عەقڵی یونیڤێرساڵی؟ ڕۆحی بەپیرۆزکراو؟ کێ دەزانێت؟ بەڵام وەک ئەوەی لە دەرەوە لە بیرمەندە ئیرلەندییە یەک لەدوای یەکەکان دەڕوانم، هەندێکجار دووچاری شۆک دەبم بەهۆی ئەو دووبارەبوونەوە ناوازەو نائاساییانە. بێرکلی یەکەم فەیلەسوفی ئیرلەندییە کە خوێندبمەوە، سەرەتا لە پرنسیپ و دیالۆگەکانی سێیەم تا نەشونماکان، هەروەها قەسیدە مەسیحییەکەی لەبارەی ئایندەی هەردوو ئەمریکا: (خولەکەی ئیمپراتۆر دەستی بە دەسەڵاتەوە گرتووە ...تاد). پاشان خولیای وایلد و شۆ و جۆیس بووم. دواجار سکۆتس ئیروجینا، فەیلەسوفی میتافیزیکای سەدەی نۆیەمی ئیرلەندی. حەزم بە خوێندنەوەی ئیروجینا دەکرد، بەتایبەت کتێبەکەی (دابەشبوونی سروشت)، کە ئاماژەی بەوە کردووە خودا لەڕێی خوڵقاندنی ئەفرێنراوەکانی لەنێو سروشت خۆی خوڵقاندووە. من هەموو کتێبەکانی ئەوم لەنێو کتێبخانەکەمدا هەیە. ئەوەم کەشف کرد کە ڕێبازی بێرکلی تایبەت بە هێزی داهێنەری عەقڵ لە پێشدا لەلایەن میتافیزیکای خوڵقاندنی ئیرۆجیناوە مەزەندەکرابوو. ئەمەش بەڕێز لای ژمارەیەکی زۆری نووسەرە ئیرلەندییەکان چەندبارە بووەتەوە: لە دوو لاپەڕەی کۆتایی دەسپێکی کتێبەکەیدا (گەڕانەوە بۆ مەتوسالح Back to Methuselah) ئەوە دەبینین کە شۆ هێڵی سەرەکی سیستمێکی فەلسەفی دەکێشێ هاوشێوەی سیستمەکەی ئیروجینا بۆ شتەکان کە لە عەقڵی خوداوە دەردەچێتو بۆ ئەویش دەگەڕێتەوە. بەکورتی، ئەوەی کە شۆ بە هێزی ژیان ناوی دەبات لەنێو سیستمەکەی خۆیدا هەمان ئەو ڕۆڵە دەبینێت کە خودا لەنێو سیستمەکەی ئیروجینا دەیبینێت. من هەروەها بەڕاستی تووشی شۆک هاتم کە هەریەکە لە شۆو ئیروجینا هەموو ڕەگەکانی خەلقی ڕەسەنیان لە عەدەمێکی میتافیزیکی دەستەبەرکردووە، ئەوەی ئیروجینا ناوی دەبات ((نهیلی))ی خودا، کە بابەتی سەرەکی بوونمانە. من گومانم هەیە شۆ ئیروجینای خوێندبێتەوە، ئەو بەدڵنیاییەوە بایەخێکی کەمی بۆ فەلسەفەی سەدەکانی ناوین هەبوو. لەگەڵ ئەوەش لێکچوونی هزرە مەوجودەکان لەوێدایە. دڵنیانیم لەوەی کە ئەوە پێوەندی بە ناشینالیزمەوە هەبێت بەقەد ئەوەی پێوەندی بە

میتافیزیکاوە هەیە.

**کیرنی:** نووسینەکانت خۆیان وا دەنوێنن کە کەڵکەڵەیەکی بەردەوامن لەنێوان جیهانی خەیاڵو خەون، گەردوونێک لە پێچو پەنا نائاگاییەکان. کەواتە ئەو جیهانە خەونئاسایە زەمینەی ئەوە نارەخسێنێت کە جیاکردنەوەی دانەر (خودی خۆت)و، کارەکتەرەکانی چیرۆکەکەو خوێنەریش (خودی ئێمە) ئەستەم بێت؟

**هینی:** پێدەچێت ئەو کارلێککردنەی نێوان خەیاڵو واقیع شوێنێکی سێنتەریانە لەنێو کارەکانت پێکبێنێت. چۆن دنیای خەونەکانت کاریگەرییان بەسەر کارەکانتەوە دەبێت؟ ئایا ماتریالی خەون هۆشیارییانە بەکاردێنیت؟

**بۆرخیس:** هەموو بەیانییەک کە لە خەو هەڵدەستم، خەونەکانم تۆماردەکەم یان دەنووسمەوە. هەندێکجار پرسیاری ئەوە دەکەم من بەخەبەرم یان خەون دەبینم. ئایا هەنووکە خەون دەبینم؟ کێ دەتوانێ لەوە دڵنیا بێت؟ ئێمە خەون بەیەکترییەوە دەبینین بەدرێژایی کات. بێرکلی ئەو مەسەلەیەی وەرگرتووە کە ئەوە خودا بوو، خەونی پێمانەوە دەبینی. ڕەنگە ئەو ڕاست بکات، بەڵام ئەو مەسەلەیە بۆ ئەو چەند جارسکەرە! خەون بە هەموو دەنگێکی پێکدادانی دوو کانزاو تۆزی سەر پیاڵەی چایەو هەموو پیتەکانی نێو هەموو ئەلفو بێیەکانو هەموو بیرکردنەوەی نێو هەموو سەرەکان ببینێت. بێگومان ئەمە کارێکە سەرقاڵبوونێکی زۆری دەوێت!

**کیرنی:** هەندێک کەسایەتی کارەکانت تەرحی بوونی تاکە عەقڵێکی خودایی دەکەن یان ئەلفو بێیەک کە گەردوون بێننە بوون بەو چەشنەی نووسەر جیهانە خەیاڵییەکەی دێنێتە بوون. لە کتێبی ئەلف (Aleph)، بەنموونە، پێدەچێ تۆ ڕووبەڕوی ئەو بیرۆکە مەئلوفەی لەبارەی خودی تاکو تەنها یان بابەتێکی سنووردار بوەستیتەوە، کە تیایدا هاتوە هەموو بوونەوەری مرۆیی هیچ نین جگە لە کەسایەتیگەلێکی درامی لەنێو شانۆگەرییەکی گەردوونیدا. پاڵەوان لەو کارەدا دەگاتە ئەو شوێنەی بڵێت: (بوومەتە هۆمیرۆس...بەم نزیکانەش دەبمە گشت پیاوەکان). لە کتێبی Tlon تەنانەت هاتووە: (مەسەلەکە وا بونیادنراوە کە گشت کارە ئەدەبییەکان لە داهێنانی تاکە نووسەرێکی نادیارو بێ ناوەوە هاتوون).

**بۆرخیس:** شۆبنهاوەر قسە لەسەر(خەون دەکات وەکو ئەوەی ژیانێکی دەستەبەرکراو بێت). ئەو قسەکانی لەوێوە نەهاتووە کە وا ڕاڤەی خەونەکان بە نائاگایی بکات، وەکو ئەوەی دەروونناسان لێمانیان دەوێت بەمجۆرە باوەڕبکەین، بەڵکو ئەو ئاماژەی بەو عەقڵە ماندوونەناسە داوە لە گەڕانی بۆ هێنانەدی خەیاڵ. وێڕای ئەوەی من ڕێبازی میتافیزیکیام لای هەریەکە لە بێرکلیو شۆبنهاوەر کەشفکرد- دواتر لەڕێی خوێندنەوەی کتێبی Koeppen (ئاییینی بودا)دا فێری ئەوە بووم کە ئەو ڕێبازە وانەیەکی سێنتەریانەی فەلسەفەی ڕۆژهەڵاتیی بوو. ئەو ڕێچکە بوداییە فێرمان دەکات کە واقیع خەونی چەند بارە بوونەوەی نێو سەری خودایە، ئەمەش هانی دام بۆ نووسینی کتێبی (خەراباتی بازنەیی).

**هینی:** حەزدەکەم بگەڕێمەوە بۆ پێوەندی نێوان خەونو کارە ئەدەبییەکانت. ئایا جیهانی خەونەکانت خۆراکی نووسینەکانت بووە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ؟ ئایا بەڕاستی ناوەڕۆکی خەونەکانت دەخوازیتو دواتریش بۆ نێو ئەدەب دەیگوازیتەوە؟ یان ئەوە کارامەیی گێڕانەوەو حیکایەتخوانییە کە

وێنەی فۆرمو قاڵبەکانی پێدەبەخشێت؟

**بۆرخیس:** گێڕانەوەی چیرۆک سیستمێک بۆ ناسیستمی ماتریالی خەون دێنێت. بەڵام ناتوانم ئەوە بڵێم کە ئایا ئەو سیستمە سەپێنراوە یان لەپێشدا لەناو ناسیستەمەکەدایە کە تەنیا لە چاوەڕوانی ئەوەدایە لەڕێی دووبارەکردنەوەی لەنێو چیرۆکدا ڕۆشنایی بەخۆیەوە ببینێت. ئایا چیرۆکنووس سیستمێکی ناوەکی نوێی دژی نەهیلیزم داهێناوە؟ پێموایە ئەگەر بمتوانیبایە وەڵامی پرسیارێکی لەو چەشنە بدەمەوە ئەوا هەرگیز نەمدەنووسی!

**هینی:** دەتوانی هەندێ نموونەی کردارەکیمان پێببەخشیت بۆ ئەوەی بزانین مەبەستت چییە؟

**بۆرخیس:** بەڵێ. خەونێکی چەندبارەبووەوەت پێدەڵێم کە کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر بەجێهێشتم. برازایەکم زۆربەی کات لەگەڵ مندا بوو، هەموو بەیانییەک خەونەکانی بۆ دەگێڕامەوە، ئەو خەونەی کە باسی دەکەم بۆ ئەزموونی من زۆر گرنگ بوو. ئەو بزربوو بوو، دوایی هاتە شوێنێکی ڕووناک کە لەوێ من لە خانووێکی دار هاتمە دەرەوە. لەو خاڵەوە لە گێڕانەوەی دیمەنە کورتەکە دەوەستاو دەیوت: «مامە، تۆ لەو خانووە چیت دەکرد؟» منیش وەڵاممدایەوە: «من لە کتێب دەگەڕام». ئەویش زۆر دڵی بەو وەڵامە خۆش بوو. ئەو وەک منداڵێک ئێستاش دەتوانێ لە لۆژیکی خەونییەوە بۆ لۆژیکی لێکدانەوەم بخزێت. ڕەنگە ئەوە ڕێگەی ئیشکردنی ئەدەبی خۆم بێت.

**هینی:** کەواتە لە پێشدا ئەوە شێوازەکەیە کە دەبێتە ئیلهامبەخشی کارەکەت و کاریگەریشی بەسەرەوە دەبێت نەوەکو ماتریالی راستەقینەی خەونەکان؟

**بۆرخیس:** دەتوانم بڵێم لەژێر کاریگەریی هەردوو فاکتەردایە. چەند خەونێکی دووبارەبووەوە بە تێپەڕبوونی ساڵەکان جێپەنجەی خۆیان بەشێوەیەک لە شێوەکان لەسەر کاری ئەدەبی مندا جێهێشتووە. سیمبۆلەکان عادەتەن جیاواز دەبن، بەڵام شێوەو بونیادەکان بەهەمان شت دەمێننەوە. بۆ نموونە زۆر خەونم بەوەوە بینیوە کە لە ژوورێکدا زینданی کراوم، منیش هەوڵمداوە دەربازبم، بەڵام خۆم لە ژوورێکی تردا بینیوەتەوە. ئایا ئەوە هەمان ژوور نییە؟ پرسیارم لە خۆم کردووە. یان من ڕووەو ژوورێکی دەرەوە ڕادەکەم؟ یان بەرەو ژووری ناوەوە دەگەڕێمەوە؟ ئایا من لە بوینس ئایرسدام یان لە مونتی ڤیدیو؟ لە شاردام یان لە لادێ؟ دەستم لە دیوار داوە تا شوێنی ڕاستەقینەی وجودی خۆم ببینمەوە، وەک هەوڵدانێک بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە. بەڵام دیوارەکە خۆی بەشێک بووە لە خەونەکە! لەبەرئەوە پرسیارەکە بۆ هەتا هەتا، وەکو پرسیارکەرەکە، بۆ ژوورەکەی دەگەڕێتەوە. ئەو خەونە مەسەلەی مەتاهات یان پێچو پەنای بۆ دەستەبەرکردم کە زۆر لە نووسینەکامدا دەردەکەوێت. هەروەها من خولیای خەونێکم ئەویش ئەوەیە خۆم لەنێو ئاوێنەیەک بە ڕووخسارێکی ماسکدار یان دەمو چاوی جیاواز جیاواز دەبینم، هەریەک بەسەر ئەویتردا کەوتووە، هەڵدەستم بە ڕووماڵینیانو لەوەشدا سەردەکەوم دواتر ئەو دەمو چاوە دەدوێنم کە لە ئاوێنەکەدا بەرامبەرمە، بەڵام ئەو وەڵامنادەتەوە، ئەو گوێی لێم نابێت یان گوێناگرێت...ئەمە مەسەلەیەکە زانینی ئەستەمە.

**هینی:** پێتوایە چ حەقیقەتێک بوو کە کارل یۆنگ لە شیکردنەوەکانی بۆ سیمبۆلو ئەفسانەکان هەوڵی دۆزینەوەیانی دەدا؟ پێتوایە نموونەگەلە ڕەسەنەکانی ڕووگەی یۆنگی دەست بدەن بۆ لێکدانەوەی ئەوەی کە لە جیهانەکانی نائاگایی تایبەت بە خەونو بابەتی ئەدەبی ئەزموونی

دەکەین؟

**بۆرخیس:** یۆنگم بەبایەخێکی گەورەوە خوێندەوە بەڵام بەبێ باوەڕپێهێنان. من، لە باشترین حاڵەتدا، یۆنگ بە نووسەرێکی خەیاڵی‌و دۆزەرەوە دادەنێم. ئەو دوورە لەوەی کە کەسێک بتوانێ تایبەت بە فرۆید بڵێت: ئەو قسە بێمانایە چییە!

**کیرنی:** ئەوەی کە لێرەدا پێشنیازت کرد ئەوەیە شیکردنەوەی دەروونی بەهاکەی لەوە وەرگرتووە کە بزوێنەرێکی خەیاڵکردنە زیاتر لەوەی میتۆدێکی زانستی بێت، ئەوەش ئەو ڕایەی تۆم بیردەخاتەوە کە دەڵێیت سەرجەمی بیرکردنەوە فەلسەفییەکان «لقێکن لە ئەدەبی فانتازی».

**بۆرخیس:** بەڵێ، من باوەڕم وایە میتافیزیکا بەرهەمێکی خەیاڵە نەک شیعر. دواجار، بیرۆکەی ئەنتۆلۆژی لەبارەی خودا کەشفکردنێکی ڕۆشنی مەزنی خەیاڵکردنە.

**کیرنی:** بەڵام، ئایا ئێمە خودامان کەشف کردووە یان خودا ئێمەی کەشف کردووە؟ ئایا خەیاڵکردنی داهێنەرانەی سەرەتا خودایی بووە یان مرۆیی؟

**بۆرخیس:** ئۆ، ئەوە پرسیارەکەیە. ڕەنگە هەردووکیان بەیەکەوە بووبێت.

**هینی:** ئایا ئەزموونی منداڵیت لەگەڵ ئایینی کاسۆلیکی بووە هۆی خۆراکبەخشی ئیدراکت یان هەستت بەپێی ڕێگە دیاریکراوەکە؟ من بیر لە سرووتو نهێنییەکانی دەکەمەوە زیاتر لە فەرمانە لاهوتییەکانی. ئایا شتێک هەیە بتوانین ناوی بنێین خەیاڵدانی کاسۆلیکی، کەوا ڕەنگبێ لە کاری ئەدەبی تەعبیر لە خۆی بکات، وەک  ئەوەی لە دانتی دا کرا بە نموونە؟

**بۆرخیس:** کاسۆلیکی بوونت لە ئەرژەنتین مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتییە زیاتر لەوەی ڕۆحی بێت. مانای ئەوەیە تۆ خۆت بەوە وەسف دەکەیت کە کەسێکی لە چینی ڕاست، ئینجا حیزبی بی یان گروهێکی کۆمەڵایەتی. ئەو وێنەیەی ئایین هەرگیز شوێنی گرنگیدانی من نەبووە. تەنیا ژنان ئایین بە جیدی وەردەگرن..ئەو کاتەی منداڵێکی بچووک بوومو دایکم لەگەڵ خۆیدا بۆ کڵێسای دەبردم بۆ نوێژی بەکۆمەڵ، بەدەگمەن نەبێت پیاوێکم لەوێ نەدەدی. دایکم ئیمانێکی بەهێزی گەورەی هەبوو، بڕوای بە بەهەشت هەبوو، ڕەنگە بەگوێرەی ئەو باوەڕەی کە هەیبوو ئێستا لەوێ بێت. ڕەنگە من کاسۆلیکییەکی مولتەزیم نەبمو نەتوانم بەشداری باوەڕەکەی بکەم، کەچی ئێستاش کاتژمێر چواری هەموو بەیانییەک دەچمە ژووری نووستنی- کاتژمێری مردنی بەر لە چوارساڵ پێش ئێستا (ئەو گەیشتە تەمەنی نەوەد و نۆ ساڵ ترسەکە ئەوەبوو بگاتە سەد ساڵ!) ئەوێ ئاوپرژێنی موقەدەس دەکەمو نوێژێکیش دەکەم کە داوای لێکردبووم. بۆ نا؟ نەمری مەسەلەیەکە لە مردن سەیرتر یان باوەڕپێنەکراوتر نییە. هەروەکو باوکمی خوانەناس خوی بەو قسەیە گرتبوو ( واقیع کە بەرهەمی درکپێکردنمانە، ئەوەیە کە چ شتێک مومکین بێت، تەنانەت سێگۆشەی پیرۆزیش). من بڕوام بە مۆراڵگەرایی هەیە، بەوەی کە شتەکانی جیهانی ئێمە یان باشن یان خراپن، بەڵام ناتوانم بڕوا بە بوونی خودا بکەم. هەروەک برناردشۆ لە باربارای سەرۆک دەڵێت: (لەپشت خۆمەوە زاوای بەهەشتم جێهێشتووە). ئێستاش شەیدای میتافیزیکاو بیرۆکە کیمیاییەکانی ئایینم، بەڵام ئەو شەیدابوونە ئیستاتیکییە زیاتر لەوەی لاهوتی بێت.

**کیرنی:** لە Tlon و Uqbar and Orbis Tertius دا باس لە دووبارەبوونەوەی هەمیشەیی کایۆس دەکەیت کە چەشنێکی میتافیزکیانەی فەرمانکردن دەخاتەڕوو یان لێی هەڵدەقوڵێت. مەبەستت

لەوەدا چی بوو؟

**بۆرخیس**: زۆر چێژم لەو نووسینە بینی. لەو کاتەوەی دەستم پێکرد هەتا کۆتاییەکەی نەمتوانی لە پێکەنین بوەستم. کۆی تێکستەکە گاڵتەجارییەکی میتافیزکی گەورە بوو. بیرۆکەی گەڕانەوەی هەتا هەتایی، بێگومان بیرۆکەیەکی ڕواقییە. قەشە ئۆگەستین سەرزەنشتی ئەو بیرۆکەیەی کرد ئەو کاتەی هات جیاوازی لەنێوان بتپەرستی کە بڕوای بە بوونی سیستمێکی بازنەیی زەمەن هەیە—شاری بابل لەگەڵ چەمکی هێڵگەرایی‌و پێغەمبەرایەتی‌و مەسیحییەت بۆ زەمەن کرد کە دەکرێ لە نێو شاری خودا، قودس بەدەستبهێندرێ. ئەو چەمکەی دوایی سەرکەوتو لە سەردەمی ئۆگستینەوە لەنێو کولتووری خۆرئاواییماندا باوە. بەڵام پێموایە هەندێک ڕاستی لە ئایدیای کۆندا لەپشت ناسیستمی گەردوون‌و ئەو وشانەش کەوا لە قسەکردن لەبارەی گەردوون بەکاریان دەهێنین، ڕەنگە سیستمێکی نادیار، سیستمێکی دووبارە یان هاوشێوەی لێدەربکەوێت.

**کیرنی**: جارێکیان نووسیوتە ئەگەر نەتوانرا ئەو سیستمە بازنەییە نادیارە بسەلمێنریت، ئەوا وەک (ئومێدێکی جوان) دەمێنێتەوە لای تۆ.

**بۆرخیس**: ئایا ئەوەم نووسیوە؟ ئەمە مەسەلەیەکی باشە، بەڵێ، زۆر باشە. من گریمانەی ئەوە دەکەم لە ئێستادا کە تەمەنم ٨٢ ساڵە، گەیشتوومەتە ئاستێک کە هەندێک شتم نووسیبێت شایانی بیرخستنەوە بێت. هەرچی ئەوانی ترە دەکرێ «بخرێتە نێو مەنجەڵ» وەک داپیرم ڕاهاتبوو وای دەوت.

**هینی**: قسەت لەسەر پێکەنین کرد لە ساتەوەختی نووسین. نووسینەکانت لێوان لێون لە خۆشی‌و کەتن. نووسین بەلای تۆوە هەمیشە کارێکی چێژبەخش بووە، یان بە بەردەوامی ئەزموونێکی قورس یان ئازاربەخش بووە؟

**بۆرخیس**: ئەو کاتەی توانای بینینم هەبوو، ئەوا حەزم لە نووسین دەکرد...هەموو ساتەوەختێک... هەموو ڕستەیەک. وشەکان لام وەک بووکەڵە سیحرییەکان وابوون کە یاریم پێدەکردن یان بەهەموو شێوازو ڕێگەیەک دەمجوڵاندن. بەڵام لەوساوەی لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا بینایم لەدەستداوە، بەو شێوەیە توانای ئەوەم نەماوە بە نووسین خۆشحاڵ بم. پێویستە ئیملای هەموو شتێک بکەم، گۆڕاوم بۆ پیاوێک کە ئیملا دەکات لەبری ئەو منداڵەی کە یاری بە وشەکان دەکات. بۆ مرۆڤی کوێر ئەستەمە یاری بە بووکەڵە بکات.

**هینی**: وای بۆ دەچم کە نەبوونی فیزیایی قەڵەم‌و پێوەنووسان بە مێزی نووسینەوە جیاوازییەکی گەورەی لێدەکەوێتەوە..

**بۆرخیس**: بەڵێ، ئەمە جیاوازییەکی گەورە دروست دەکات، بەڵام ئەوەی من لەدەستمداوە توانای خوێندنەوەیە زیاتر لەوەی توانای نووسین بێت. هەندێکجار کەمێک خۆم هەڵدەخەڵەتێنم، بەوەی لە دەوری خۆم جۆرەها کتێب کۆدەکەمەوە، بەتایبەت فەرهەنگەکانی ئینگلیزی‌و ئیسپانی‌و ئەڵمانی‌و ئیتالی‌و ئایسلەندی. ئەو کتێبانە وەکو بوونەوەری زیندوو وان بۆ من، بوونەوەرگەلێک کە لەنێو تاریکییدا بە چرپە لەگەڵم دەدوێن.

**هینی**: تەنیا بۆرخیسە کە بتوانێ ئیش لەسەر کردەیەکی خەیاڵئامێزی وا بکات! خەونەکانت هەمیشە لای تۆ گرنگ بووە. ئایا پێتوایە تواناو پێویستبوونی تۆ بۆ نیشتەجێبوون لەنێو جیهانی

چیرۆکو خەون بەشێوەیەک لە شێوەکان دوای لەدەستدانی بینایت زیادی کردووە؟

**بۆرخیس:** لەوەتەی کوێربووم هەموو ئەو شتەی کە بۆم مابێتەوە تەنیا چێژکردنە لە خەون و خەیاڵکردنە لەوەی کە دەتوانم بیبینم. هەندێکجار خەونەکانم لەودیو خەوتنەوە بۆ نێو جیهانی بەئاگابوونم درێژدەبنەوە. زۆرجار خۆم دەبینمەوە کە خەون دەبینم، بەرلەوەی بچم بنووم یان دوای بەخەبەرهاتنیش، هەروەها بە ڕستەی نادیارو تەمومژاوی وڕێنە دەکەم. ئەو ئەزموونە بەسادەیی ئەو قەناعەتەم لا جێگیر دەکات کە دەڵێت عەقڵی داهێنەر بەشێوەیەکی بەردەوام کاردەکات، هەروەها ئەو عەقڵە بەشێوەیەکی بەردەوام خەون دەبینێت ئەگەر بەشێوەیەکی لاوازیش بێت. نووستن چەشنی مردنێکی خەونئاسا وایە، تەواو وەکو ئەوەی بەئاگابوون چەشنی ژیانێکی خەونئاسا وایە. هەندێکجار تواناى ئەوەم نییە لەیەکتریان جیابکەمەوە کە کامەیان کامەیە.

**سەرچاوە:**


States of Mind
Dialogue with contemporary thinkers

By Richard Kearny
1995

-مێژوو
جان فرانسوا دۆرتیێ
لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

## -جۆرێکی تری مێژوو:

## میشل فۆکۆ و تیورەی نابەردەوامی لە مێژوودا
مارك پۆستەر
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

## -وتارێك دەربارەی گەوهەری مێژوو
ئیحسان تەبەری
لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار

## -چەمکی مێژوو لای مارکس
عەزیز لغمیش
لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

## -تێڕامانێك لە مێژووی هاوچەرخ
جان لویس گدیس
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

## -"فێرنان برۆدێل" و قوتابخانەی (مێژووی نوێ)
د. مەسعود ضاهر
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

## -ئەو کەسایەتیانەی مێژوویان دروستکرد
هاشم ساڵح
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

# مێژوو

جان فرانسوا دۆرتیێ
لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

مێژوو جگە لە گێڕانەوەی حیکایەتەکان شتێکی دی ناکات، لەتەک ئەمەشدا مێژوو بریتییە لەڕەنگدانەوەی نموونە سیاسی و ئایینی و زانستییەکانی سەردەمەکەی خۆی. ئەم زانستە لەپاش سەدەی نۆزدەهەم دینامیکیەتێکی ئاشکرای پیشان دا، کە تا ئەمڕۆش بەردەوامە، ئەمڕۆ مێژوو لەنێو زانستە مرۆڤایەتییەکاندا شوێنێکی نایاب و گرنگ دەگرێ.

هەمیشە مێژوو پەیوەست بووە بە هێزی حیکایەتە نیشتیمانییەکان و بەوڵاتان و بەو میللەتانەی دەیانەوێ رابردووی خۆیان بنووسنەوە. لە فەرەنسادا مێژوو بە پسپۆرییەکی شیاو و بە بابەتێکی خۆشەویست دەژمێردرێت، هەروەک رەگەزێکی بنچینەیی لە رۆشنبیریدا پێکدەهێنێت.

لەسەدەی نۆزدەهەمەوە مێژوو چۆتە ناو پرۆگرامەکانی خوێندنەوە، لەشەستەکانی سەدەی بیستەمیشەوە بەربڵاوییەکی بێوێنەی بەخۆوە بینیوە، بەردەوام کتێبی جیاجیای مێژوویی و هەروەها کتێب دەربارەی مێژوو چاپ دەکرێت، هەندێ لەمامۆستا ناودارەکانی زانکۆ کە پسپۆڕن لە مێژوودا، بەرنامەی تایبەتی لە ئێستگەو تەلەڤیزیۆنەکاندا پێشکەش دەکەن (یەکێک لەوانە جۆرج دۆبی کە لەساڵی ١٩٧٣دا بەرنامەی تەلەڤیزیۆنیی دەربارەی مێژوو هەبوو) و گۆڤاری دەردەکرد، جەماوەرێکی فراوان پێشوازییان لەبەرنامەکەی و گۆڤارەکەش دەکرد.

مێژوو بەوە جیادەکرێتەوە کە حیکایەتەکانی رابردوومان بۆ دەگوازێتەوە، پۆل فینی پێی وایە مێژوو جگە لە رۆمانێکی راستەقینە شتێکی تر نییە. جا لەبەر ئەوەی مێژوو کینایەیە بۆ گێڕانەوەی حەقیقەت، ئیدی بابەتی مێژوو بەدرێژایی سەدەکان هەڵگری چەند گرەوێکی گرنگە کە لەسەرەتادا مۆرکێکی ئایینی و سیاسیی پێوەبوو، دواتر و لەرۆژگاری ئەمرۆماندا مۆرکێکی مەعریفیی هەیە، بۆیە ئەم بابەتە، بەتایبەتی لەسەدەی نۆزدەهەمەوە، بوو بە شوێنی گفتوگۆ و ناکۆکی و مشتومڕێکی بێئامان لەنێو گروپی مێژوونوساندا، کە پرسیاری جدی و کاریگەریان دەورووژاند، پرسیار لەچەشنی: ئایا دەکرێ مێژوو ببێت بە زانستێک؟ زانستێکی کۆمەڵایەتی؟ ئەگەر وەڵامەکە بەڵێ بێت، ئەی دەبێ سەرچاوەکانی ئەو زانستە چی بن؟ هەروەها ئامانج و رێگەکانی مێژوو چین؟ چ دامەزراوێک رەوایی بەمێژوو دەبەخشێت؟ ئاخۆ ئەو زانستە بابەتگەرایی تیادا دەبێت؟

لەراستیدا ئەم پرسیارانە تازە نین، زۆربەی ئەو کەسانەی خۆیان بۆ گێڕانەوەی رووداوەکانی سەردەمی خۆیان تەرخان کردووە، هەمیشە هەوڵیان داوە پاساو بۆ ئەو کاروانەی خۆیان بهێننەوە، ئیدی لەپاش سەدەی نۆزدەهەمەوەو لەدوای سەرهەڵدانی چەند رێبازو قوتابخانەیەکی رەخنەیی، ئەو پرسیارانەیان بەشێوەیەکی توندتر دەخستە ڕوو، کە لەگەڵیدا بیر لەوە دەکرایەوە وەک پسپۆرییەک دەست بەنووسینەوەی مێژوو بکرێت.

## لە هۆمیرۆسەوە بۆ هیرۆدۆتس:

لەیۆنان و لە سەدەی پێنجەمی پێش زاییندا، مێژوو لەگەڵ هیرۆدۆتس و توسیدید دەستی پێکرد. لەکاتێکدا پرۆژەی هۆمیرۆس لەسەر جەنگە میدییەکان راوەستابوو کە یۆنان رووبەڕووی فارسەکان دەبوونەوەو شاری یۆنانی فراوانتر دەبۆوە، هیرۆدۆتس کە گەشتیارێکی گەورە بوو وخاوەنی زەینێکی گەشاوەبوو، وەسفێکی ورد و جوگرافییانەی ئەو گەلانەی دەکرد کە لەگەشتەکەیدا رێکەوتی دەکردن، هەروەها گێڕانەوەی مێژوویی داهێنا تا —وەک خۆی دەڵێ- زەمەن کاری پیاوە گەورەکان لەیاد نەکات و تا سەرکەوتنە گەورەکانی یۆنان و بەربەرییەکان لەبیر نەکرێن. لەپاش چەندین دەیە، توسیدید بوو بە شایەتی جەنگی بلیبۆنیز کە لەنێوان ئەسیناو ئیسپارتەدا لە ساڵانی ٤٣١ بۆ ٤٠٤ی پێش زایین ڕووی دا.

لەگەڕان بەدوای هۆکارەکانی ئەو رووداوانەو هەروەها لەلایەنی بابەتێتی لە وەسف و شیکردنەوەدا، هیرۆدۆتس و توسیدید بوون بە پێشەنگ لە زانستی مێژوودا، کە لەسەردەمی ئەواندا مێژوو لە زانستی ئەفسانە جیابۆوە.

بەڵام لەسەدەکانی دواتردا ئەم پرۆژەیە فراوان نەبۆوە، ئەگەرچی مێژوونوسە رۆمانییەکانی وەک شیشرۆن و تیت لیف و تاسیتۆس و سیاتۆن نێوبانگێکی باشیان بەدرێژایی سەدەکان پەیدا کرد، بەتایبەتی لەچەرخی رێنیسانسدا، بەڵام ئەمە بەهۆی لێهاتووییانەوە بوو لەلایەنی ئەدەبی و زمانی رەوانبێژی و داڕشتنەوە.

## سەدەکانی ناوەڕاست: مێژووی مەسیحی:

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی مەسیحیەتدا لەسەدەی یەکەمی زاییندیدا، مێژوو مۆرکێکی مەسیحییانەی

وەرگرت کە پتر لەدەوری عەهدی کۆن (تەورات) و عەهدی نوێ (ئینجیلەکان) دەسوڕایەوە. کاتێکیش مێژووی ناوەڕاست فەرامۆش کرا بەو پێیەی مێژوویەکە سەر بە تیۆلۆژیا و کەنیسەیە، لەسەدەی بیستەمدا مێژوو بایەخێکی گەورەی پەیدا کرد، ئەمە چونکە مێژوو لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بریتی بوو لەو دەقانەی باس لەژیانی قەشەکان و موعجیزەکان و رووداوی خورافی دەکات، تەنها هەندێ دەقی زۆر کەم لەبەردەستدان کەشایستەی سوود لێوەرگرتن بێت، بۆ نموونە دەقەکانی قەشە گریگوار دی تۆرز (٥٣٨ز–٥٩٤ز) دەربارەی بیروباوەڕی سەردەمەکەی خۆی و هەروەها ئەو تاعونەی لەساڵی ٥٨٨ز سەرانسەری مەرسیلیای گرتەوە.

لەسەدەی هەژدەهەمدا جان دی جوانفیل کتێبێک دەنووسێت بەناونیشانی «کارەکانی قەشە لویس و وشە پیرۆزەکانی» لەوێدا وەسفێکی وردی ژیانی ئەو بەدووانە دەکات کە لەکاتی جەنگی خاچپەرستیدا لە میسر رێکەوتی کردن، هەروەها تێڕوانینی خاچپەرستەکان دەخاتە ڕوو لەبەرامبەر جیهانی ئیسلامیدا. هەروەها قەشە راوول گلابێر چەند گەواهینامەیەکی هەیە باسی لایەنی ئەقڵیی خەڵکی دەکات لە هەزارەی یەکەمدا، مێژوونوسی هاوچەرخ جۆرج دۆبی پشت بەو تێکستانەی قەشە راوول دەبەستێت.

لەچەرخی رێنیسانسەوە تا سەدەی هەژدەیەم، مەعریفەی مێژوویی چەند رەوتێکی جیاوازی وەرگرت، کەهەریەکە لەو رەوتانە بە رێگەی خۆی مێژووی هاوچەرخی پێکدەهێنا. هیومانیستەکانی چەرخی رێنیسانس و عەلمانیخوازەکان دەستیان کرد بە گەڕان بەدوای دۆکیومێنتە ئەسڵییە ئایینی و غەیرە ئاینییەکان، کە بەشێوەیەکی رەخنەیی هاوچەرخ ئەو دۆکیومێنتانەیان شیدەکردەوە، ئەمانە بەزۆری عەوداڵی مێژووی کۆنی یۆنانی و رۆمانی بوون.

لەسەدەی هەژدەیەمدا، واتە سەدەی رۆشنگەری، فەیلەسوفانی وەک ڤۆلتێر و مۆنتیسکیو و دیدرۆ و کۆندۆرسێ، بایەخێکی بەرچاویان دا بە مێژوو و بنەمای فەلسەفەی مێژوویان دانا، پتر تەرکیزیان دەکردە سەر بابەتی وەک نەژادی نەتەوەکان و مێژووی شارستانییەکان و کاروانی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی.

لەسەدەی نۆزدەهەمدا، لەتەک پەرەسەندنی ئەقلانییەتدا، چەند فەیلەسوفێکی وەک ئیمانۆیل کانت و هیگڵ و مارکس بایەخیان بەمێژوو داو بەسیفەتی ئەوە باسی مێژوویان دەکرد وەک ئەوەی کاروانێکە بەرەو ئازادی کە ئەقڵ پارێزگاری لەو ئازادییە دەکات.

## سەدەی نۆزدەهەم، سەدەی مێژوو:

سەدەی نۆزدەهەم بە «سەدەی مێژوو» ناودەبرێت. لەو سەدەیەدا مێژوونوسە فەرەنسی و ئەڵمانی و ئینگلیزەکان، لەشۆرشی فەرەنسی و دەرکەوتنی ناسیونالیزم و نەتەوە لە ئەوروپادا، ورد دەبوونەوە و لەو رووداوانە ڕادەمان. هەروەها چەند قوتابخانەیەکی نیشتمانی دەرکەوتن، لەوانە قوتابخانەی ئەڵمانی لەگەڵ لیۆبۆلد فۆن رانکە (١٧٩٥-١٨٨٦) و تیۆدۆر مومسن (١٨١٧-١٩٠٣) ویلهلم رۆشر (١٨١٧-١٨٩٤). هەروەها مێژوونوسی سویسری جاکۆب بورکهاردت (١٨١٨-١٨٩٧) کە قوتابیی لیۆبۆلد فۆن رانکە و هاوڕێی فریدریک نیچە بوو، قوتابخانەی کولتووریی دامەزراند.

لەفەرەنسادا سەدەی نۆزدەهەم ئەو قۆناغەیە کە نووسینی مێژوویی، ڕێسای دامەزراوەیی لەخۆگرت، لە سەردەمی حوکمی لویس فیلیپی یەکەمدا ئەرشیفی نیشتیمانی دامەزرا، لە سەردەمی ناپلیۆندا مێژوو لەقوتابخانەکاندا دەخوێندرا. دیارترین مێژوونوسانی ئەو سەدەیە لەفەرەنسادا بریتین لە ئۆگستین تیری (١٧٩٥-١٨٦٥) و جیل میشلیە (١٧٩٨-١٨٧٤) کە هەوڵیان دەدا «مێژووی گشتی» بنووسنەوە و باسی نەتەوەی فەرەنسی بکەن و زیاتر تەرکیز بکەنە سەر چەمکی گشتی و پێشکەوتن.

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، فەلسەفەی پۆزەتیڤیزمی ئۆگست کۆنت (١٧٩٨-١٨٥٧) کاریگەرییەکی زۆری لە مێژوونوسە فەرەنسییەکان کرد، لەوانە هیپۆلێت تێن (١٨٢٨) و نومادنیس فۆستل دی کۆلینگ (١٨٣٠-١٨٨٩)، ئەمانە باوەڕیان وابوو کە دەبێ بەرێگەیەکی ئەقڵانی و بە پشت بەستن بە زانستی سروشت باسی مێژوو بکرێت.

لەساڵی ١٨٧٦دا گابرێل مونۆد گۆڤارێکی دەرکرد بەناوی «گۆڤاری مێژوویی»، لەژمارەی یەکەمیدا بابەتێکی بڵاوکردەوە بەناونیشانی «قوتابخانەی میتۆدگەرایی» کە لەوێدا پشت بە مێژوونوسە ئەڵمانییەکان دەبەستێت، هانی مێژوونوسان دەدات ئەرشیف و ئامار کۆبکەنەوە، داوای لە مامۆستایانی مێژووی زانکۆی سۆربۆن دەکرد واز لە زمانی ڕەوانبێژی و ستایلی زمانی ئەدەبی بهێنن تا مێژوو زمانی تایبەتی خۆی هەبێت.

لەساڵی ١٩٠٠دا و لەچوارچێوەی کێبەرکێ لەگەڵ ئەڵمانیادا و جێگیرکردنی فەرەنسای کۆماریدا، کتێبێک چاپ کرا بە ناونیشانی «مێژووی فەرەنسا» لەلایەن ئەرنست لانیس (١٨٤٢-١٩٢٢) کە لە ١٧ بەرگ پێک هاتووەو ستایشی نەتەوەو دەوڵەتی فەرەنسی دەکات هەر لە سەردەمی کلۆفیسەوە تا ڕۆژگاری خۆی، دواتر ئەو کتێبە گەورەیە بوو بە کتێبی ڕەسمی لە خوێندنی فەرەنسیدا.

## سەدەی بیستەم، سۆسیۆلۆژیا و مێژوو:

لەگەڵ وەرچەرخانی سەدەی نۆزدەهەمدا، زانستە کۆمەڵایەتییەکان و بەتایبەتی سۆسیۆلۆژیا پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆوە بینی. لەساڵی ١٩٠٣دا فرانسوا سیمیاند ڕەخنەی لە ڕەوتی پۆزەتیڤیزمی مێژوویی گرت و پێی وابوو ئەم ئاراستەیە تەنها وەسفی دیاردەکان دەکات، لەکاتێکدا سۆسیۆلۆژیا دەتوانێت چەندین یاسا و ڕێسا دابمەزرێنێت و دیاردەکان شیبکاتەوە.

لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا جان جۆریس کتێبێکی گرنگ دەردەکات بە ناونیشانی «مێژووی سۆشیالیستیی شۆڕشی فەرەنسی»، ئەم کتێبە لەتەک بیری مارکسیزم دەربارەی حەتمیەتی ئابووری و کۆمەڵایەتی، کاریان کردە سەر وەچەیەک لە مێژوونوسان، لەوانە: مارک بلوخ، لوسیان فیفر، ئەلبێر ماتییز، ئەرنست لابروس، ئەمانە هەوڵیان دەدا واز لە مێژووی سیاسی بێنن و بایەخ بە مێژووی ئابووری و کۆمەڵایەتی بدەن.

لەسەدەی بیستەمدا گۆڤاری حەولیاتی فەرەنسی کاریگەرییەکی ئاشکرای کردە سەر ڕەوتی پێشکەوتنی میتۆدی مێژوویی، بەدرێژایی سەدەی بیستەم بەشێکی زۆری مێژوونوسان سودیان لە پێشکەوتنی مێژووی ئابووری و دیمۆگرافیای مێژوویی وەرگرت، لەو دەمانەدا فیرنان برۆدێل پسپۆری

مێژوویی کرد بە پسپۆرییەکی سەرەکی و زاڵ بەسەر زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییەکانی دی. برۆدێل بیرۆکەی «ماوەی زەمەنیی درێژ»ی داهێنا کە مێژوونوس دەتوانێت لەتەک «ماوەی زەمەنیی کورت» و «ماوەی زەمەنیی مام ناوەندی»دا بەدروستی مێژووی سەردەمێک و بگرە مێژووی دیاردەیەکیش بخوێنێتەوە.

هەر لەو کاتانەدا «مێژووی زەینەکان- الذهنیات» بڵاوبۆوە کە فیلیپ ئاریس پتر بایەخی بە لایەنی کولتووری و کۆمەڵایەتی و ئیتنۆلۆجی دەدا. پاشان بیر و فەلسەفەی میشێل فۆکۆ دەربارەی دابڕانی مەعریفی و زانستی کاری لە رەوتی مێژوو کرد.

لەسالانی حەفتاکان بەدواوە حەولیاتی فەرەنسی گەشانەوەیەکی بێوێنەی بەخۆوە بینی، چەندین مێژوونوسی ناوداری وەک ئاندرێ بۆرگیێر و مارک فیرۆ و جاک لی گۆف و ئیمانۆیل لی روی لادوری و جاک ریڤال، ئیدارەی زانکۆکانیان گرت و کتێبی هەمەجۆری مێژووییان چاپ کرد.

لەساڵی ١٩٨٥دا مێژوونوسی ناودار جۆرج دۆبی کە بایەخی بە سەدەکانی ناوەڕاست دەدا، چەندین رەخنەی ئاراستەی حەولیات کرد و داوای دەکرد ئاراستەو میتۆد و بوارەکانی مێژوو بەرینتر بکرێت. لەکۆتایی سەدەی بیستەمیشدا توێژینەوەی مێژوویی بوو بە توێژینەوەیەکی جیهانی کە تەوەری هەمەچەشنی لەخۆ دەگرت. ئەم مێژووە لەچەندین رووداوی گرنگی ئەو سەدەیە ورد دەبۆوە، لەوانە هەردوو جەنگی جیهانی، سەرکەوتن و شکستی کۆمۆنیزم، دەرکەوتنی فاشیزم و نازیزم. هەروەها مێژووی رۆشنبیری سەری هەڵدا کە لەچەند بابەتێکی دەکۆڵییەوە، وەک: مێژووی خوێندن و نووسین، مێژووی کۆچ، مێژووی ئایینەکان، مێژووی فەلسەفە و مێژووی زانستەکان.

### سەرچاوە:

معجم العلوم الانسانية، بإشراف جان فرانسوا دورتيه، ترجمة: د.جورج كتورة، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر، بيروت- ٢٠٠٩.

# جۆرێکی تری مێژوو:
# میشل فۆکۆ و تیۆرەی نابەردەوامی لە مێژوودا

مارك پۆستەر
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

میشل فۆکۆ (١٩٢٦-١٩٨٤) لە پواتیەی فەڕەنسا لەدایکبوو. خوێندنی باڵای لە ئکول نورمال سوپریور لە زانکۆی سۆربۆنی پاریس لە لقی فەلسەفەدا تەواوکرد. ماوەیەک پۆستی بەڕێوەبەرایەتی ئینستیوتی فەڕەنسای لە هامبۆرگو ئنستویتی فەلسەفەی لە زانکۆی ئەدەبیاتی زانکۆی کلرمۆن-فران فەڕەنسای لەئەستۆ بوو.

فۆکۆ یەکێکە لە بیریارە بەرجەستەکانی فەڕەنسا لەپاش جەنگەوە، فەڕەنسایەک کە فەزا فکریەکەی لەلایەکەوە لەژێر کاریگەری بونگەریو بەتایبەتی بیروڕای سارتەرو مۆریس میرلۆ پۆنتیدا بوو، لەلایەکە دیکەشەوە بەتوندی لەژێر کاریگەری مارکسیزمدا بوو. فۆکۆ لەم ئاوو هەوا فکریەدا نەشونمای کرد. فەڕەنسا لەم قۆناغەدا بەڕاستی دەورێکی گەورەی لە بوارە جیاوازەکانی زانستە مرۆییو کۆمەڵایەتیەکاندا هەیەو بیریارانێکی بەرجەستەی لە بوارەکانی مرۆڤناسی، مارکسیزم، دەرونشیکاری، فەلسەفەو مێژودا پێشکەش بە جیهان کردووە، کە بێگومان فۆکۆ یەکێکە لە بەناوبانگترینیان. بەرهەمەکانی فۆکۆ بە ئاسانی لە سنورە باوەکانی لقە ئەکادیمیەکاندا جێگەیان نابێتەوەو شیکردنەوەکانیشی لە چوارچێوە ڕێکەوتنامەیەکانی زانستە کۆمەڵایەتیو مرۆییەکاندا نیە.

فۆکۆ ماوەیەک سەرقاڵی خوێندن بوو لە بواری دەرونناسیو زیاندناسی دەروونی و لیسانسو دیبلۆمیشی لە هەردوو ئەم بوارەدا لە ساڵەکانی ١٩٥٢و ١٩٥٤دا

بەدەستهێنا. پاش زنجیرەیەک لێکۆڵینەوە لە بواری زیانناسی دەرونیو چالاکی لە ئەنستویتی فەڕەنسی لە زانکۆی سوید، پۆڵەنداو ئەڵمانیا بڕوانامەی دکتورای بەتەواوکردنی کتێبێک لەژێر ناونیشانی "شێتی و شارستانێتی: مێژووی شێتی لە سەردەمی کلاسیکیدا" تەواوکرد. لە ساڵی ١٩٧٠دا کورسی وانەی "مێژووی سیستەمە فکریەکانی" لە کۆلێژ دی فرانس وەرگرت. فۆکۆ بەدرێژای ئەم قۆناغانە پەیوەندی بە کەسایەتی فکری گرنگەوە پەیدا کرد: یان شتیان لێوە فێر ئەبوو، یان هاوکاریەکی تیوری نزیکی لەگەڵیاندا هەبوو. کەسانی وەک ژۆرژ کنگلیم/ ژان هیبۆڵت، لیوی ئالتۆسیر، ژاک دیرێداو جیل دۆلۆز. سەرەڕای ئەمانە کاریگەریی بیروڕاکانی سێ کەسایەتی رۆژئاوا واتە مارکسو فرۆیدو نیچەش لەسەر پێگەیشتنو شکڵوەرگرتنی بیروڕاکانی زۆر گرنگو هەمیشەیی بووە . ماوەیەک ئەندامی حیزبی کۆمنیستی فەڕەنسی بوو، لە ساڵی ١٩٥٢ دا وازی لێهێنا.

گرنگترین سیمای بیروڕاکانی فۆکۆ "جینالۆجیای زانینو دەسەڵات"و پەیوەندی نێوان شێوە جیاوازەکانی زانینو دەسەڵاتە کە بەشێوەیەکی سەرەکی لەژێر کاریگەری بیروڕاکانی نیچە "ی فەیلەسوفی دەسەڵات"دایە . فۆکۆ بڕوایوایە کە دەکرێت لەڕێی تێگەیشتنی جینالۆجیای دەسەڵاتەوە لەوە تێبگەین چۆن خەڵک لە خۆیانو کەسانی دی بەهۆی زانینەکانی خۆیانەوە تێئەگەنو دەناسن. فۆکۆ بەتەواوی بڕوای بەوەیە کە ئەوە زانینە دەسەڵات دروستئەکات. بۆ سەلماندنی ئەم خاڵەش دەستئەکات بە لێکۆڵینەوەی زنجیرە پلەی "زانین"و بەو ئەنجامگیریە دەگات کە لەبەرئەوەی "زانستەکان" بەرزترین پلە لە زنجیرە پلەی "زانین"دا داگیرئەکەن، لەبەرئەوە خاوەن زۆرترین "دەسەڵات"یشن. بەبڕوای فۆکۆ دەبێت چیەتی (ماهیەتی) دەسەڵات لە هەموو ئاستە وردەکانی کۆمەڵگادا شیبکرێتەوە: لە ئاستی خێزان، قوتابخانەکان، زانکۆکان، خەستەخانەکان، کارخانەکانو سەرجەم شێوازە بەدەزگایی بوەکانو رێکخراوەکانی لە کۆمەڵگادا هەن.

فۆکۆ هەرگیز لەڕووی فکریو دیدەوە خۆی لە چوارچێوەی مەبەست یان میتۆدێکی تایبەتدا سنوردار نەکردو بەردەوام هەوڵی گۆڕینو چاکسازیو کامڵکردنی هەڵوێستە فکریەکانی خۆی ئەدا. لەڕووی بابەتیشەوە هیچکاتێک خۆی بە مەسەلەیەکەوە سنوردار نەکرد. لە بەرهەمەکانیدا جۆرێک هەمەڕەنگی ئەبینرێت: لە ئەبتستمۆلۆجیاوە لە شکڵی تیوریو عەمەلیەکانیەوە بیگرە تا فەلسەفە، مێژوو، ئەدەبیات، رەخنەی ئەدەبی، دەرونشیکاری، فەمەنیزم، سیاسەت، زمانناسی، هێرمۆنتیک، مۆدێرنیزمو پۆستمۆدێرنیزم، هونەرو مۆسیقا تا شەرحکردنی وردو درێژ لەبارەی هەموو شتێکەوە: لەوانە سیستەمی زامنکردنی کۆمەڵایەتی لە فەڕەنسا، سیستەمی یاساکانی سزادانو سیستەمی زیندانەکان و دەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران کە وەک دەرکەوتنی ئیرادەی گشتی ئێرانیەکان باس و ستایشی ئەکات و ئێران بەرۆحی دنیایەکی بێ رۆح ئەزانێت، کە بە داهێنانو پێشکەشکردنی گوتارێکی تازەو بێوێنەی رادیکالیزمی تیورەیەکی سیاسی-عیرفانی لەناو جەرگەی ئەو چەمکو تێزە مەزهەبیانەی کە بەدرێژای چەندان سەدە لەناو تەپوتۆزی خورافەو جەهلو کۆنەپەرستیدا فەرامۆشکرابوو، مژدەی جۆرێک "ئیلاهیاتی ئازایخواز" ئەبەخشی.

دەکرێت فۆکۆ سەرەڕای ئەو بابەتانەی سەرەوە بە فەیلەسوف-مێژوونوسێکی بەهێزیش بژمێرێت. لە بیرکردنەوەی فۆکۆدا مانایەکی زۆر جیاواز بۆ "مێژوو" هەیە کە بەشێوەیەکی سەرەکی ئیلهامی لە بیرکردنەوەی نیچەوە وەرگرتووە، مانایەک کە تەواو جیاوازە لە چەمکی "تیورەی پێشکەوتن

لە مێژوودا". دەکرێت نمونەی بەرجەستەی تەماشاکردنی نیچەیانەی فۆکۆ بۆ مێژوو، لە دوو بەرهەمی سەرەکی فۆکۆدا واتە لە "کونترۆڵو سزا: لەدایکبونی زیندان"و "مێژووی سێکسوالیتی" دا ببینرێ. هەر دوو ئەم بەرهەمەش بە بەشێک لە سەرچاوە گرنگو بایەخدارەکانی رەخنەی هاوچەرخ لە زانستە مرۆییو کۆمەڵایەتیو بەتایبەتی مێژوو ئەژمێرێت. ناوەڕۆکی سەرەکی ئەم دوو بەرهەمە لە دەوری ئەو تیورەیە ئەسوڕێتەوە کە هەر شکڵبەندیو فۆرماسیۆنێک کە دەرئەکەوێت، پێویستی بە پیاچونەوەی وردی تیورەو کاری مێژووە. لەم ئاراستەیەدا فۆکۆ شکڵبەندی "شێوەی زانیاری" وەک ئەڵتەرناتڤێک بۆ شکڵبەندی "شێوەی بەرهەمهێنان" پێشکەش ئەکات: لەو روەوە کە رۆژ بە رۆژ کرداری کۆمەڵایەتی بە یارمەتی ئامرازو دەزگای پێشکەوتوی ئەلەکترۆنی پێ بەپێی ئەزمونو دەستکەوتەکانی بواری زمانو زماننانسی ئەڕوات. لەبەرئەوە چیدی تیورەی کلاسیکی شێوەی بەرهەمهێنان ناتوانێت وەک بنەمایەک بۆ تیورەی رەخنەگرانە کاربکات، چونکە کارایی پێویستی خۆی لەدەستداوە. فۆکۆ شێوازی گوتار/ پراکتیکی خۆی لە چوارچێوەی تیورەی شێوەی زانیاریدا، لە بەرامبەر شێوەی بەرهەمهێناندا رێکخستووە، و لەم رێگەیەوە شێوازە تازەکانی دەسەڵات ئاشکرا و شیئەکاتەوەو دەستئەکات بە ناساندنی سەرچاوە تازەکانی ناڕەزایی رادیکال.

دەبێ سەرنجی ئەوە بدەین بەهێزیو پتەوی بەرهەمەکانی فۆکۆ ئەگەڕێتەوە بۆ شیکردنەوەکانی. هەموو شیکردنەوە مێژووییەکانی فۆکۆ سەبارەت بە رێکخستنو دەزگا مۆدێرنەکانی زانستە تیوریو پراکتیکیەکانو پەیوەندیان بە بەکارهێنانو شێوە دیاریکراوەکانی دەزگا کۆمەڵایەتیەکانەوەیە. بەدەربڕینێکی سادە واتە شیکردنەوەکانی فۆکۆ بۆ نمونە لەبارەی لەدایکبوونی دەرمانخانە، نەخۆشخانەو زیندانەوە، شیکردنەوەگەلێکی مێژوویی بووە، و دیارە کێشەکانی تەفسیری مێژوویشیان تێدایە. بەڵام فۆکۆ هیچ کاتێک مەبەستی ئەوە نەبووە وەک مێژوونوسە فەرمیو نافەرمیەکان، کلاسیکی و باوەکان، و تەنانەت وەک مێژوونوسە ئەکادیمیەکان، "رابردوو" بەشێوەیەکی مێژوویی، وردو موو بە موو بونیاد بنێتەوە. فۆکۆ هەر شیکردنەوەیەکی مێژوویی بە کێشە یان پرسێک دەست پێئەکات، پاشان لەرێی لێکۆڵینەوەی مەیدانیەوە بەبێ تێبینیکردنی دابەشکردنە ئاساییەکانی شوێنو کات، تاوتویو شیئەکاتەوە. بۆ نمونە لە کتێبی "سیستەمی شتەکان: ئەرکۆلۆژیای زانستە مرۆییەکان"دا دەستئەکات بە تاوتوێکردنو شیکردنەوەی دوو جوڵەی بنەڕەتی لە مێژووی فکری رۆژئاوا لە رینسانس بەدواوە. یەکێکیان لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەوەو ئەوی تر لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە. مەبەستی فۆکۆ ئەوەیە کە گوتار وەک روداوێکی بەرجەستەو هەستپێکراو لێبکات، بەڵام مێژووی دەرکەوتنی یان دامێنی کاریگەریەکانی، لە پلەی دووهەمی گرنکیدا دێت.

خاڵێکی گرنگی تر ئەوەیە کە فۆکۆ لە سەیرکردنیدا بۆ مێژوو، رەوتی پەرەسەندن یان پێشکەوتن بە جوڵەیەک لە کۆمەڵگای دواکەوتووەوە بۆ کۆمەڵگای پێشکەوتووی سەردەمی ئێستا نازانێت، کە لەسەر بناغەی زانینێکی قوڵ راوەستاوە، بەڵکو مێژوو وەک جوڵەیەک لە سیستەمێکی دەسەڵاتەوە ئەبینێت(کە لەسەر بناغەی زانینی تایبەتی خۆی دامەزراوە) بۆ جۆرەکانی تری سیستەمی دەسەڵات(بە زانینی تایبەتی خۆیەوە). فۆکۆ مێژوو بە روداوێکی بەردەوامی زنجیرەیەک رودوای پێکەوەگرێدراو وەک دانەکانی زنجیرێک نازانێت، کە لە رەوتێکی روبارئاسادا لە رابردووە تا ئێستاو بەرەو ئایندە بەشێوەیەکی بەردەوام لەجوڵەدایە. فۆکۆ مێژوو بە روبەری دوبارەبونەوەی پێشهاتو

رودواوەکان بۆ پەند لێوەرگرتن نازانێت، یان وەک کۆمەڵێک ئەڵقەی پێکەوە گرێدراو و زنجیرەیەک پێشهاتو روداو کە ئەگەر ئەڵقەیەک یان بەشێکی ون بێت، پەیوەندی پێشهاتو روادەکانی پێشو دوای دابڕێتو نەکرێت هۆیەتی یان پەیوەندییەکی لۆژیکی لە نێوانیاندا بدۆزرێتەوەو توشی نائومێدیو سەرگەردانی ببین. "مێژوو" بەپێچەوانەی ئەوەی مێژوونوسان تا هەنوکە بەشێوەیەکی دۆگمایی رایانگەیاندووە:"دوبارەبونەوەی روداوەکان" نیە، رەنگە چونیەکی و لێکچونێک لەئارادا بێت، لەبەرچیو بەچ مافێک رێگە بەخۆیان دەدەن (واتە مێژوونوسان) کە روداوێکی کۆمەڵایەتی-سیاسی لە زەمەنێکی تایبەتو شوێنێکی تایبەتدا بە دوبارەکردنەوەی موو بە مووی روداوێکی تر، لە زەمانو شوێنێکی تردا بزانن. مێژونوسانی فەرمیو نافەرمی، ئەکادیمیو نائەکادیمی مێژوو و مێژوونوسین بە پیشەی پسپۆریو پاوانکراوی خۆیان ئەزانن، بەپێی چ بەڵگەو پێداویستیەکو بەچ پاساوێک بەردەوام بەشێوەیەکی بڕاوە حوکمئەدەن "کە دیسان مێژوو دوبارە بۆتەوە"، لەکاتێکدا نە روبەری زەمەنیو نە روبەری شوێنو خودو چالاکوانەکانی لەناو روداوەکاندان (مرۆڤەکان) یەک شت نین: شۆڕشی ئۆکتوبەری ١٩١٧ی کۆمنیستو سوشیالیستەکانی رۆسیا، چۆن ئەتوانێت دوبارەکردنەوەی شۆڕشی ١٧٨٩-١٧٩٢ی یاکۆبینەکانی فەڕەنسا بێت. تازە ئەمەش کاتێک ئامانجو بەرنامەو بەکارهێنانەکانی ئەم دوو شۆڕشە لەبەرچاو نەگرین: یەکێکیان پێشڕەوی کۆمەڵگای بۆرژوازی مۆدێرن کە بانگەشەی بۆ سەرمایەداری روو لەپێش ئەکرد، و زەنگی مەرگی رژێمی کۆن بوو، ئەوی تریشیان بانگەشەکەری لەناوبردنی رژێمی سەرمایەداری بۆرژوازی و جێگیرکردنی کۆمەڵگای بێ چینو زەحمەتکێشان بوو. فۆکۆ بەم ئاوازە رەخنەگرو لێدەرە، دەستیکردووە بە هاندان دژی روداوە باوەکان لە مێژوونوسیدا. لەڕاستیدا تێزەکانی بەڵگەنامەیەکە دژی مێژوونوسی لە رابردووەوە تا ئێستاو بانگەشەیەکە بۆ ململانێ لەگەڵ مێژوونوسان لە رابردووەوە تا ئێستا. هەر ئەم تێزانەی فۆکۆ کە زوربەی مێژونوسانی بەتوندی شڵەژان، وای لێکردن دژی رابوەستنو بە هەڕەشەیەکی جدیی بزانن بۆ پیشەی مێژوو، (مێژوونوسان) هاوپیشەکانی خۆیان ئاگادار کردەوە کە دەبێت بەشێوەیەکی جدی دژی ئەم "ئافەت زیانبەخشە بۆ کێڵگەی مێژوو" رابوەستن. (و.ف)

## فۆکۆ و تیورەی نابەردەوامی لە مێژوودا

ئەگەر نەکرێت "تیورەی کار" بە مانا مارکسیەکەی وەک بنەمایەکی رێکخەر بۆ لێکۆڵینەوە مێژووییەکان بەکاربهێنرێ، لەم حاڵەتەدا دۆزینەوەی تیورەیەکی ئەڵتەرناتیڤ ئەبێتە پێویستیەکی سەرەکی. لەم وتارەدا هەوڵدراوە تا ناوەڕۆکی سەرەکی تیورەی مێژوو لای فۆکۆ رون بکرێتەوەو شایستەیی وەک چوارچێوەیەکی گشتی تازە، پێشکەش بە مێژونوسان بکرێت.

بەدرێژای چەند دەیەی رابردوو لەگەڵ دەرکەوتنی لقە تازەکانی میتۆدلۆجیاو بابەتی تازەی لێکۆڵینەوە، کە لەژێر ناونیشانی "مێژووی کۆمەڵایەتی"دا کۆبۆتەوە، شۆڕشێک لە لقی مێژوودا رویداوە . بڵاوکراوەکانی وەک "ئەنال" لە فەڕەنساو "ئێستاو رابردوو" لە ئینگلتەرا، ناوکی ئەم گۆڕانە

تازانە بوون. ناونیشانو ناوی فەسڵەکان وەک سەرژمێر، شار، خێزان، ژنان، چینەکان، وەرزشو رونکردنەوەی حاڵەتی دەرونی، کۆمەڵێک ناونیشانن کە بەدرێژایی ئەم دەیەیی دوایی بەسەر بابەتو ناونیشانە مێژووییە تەقلیدیەکاندا زاڵ بووەو خستونیەتە ژێر سێبەری خۆیەوە. دیدە تازەکانی میتۆدۆلۆجیا لە هەموو بوارەکانو لقە تازەکانی زانستەکاندا بەخزمەت وەرگیراوە: پێوانی ئابوری لە لقی ئابوریەوە، چاککردنەوەی خێزان لە لقی سەرژمێری، "تەفسیری قوڵ" لە لقی خەڵکناسیەوە، شیکردنەوەی راکانی هەڵبژاردن لە زانستە سیاسیەکانەوە، شیکردنەوەی پرسیارنامەو شیکردنەوەی چینایەتی لە کۆمەڵناسیەوە، دەرونشیکاری لە دەروونناسیەوە. بەم شێوەیە مێژوو کە سەردەمێک لقێکی زانستە مرۆییەکان بوو کە لەسەر بناغەی گواستنەوەی بەسەرهاتو گێڕانەوەی حیکایەت دامەزرابوو، هەنوکە وەک تێکەڵەیەکی هەمەڕەنگ لە شێوازەکانی زانستە کۆمەڵایەتیەکانی لێهاتووە. ئەوە راست نیە کە لە سەردەمی "رانکە"وە مێژوو لەبەردەم ئەمجۆرە پیاچونەوە بەرچاوانەدا بووە، دواجار بە قبوڵکردنی ماتریالیزمی مێژوویی لەلایەن مێژونوسانەوە، مارکسیەکان قازانجێکی زۆریان لەم قبوڵکردنە وەرگرت. یەکێکی تر لە جیاکەرەوە سەرەکیەکانی گۆڕان لە مێژوونوسیدا و لێکۆڵینەوەی مێژوویی، دەرکەوتنی باسی تازەی "مێژووی دەرونیە" کە جێگەیەکی گرنگ یان بەرجەستەی بۆخۆی داگیرکردووە. تەنها ئەم سێ دەیەیە پێشتر بوو کە بەرهەمی مامۆستایانەی ئریک ئریکسۆن لەبارەی مارتین لوسەرەوە، روبەروی بێزاریو توڕەیی زوربەی مێژونوسانی کلاسیک بۆوەو لەلایەنەوە رەتکرایەوە. ئەم مێژوونوسانە تەنانەت زەحمەتی ئەوەیان بەخۆیان نەدا کە لێکۆڵینەوەیەک یان ناساندنو رەخنەیەک ئەگەرچی بەگشتی بووە بۆ ئەم بەرهەمە لە بڵاوکراوەی American Historical Review چاپبکەن، ئەمەش لەکاتێکدایە کە ئەمڕۆ "مێژوویی دەرونی" وەک وانەیەکی سەربەخۆ لە زانکۆکانی دنیادا ئەخوێنرێت، گەلێک بڵاوکراوەی جیاواز لەبارەی مێژووی دەرونیەوە بڵاوئەبێتەوەو چەندان سەمینار و کۆنفرانس لە زانکۆ سەرەکیەکاندا لەبارەیەوە دەگیرێت.

بێگومان هێشتا شێواویو ئاڵۆزیەکی زۆر لەئارادایە. بەرنامەی ستاندارد بۆ مێژوو، شتێکە سەر بە رابردوو، لەکاتێکدا سەبارەت بەتوانا و هێزی عەقڵی ئەم هەلومەرجە، قسەیەکی زۆر هەیە بکرێت، بەڵام ئەگەری ئەم ئەنجامگیریە نائۆمێدانەیەش هەیە کە بەشەکانی مێژوو بۆ کۆمەڵێک بەشو پارچەی پەرشوبڵاوی بێ ئەژمار پارچە پارچە بێتو هەرگیز سەرلەنوێ شێوەیەک بەخۆیەوە نەگرێت کە قابیلی ناسینەوە بێت. تەنانەت رەنگە وەک زەخرەفەیەک لەناو لقەکانی تری زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا بتوێتەوە. ئەمڕۆ یەکێک لە سەرەکیترین هۆکارەکانی نەگونجانو ناپەیوەستبوون لە بەرهەمە مێژوویەکاندا ئەوەیە چالاکوانانیو هەڵسوڕاوانی مێژووی کۆمەڵایەتی، خاوەنی ئەندێشەیەکی تیوری نین. رەنگە بکرێت مێژونوسان بەجۆرێک ئاوارتن بزانرێن، چونکە نوسینو بەرهەمەکانیان سەرچاوە لە نەریتێکی تیوریو قوڵەوە وەرئەگرێت. بەڵام مەسەلەکە هەمیشە بەمشێوەیە نیە. بۆ نمونە لەبارەی ئیدوارد تامپسۆن کە یەکێکە لە مێژونوسە مارکسیەکان، کاتێک یەکێک لە بەرهەمە وتوێژ وروژێنەکانی هەڵئەسەنگێنین کە دژی لوئی ئالتۆسیری فەیلەسوفو (دەکرێت بڵێین) مێژوونوسی مارکسی فەڕەنسیە، واتە "فەقیری تیوری" (١٩٧٨) دەبینین کە ئەم مێژونوسە کەمترین تێگەیشتنی بۆ چەمکی تیورە نیە. رەنگە هەموو مێژوونوسە مارکسیەکان لەو کەلەرەقیە دژە تیوریەی تامپسۆندا هاوڕای نەبن، بەڵام لە نوسینەکانیاندا ئاراستەیەکی سەرەکی بۆ

هەڵوێستوەرگرتنی ئەزمونگەریانە هەیە کە تەنها پابەندبونی بەهێزی سیاسی بە سۆشیالیزمەوە، پارێزگاری لێئەکات. مێژوونوسانی سۆشیالیستی نامارکسی بەنۆبەتی خۆیان لە فەرامۆشکردنی پێشگریمانە تیوریەکانی نوسینەکانیاندا، چەندانجار زیاتر هاودەنگن. بەشی زۆریان شێوازناسی چەندایەتیان قەبوڵەو دوای واقعیەتی بەرجەستە یان پێناسکراوی شێوازی چەندایەتی ئەکەون، و هەرگیز زیهنیەتو ئەو چەمکانە ناخەنە ژێر پرسیارەوە کە لەلایەن ئەم شێوازەوە پێشکەش ئەکرێت. لێرەوە لە نوسینەکانی پیتر لسلت مێژووی خێزانی تا ئاستی ئەژمارکردنی ئەو پەیوەندیە خوێنیە دائەبەزێت کە لە خێزان بەجێماوە. بە تێبینیکردنی جەختکردن لەسەر پێویستی وردبینی ئامار-ژماردن، ئەو کۆمەڵە مەسەلەیەی پەیوەندی بەژیانی خێزانیەوە هەیەو قابیلی ئەندازەگیری چەندایەتی نیە، وەک کۆمەڵێک مەسەلەی بێبایەخو ناگرنگ تەماشائەکرێنو ئەخرێنەلاوە. بەڵام بەگشتی لەناو مێژونوسانی کۆمەڵایەتیدا پاکیو بێگەردی شێوازناسی، نابێتە هۆی سەرکوتکردنی فزولیەتی زیهنی، و دەبێت بەچاوێکی رازیبوونو دۆستەوە تەماشای ئاراستە تازەکانیش بکەین.

لەگەڵ ئەمەشدا سەرەڕای پێشکەوتنە ئاشکراکان، سودێکی ئەوتۆ لەو هەلانە وەرنەگیراوە کە مێژووی کۆمەڵایەتی بۆ خستنە ژێر پرسیاری گریمانە بنەڕەتیەکانی بەرهەمی لێکۆڵینەوەی مێژوویی لەم لقەدا داوێتی بەدەستەوە. هەر هەمەڕەنگی بابەتەکان و ئەو ناونیشانانەی مێژونوسان بەدوایدا دەچن، خۆی لە خۆیدا هاندەری گریمانە تیوریەکانی ئەم لقەیە. ئەگەر مێژووی خێزان، مێژووی شارنشینی، مێژووی ژنانو مێژووی هەلومەرجی دەوروبەر، هەمویان بواری گرنگ بن بۆ لیکۆڵینەوە، لەم حاڵەتدا پێوەرەکانی هەڵبژاردنی ئەم یان ئەو لقە بۆ لێکۆڵینەوە چیە؟. هەریەک لەم ئاراستانە چۆن دەبنە دروستکەری بوار یان زەمینەیەکی کۆمەڵایەتی تایبەت؟ ئایا ئامانجەکانی لێکۆڵینەوە لە هەریەک لەم ئاراستانەدا پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە؟ ئایا دژ بەیەکن؟ ئایا دەکرێت بەشێوەیەک لە شێوەکان هەمویان وەک مێژووی گشتی لە شوێنێکدا کۆبکرێنەوە؟ ئەم پرسیارانە تەنها بەدەستپێکی لێکۆڵینەوەیەکی تیوری لەبارەی مێژووی کۆمەڵایەتیەوە ئەژمار ئەکرێن، کە ئەمڕۆ بونی زۆر بە پێویست ئەزانرێت. گرنگیو بایەخی دوا نوسینو بەرهەمەکانی فۆکۆ ئەوەیە بە سەرنجدان لە جیاوازیان لەگەڵ مێژووی کۆمەڵایەتیدا، زۆر بە بەهێزی هەموو پرسیارە تیوریە گرنگەکان دەهێنێتە ئاراوە.

فرەییو بابەتە هەمەڕەنگو جیاوازەکانی بەرهەمەکانی فۆکۆ، شێوەی هێنانەئارای بابەت لەدوای بابەت، چاوەڕوانیەکانی خوێنەری ئاشنا بە مێژووی کۆمەڵایەتی ئەشێوێنێت. درزی گەورە لە خوێندنەوەیدا هەیە، بێدەنگی ئەوتۆ کە بەدەنگی بەرز بەسەر خوێنەردا هاوار ئەکەن. ناونیشانو بابەتەکان بەشێوەیەکی ئازاربەخش لە رەوتی ئاسایی خۆیان ئەچنە دەرێو هەستی بەدواداهاتنی لۆژیکی خوێنەر ئەشێوێنن. ئاستەکانی شیکردنەوە تێکەڵ بەیەک ئەبنو پەشێویەک دروستئەکەن: جیاوازی نێوان بیروڕاکانو رەفتار دانی پیانانرێتو بە ئاسانی چاوپۆشی لێئەکرێت. مەسەلە سادەکانی هۆکارێتی (علیەت) فەرامۆش ئەکرێن و بەشێوەیەکی پێچەوانە پیشان ئەدرێن. شێوازی نوسینەکە زۆر قورس پڕ لە ئیستیعارەو کنایەیە و دیدی هێڵی گێڕانەوە زوربەی جار کەم رەنگ یان لە بنەڕەتدا ونە. هیچ کاتێک ئامانجی لێکۆڵینەوە بەشێوەیەکی ورد و روون، دیاری ناکرێت، بە روکەش نە فەردیە، نە کۆمەڵیەو نە دەزگاییە. لە هەمووی خراپتر ئەوەیە مەسەلەکان لەکاتی

نوسیندا جێگۆڕکێ ئەکەن: لە دەستپێکی نوسیندا بابەتێک هێنراوەتە ئاراوە، و لە کۆتاییدا پێدەچێت کە خەریکە باسکردنی شتێکی دی ئەخوێنینەوە. دیسان لەمەش خراپتر ئەوەیە کە شێوازی نوسینی نوسەر بۆ بابەتی لێکۆڵینەوەکە هەرگیز بەڕوونی دەرناکەوێت. پێدەچێت نوسەر حەزی لە گۆڕینی هەڵوێست یان وەرگرتنی هەڵوێستێکی نافەرمیو وروژێنەر هەبێت. دواجار گەرچی فۆکۆ لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا سود لە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زۆر جیاوازو هەمەڕەنگ وەردەگرێت، بەڵام بەشی زۆری بابەتەکان فەرامۆش ئەکرێت و کەمترین سەرنجیان لێ نادات. لێرەوە جێی سەرسوڕمان نیە کە مێژوونوسان بەدبینن بەرامبەر بە نرخی هەوڵەکانی فۆکۆ.

دیارە ژمارەیەکی بەرفراوانی خەڵکناسان، کۆمەڵناسان، فەیلەسوفان، ڕەخنەگرانی ئەدەبیو مێژوونوسان بەرهەمەکانی فۆکۆ ئەخوێننەوە. بەڵام کاریگەری بەهێزی بەرهەمەکانی فۆکۆ مێژووییە. فۆکۆ شێوەی بیرکردنەوەیەکی تازەی لەبارەی مێژووەوەو سود لێوەرگرتنی لە ململانێ سیاسیە باوەکاندا هێنایە ئاراوە. ئەگەر فۆکۆ "مناڵێکی بەدە" کە لقی زانستە مرۆڤایەتیەکان بەرەو لەناوچون ئەبات، لە هەمانکاتدا بە یەکێک لە شەیداترین لێزانی ئەم بوارانەش ئەژمار ئەکرێت، کە ئەیەوێت لەڕێی پراکتیکێکی مێژوویی ڕەسەنو زۆر تایبەتەوە، هێڵە سەرەکیەکانی ئەم لقانە تازەبکاتەوە. فۆکۆ مێژوونوسێکی دژ بەمێژووە. مێژونوسێک کە لە نوسینەوەی مێژوودا هەڕەشە لەیەک بەیەکی ڕێساو حوکمەکانی ئەم پیشەیە دەکات. لێرەوە دەکرێت بپرسین ئایا لە بنەڕەتدا لە تێکستەکانی فۆکۆدا "تیورەیەک لەبارەی مێژووەوە" ئەبینرێت؟ ئایا بەپێچەوانەی نوسینی دژی سیستەمی فۆکۆوە، دەکرێت کۆمەڵێک چەمک یا وتەزا بدوزرێتەوە کە ژێرخانی زانیاریەکی فراوان، بەهێزو وروژێنەری فۆکۆ ئاشکرا بکات؟.

خوێندنەوەی بەرهەمە سەرەکیەکانی فۆکۆ ڕەنگە مرۆڤ بەو ئەنجامگیریە بگەیەنێت کە فۆکۆ شتێکی وەک "تیورەی مێژووی" پێشکەش نەکردووە. فۆکۆ هیچ بەرهەمێکی لە قاڵبی شێوەی لێکۆڵینەوەکانی "توین بی"دا، واتە لێکۆڵینەوەی رابردوو و تیکئالانی مێژووی چەند هەزارەی دوایی لە چوارچێوەی وتەزای هەمەکیدا نەنوسیووە. هیچ تیورەیەکی لەبارەی هۆکارێتی (علیەت) — بەو مانایەی هۆکارێک یان کۆمەڵێک هۆکار چارەنوسی مرۆڤ دەست نیشان ئەکەن- پێشکەش نەکردووە. هیچ وتار یان نامەیەکی ئامانجناسی نەنوسیوە کە بۆ نمونە بیسەلمێنێت کە دەبێت بەشێوەیەکی دیاریکراو لە ماناو ئایندەی مرۆڤایەتی بگەین یان بەدیبهێنین. جگە لەمەش زۆرێک لە مێژونوسانی لێزان لە دنیای ئینگلیزی زماندا، زۆرجار تەنانەت ئەوە قەبوڵناکەن کە فۆکۆ یەکێک بێت لەوان. زۆرێک لە مێژوونوسانی ئەمەریکیو ئینگلیزی، کتێبەکانی فۆکۆ نەک وەک فراوانکردنو پەرەپێدانی تیورەیەکی تازە لەبارەی مێژووەوە تەنانەت نەک وەک بەرهەمەکانی مێژوونوسێکی ئەزمونگەر، بەڵکو وەک هێرشێک بۆ سەر لقی مێژوو تەماشائەکەن. مێژوونوسێک بەشێوەیەکی روکەشانەو ساویلکانە ئاماژە بۆ "نەفیکردنی زیادەڕەوانەی بەها زاتیەکانی لقی مێژوو" لەلایەن فۆکۆوە ئەکات. مێژوونوسێکی تر بە نوسینی بابەتێک لە بڵاوکراوەی موعتەبەر و بەپێزی journal of Modern History دا بە تەرخانکردنی زیاد لە پەنجا پەڕە، هەوڵئەدات مێژوونوسان لە مەترسیەکانو دەرئەنجامە وێرانکاریەکانی بەرهەمەکانی فۆکۆ بۆ لقی مێژوو وریا بکاتەوە. لەم هەلومەرجەدا کێ جورئەت ئەکات یان ئەو مافە بەخۆی ئەدات باسی "تیورەی مێژووی فۆکۆ" بکات؟

دەبێت ئەو خاڵەش بەبیر بهێنینەوە کە فۆکۆ تا کاتی مەرگی ناوەختو خەمناکی، لێپرسراوی کورسی وانەی مێژوو بوو (مێژووی سیستەمە فکریەکان) لە کۆلیژ دی فرانسی پاریس. هەروەها دەبێت ئەوەش بڵێین کە فۆکۆ شەش بەرگ کتێبی نوسیوە کە پەیوەندی بە رەهەندە جیاوازەکانی مێژووی رابردوی ئەوروپاوە هەیە: شێتیو شارستانێتی: مێژووی شێتی لە سەردەمی عەقڵدا (١٩٦١) (وەرگێرانی ئینگلیزی ١٩٦٥، ١٩٧٧)، لەدایکبوونی خەستەخانە: ئەرکۆلۆژیای تێگەیشتنی پزیشکی (١٩٦٣) (ت: ١٩٧٥، ١٩٧٧، ١٩٧٩)، سیستەمی شتەکان: ئەرکۆلۆژیای زانستە مرۆییەکان (١٩٦٦) (ت ١٩٦٦، ١٩٦٩، ١٩٧٧)، ئەرکۆلۆژیای زانین، و گوتارێک لەبارەی زمانەوە، دوو بەرهەم لەیەک بەرگدا (١٩٦٩) (ت: ١٩٦٩، ١٩٧٥)، کۆنترۆڵو سزا: لەدایکبونی زیندان (١٩٧٥) (ت: ١٩٧٧، ١٩٧٩)، مێژووی سیکسوالیتی لە سێ بەرگدا (بەرگی یەکەم: پێشەکی ١٩٧٦، ت: ١٩٨٠) (بەرگی دوهەم: بەکارهێنانەکانی لەزەت ١٩٨٤، ت: ١٩٨٥) (بەرگی سێهەم: سەرنجدان لە دەرون ١٩٨٤) کە دوو بەرگی دوایی لە دوا رۆژەکانی ژیانی فۆکۆدا چاپکران. هەموو ئەم بەرهەمانە لانیکەم بە روکەش بە بەرهەمی مێژووی ئەژمێرێن. ئێستا چۆنە کە کەسێک ئەوەندە خەریکی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی دەوڵەمەند، داهینەرانەو قوڵ بووە لەبارەی رابردووەوە، ناوی مێژونوسی لێ نانرێت؟

## 1- تیورەی نابەردەوامی:

وەڵامی پرسیارەکەی سەرەوە زۆر ڕوونە. فۆکۆ رەوتی گۆڕانی مێژووی رابردوو ناگێڕێتەوە، حکایەتخوانی روداوو و بەسەرهاتەکانی رابردوو نیە، لەمڕووەوە حکایەتخوانیی ناکات کە چۆن "مێژووی یەکپارچەی رابردوو" بەئارامی و بەشێوەیەکی هاوئاهەنگ دروستبوو. بە کورتی فۆکۆ مێژوونوسی بەردەوامی نیە، بەڵکو مێژوونوسی نابەردەوامیو بەدوای یەکدا نەهاتنە. فۆکۆ هەوڵئەدات جیاوازبون، نامۆییو هەڕەشەئامێزی رابردوو پیشانبدات. هەوڵی فۆکۆ ئەوەیە رابردوو لە ئێستا جیابکاتەوە، واتە دابڕانی ئەو پەیوەندیە سادەو گەرمەی کە مێژوونوسان بەشێوەیەکی تەقلیدی لەنێوان رابردوو و ئیستادا هەیانبووەو هەیانە. فۆکۆ ئەیەوێت پێگەی مێژوونوس لە تاکەکەسێکەوە کە بەکۆکردنەوەی هەموو ماناکانی "رابردوو" و بەدواداچونی ئەو رەوتی ناچاریانەی لەرێگەیەوە ئەو مانایانە لە "ئێستا" دەتوێنەوە، پارێزگاری لە "ئێستا" دەکات، بکاتە پێگەیەکی فەردی کە رابردوو لە ئێستا دائەبرێنێت، و بە پیشاندانی نامۆبونی رابردوو، ڕەوایەتی ئێستا کەمو مەرجدارو رێژەیی ئەکات. فۆکۆ ئەم کارە بەشێوەیەکی توندو بریندارکەر ئەنجامئەدات، بۆ نمونە لەم دەربڕینانەی خوارەوەدا فۆکۆ سەرزەنشتی مێژوونوسە رۆشنبیرەکان دەکات، لەبەر وەسواسی فکری یان دڵەراوکێی زیاد لەسنوریان لەبارەی نزیکیو خزمایەتی نزیکی نێوان بیروراکان، کە لەڕاستیدا دەربڕینێکی ترە لە تێزی بەردەوامی:

گەڕان لەناو ئەم ژمارە زۆرەی پێشتر ناومان هێنان بەدوای تێکستێکدا کە "لەپێشەوە" هاوشێوەی تێکستێکی دواییە، بۆنکردنی مێژوو بۆ دۆزینەوەی پێشبینیەکان، و یان دەنگدانەوەی دوبارە وتراوەکان، گەڕانەوە بۆ رابردوی دوور بۆ دۆزینەوەی تۆوەکانی سەرەتا، یان چونە پێشەوە بۆ دۆزینەوەی دوا جێپێکان، ئاشکراکردنی پابەندبونی مێژوو بە نەریت یان یەکتابوونی کە قابیلی

کورتکردنەوە نیە، بۆ ناو تێکستێک، زیادکردن یان کەمکردنەوەی توانای داهێنانی، وتنی ئەوەی کە نەحویەکانی پۆرت رۆیال هیچیان دانەهێناوە، یان دۆزینەوەی ئەو خاڵەی ”کویە“ ئیلهامێکی زۆری لە پێشینانەوە وەرگرتووە، هەموو ئەمانە بۆ مێژونوسانێک کە لە هەموو پێشکەوتنێک ئەترسن، تەکنیکیی بەرێژە بێ زیانە“. بەمشێوەیە لوتکەی پێگەیشتنو کامڵبونی هەر مێژونوسێک پێویستی بە تامکردنی تامی رابردوو و ئارەزوکردی وەک تامەزرۆیەکی گەورە بۆ شتێکی جیاوازە.

فۆکۆ دەمامکی مەزڵومیەتو پاکی ئەبستمۆلۆجی مێژوونوس لائەباتو هەقیقەت ئاشکرائەکات. فۆکۆ ئەم پرسیارە بریندارکەرە ئەهێنێتە ئاراوە: کاتێک مێژوونوس بەدوای دۆزینەوەی جێپێی بەردەوامی مێژووی رابردودایەو هۆکانی روداوەکانی رابردوو ئەگەڕێنێتەوە بۆ رەگەزی بەردەوامی، چ بەڵایەک بەسەر رابردودا دێنێت؟ لە روانگەی فۆکۆوە مێژوو هاوکات شێوەیەکی زانینو شێوەیەکی دەسەڵاتە، بەمانایەکی دی مێژوو ئامێرێکە بۆ کۆنترۆڵو دەستەمۆکردنی رابردوو لەرێگەی ناسینیەوە. بەدەربڕینی رانکە مێژوونوس وا پیشانی ئەدات کە دوبارە مێژوو لە شکڵێکی واقعیدا دروست ئەکاتەوە. مێژوونوس بە سودوەرگرتن لە ئاوێتەکردنو تێکەڵکردنی ناشیانەی حیکایەتەکان، ئامارو ژمارەکان، روانگەی رابردوو بە وریاییەوە بە رەنگەکانی ئێستا رەنگرێژ و وێنە ئەکات. ئەو ئێستا بەپێی رابردوو وەسفئەکاتو بانگەشەی ئاشکراکردنی هەقیقەت یان هەقیقەتێکە لەبارەی رابردوو و ئێستاوە. مێژوونوس بێ ئەوەی خۆی بخاتە ژێر پرسیارەوە، ئەم ئەرکە ئەنجامئەدات، لەکاتێکدا ئەبێت کاری مێژوونوس لەژێر پاڵنەری هێزی هەقیقەتی پەتیو گەڕان بەدوای ڕاستیدا ئەنجامبدرێت.

لە بابەتە سەرەکیەکەمان دوور نەکەوینەوە. رەخنەی فۆکۆ لەسەر بناغەی دژایەتی نێوان بابەتیبوونو رێژەگەری، زانستو ئایدۆلۆژی بیناکراوە. هەڵوێستی ئەو رەنگە لە هێرش بۆسەر بێلایەنی بەهایی بچێت، بەڵام ئەو مەسەلەیەی فۆکۆ ئەیەوێت شتێکی ترە. زانینی ئەو خاڵەش هیچ یارمەتیەک نادات کە ئایا بۆ نمونە مێژوونوس بەئاشکرا ئەو بەهایانەی خۆی بڕوای پێیەتی وەک خۆشەویستی نیشتیمان، لایەنگری حیزبیو ئەم بابەتە شتانە ئەخاتە کار یان نا. رەخنەی فۆکۆ زۆر بنەڕەتیترە لەم قسانە. خاڵی سەرەکی ئەوە نیە ئایا مێژوو بە گرنگیدان بە شتە بابەتیەکان دەنوسرێتەوە، یان بە پاڵنەرێکی ئایدۆلۆژی، بەڵکو ئەو خاڵەی جێگە باسە، کاری کەسێکە کە بانگەشەی ئەوە ئەکات خودهوشیاری ئەو هەڵگری جۆرێک هەقیقەتە لەبارەی رابردوەوە کە لەرێی نوسینەوەی مێژووەوە دەریئەخات. فۆکۆ بڕوای وانیە هەنگاوی لەمشێوەیە هەوڵی بێهودەو نامومکینو نارەوان، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەمە بەکارێکی چالاک، ئیرادەوی ئەزانێت کە ئاماژە بۆ زەوقو تامەزرۆیی لەکارکردن بە کەرەسە و بابەتەکان ئەکات. ئەمە داهێنانێکە، چیرۆکێک یان رۆمانێک بەمانای وردی وشە. چیرۆکێک کە بەپێی وتەی پۆزتڤیزمەکان، لیبراڵەکانو مارکسیەکان گوتارێک بەرهەمدێنێت، بە کۆمەڵێک ماناوە کە هەرکەسێک بیخوێنێتەوە ئەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە. فۆکۆ بڕوای وایە نوسینی مێژوو کارێکە کە کاریگەری بەدوای خۆیدا دێنێت، و ئەم کاریگەریانەش بەدەر لە حیزبی سیاسی کەسی مێژوونوس، رووی لە سڕینەوەی جیاوازیو ناچونیەکی رابردووەو ئاراستەکردنی ریوایەت یان تەفسیرێکی دیایکراو بۆ ئێستا هەیە. دواجار بەکارهێنانی گوتاری رابردوو، مێژوونوس لە پێگەیەکی بەهێزدا دادەنێت: مێژوونوس وەک کەسێک کە رابردوو دەناسێت، خاوەن

دەسەڵاتە. مێژوونوس رۆشنبیرێکە کە دەسەڵاتی بەسەر رابردوودا هەیە، بەتەواوی شارەزایەتی، بەهێزی ئەکات، فراوانو پەرەی پێئەداتو کۆنترۆڵی ئەکات. لەبەرئەوەی مێژوونوس لەژێر چاودێری تیورەی بەردەوامیدا توانای کۆکردنەوەی ئەزمونەکانی رابردوی لەخۆیدا هەیە، لەبەرئەوە جۆرێک بەرژەوەندی ئایدۆلۆژی هەیە لە پاراستنو جەختکردن لە گرنگی رابردوو، جەختکردن لەسەر جۆرێک ناچاری کە تیایدا رابردوو بە ئێستا کۆتایی دێت، هەروەها نکوڵیکردن لەوەی بەپێی جۆرێکی دیارکراوی دەسەڵات لەئارادایە. فۆکۆ ئەنوسێت:

"مێژووی بەردەوام بەشێکی دانەبڕاوی دەوری سەرەکی خودە (بکەری مێژوو): زەمانەتی ئەوەی هەرچیەک کە لەدەستی داوە دەکرێت جارێکی دی بەدەستی بێنێتەوە، ئەو دڵنیاییەی کە زەمەن هیچ شتێک بێ گێڕانەوەی بۆ چوارچێوەی یەکێتیەکی سەرلەنوی دروستکراوە لەناو نابات، ئەو مژدەیەی کە دواجار خود رۆژێک-لە شکڵی خودهوشیاری مێژوویدا- ئەتوانێت جارێکی تر هەموو ئەو شتانەی بەهۆی لیکنەچونو جیاوازیەوە لەیەک دورکەوتونەتەوە یان دوور لەیەک دانراون، سەرلەنوێ بۆخۆی هەڵگرێتەوەو بیخاتە ژێر دەسەڵاتو کونترۆڵی خۆیەوە و تیایاندا شتێک بدۆزێتەوە کە دەکرێت ناوی بنێن مەنزڵگاو مەبەستی ئەو". بەمشێوەیە مێژوو بەو شێوەیەی ئەمرۆ کاری پێئەکرێت، جۆرێک هەمەکی بەخشی هیگڵی رابردوو و ئێستا پیشان ئەدات.

گرنگی رەخنەی ئەبستمۆلۆژی بەکارهێنانی مێژوویی لەلایەن فۆکۆوە، کاتێک ئاشکرا ئەبێت کە لەبارەی ئەو کۆمەڵە لقە مێژووییەوە کە هوشیارانە خۆیان بەلایەنگری پێشکەوتن ئەزانن بەکاربهێنرێت. کاتێک پەیوەندی نێوان بزوتنەوە رزگاریخوازەکانو نوسینی مێژوو لە زەمەنی ئێستادا باس ئەکرێت، بەهێزی تیورەی نابەردەوامی فۆکۆ بەڵگەنەویست ئەبێتو وەک تیورەیەکی بەجێو گونجاو دەرئەکەوێت. قوتابخانەی مێژووگەری مارکسیانە نمونەیەکی زۆر گونجاوە. بەپێی بنەماکانی ماتریالیزمی مێژوویی پەیوەندییەکی راستەوخۆ هەیە لەنێوان تیورەو نوسینی مێژوو لەلایەک، و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کۆمەڵایەتی لەلایەکی ترەوە. لێکۆڵینەوەو تاوتوێکردنی ناکۆکی چینایەتی لەژێر رۆشنایی تیورەی شێوەی بەرهەمهێناندا، رێنماییەکە بۆ ئاگاداربوون لە چۆنێتیو رەوتی ململانێکان لە ئێستادا. بەبڕوای مارکسیەکان مێژوو نە بۆ سەرگەرمی ئەنوسرێتو نە بۆ خۆهەڵکێشان. هەندێک مێژوو بۆ بەرەوپێشچونی شۆڕش ئەنوسن. ئەم مێژوونوسانە مێژووی ململانێی چینایەتی رابردوو هەرچەند لەڕووی چۆنایەتیشەوە جیاواز بێت، کۆئەکەنەوەو لەسەر بناغەی ئەوەش تەئیدی بزوتنەوە رزگاریخوازە کۆمەڵایەتیەکانی ئێستا ئەکەن. لێرەوە بەردەوامی رابردوو و ئێستا لە مێژوونوسی مارکسیانەشدا ئەپارێزرێت. مێژوونوسی مارکسی تەنها پاسەوانی مۆزەخانەی ململانێ فەرامۆشکراوەکان نیە، بەڵکو بەهۆی زانینی خۆیەوە بە ئەکتڤیستو بەشداریکارە بەرجەستەکانی هەلومەرجی هەنوکەی راپەڕینو شۆڕش ئەژمێرێت، مێژوونوسێک کە لەڕووی تیوریەوە کەسێکی ئاگادارو شارەزایەو چەندان پلە زیاتر لە کرێکاران هوشیارە سەبارەت بە ستراتیژی شێوەی گۆڕان. لێرەوە مارکسیزم جەخت لەسەر ئامادەیی بەشێکی دیاریکراوی رۆشنبیران ئەکاتەوە وەک نوێنەرانی کرێکاران لە پەیامی ترسناکی شۆڕشدا.

ماتریالیزمی مێژوویی لە ڕەوتی بەدەستهێنانی دەسەڵات بەسەر کرێکاراندا لەرێگەی پشتبەستن بە توانای رۆشنبیران لە ناسینی رابردوو و بەدوای ئەویشدا ئێستا، بە پشتیوانیەکی تیوریو بەهێز

ئەژمێرێت بۆ لینینزم. بەمشێوەیە رۆحی هەقیقی بزوتنەوەکە بۆ گۆڕانو شۆڕشی کۆمەڵایەتی، لەدەستی کرێکاران ئەچێتە دەرێو ئەگوێزرێتەوە بۆ زیهنو بیری رۆشنبیران. بەم وەسفە بەپێی تێزەکەی فۆکۆ لەو روەوە کە تیورەی بەردەوامی، خەباتی کرێکارانی گواستۆتەوە بۆ رۆشنبیرانو ئەبێتە هۆی ئەوەی ئەوان بەرهەمو دەستکەوتەکانی خەباتی کرێکاران بخەنە گیرفانی خۆیانەوە، کەوابوو مێژوو لەلایەن رۆشنبیرانەوە خراپ سودی لێ وەرگیراوە.

ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە بەپێچەوانەی پڕوپاگەندەکارانی دژ بە کۆمنیستی سەردەمی جەنگی ساردەوە، لادان و تاوانبارکردنی مارکسیەکان نیە. دەکرێت هاوشێوەی ئەم شیکردنەوەیە بۆ مێژوونوسانی لیبراڵ، پۆزتڤیزمو تەنانەت کەلەڕەقترین گروپەکان واتە ئەزمونگەرەکانیش بهێنینەوە، چونکە لەبارەی هەموویانەوە راستە. لەڕاستیدا بە تێبینیکردنی ئەوەی هێشتا لایەنگرانی ئەزمونگەری بەسەر مێژوونوسی ویلایەتە یەککگرتووەکانو ئینگلتەرادا باڵادەستن، لەبەرئەوە زیاد لە هەر روداوێکی تر پێویستیان بە تاوتوێکردنی رەخنەگرانە هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا من بە هێنانەئارای چەند پرسیارێک لەبارەی مارکسیزمەوە، تاوتوێی زیاتری تیورەی مێژوویی فۆکۆ ئەکەم. چونکە بە بڕوای من مارکسیزم گرنگترین قوتابخانەی مێژووگەری بووە و لەبەرئەوەش کە فۆکۆ لە فەڕەنسا راستەوخۆ سەروکاری لەگەڵ ئەم قوتابخانەیەدا هەبوو.

## 2_ ئەرکیۆلۆژیای زانین/ جینالۆجیای دەسەڵات:

لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٧٠دا فۆکۆ دوو کتێبی دی نوسی: "سزاو کۆنترۆڵ" و "مێژووی سێکسوالیتی" کە لەڕاستیدا خاڵی دەستپێکردنی جیابونەوەیەتی لە نوسینو بەرهەمەکانی پێشوی، و بەشێوەیەکی دیاریکراو بە فراوانکردنو پەرەسەندنی تیورەی مێژوویی فۆکۆ ئەژمێرێت. فۆکۆ لەو بەرهەمانەدا کە دەربارەی زیندانیەکانو مەسەلەی سێکسوالیتی نوسیوێتی، ئامانجی خۆی بە گەڕانو دۆزینەوەو پێشکەشکردنی جۆرێک پێکهاتەو پەیکەربەندی زانینو دەسەڵات یان کۆمەڵێک پەیکەر داناوە کە بەشێوەیەکی ئاشکراو روو لە زیاد بووە بە خەسڵەتی دیاریکراوی کۆمەڵگای ئەوروپیو ئەمەریکی لە سەدەی بیستەمدا. فۆکۆ بڕوای وایە زانینو دەسەڵات پەیوەندیەکی قوڵو دێرینیان بەیەکەوە هەیە، و پەیکەربەندی نێوانیان، ئامادەییەکی زاڵ و ناچاریانەی بەسەر کۆمەڵگای پیشەسازی پێشکەوتودا هەیە. بەشێوەیەک کە تەنانەت دەست ئەخاتە ناو شەخسیترینو تایبەتمەندیترین بوارەکانی ژیانی رۆژانەی تاکەکانیشەوە. شێوەی دەسەڵاتی تایبەتی سیستەمی سەرمایەداری پێشکەوتوو، نە وەبەرهێنان، نە لەخۆنامۆبوون، نە سەرکوتی دەروونی، نە بێ سەروبەرێو نە رەفتاری خراپە، بەڵکو نمونەیەکی تازەی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتیە، کە بەکردەوە لە زوربەی حاڵەتەکاندا لە زەمینەی کۆمەڵایەتیدا شاراوەیەو کۆمەڵێک بونیاد پێکئەهێنێت کە کارگوزارەکانی هەموانو هیچ کەسیش نیە.

من لە جێیەکی دیدا چەمکی کارم لای مارکس تاوتوێ کردووەو ئاماژەم بۆ کەموکوڕیو سنوردارێتیەکانی کردووە. لێرەشدا ئاماژە بۆ هەندێک لەو رەخنانە ئەکەمو ئەیخەمە ناو بۆتەقەی رەخنەی فۆکۆوە لە خود "بکەر"، و لە دیدی ئەوەوە پیشانی ئەدەم کە بۆچی هاوشێوەو لێکچووی

"گریمانە لیبرالیەکانی مێژوون". ئەوسا پیشانی ئەدەم کە چۆن وتەزای "زانین/دەسەلات"، واتە ئەڵترناتیڤی فۆکۆ لەبەرامبەر وتەزای بکەری کرێکاردا توانای رونکردنەوەی رووبەری مێژوویی بەشێوەیەکی مژدەبەخشو ئومێدبەخش هەیە. پاشان دەست دەکەین بە لێکۆڵینەوەو تاوتوێکردنی وتەزاکانی ئایدۆلۆژیاو سەرکوتکردن کە لە وتەزاکانی مارکسیزمی رۆژئاواییین. لە دیدی فۆکۆوە ئەو بیروڕایانەی ناومان هێنان، لەڕووی بەکارهێنانیانەوە لە گوتاری مێژوویشدا، لاوزاو کەموکوڕیان هەیە.

تەبا لەگەڵ دیدی فۆکۆو چەند تیورەسازێکی پۆستمۆدێرنو رادیکاڵدا کە کۆمەڵێک هێڵی بەڵگاندنی تیۆری یەکسانو بەرێژە چونیەکیان هەیە (ژیل دۆلۆز، فیلیکس گتاری،/ژان بۆردیار، ژان فرانسوا لیوتار) تێڕوانینی مارکس بۆ چەمکی کار بەهۆی پشتبەستن بە هەندێک رووی تیورەی لیبراڵەوە کە بەدوای بڵندکردنەوەیانە، درزی تێکەوتووە. مارکسیەکانو لیبرالەکان بەشێوەیەکی یەکسان کار بە دروستکەری دنیای کۆمەڵایەتی وەک بەرهەمی بکەرێکی دەستەجەمعی، واتە هێزی کار ئەزانن. بەڵام مارکسیەکان زیاتر ئەڕۆنو دەریئەخەن چۆن دەستکەوتو بەرهەمەکانی کار بەهۆی میکانیزمەکانی وەربەرهێنانو لەخۆ نامۆکردنەوە، لە کرێکار-بکەر ئەدزرێت. (بەڵام) بەبڕوای لێبرالەکان کرێکاران کرێیەکی دادپەروەرانەو گونجاو کە لەرێی بازاڕەوە دیاری ئەکرێت وەرئەگرن، بەشێوەیەک کە دەسەلات لەناو ئەچێت. لەهەردوو حاڵەتەکەدا بابەتی شیکردنەوەی مێژوویی-کۆمەڵایەتی ڕووی لە تاکی خودە (سوبژێکت). لە دیدی لیبراڵەکانەوە ئەم نمایشە کاتێک ئەگاتە لوتکەی قەیرانی خۆی کە "پەیمان" ببەسترێت: دوو بکەر کە لۆژیکیو عەقڵانی رەفتار ئەکەن، لەبارەی بەرپرسیارێتە دولایەنەوە بەسازان ئەگەن. لە کاتێکدا لە دیدی مارکسیەکانەوە "پەیمانێکی" وا بەتەواوی یەکلایەنیەو لە هەردوولای پەیمانەکە هەمان چۆنایەتی یەکسان نیە، بەڵکو جیاوازن لەیەک: بکەرەکان-کرێکار لەسەر کەرەسە سەرەتاییەکان کار ئەکەن، شتگەلێک دروستئەکەن کە لە رێگەی کەناڵەکانی دنیای کۆمەڵایەتیەوە دابەش ئەکرێن، بەڵام تەنانەت لێرەشدا ئێمە سەروکارمان لەگەڵ چیرۆکی لاهوتی خودە چالاکەکان هەیە کە مادە بەشێوەیەکی خوازراو دروستئەکەن. لە هەردوو حاڵەتەکەدا روبەری کۆمەڵایەتی-مێژوویی بۆ شیکردنەوەو لێکۆڵینەوە، لەسەر بناغەی خود ئامادەکراوە.

بەبڕوای فۆکۆ ئەم شیکردنەوەو تاوتوێکردنانە گونجاوو بەس نیەو مارکسیزم ناتوانێت ببێ بە بنەمایەک بۆ تیورەی رەخنەگرانەی مێژوو، چونکە لە دیدی سنورداری قازانجی خودەوە، ناتوانین بە چیەتیو ناوەرۆکی شێوە جیاوازەکانی ئاشکراو شاراوەیی دەسەلات لە سەدەی بیستدا بگەینو ئاشکرایان بکەین، چونکە ئەمڕۆ دەسەلات شکڵی پێکهاتە یان بونیادی زانینو دەسەلاتی بەخۆیەوە وەرگرتووە کە لە دەرەوەو جیا لە تاکی خود نیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆ خود هەست پێنەکراوە. تیورەی رەخنەگرانە ناتوانێت مێژوو وەک گواستنەوە لە ئەرستۆکۆراتە چاوچنۆکەکانەوە بۆ سەرمایەدارانی وەبەرهێنخواز دابنێت، چونکە هەنوکە دەسەلات نە رووی لە خودەکانەو نە دەرئەنجامی کاریانە. لە دەرئەنجامدا پرۆسەی کار کە بەهۆی مارکسەوە تیوریزە کراوە، ئەمڕۆ ئیدی بە سەرچاوەی رادیکالیزمێکی هەستپێکراو کە بۆ روخاندنی شێوە باوەکانی دەسەلات بەسودو کاریگەرن. ئامادە ناکات.

مەسەلەکە ئەوە نیە کە پرۆسەی کار لە دەسەڵاتی ستەمو سەرکوتکردن یان "تەکنەلۆژیا باڵادەستەکانی دەسەڵات" رزگار نەبووە، بەڵکو مەسەلەکە ئەوەیە جوڵەو جێگۆڕگێ بەرەو چەمکە رەخنەگرە تازەکان، بە پشتبەستن بە میکانیزمە کۆمەڵایەتیەکانی تر باشتر روئەدات-تارادەیەک لەبەرئەوەی مارکسیزم وتەزای کار کۆلۆنیال ئەکاتو تارادەیەکیش لەبەرئەوەی کە بونیادە زاڵ و باڵادەستەکان لە شوێنەکانی تریش پەرەی سەندووە. فۆکۆ لە میکانیزمەکانی تەمێکردنو سێکسوالیتەدا، لە جێگەو پێگە کۆمەڵایەتیەکانی خێزاندا، سوپا، خەستەخانەکاندا شێوە تازەکانی دەسەڵات ئەدۆزێتەوە، کە لەڕاستیدا بەتێکەڵو گوتارو میکانیزمگەلێکی جیاوازی دروستکەری شێوە تازەکانی کۆنترۆڵو ملکەچکردن ئەژمێرێن. ئەم پرۆسەیە هەروەها میکانیزمەکانی کارکردن لە سیستەمی سەرمایەداریدا خستۆتە ژێر کاریگەری خۆیەوەو گۆڕانی بەسەردا هێنا، دیارە نەک بەو شێوەیەی مارکس بڕوای پێبوو. رێکخستنو دیسپلین لەناو کارخانەدا نابێت لەگەڵ میکانیزمەکانی وەبەرهێنانو لەخۆنامۆبوون بە یەک شت بزانین.

فۆکۆ لە دوو بەرهەمی "کۆنترۆڵو سزا"و "مێژووی سێکسوالیتی" مێژووی تاوانو جنس بۆ دوو یان سێ قۆناغی سەرەکی دابەش ئەکات، کە تیایدا سەدەی هەژدەهەم وەک یەکێک لە هێڵە جیاکەرەوەکان لەبەرچاو ئەگیرێت. لە سەردەمی سەرەتادا زانینو دەسەڵات لەبارەی تاوانەوە تەنها رووی لە جەستەی کەسی تاوانبار بوو. لە نمونەی پەندئامێزی دامیانی شا کوژدا، بۆ ئاگاداربوون لە "هەقیقەتی" تاوانەکەو وەرگرتنی دانپیانان، بە زنجیرەیەک ئەشکەنجەی نهێنیو تەمێکردنی ئاشکرا، سود لە "تەکنەلۆژیاکانی دەسەڵات" وەرگیرا. جەستەی دامیان بووە ئامانجی تاقیکردنەوەکانی زانین/دەسەڵاتی دەزگای دادوەری رژێمی کۆن. لەسێدارەدانی ئاشکرای بێ بەزەییانەو دڕندانەی دامیان، دوا مەراسیم بوو کە تیایدا سیستەمی سزادانی پێشمۆدێرنی تیا ئەنجامدرابوو.

تا پێش روداوەکانی دژ بە ریفۆرمخوازی، زانین/دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر دیارەی سێکسواڵتیدا، ئاڕاستەی جەستەو کردارەکانیو هەڵەو لاساریەکانی ئەکرا. لەم حاڵەتدا گوتاری سێکسوالیتی لەژێر سەرپەرشتیو چاودێری خاوەن پلە دینیەکان یان رۆحانیەکاندا بوو، نەک خاوەن پلە دنیاییەکان. جێگەی تایبەتی داننان بە گوناهەکاندا، جێگەیەک بوو کە تیایدا کردارە سێکسیەکان تاوتوێ ئەکراو لێی ئەکۆڵرایەوە. پرسیارگەلێک ئەکرا بۆئەوەی دەرکەوێت چ کردارێکو بەهۆی چ کەسێکەوە، لە چ هەلومەرجو جێگەیەکدا و چەندجار ئەنجامدراوە. بە مەبەستی دیاریکردنی پەشیمانی لەپای پێشێلکردنی بنەماو رێسا دینیو ئەخلاقیەکان، کۆمەڵێک بەرنامەی جێگیری تۆبە دانرابوو. ئەوسا لەسەردەمی پێش مۆدێرندا زانین/دەسەڵات بە کونترۆڵکردنی جەستەی تاکو بەرێکخستنی لەکاتی پێویستدا بۆ بەرهەمهێنانو دوبارە بەرهەمهێنانەوەی رێکخستنی کۆمەڵایەتی، دەستیکرد بە دروستکردنو شکڵدان بە میکانیزمەکانی تاوانو سێکسوالیتی. کۆی کاریگەرییەکانی شیکردنەوەکانی فۆکۆ بۆ ئەم تەکنەلۆژیانەی دەسەڵات، پێویستی بە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی وردی بەرهەمو تێکستەکانی فۆکۆ هەیە. بەڵام ئەم لێکۆڵینەوە گشتیەش رەنگە بتوانێت سەردێڕە گشتیەکانی بابەتەکانی دۆزینەوە روونبکاتەوە.

ساڵەکانی سەرەتای سەردەمی تازە بەجۆرێک نابەردەوامی بەرچاو لە سەدەی نۆزدەو بونیادی تاکانەی زانین/ دەسەڵات جیا ئەکرێتەوە. لەم سەردەمانەی دواییشدا گوتارەکانی پەیوەندی بە

سێکسوالیتیو تەکنەلۆژیەکانی دەسەڵات دژی تاوانەوە هەیە، گۆڕانی قوڵی بەسەردا هات. تاوانو سێکسوالیتی بووە بابەتی جێی سەرنجی خاوەن پلەکانی دیسپلینی تازە، کە بە داهێنانی تیورە لەبارەی "سروشتی وردی دەسەڵات"، لە هەموو ئاسۆی کۆمەڵایەتیدا بڵاویان کردەوەو پەرەیان پێدا. کتێبی "سیستەمی چاودێری باڵادەست بەسەر هەموو کەسو هەموو جێیەک"دا کە بەرهەمی "بنتام"ەو تایبەتە بە لێکۆڵینەوەی تاوان، بوو بەیەکێک لە سەرچاوەکانی سیستەمی تازەی زیندانەکان، و لەبارەی سێکسوالیتیشەوە تیورەی چەپاندن (ئارەزوە نوستوەکان)ی فرۆید دواجار بوو بە تیورەیەکی باڵادەست بەسەر ژیانی خێزانیدا. لە هەردوو حاڵەتدا رژێمی یاساییو دادوەری تازەیان دروستکردووە کە تیایدا تاوانباران، تاوانکارانو چالاکی سێکسی (بەتایبەتی سەبارەت بە منداڵان) بە وردیو وەسواسیەکی زۆرەوە کۆنترۆڵو چاودێری ئەکرێت. ئامانج یان بابەتی چاودێری لە جەستەوە گواستراوەتەوە بۆ زیهن، شێوازەکانی کۆنترۆڵیش بە سەرنجدان لەوەی کە دەرئەنجامو کاریگەرییە تەکنەلۆژیەکانی دەسەڵات جۆری تازەی گروپی ملکەچ و دیسپلینکراو دروست ئەکات، بەشێوەیەکی وردو کامڵ روون کراونەتەوە. بیرۆکراتیەکی درێژوپان بۆ کۆنترۆڵی تاکەکان دروستبووە، ئەرشیفەکان، پێشینەی ئەرشیفێکی کامڵو گشتگیر هاوکات لەگەڵ پەرەسەندنی مەزنی لقە زانکۆییەکانو ئەزمونی زانستی- بۆ لێکۆڵینەوەو تاوتوێکردنی تەنانەت پڕوپوچترینو ئاسایترین بیروڕاو کردارەکانی تاوانبارو تۆمەتبارانی بەزەبر دروستبووە، بۆ کەسانێک کە بەردەوام تاوان ئەکەن، کەسانێک کە لە سەردەمی منداڵیدا توشی لەخۆ رازیبون بوون، و ئەو ژنانەی توشی حاڵەتی هێرشی تورەیی ئەبن کە دەرئەنجامی تێکچوونی هاوسەنگی هرمۆنیە. دروستبوونو پێکهاتنی گوتارەکانو دەسەڵاتە بەدەزگایی بوەکان رەوتێکی بێ کۆتایی هەیە، و دواجار دەکرێت خەڵک وەک میکرۆب بخرێنە ژێر زەرەبینی چاودێریی بەردەوامەوە. گەرچی نمونەی "سیستەمی چاودێری باڵادەست بەسەر هەموو جێو هەموو کەسدا" لەلایەن هەموو دەزگا کۆمەڵایەتیەکانەوە قەبوڵنەکرا، بەڵام بەپێی وەسفی فۆکۆ پەرەسەندنو بڵاوبونەوەی زیاد لە سنورو هەموو جێگەی ئەم تەکنیکە، زۆر ترسناک بوو:

"زنجیرەیەک میکانیزمی هەمەکی هەبوون کە مۆدێلی زیندانی "داخراو"یان قەبوڵنەدەکرد، بەڵام سودیان لە بەشێک لە شێوازەکانی ئەمجۆرە زیندانانە وەرئەگرت. کۆمەڵە خێرخوازەکان، ئەنجومەنەکانی چاکسازی ئەخلاقی، رێکخراوەکانی دابەشکردنی کۆمەک بەسەر فەقیرەکانو سەرپەرشتیو چاودێریکردنی نەخۆشەکانو بەرکەوتوانی روداوە سروشتیەکان، رەچاوکردنی شتەکانی خۆشگوزەرانی بۆ بێچارەکان، دۆزینەوەی خانوو و تایبەتمەندکردنی دارایی بۆ کرێکارانو فەقیرەکان، دروستکردنی میوانخانەو موسافرخانە..و دواجار ئەم تۆڕە مەزنەی تایبەت بە زیندان، زاڵ ئەبێت بەسەر سەرجەم کاروبارەکانی کە لە سەرتاسەری کۆمەڵگادا کارئەکات".

لەو نمونەی تاوانو سێکسوالیەتەدا کە فۆکۆ لێی ئەکۆڵێتەوە، ناتوانرێت کرداری زانین/دەسەڵات لەژێر ناونیشانی سەرکوتکردندا ببینین یان وەربگرین. بەپێچەوانەی ئەوەی مارکسیزمە فرۆیدیەکان هەوڵئەدەن بڕوای پێبکەین، لە سەدەی نۆزدەهەمدا سێکسوالیتی سەرکوت نەدەکرا. تەکنەلۆژیەکانی دەسەڵات بەمشێوەیە کار ناکەن. بەپێچەوانەوە فۆکۆ بڕوای وایە گوتارەکانی پەیوەندیان بە سێکسوالیتیەوە هەیە، هیچکاتێک لە رابردودا وەک سەدەی نۆزدە پەرەیان نەسەندو گەشەیان نەکردبوو. ئەگەر سێکسوالیتی بێ بەندوبار لە کۆمەڵگای سەختگیری ئەخلاقی وەک ئینگلتەرای سەردەمی

ڤیکتۆریادا قەدەغەکرا، تەنها لەبەرئەوە بوو ئەم مەسەلەیە زیاد لە سنور وەک سەرقاڵیەکی زیهنی کۆمەڵگای لێهاتبوو. لە خێزانە بۆرژوازیەکاندا باوکانو دایکان ئەو بەشە لە بەرهەمە پزیشکیەکانیان ئەخوێندەوە کە لەرووی پەروەردەکردنی منالآنەوە لە مەترسیو دەرئەنجامەکانی خۆ رەحەتکردنی منالآن ئاگاداریان ئەکردنەوە. چالاکیەکی هاوئاهەنگ کە هەم جنسیەتی سەردەمی منالی قەدەغە ئەکردو هەم هێزی دایکانو باوکانی بۆ روبەروبونەوەی تەیار ئەکرد. سێکسوالیتی لە منالآن ئەسەنراو پاشان بۆ رێگەگرتن لە دەرکەوتنی بێ بەندوبارو ئاشکرای، ئەکەوتە ژێر کۆنترۆڵکردنی یاساو رێسا گشتیەکانەوە. بە هەمانشێوە ژنانی توشبوو بە نەخۆشی هیستریاش بە کۆمەڵێکی ئالۆز لە بزوێنەرە سێکسیە ناکۆکەکان، و لە هەمانکاتدا بە ئاوێنەی پاکیو پاکژی دائەنران. لەم حالەتانەدا هیچ جۆرە کار یان چالاکیەک نەبوو کە "سەرکوت" کرابێت، بەڵکو بلاوبونەوەی زانین/دەسەلآت بوو کە میکانیزمەکانی بەپێی کۆمەڵێک یاسای ئالۆز فۆرمەلە ئەکردو رێکی ئەخستو کۆنترۆڵی ئەکرد. بە بڕوای فۆکۆ تەکنەلۆژیەکانی دەسەلآتو گوتارەکان بەیەکەوە، بە هێزی داهێنەرو دروستکەرو پۆزەتیڤ ئەژمێرێن، نەک هەنگاوی نێگەتیڤو رێگرانە.

ئەگەر وایە کەسێک کە سەر بە ئەڵقەی مارکسیە فرۆیدیەکان نەبێت، چۆن ئەتوانێت ئەو بڕوا باوە رونبکاتەوە کە دەسەلآت روداوێکی رێگرە، سەرکوتکەرە، پاوانخوازە، نەفیکەرو دەسیسەکەرە، خۆبەزلزانو رێگرە ..؟ فۆکۆ گریمانەیەکی زۆر سەرنج راکێشو وەسوەسەئامێز بۆ پاساوو رونکردنەوەی ئەم تیورەیە کە دەسەلآت روداوێکی نێگەتیڤە، پێشکەش ئەکات. فۆکۆ بڕوای وایە سیستەمی یاسایی رۆژئاوا، لە باوەشی سیستەمی پاشایەتیدا پەرەیسەندو کامڵ بوو. پاشاکان پاش سەقامگیربونو بەهێزبونی پێگەی خۆیان وەک مەرجەعو سەرچاوەی دەسەلآت، روبەڕوی ناڕەزاییو بەرگری هەندێکجار هاوکاتی ئەرستۆکراتەکانو نەجیبەکانو بۆرژوازیەکان ئەبونەوە. ئەرستۆکراتو نەجیبەکان بەدوای ئەوەوە بون ئەو مافو ئیمتیازاتو ئازادیانەی پاشا لێی مەحروم کردبوون، وەک ئەو شتانەی لە بلاوکراوەی مەزنی "ماگناکارتا"دا هەبوو، دوبارە بەدەست بێنەوە، بۆرژوازیش سیستەمێکی تازەی بەرهەمهێنا کە ئاراستەی سەرەکی رووی لە سنوردارکردنو رێگری لەو هەنگاوانەی پاشا بوو کە بۆ دروستکردنو سەقامگیری ئابوری داڕێژراو لەسەر بازاڕ زیانبەخش بوو. پاشا ڕێگەی لە دروستکردنی موڵکایەتی تایبەتی فراوان و تویلە شەخسیەکان لەناو ئەرستۆکراتو نەجیبەکاندا گرت، و سیستەمی یاسایی بۆرژوازیش خراپ بەکارهێنانەکانی دەسەلآتی دیکتاتۆریانەی پاشاو دەرباری سڕیەوەو بە نایاسایی لەقەڵەمی دا. لە هەردوو حالەتەکەدا قسە لەسەر تێڕوانینی پۆزەتیڤ یان نیگەتیڤ بوو بۆ دەسەلآت. بەدرێژای سەدەکانی رابردوو گوتارەکانی لەسەر دەسەلآت گوتراون، تەنها لەم گۆشەیەوە تەماشای دەسەلآتیان کردووەو بیریان لێکردۆتەوە. لەو رووەوە کە دەسەلآت خۆی لەخۆیدا وتەزایەکی پۆزەتیڤە، لەبەرئەوە ئەم تیورەیە کە دەسەلآت روداوێکی نێگەتیڤو خراپو گەندەڵکارە، وەک ئایدۆلۆژیایەک کارئەکات کە هەوڵئەدات ماهیەتی راستەقینەی خۆی بشارێتەوە.

## 3- چەمکی ئایدۆلۆژی:

وەک چۆن چەمکی سەرکوت لە نەریتی فرۆیدیدا وەک رێنمایەک بۆ کارەکانی دەسەلات، چەمکێکی نەگونجاوە، بەهەمانشێوە چەمکی ئایدۆلۆژی لە نەریتی مارکسیانەشدا توانای پێشکەشکردنی چوارچێوەیەکی تیۆری بۆ دیاردە، دەرکەوتە مێژوویەکانی زانینو گوتار نیە. پێش ئەوەی دەستبکەین بە باسکردنی رەخنەی فۆکۆ لە چەمکی ئایدۆلۆژی، ناچارین پێویستیو گرنگی ئەم چەمکە بۆ بەردەوامی ژیانی تیورەی مارکسی رونبکەینەوە. لە سەدەی بیستەمدا تیورەسازانی مارکسی لە ئیتاڵیا، فەرەنساو ئەڵمانیا بۆ رونکردنەوەی دیاردە جیاوازەکانی سەرمایەداری پێشکەوتوو، و شیکردنەوەی رەهەندە جیاوازەکانی، بەشێوەیەکی فراوان رویان کردە چەمکی ئایدۆلۆژی، ئانتۆنیۆ گرامشیو جۆرج لۆکاش، قوتابخانەی فرانکفۆرتو ژان پۆل سارتەرو لوی ئالتۆسیر هەمویان لە قالبی چوارچێوەی مارکسیانەدا بۆ رونکردنەوەو شیکردنەوەی گۆڕانو گۆڕانکاریە گرنگە کلتوریەکان کە روکەش بونەتە هۆی دواکەوتنی رەوتی پێشکەوتنی شۆڕشی پرۆلیتاری، پەنایان بۆ چەمکی ئایدۆلۆژیا ئەبرد. رۆڵی ناسیۆنالیزم لە شێواندنی ناکۆکە چینایەتیەکان لە سەردەمی جەنگدا، دەوری رەگەز لە دابەشکردنی چینی کرێکاردا، دەوری مەسرەفگەری لە زیادبوونی وابەستبوونو وەفاداری کرێکاران بۆ سیستەمی سەرمایەداری، دەوری سیستەمی پەروەردەو کەناڵە گشتیەکان لە گۆڕانی دژایەتیەکان بۆ سازانو رێکەوتن، دەوری خێزان لە پێشکەشکردنی رێگەیەک بۆ دەربازبوون لە خەبات لەپێناوی ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا- هەموو ئەمانە دەستیان خستۆتە دەستی یەکەوەو بە راشکاوی لایەنگری ئەوەیە بیروراو باوەڕەکانی چینی باڵادەست، ببێ بە بیروڕاو باوەڕی باڵادەست بەسەر کۆی کۆمەڵگادا. لێرەوەیە کە چەمکی ئایدۆلۆژی لە دەزگای تیوریو فکری مارکسیزمدا جێگەیەکی گرنگو چارەنوسسازی داگیرکردووە، و روونی ئەکاتەوە کە چۆنو بۆچی خودهوشیاری چینایەتی بەشێوەیەکی بەردەوام بەرەو خودهوشیاری درۆزنانە ئەڕوات. ئەگەر چەمکی ئایدۆلۆژیا رووی لە پوکانەوە کردووەو لە پراکتیکدا رووبەروی لاوازی و کەموکوڕی و نەگونجان بۆتەوە، ئەوا لەم حاڵەتەدا مارکسیەکان بۆ هەڵسەنگاندنو شیکردنەوەیەکی گشتگیرو لۆژیکی بۆ نائامادەبوونی رێژەیی خەباتی چینایەتی لە کۆمەڵگا پێشکەوتوەکاندا، روبەروی کێشە ئەبنەوە. لە خوارەوە رەخنەی فۆکۆ لە چەمکی ئایدۆلۆژی ئەهێنینەوە:

"بە بڕوای من سودوەرگرتن لە چەمکی ئایدۆلۆژیا لەبەر سێ هۆ ئەستەمە: یەکەم: ئەوەی کە چ بمانەوێت یان نەمانەوێت چەمکی ئایدۆلۆژیا تەواو لەرووی واقعیەوە جیاوازە لە شتێک هاوشێوەی هەقیقەت. بەبڕوای من لە هەنوکەدا مەسەلەی دابەشکردن لەنێوان ئەوەی لە گوتارێکدا لەڕیزی زانستی بوونو هەقیقەت دادەنرێت و ئەوەی لەژێر ناونیشانێکی تردا دائەنرێت نیە، بەڵکو مەسەلەکە ئەوەیە ببینین لەرووی مێژووییەوە لەو گوتارانەدا کە خۆی لەخۆیدا نە هەقیقەتن و نە درۆ، چۆن کاریگەریو دەرئەنجامی هەقیقی دروست ئەبێت. کێشەی دووهەم ئەوەیە بەبڕوای من چەمکی ئایدۆلۆژیا بەناچار ئاماژە بۆ شتێکی وەک خود ئەکات. سێهەم ئەوەی کە ئایدۆلۆژیا لە پەیوەندیدا بەو شتەوە کە دەبێت وەک ژێرخان یان دیاریکەری ئابوری یان مادی ئەو کاربکات،

جێگەیەکی لاوەکی هەیە. لەبەر ئەم سێ هۆیە بڕوام وایە ئایدۆلۆژیا چەمکێکە کە ناکرێت بەبێ وریایی بەکاری بێنین".

یەکەم رەخنەی فۆکۆ لە چەمکی ئایدۆلۆژیا ئاراستەی دژایەتی دو لایەنەی زانست/ ئایدۆلۆژیا یە، کە جێگەیەکی تایبەتی لە بیرکردنەوەی مارکسیانەو بەتایبەتی بیروڕاکانی لوی ئالتۆسیردا هەیە. لێرەدا ئایدۆلۆژیا بە شکلێکی رەمزئامێز دائەنرێت کە ناگاتە پلەو جێگەی زانین یان زانست. لێرەوە لێکۆڵینەوەی ئایدۆلۆژیا بریتیە لە لێکۆڵینەوەی بیروڕاو باوەڕگەلێک کە لە ئەنجامی ئالودەبوون بە هەندێک پەیوەندی کە لەسەر بناغەی دەسەلات دامەزراون توشی لادان بوون، بەو شێوەی کە لە تیورەی "دۆخی ئاخاوتنی نمونەیی" هابرماسدا پێشکەشکراوە. بەڵام لە روانگەی نیچەیانەی فۆکۆوە هەموو گوتارەکان لە کۆمەڵێک روانگە زیاتر نین و ئەگەر یەکێکیان لەوانی دی نرخی زیاتر بێت، ئەوا لەبەر خەسڵەتی ناوەکی و دەروونی ئەو گوتارە وەک "هەقیقەت" یان لەبەرئەوەی کە ئێمە ناوی "زانستی" لێئەنێین نیە، بەڵکو لەبەر بوونی کۆمەڵێک زەمینەی بان ئەبستمۆلۆجی یان ئەو دەورەیە گوتار لە دروستکردنی میکانیزمەکاندا ئەیبینێت. مارکسیزم بە ناونانی خۆی بە "زانستی" جۆرێک رەوایەتی درۆزنانە بەخۆی ئەدات، رەوایەتیەک کە رێگە بە تیورەسازی مارکسی ئەدات تاخۆی وەک هەڵگری نوێنەری گیتی سەروتر لە جەماوەر دابنێت. مارکسیزم لە پلەی زانستدا رێک شکڵی گوتارێکی تر ئەگرێت کە بۆ خزمەتی دروستکردنی بەکارهێنانێکی گوێڕایەڵو کۆنترۆڵکراو، دەور ئەبینێت. لێرەوە فۆکۆ چەمکی ئایدۆلۆژیا بە نمونەیەکی تر ئەزانێت لەو شێوانەی کە عەقڵ هەوڵئەدات لە هەمان ئەو بەرکارانەی دەیەوێت رزگاریان بکات، واتە مرۆڤ زاڵ بێت.

رەخنەی دوهەمی فۆکۆ لە چەمکی ئایدۆلۆژی ئەگەڕێتەوە بۆ هەڵوێستی دژ بە هیومانیزمی فۆکۆ. چەمکی ئایدۆلۆژی سەرچاوەو رەگی "بیروڕاکان" یان باوەڕەکان ئەگەڕێنێتەوە بۆ خودەکان (بکەرەکان)، واتە بۆ چینی باڵادەست کە وەک لە دەربڕینەکانی مارکسدا دەرئەکەوێت دەربڕی بیروڕای باڵادەستە لە هەر سەردەم یان قۆناغێکدا. گێڕانەوە بۆ بکەری بناس رێگە لەوە دەگرێت تا بەو شێوەیەی فۆکۆ مەبەستێتی تاوتوێی بیروراو باوەڕەکان بکرێت، وەک ئەو گوتارانەی کە تێگەیشتنیان سەرچاوە لە خودەوە ناگرێت. دژایەتی فۆکۆ لەگەڵ زیهنگەریدا یەکێکە لە هێڵە سەرەکیو رێنمایکەرەکان لە نوسینەکانی فۆکۆدا کە لە مەسەلەو بابەتی تردا لەساڵەکانی دەیەی ١٩٦٠ تا ساڵەکانی ١٩٧٠ توشی گۆڕانی سەرسوڕهێنەر بوو. دەبێ دان بەوەدا بنێن ئەم دیدە یان ئاراستەیە بەرهەمی دیدی بونیادگەریە لەبارەی زمانەوە وەک هەمەکیەکی پەرشوبڵاو چڕنەبۆوە. زمان لە روانگەی بونیادگەرەکانەوە ئامرازێک نیە بۆ دەربڕینی بیروڕاو باوەڕەکانی کەسی بکەری بناس (بکەری نوێنەری) نیە، بەڵکو وەک "سیستەمێکی پەیوەندی نێوان ئاماژەو نیشانەکانە" کە بەرکار (بابەت)ی خۆی وەک بکەر (ئامانج) دائەنێت. فۆکۆ بەردەوام نکوڵی لە هەموو شێوە پەیوەندیەکی خۆی بە بونیادگەریەوە کردووە، ئەمەش ڕاستە چونکە فۆکۆ کەسێکی فۆرمخواز نیە کە وەک کلۆد لیڤی شتراوس بەدوای پێکهاتەیەکی هەمەکیو جیهانیەوە بێت.

نەخشەی فۆکۆ بۆ شیکردنەوەی میکانیزمەکانی زانستە مرۆییەکان، ئەبێتە سەرسەختی فۆکۆ دژی خود (سۆبژێکت). ئەو لقانەی "مرۆڤ" وەک بەرکاری (بابەتی) خۆیان وەرئەگرن، "بکەر"ی (ئامانج)ی خۆشیان بە "مرۆڤ"دائەنێن، ئەم خولانەوە هێرمۆنتیکیە جۆرێک ناڕوونیو ئاڵۆزی

دروست ئەكات كە دەبێتە هۆی ئەوەی زانستە مرۆییەكان خۆی لە بیركردنەوە لە كاریگەرییەكانی خۆی بەسەر كاردا بەدوور بگرێت. فۆكۆ بیرئەكاتەوە كە بە وەرگرتنی دیدێكی جیاواز لە دیدی بكەر، دەكرێت لە نهێنی ئەو میكانیزمانە بگەین كە زانستە مرۆییەكان هەوڵئەدات لەرێگەیانەوە لەبری ئەوەی ببێتە هۆی رزگار بوونی خود، دەسەڵاتی بەسەردا پەیدا بكات. ئەم مەبەستە پاڵنەری هەوڵدانی فۆكۆیە بۆ پێشكەشكردنو فراوانكردنی چەمكی گوتار. لەبەرئەوە گوتار وەك روبەروبونەوەو نەیاری خود تەماشا ئەكات، بەو دەربڕینە كە:

من هەموو شێوە هەوڵێك بۆ تەماشاكردنی گوتار وەك دیاردەی دەربڕین-وەرگێڕان شەفەهی سەنتزێكی لەپێشەوە دیاریكراو و سەقامگیر، ئەخەمە لاوە، لەبری ئەوە بەدوای دۆزینەوەی یاساڕێژیو رێكخستنی هەڵوێستە جیاوازەكانی زیهینیتەوە ئەبم. بەم تێڕوانینەوە گوتار دەركەوت یان دیاردەی ئاشكراو بەپێچەوانەی هەمەكیەكەوەیە كە رەنگە بتوانرێت تیایدا ئاڵۆزی كەسی خودو نەبونی پەیوەندیو نابەردەوامی خۆی دیاری بكرێت".

ئەم تێڕوانینە نازیهنیە بۆ گوتار، ئایدۆلۆژیا لە چەمكی ماركسیانەدا لەبەرهۆی ئاڵۆزی و پەیوەندی بە گریمانەی دەربڕینەوە تاڕادەیەك بێبایەخ ئەكات. چەكی ئایدۆلۆژی بۆ دۆزینەوەی رەهەندە جیاوازەكانی دەسەڵاتی شاراوە لە زانستە مرۆییەكاندا- ئەو لقانەی كە ئەمرۆ بەگشتی لە هەموو شوێنێكدا ئامادەن- بە ئامرازێكی گونجاو و كاریگەر دانانرێن.

سێهەمین رەخنەی فۆكۆ لە چەمكی ئایدۆلۆژیا، واتە ئەو بیروڕاو باوەڕانەی كە قابیلی كورتكردنەوەن بۆ شێوازی بەرهەمهێنان، لە جەختكردنیدا بۆ پەیوەندی زاتی و ناچارانەی زانینو دەسەڵاتدا ئەبینرێت. رەنگە فۆكۆ لە ماركس زیاتر بڕوای بە ژێرخانی مادی بۆ زانین هەبێت، چونكە ئەو بیروڕاو باوەڕەكان لە پەیوەندی و نزیكایەتیەكی زۆردا ئەزانێ بە كارەوە. هەنوكە لە دیدی فۆكۆوە گوتارەكان هەمان دەسەڵاتنو پێویست ناكات لە جێگەیەكی تر، بۆ نمونە لە شێوەی بەرهەمهێناندا، بەدوای دۆزینەوەی هێزی مادیانەوە بین. ئەم دیدە لە هەموو شتێك گرنگتر خاڵی جێی سەرنجو جەختكردنی تیورەی رەخنگرانەی مێژوو لە بیروڕاو باوەڕە پاكو بێگەردی رۆشنبیرانەوە ئاراستەی گوتارە ئاسایی و ئەم دنیاییەی دەزگا دیسپلینكەرەكان ئەكات كە راستەخۆ كاریگەریی لەسەر ژیانی خەڵكی دائەنێن. ئایدۆلۆژیا چیدی وەك وتوێژی لاهوتی زیهنە مەزنەكان دانانرێت، بەڵكو بەركەوتنێكی ئاساییو تەمەڵكارانەیە لەنێوان تاوانبارو تاوانبارناس، نەخۆشی دەرونیو پسپۆری دەرماندناس، منداڵو دایكو باوك، خەباتو دەزگا خوشگوزەرانەكان.

لێرەوە فۆكۆ لەگەڵ تێزی سەرەكی ماتریالیزمی مێژوویی -ژێرخانو سەرخان- كە چەمكی ئایدلۆژیای لەسەر دامەزراوە نیە. مادام ماركسیزم پشتبەستوو و وابەستە بێت بەم جیاكاریەوە، ناتوانرێت وەك بنەمایەكی گرنگ بۆ تیورەی رادیكال سودی لێ وەربگیرێت. هەندێك لە ماركسیەكان بە پشتبەستن بە ئەندێشەكان كە سارتەر گشتیترینو سادەترین شێوەی لە "رەخنە لە عەقڵی دیالەكتیی"دا پێشكەشكردووە، بەرگریان لە هەڵوێستی خۆیان كردووە. ئەم ماركسیانە قبوڵیان نیە كە چەمكی سەرخان/ژێرخان لە پاشماوەكانی ئەنتەرناسێۆنالیزمی دووهەمو سێهەم بێتو ماركسیەكان نابێت زۆر بەجدی وەریبگرن.

ماركسیزمە هاوچەرخەكان بە دانذان بە كاریگەری و پەیوەندی دوولایەنەی ژێرخانو سەرخان،

دەست ئەکەن بە پاساوهێنانەوە بۆ رووبەری بەناو سەرخانیەکان. هەنوکە ئیدی قۆناغی دیترمنیزمی ئابوری ساڵەکانی دەیەی ١٩٢٠و ١٩٣٠ کۆتایی هاتووە . دەبێ ئەوەش بڵێین کە تەنانەت خودی مارکسو ئنگلزیش ئەمجۆرە کورتکردنەوانەیان قەبوڵنەدەکردو لایەنگرانی خۆیانیان لێ ئاگادار ئەکردەوە . گەرچی دەشێ ئەوە قەبوڵبکرێت کە چەمکی ئەندێشە لەبەرامبەر کورتگەریدا خۆی لەخۆیدا بە پێشکەوتنێک دائەنرێت، بەڵام دەبێ ئەوە بڵێین کە ئەم گۆڕانو پێشکەوتنە هێندەش قوڵو کاریگەر نەبووەو بەپێی پێویست ئەنجامنەدراوە . دیارە ئەو دیدەی بڕوای بە کاریگەری یا پەیوەندی دولایەنەی سەرخانو ژێرخان هەیە، ئەوەندە توانای رونکردنەوەو پاساوهێنانەوەی بۆ ئاڵۆزی دەرونی رەهەندە ئاڵۆزەکانی "ژێرخانی"ی نیەو بزوێنەرێکی هەمەکی بەخشی پێکەوەگرێدراوە کە فۆکۆ بە گومانە لێی.

## 4- فرەیی هێزەکان:

فۆکۆ لەبری چاکسازیو ئارایشتکردنی مارکسیزم بەشێوەی ئاڵۆزی هەمەکی بەخشی، پێشنیاری جۆرێک فرەیی هێزەکان لە شکڵبەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا ئەکات، فرەییەک کە پەرشوبڵاو، دابڕاو، ناهاوکاتو ناهاودەمە. بەبڕوای فۆکۆ تیورەی کۆمەڵایەتی ناتوانێت لەرێگەی یەک چەمک یان نەخشەیەکی کلیلیەوە لە سەرجەم شکڵبەندی کۆمەڵایەتی تێبگات، بەڵکو بەپێچەوانەوە تیورەی کۆمەڵایەتی ئەبێت هەر گوتار/کارێک بەشێوەیەکی جیا بدۆزێتەوەو لایەنە جیاوازەکانی کە دروستیان کردووە لەیەک جیابکاتەوە، ماناو ناوەڕۆکە شاراوەکانی ئاشکرابکاتو بەدوای رەوتی پڕ پێچوپەنایدا بچێت، تائەو شوێنەی کە مومکینە کۆتایی تیا بێت. فۆکۆ بەتوندی دژی هەموو جۆرە هەمەکیگەریو هەمەکی بەخشیەک بوو، وە لایەنگری روکردنێکی لەسەرخۆ و دابڕاوە کە هەرگیز بانگەشەی ئەوە ناکات سەرجەم ساتەوەختی مێژووی رومالّ کردووە . فۆکۆ لەم ئاراستەیدا تا ئەو شوێنە ئەڕواتە پێشێ کە لە هەندێک حاڵەتدا ئەگەری فرەگەری ئەسەلمێنێت. نابێت ناڕەحەت بین لەوەی مارکسیزم (و هەروەها لیبرالیزم) ئێمەیان زیاد لە سنور بە هەمەکی بەخشینو گشتگیریکردنەکان راهێناوە، ئەوەی پێویستیەکی گرنگە روخانو هەڵوەشانەوەی هەموو ئەو گشتگیریە گەورانەیە کە ماوەیەکی زۆر بەسەر شێوەی بیرکردنەوەی مێژوویدا زاڵبووە . گشتگیریەکانی وەک دەرکەوتنی بۆرژوازی، دروستبونی دیموکراسی، خەباتی چینایەتیو شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری. فۆکۆ ئەپرسێت ئەوە چ ترسێکە بۆتە هۆی ئەمجۆرە گشتگیریە پەلەو دوور لە تێرامانانە؟ فۆکۆ لەبری "مێژووی جیهان" "مێژووی گشتی" دادەنێت کە مەبەستو ئامانجی بریتی ئەبێت لە "رونکردنەوەو وەسفی خەسڵەتە تایبەتیەکانی میکانیزمەکانو شێوەی پەیوەندیەکانو شکڵ و وابەستەیەکانێتی".

فۆکۆ بەم رۆحیەتو شێوە بیرکردنەوەیە، لە دوو کتێبی "کۆنترۆڵو سزا"و "مێژووی سێکسوالیتی" جەختی سەرەکی لە فرەیی/پەرشوبڵاویو دووری زانینو دەسەڵات ئەکات. جەختێک کە ئاشکراکەری دورکەوتنەوەیە لەچەمکی پێشوی "زانین". بۆ نمونە لە "سیستەمی شتەکان: ئەرکۆلۆژیای زانستە مرۆییەکان"دا "زانین" بەکلیلی سەرەکی هەموو جۆرە گوتارێک ئەژمێرێت-تەنانەت گەر فۆکۆ خۆشی نیەتی شتێکی وای نەبووبێت و مێژووش وەک بەدواداهاتنی زانین تەماشا ئەکرێت. هەر سەردەمو

قۆناغێک "زانین"ی تایبەتی خۆی هەیە کە بە زەمینە یا رووبەری پارچەگوتە(1) "utterance" ئەژمێرێت. زانین وەک چەمکێکی هەمەکیبەخش کاری ئەکرد کە فۆکۆی لەبەردەم ئەو رەخنەیەدا بێ بەرگری کرد، کە ئەو ناتوانێت ئەو چۆنێتی و بۆچێتیە روونبکاتەوە کە زانینێک ئەگۆڕێت بۆ زانینێکی دی.

دانانی تیورەی فرەیی گوتارەکان لەبری تیورەی زانین، ئەو توانایەی بە فۆکۆ بەخشی کە خۆی لە خراپی کێشە ئاڵۆزەکانی هۆیەتیو گۆڕان رزگار بکات. هەنوکە فۆکۆ توانی بەئاسودەیی بە تێهەڵکێشکردنی چەمکی نابەردەوامی لە شیکردنەوەیەکی مێژوویی‌و گونجاودا باسی پرسی لەدایکبونی زیندانەکان بکات، شیکردنەوەیەک کە بەباشی ئەتوانێت بەدوای بەسەرهاتو روداوە مێژووییەکاندا بچێت، کە لە هەموو شوێنو لە هەموو زەمەنێکدا رووئەدەن و لە هەمانکاتدا هەروا جەخت لەسەر ناپەیوەستبوونو نابەردەوامی بەسەرهاتو رووداوی زەمەنی و شوێنی بکات. فۆکۆ سەرەتا پیشانیدا کە چۆن "سیستەمی چاودێری باڵادەست" بەشێوەیەکی جدیو بڕاوە پەیوەندی خۆی لەگەڵ رابردوودا پچڕاندووە. پاشان پیشانیدا چۆن ئەم سیستەمە بەشو لایەنە جیاوازەکانی شێوەکانی دیسپلینی رابردووی تێهەڵکێش کرد، وەک ڕەوتی گۆڕانی تەکنەلۆژیای دەسەڵات لە سوپاداو پەرەسەندنی لە شکڵی فرقەکانی سوپادا کە پێکهاتووە لە کەسانێکی زۆرو گۆڕانی دواییان لە شکڵی زیندانەکاندا. لە شیکردنەوەکانی فۆکۆدا دەکرێت چاومان بە گۆڕانی تایبەتو هەروەها بەردەوامی لە جۆرێکی تایبەت بکەوێت، بێ ئەوەی بەڵگاندنی سەرەکی خۆی واتە تێزی نابەردەوامی- یان تەوەرەو ناوەڕۆکی هەرشێوەیەکی مێژوویی- لەم ناوەدا رەچاو نەکرێت.

لە بەرهەمەکانی تری فۆکۆدا بە بەکارهێنانی تێکەڵێک لە چەمکەکانی ئەرکۆلۆژیاو جینالۆجیا، لە تۆمەتی بونیادگەری نامێژوویی خۆی بەدوور گرتووە، هەرچەندە ئەم چەمکانە لە تێکستەکانی فۆکۆدا تاڕادەیەک تەمومژاویو ناڕونن، بەڵام دەربڕی دەستپێکردنی جوڵەیەکە بەرەو جۆرێک باس یان کێشەی مێژوویی کە مژدەی سەقامگیری هەڵوێستەکانی لەبەرامبەر مارکسیزمو مێژووگەری کلاسیکیدا ئەدات. لەئاستێکی گشتیتر و هەمەکیتردا لەڕاستیدا ئەرکۆلۆژیای زانینو جینالۆجیای دەسەڵات، رێنماییەکی مۆرفۆلۆجین کە گۆڕان لە بونیادی دیاردە جیاوازەکاندا ئەکەن. فۆکۆ سود لە وشەی ئەرکۆلۆژیا بۆ پیشاندانی ئاستێک لە شیکردنەوەی گوتارەکان وەرئەگرێت، کە بێ گێڕانەوەی بۆ بکەری بناس، دەستی بە "رێساکانی شکڵبەندی"یان (گوتارەکان) ئەگات. وشەی ئەرکۆلۆژیاش دەربڕی بەکارهێنانو دەورێکی سیاسیە کە تیایدا مێژوو بریتیە لە "هەڵگێڕانەوەو پێچەوانەکردنی پەیوەندی هێزەکان". مێژوونوس ئەتوانێت بە پێچەوانەکردنو هەڵگێڕانەوە پیشاندانی وێنەکانی ئێستا بۆ رابردوو، ئێستا وێرانبکات. ئەو شێوەیەی فۆکۆ بەرگری لێئەکات پێویستی بەوەیە مێژوونوس لە زەمەندا بگەڕێتەوە بۆ دواوە، تا ئەو کاتەی حاڵەتێکی جیاواز پیشانبدات، وەک روداوەکەی دامیان، بڵاوکراوەکانی دانپیانانەکانی پێش ترنتی، کەشتیەکانی هەڵگری گولەکانو شێتەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا. ئەوکات ئەم گوتارە بێگانانە بەشێوەیەک ئەدۆزرێنەوە کە روی نێگەتڤیان لە پەیوەندیدا بە ئێستاوە، "عەقڵانیەت"ی دیاردە بڕاوەو بەڵگەنەویستەکان نەفیئەکات. لەکاتێکدا کە تەکنەلۆژیای دەسەڵات بەشێوەیەکی ورد رونبکرێتەوە، گریمانەکانی ئەمڕۆ کە مێژوو بە روداوێکی "ناعەقڵانی" پیشانئەدەن، بایەخی خۆیان لەدەستئەدەن.

## 5- ئەلتەرناتیڤێک بۆ مارکس:

لەم وتارەدا سەردێڕە سەرەکیەکانی دەستوری کاری فۆکۆم بۆ نوسینی مێژوو باسو تاوتوێکرد. لێرەدا ئەمەوێت کەمێک راوەستم و مەسەلەیەکی یەکجار گران واتە پەیوەندی وردی تیورەکانی فۆکۆو مارکس رونبکەمەوە.

ئەو بانگەشەیە کە فۆکۆ بەئاسانی جێگەی مارکسی وەک بلیمەتەکانی تیورەی مێژوو داگیرکردووە، جگە لە بانگەشەیەکی هەڵخەڵەتێنەر زیاتر نیە. لەڕاستیدا رەنگە گەر هەندێک لە خوێنەران بڕوایان بە باسەکانی پێشەوە کردبێت، بەم دەرئەنجامگیریە بگەن. بەڵام دەبێت جەخت لەوە بکەم کە نە نیەتی من وابووەو نە هەڵسەنگاندنێکی لەم چەشنەم هەبووە. "شیکردنەوەی گوتاری فۆکۆ" هەرچەند خاوەن گرنگیو بەرجەستەی تایبەتی خۆی بێت، هەر جێگەو پلەیەکیشی هەبێت، هەرگیز ناتوانێت جێگەی "تیورەی شیکردنەوەی چینایەتی" یان تەنانەت شیکردنەوەی لیبراڵەکان بۆ بەسەرهاتو روداوە سیاسیو فکریەکان بگرێتەوە. لێرەدا مەسەلەکان لە دوو ئاستی دیاریکراو و سەربەخۆ لەیەکدا رائەوەستن کە پێویستی بە لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی سەربەخۆ بۆ کاریگەری بەرهەمەکانی فۆکۆ هەیە: لەسەر ئاستی گشتی چوارچێوەی مێژوویيو لەسەر ئاستی تایبەتی مێژوونوسینی تاکانە.

لەئاستی گشتیدا بەرهەمەکانی فۆکۆ بۆ مارکسیزم زۆر بە هەڕەشە ئەژمێرێن. مارکسیزم وەک چوارچێوەیەکی هەمەکی بەخش کە سەرجەم مێژوو لە چوارچێوەی نەخشەی پەرەسەندنێکی پلە بە پلەدا ئەگرێتەوەو هەموو ئاستەکانی کۆمەڵگا لەژێر باڵادەستی شێوەی بەرهەمهێناندا بەیەکەوە ئەبەستێتەوە، چیدی شتێک نیە توانای بەردەوامی هەبێت و بەرگری لێبکرێتو بەئاسانیش زیانی پێ نەگەیەنرێت. پێشتر سنورداریێتی ئەمجۆرە بیرکردنەوە هەمەکی بەخشەمان تاوتوێکردو پێویست ناکات جارێکی دی دوبارەی بکەینەوە. هەرئەوەندە بەسە بڵێین بەڵگاندنی فۆکۆ لەبارەی هەمەکی داماڵینەوە لە تیورەی مێژوو، بەڵگاندنێکی زۆر بەهێز، و قانع پێکەرە. رەخنەی فۆکۆ لە بکەری بناس یان ناسکەر چ لەئاستی بابەتی لێکۆڵینەوەی مێژوویدا (بکەری کرێکار لەتیورەی مارکس) و چ لە ئاستی بکەری دانەردا کە مێژوو ئەنوسێتەوە، بەتەواوی قابیلی بەرگریو سەلماندنە. لێرەدا جێی خۆیەتی سەرلەنوێ ئەوە دوبارە بکەینەوە کە دیدو تیورەکانی بکەرێکی تایبەت (پرۆلیتاریا، سیاسەتمەداری لایەنگری بنەما دیموکراتیەکان، تاکی لۆژیکی) بنەمایەکی گونجاو نیە بۆ هەمەکی بەخشینی بواری کۆمەڵایەتی. لەهەمانکاتدا نوسەری تێکستێکی مێژوویی، سود لە چوارچێوەیەکی تیوری وەرئەگرێت کە بەردەوام چوارچێوەیەکی یەک لایەنەو کەموکورە، بەردەوام سنوردارە بە بوارێک کە هەوڵی رونکردنەوەی ئەدات، و هەر لەبەرئەمەش ناتوانێت هەرگیز وەک بنەمای چوارچێوەیەکی گشتگیرو هەمەکی بۆ تیورەی مێژوو کاربکات. لەو رووەوە کە زانین بەردەوام لە پەیوەندیدایە بەدەسەڵاتەوە، لەبەرئەوە بەردەوام دەبێت جێگەو هەڵوێستی تایبەتی نوسەری دەقێکی مێژوویی، دامێنی بانگەشەی لەسەر راستبوونی (ئەوەی کە تیورەکانی بەتەواوی هەقیقەتن) سنوردار ئەکات.

ئەگەر بانگەشەی مارکسیزم کە لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراوە وەک تیورەیەکی هەمەکی بەخشی مێژوویی کارئەکات بخەینە لاوە، لەو کاتەدا ئەگەری دەرکەوتنی نرخی راستەقینەی شیکردنەوەی چینایەتی بۆ ئامانجو بابەتە مێژووییە تایبەتەکان دەرئەکەوێت. لەم ئاستەدا بەهیچ شێوەیەک هەڵوێستی فۆکۆ شیکردنەوەی مێژوویی مارکسیانە فەرامۆش ناکرێت. لەم ئاستەدا ئەبێت شایستەییو بایەخی رێژەیی ئەرکۆلۆژیای زانین، شیکردنەوەی چینایەتی مارکسیانە، مێژووی کۆنزەرڤاتیڤانە (مێژووی ویگ) بۆ رونکردنەوەی بواری کۆمەڵایەتی-مێژوویی، لەهەر حاڵەتێکی تایبەتدا هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت. لەم ئاستەی دژایەتی نەخشەو بەرنامەکانی تەفسیر- رونکردنەوەدا، دەکرێت شایستەیی و بایەخی هەڵوێستی فۆکۆ لەسەر ئەو بناغەیە هەڵسەنگێنرێت کە چۆن تاکەکان روبەروی پێداویستی و نیازەکانی هەلومەرجی هەنوکە ئەبنەوە. ئەگەر قەناعەت بکەین یان قەبوڵیبکەین کە وتوێژی ئازادو ئاشکراو و هەروەها دیموکراسی پەرلەمانی لە پێداویستیە بنەڕەتیەکانی هەلومەرجی هەنوکەن، لەم حاڵەتدا زمانناسی تەواوکاری هابرماس یان شیکردنەوەی سیاسی لیبڕاڵیانە بە خەسڵەتە کلیلیەکانی شیکردنەوەی مێژوویی ئەژمێرێن. ئەگەر بڕوامان بەوە بێت خەباتی چینی کرێکار بەناوەڕۆکی روداوە هاوچەرخەکان ئەژمێرێت، لەو حاڵەتەدا هەڵوێستی مارکسیانە بۆ کاری مێژوویی لە پلەی یەکەمدا دێت. ئەگەر بڕوامان کردبێت کە شکڵبەندی کۆمەڵایەتی تازە (شێوەی زانیاری) لە کۆمەڵگای سەرمایەداری پیشەسازی پێشکەوتودا لە دۆخی دروستبوونو دەرکەوتندایە، کە تیایدا زانین بەشێوەیەکی روو لەزیاد گرفتاری شێوە جیاوازەکانی دەسەڵات ئەبێتو نەیارێتی (ئعتراز) نوکی هێرشی خۆی لەسەر پرۆسەی بەرهەمهێنان لاداوە، لەم حاڵەتەدا نەخشەو بەرنامەی فۆکۆ ئەبێت بە رەگەزێکی گرنگو زیندوو بۆ دەستوری کاری مێژوونوسی. بەڵام لەهەموو حاڵەتێکدا هەر هەڵوێستەو لەجێی خۆیدا توانای دیاریکردنو رونکردنەوەی لایەنو رەهەندە دیاریکراوی بواری مێژووی هەبووە، و قەدرو بایەخ یان شایستەیی هەر هەڵوێستێک لەبەرامبەر هەڵوێستەکانی تردا، شتێکی رێژەییە نەک رەها.

## پەراوێز:

١) پارچە گوتە (utterance) لە زمانناسی بونیادگەریدا بە پارچەیەکی گوتار ئەگوترێت کە پێش و پاش ئەو بێدەنگی بێت. لێرەوە پارچە گوتە لەگەڵ رستەدا یەک شت نیە. چونکە رەنگە زۆرێک لە پارچە گوتەکان تەنها لەیەک وشە، گروپ یان رستەیەکی کەموکوڕ دروست بوو بێت. هەندێک پارچە گوتەش رەنگە لە کۆمەڵەیەک یەکەی باڵاو رەنگە لە رستە پێکهاتبن. (و.ف)

## سەرچاوە:

فلسفه تاریخ
روش شناسی و تاریخ نگاری
ترجمه و تدوین: حسین علی نوزری —تهران، طرحی نو، ١٣٧٩.

# وتارێك دەربارەی گەوهەری مێژوو

ئیحسان تەبەری
لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار

لیۆتۆلستـــتۆی، مێژووی ئینســـان بـــە گەڕانێکی راز ئامێز، پـــەی پێنەبراوو پێشبینی نەکراو دادەنێت کە دەسەڵاتێکی دورە دەست بە حەزو ئارەزووی خۆی ئەیسورێنێتەوە.

کارێل یاســـپێرس فەیلەســـوف و بیرمەندی هاوچەرخی ئەڵمانی، مێژوو بە هاتنـــەدی وردەوردەی خەون و ئارەزووی دیاریکراو دانانێت بەڵکو مێژوو لای ئەو وەزعیەت و بونیادێکی بەرچاو و سەربەخۆیە بەدوور لە دەستێوەردان و دەسەڵاتی مرۆڤ، هەر بۆیە مێژوو بەو ئاراستەیەدا ناچێت کە وەچە (نەسل)ەکان ئەیانەوێت و گەلێ شتی سەیر و سەمەرەی چاوەڕواننەکراوی لەناخدایە.

هایدگر، بیرمەندێکی دیکەی هاوچەرخی ئەڵمانی کە ئەویش وەکو یاســـپێرس بە بناغەدانەری مەکتەبی وجودیەتی ئەڵمانی ناسراوە، مێژوو بە بیابانێکی رەهاو نەزۆک ئەشـــوبهێنێت و لەو باوەڕەدایە کە مرۆڤ دەبێت پەڕینەوەی خۆی لەگەڵ ئەودا بەرانبەر و تەتبیق بدات و، بە هێمنی و لەســـەرخۆ، وەک رەواقیەکان خۆی بـــۆ خولی گیان توێنەری ئەو ئامادە بکات. ئەم بۆچوونە جۆرێک زیادەڕۆییە بە بەراورد لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا کە دەڵێت گەڕانی مێژوو بە ئاراستەیەکی قەدەری و لە ئەزەلەوە دیاریکراوە بەرەو ئامانجێکی تایبەت.

ئایینداەکان ئیـــرادەی یەزدان بە جەوهەری مێژوو ئەزانن و مێژوو لای ئەوان یانی هیدایەتی مرۆڤ لەلایەن پێغەمبەرانەوەو گەیشـــتنی ئینسان بە دۆزەخ یان

خود بەهەشــت کە دەرەنجامی کردەوەی خێر یاخود شــەڕی مرۆڤە و لە ئاکامدا تێکڕای مرۆڤەکان بەرەو قیامەت و زیندووبوونەوە و وەرگرتنی پاداشــت یاخود ســزادان ئەڕۆن. تەنانەت ئەوانەش کە دەوری خوا لە مێژوودا وەلائەنێن و مرۆڤ بەحەق بە قارەمانی ناوەندی (دەورگێڕی یەکەمی) مێژوو ئەزانن، زۆرجار تەسەورێکی بەستوو بێڕەنگیان (وەکو روانینی ئایینی) بۆ ئەم چەمکە هەیە. واتە ئەڵێت مێژوو بەرنامە و ئەرکێکی لەئەستۆدایە و لە چارەنووسیدا نووسراوە. کە وەچەیەکی تایبەت بە هوشــیاری ووردبینییەوە ئامادەو فەراهەم کردووە هەربۆیە کاتێک مێژوو لە رەوتی خۆیدا، شتی سەیر و مەسەرە ئاشکرا ئەکات ڕووبەڕووی سەرسوڕمان و گومان و لە ئاکامیشدا ڕەشبینی و ئینکار دەبنەوە.

لەنێوانی ئەم دوو بۆچوونەدا، ئەڵتەرناتیڤێکی سێهەم، بەڕای من هەیە کە بە دروستی و هاوکات ئــەم ئاڵۆزی گەڕانەی مێژوومان بۆ ئاشــکرا ئــەکات و گەوهەری ئەم خولانــەوە دەرئەخات ئەویش ئەمەیە:

*بزاڤی مێژوی مرۆڤ، وەکو مێژووی مادە بە گشــتی، پێڕەوی یاســا گشــتیەکانی تەکامولی مادەیە. مێژووی مرۆڤ بەکوڵ و کۆترین و سەیرترین بەشی ئەم تەکامولەیەو لەم ڕێگەدا هەر ئان و ساتێک سیستمێکی هاوئاهەنگ و ئاڵۆزتر و بالاتر دێتە ئاراوە و ئەم ڕەوتە هەرگیز کۆتایی پێنایەت و بەردەوام شتی تازە و چاوەڕواننەکراوتر بەخۆوە دەبینێت.

*هەرچەند ئەتوانین رێگەی گشــتی مێژووی مرۆڤایەتی لەسەر تابلۆی بیر و هزرێکی تەجریدی بەرێکوپێکی و بەشــێوەیەکی زانستیانە دیاری بکەین، بەلام بەرزونزمی و چاڵ و چۆڵی ئەم ڕێگەیە بەکەس پێشــبینی ناکرێت. مێــژوو بەرەو ئامانجێک رێــدەکات کە ئەم ئامانجــە خودی خۆی لە ناچارکردنی ناخی بزاوتی تەکامولی سیســتەمی ئاڵۆزی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیەوە، هەڵقولاوە. مێژوو بەردەوام رێدەکات، بەلام تاکەی و تاکوێ و چۆنایەتی ئەم ڕۆشتنە ڕوون و ئاشکرا نیە. ئەتوانین بۆ سەردەمێکی کورت، بەشێوەیەکی ئیحتمالی، هەندێ تایبەتمەندی وردی ڕەوتی مێژوو دیاری بکەین، بۆ وێنە خێرایی و هێواشــی و لەســەرخۆیی بزاوتی تەکامولی مێژوو لە زەماندا، یاخود کارەســات لــێ کەوتنەوە یا پێچەوانەکەی، ئیمکانی ڕوودانی شــتێک لە شــوێنێکی دیاریکراودا.. کە ئەمەش خــۆی نیازی بە کۆکردنەوەی کۆمەڵێک فاکت و زانیاری پێویســت هەیــە بەلام بە دڵنیاییەوە، ئەم تایبەتمەندییە وردانە بۆ ســەردەمێکی درێژخایەن ناتوانین دیاری بکەین، چونکە مێژوو هیچکاتێک نموونەیەکی پێشــوەخت ئامادەکراو وەکو بەرنامەی عەمەلی قبووڵ ناکات. تاکە پێشبینی زانستی توندو تۆڵ و پایەدار پێشــبینی ڕەوتی گشــتی مێژوو لەســەر بنەمای ناســینی یاسا و ڕێساکانی مێژووە.

*مێژوو خەلقکەرو هاوکات خولقێنراوە. وەکو هێزێکی ئاشکرا و بەر چاو و سروشتی لە دەرەوەی دەســەلاتی مرۆڤ و وەچەکانی تێکدەر و دروستکەری سیستم و تێکڕای سەربوردەکانە. بەلام وەکو کۆمەڵێک کــرداری ئاگایانە و نائاگایانەی میلیاردەها مرۆڤ، دروســتکراوی ئەوانە. مێژوو دونیای ڕووبەڕووبوونەوەی عەین و زەین (واقع و فیکر)ە.

هەروا کە مادە دارای شــانایەکی سەرەتایی یاخود پلاســمایەکی بزۆز و سووتێنەرە کە هەوێنی یەکەمینی جیهانی جۆراوجۆرە، پراکتیک (کردە) پلاســمای مێژووە. لە پراکتیکدا، عەینی مێژوویی

لە زەیندا ئەشــکێتەوە و دەبێتە عەینیەتی مێژوویی. ئەم پلاسما بزۆز و ئاڵۆز و سوتێنەرە کاتێک لەگەڵ فکر و ئیحساس و کرداری میلیاردەها مرۆڤ بەرەو ڕوو ئەبێتەوە شێوەگەلێک لەخۆ دەگرێت و بە ئاڕاســتەیەکدا ئەڕوات کە ناتوانرێت بە گشــتی پێشــبینی بکرێت یان لێــی تێبگەیت، ئەم تێنەگەیشتنەش لە میکرۆ پرۆسێسەکانی مێژوو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم رووداوانە لە حەشارگە و بە شــێوەیەکی نهێنی لە مێژوودا لەدایک ئەبن دواتر بە شێوەی رووداووی دابڕاو لە یەکتر خۆیان دەرئەخەن. بەڵام لە ماکرۆپرۆســەکانی مێژوو، ئەو دەمەی رووباری ئیرادەی ملیۆنەها مرۆڤ دەبێتە «دەریای مێژوویی» و دەبێتە شــەپۆلی نەســرەوتی «یاســا مێژووییەکان» مێژوو دەنووسرێت و مەیدان مەیدانی شارەزایی و دەرکی زانستیە هەروا هەنگامەی مێژوو دەبیسترێت و شتە بینراوەکان و دیمەنەکان و هێڵە سەروەکان ئاشکرا دەبن.

*وزەی بزاوتــی مێژوویی مرۆڤ، ناکۆکــی و دژایەتییە: ناکۆکی بیۆفیزیکــی (دژایەتی لەگەڵ سروشــت، ناکۆکی لەگەڵ ئەتنیک و رەچەڵەک، ناکۆکی تەمەن و ڕەگەز) یان ناکۆکی کۆمەڵایەتی لە نێوان چینەکانی کۆمەڵگا (بەرهەمهێنەر و بەرخۆر) یاخود دژایەتی ئاشتیانە لە کۆمەڵگای یەکسانی دوور لە جیاوازی چینایەتی کە بەردەوام لەلایەکەوە لە نێوان بزاوتی هێزە بەرهەمهێنەرەکان و ئاستی تێگەیشــتنی ئەوان لەگەڵ ئەو لای دیکە، واتە پەیوەندیەکان و ســازمان و ئەو نیزام و رێکخراوانەیدا کە هەن جۆرێک لە ناتەبایی و ناهاوئاهەنگی دێتە ئاراوە کە دەکرێت بەشێوەیەکی ئاشتیانە و بەبێ ئەوەی کارەساتی لێ بخوڵقێت چارەسەر بکرێن، لە ڕاستیدا، دژایەتی رۆن و سوتەمەنی گڕ و کڵپەی زۆپای مێژووە.

*تــاک (مرۆڤ) ســەرەڕای بچووکی خۆی، دەورێکی گەورە لە مێــژوودا دەگێرێت. دەتوانێت لە کاتەکان بە جوانی کەڵک وەربگرێت و گالێسکەی مێژوو خێراتر بەرەو پێشەوە ببات.

تاک ئەتوانێت بە لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندی خۆی و لێهاتوویی، تواناکانی خۆی لە پراکتیکدا بخاتە گەڕ و لەســەر هەویری لاســتیکی مێژوو مۆر و نیشانی چاک یان خراپی خۆی بەجێبهێڵێت. زۆرێک لە رووداوە گەورەکانی مێژوو بە تاڵی ناســکی دەزووی ئیرادەی ئەم یان کەســێکی ترەوە بەندەو دەیان قارمانی گومناوو نەناســراو لە مێژوودا دەوری گەورەیان گێڕاوە و کەســیش حسێبی بۆنەکردوون.

*ئەوەی بەسەر خوالێخۆشبوی مێژوودا دێ لە چێشتخانەیەکی نهێنی و رازئاویدا ئامادەدەکرێت. ئەم چێشتخانەیە ژوانگەی رۆحی و گیانی مرۆڤە دروستکەرەکانی مێژووە لەلایەک و، لەلایەکی تریش رووداوە سەرسوڕهێنەرەکان و چۆنیەتی و شکاندنەوەی رەنگەکانی ژیانی کۆمەڵگا لە هەست و نەست و، هەســت و نەســتیش لە ژیانی کۆمەڵگادا، هەر بۆیە ئەگەر توێژەرێک بە وردی سەیری بکات لەم رەوت و موکاشفە سەری سووڕ دەمێنێت.

زانستی ئەمڕۆ بۆمان ئاشکرا دەکات کە دروستبوونی گەڵای گوڵێک لەژێر چەتری پەڵە هەورێکدا لە کۆبونەوە و بەســتنی میلیۆنەها دڵۆپە ئاو پێک دێت و لە ئاســمانەوە تا سەر زەوی، رێگایەکی ئاڵۆزو دژواری لەبەردایە، بەڵام لەم ڕەوتە ئاڵۆزکاوتر، بلووری رووداوە مێژووییەکانە کە سەد هێندە ســەیر ترە. هەربۆیە گەر بمانەوێت لە مێژوودا ببینە دادوەرێکی عادل، دەبێت لە هەڵســەنگاندنی بەپەلەی مێژوو و هەروەها لە قەبووڵی تەعبیر و ڕاڤەکردنی رووداوەکان کە زۆرداران نووســیویانە،

خۆ بپارێزین. تا بێت فریوی ناوبانگ یاخود بەدووی قســـەی خەڵکی ئاسایی بکەوین و رواڵەتەکان ببینین و بە ناخی رووداوەکاندا شۆڕ نەبینەوە و نهێنیەکانی رازاوی گیانەکان و رووداوەکان هەست پێنەکەین.

دەبێت بە شێوازی زانستی بیرکردنەوە و لە ژێر رووناکی توێژینەوەدا، بڕۆینە ناو گێژاوی مێژوو لەناو کارێزە تاریکەکانی مێژوودا زۆلاڵی واقعیەتەکان هەڵهێنجێنین و پێوەری ئەم قەزاوەتەشـــمان دەبێت ئەمە بێ: «حەق ئەو شتەیە کە بە قازانجی رەوتی تەکامولی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بێت».

* (جیهان بەســـەر شـــارێی عەدالەتدا ئەڕوات). دروســـتی ئەم وتەیەی حافزی شیرازی ئەمڕۆکە ئاشـــکرایە، چونکە مێـــژووی لەخۆبوردویی و هەوڵ و تەقەلای مرۆڤ تەنیـــا فیداکاری و هەوڵێکی رەواقی (تســـۆئیک) نیە کە تەنیا لەبەر زاتی فەزیلەت و پاراســـتنی لێهاتوویی مرۆڤ بێت بەڵکو جۆرێکە لە هەوڵ و فیداکاری تێلەئۆلۆژیک بە مەبەســـت و ئامانجێکی تایبەت. دەبێت نەسرەوین و رەوتی تەکامولی مێژوو خێراتر بکەین. ئەمەش پێویستی بە فیداکاری و هەوڵی گشتی هەیە. بۆیە ئێمە بە پێچەوانەی وجودیەکان مێژوو بە وتنەوەی رەها و گۆڕەپانێکی نەزۆک دانانێین.

مارکســـیزم — لینینیزم یانی شیکردنەوەی مێژووی ســـەردەم و دیاری کردنی هێڵە گشتیەکانی تەکامولی مێژوو بەبێ واســـتیە. ئاشـــکرایە کە م.ل لە پێشـــیەوە هیچ حوکمێکی دۆگم لەم بارەوە دەرناکات و خۆی ئەداتە دەســـت ئەو ڕاســـتی و وردبینیانەی کە لە پراکتیکدا دێتەپێشێ. هەربۆیە م.ل زانستی، گشتی، وردبین و کامڵترین لێکدانەوە و باشترین بەرنامەیە بۆ موبارزەو کارو داهێنان بەدەست وەچەی ئێستاو داهاتووەوە. م.ل باشترین پێوەری بۆ هەڵسەنگاندنی مێژوو لەم سەردەمەدا داناوە و بەشـــێوەی تەرحێکی فاتاڵ و بەســـیت و ئاییني ناڕوانێتە مێژوو و مێژوو بە شـــتێکی بێ ئەســـەر (نێرەمووک) و یاخود کۆمەڵێک رووداوی بێ مانا دانانێت. ئەم ڕوانینە دروســـتە بۆ مێژوو هۆکارێکە بۆ ئەوەی مارکســـیەکان خۆیان لە کلێشـــە دانان و هاوکات لە تەسلیم بوون لە بەرانبەر «ئیراسیۆنالیزمی مێژوویی» دوور بگرن.

## سەرچاوە:

نووسراوە فەلسەفی و کۆمەلایەتیەکان — ئیحسان تەبەری — ١٣٨٢ حیزبی شیوعی ئێران (تودە).

# چەمکی مێژوو لای مارکس

عەزیز لغمیش
لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

لێکۆڵینەوە لە چەمکی مێژوو لای کارل مارکس، بیرێکی فەلسەفیانەی نوێ بۆ مێژوو دێنێتە ئاراوە، کە لە بەر ڕوناکیی میتۆدێکی زانستی لەسەر بنەمای دیاری کردنی هۆکارە فەلسەفی و ئەپستمۆلۆژیەکانی مێژوو بنیات نرابێت. ئەمەیش لە واقیعی ئینسانی و دینامیکیەتێکەوە سەرچاوە دەگرێت کە بەزەمەندا گوزەری کردبێت لە چوارچێوەی هەماهەنگی کردنی دەروونی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریەوە. مارکس فەلسەفە مێژووییەکەی لەو فەلسەفانەوە فۆرمەلە کردوە کە پێش خۆی بەرهەم هاتوون، یان هاوسەردەمی بوون. بە تایبەتی کە مارکس لە ژێر کاریگەریەکی زۆری فەلسەفەی مێژووی هیگڵدا بووە. ئەو هەر لەو فەلسەفەیەوە بنەمای فەلسەفە ماتەریالیزمە مێژووییەکەی خۆی وەرگرتووە. ئەم کاریگەریە بە ئاشکرا لە فەلسەفەی مارکسدا دەردەکەوێت سەرەڕای هەندێک جیاوازیی میتۆدی و مەعریفی.

ئێمە کاتێک باس لەوە دەکەین کە مارکس بایەخی بە مێژووی مرۆڤ داوە، مانای وایە ئەو بایەخی بە مێژووی رووداوەکانی ڕابوردوو داوە. بەڵکو و ڕووداوەکان دەخاتە نێو کۆنسێپتێکی فەلسەفی شیکاریی ڕەخنەییەوە کە واقیعە مێژووییەکەی دەبەستێتەوە بە ڕەوتە تیورییە کارلێکیەکەوە لە چوارچێوەی ئەو پەیوەندیە دیالەکتیکیەی لە نێوان بەرهەمی ماتەریانەی مرۆڤ و ئەو ململانێ کردنەدایە کە لەگەڵ هەمان بەرهەمدایە. دیدگای مارکس بۆ مێژوو

وەک پەرچەکردارێکی ڕاستەوخۆیە بۆ ئەو قۆناغە مێژووییەی خۆی تیا ژیاوەو ئەو کاریگەریانەی شارستانیەتی خۆراوا هەیبوە (وەک ململانێی نێوان زانست و مەسیحیەت، بەتایبەتی لە چاخەکانی ناوەڕاستداو، ئەو حوکمە تیوکراتیە ستەمکارانەیەی بەرهەمی هێنابوو، پاشان سەردەمی ڕێنیسانس و سەرهەڵدانی دۆزینەوە تازەکان لە بواری زانستی و تەکنیکیدا، پێشکەوتنی پیشەسازی، کۆڵۆنیالیزم و بڵاوبوونەوەی کلتووری خۆراوایی بە ناوی گەردوونگەرایی شارستانیەتی خۆراواوە...)

وەک ئەنجام لە دیدی مارکسەوە، دیالەکتیکی مێژوویی، لەڕێی ململانێی چینایەتیەوە دەوڵەتی سەرمایەداری دەگۆڕێت بۆ کۆمەڵگایەکی کۆمۆنیستی، کۆمەڵگایەک لەسەر دادپەروەری و ئازادی بنیات نرابێت. لێرەوەیە دەبینین ئەو فەلسەفە مێژوییەی مارکس بەرهەمی هێناوە، مانای مێژوو لە پەیوەندیی نێوان مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ و پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ سروشتدا دیاری دەکات.

ئەوەی جێگای سەرنجدانە، مێژوو لای مارکس تەلیسمێکە فەیلەسووف تووشی دۆشدامان دەکات و، چارەسەرکردنیشی بەشێوەیەکی هەڕەمەکیانە ئەستەمە. بەڵام ئەو لەناو بەرنامە گشتیەکەیدا مانایەک بە مێژوو دەبەخشێت کە کۆمۆنیزمە. بەلای مارکسەوە کۆمۆنیزم تاقە چارەسەری ئەو تەلیسمە مێژووییەیە. مارکس دەڵێت کۆمۆنیزمی ڕاستەقینە بریتیە لە تەلیسمی چارەسەرکردنی مێژوو، هەر ئەویش دەزانێت چۆن چارەسەر دەکرێت. مانای وایە کۆمۆنیزم، بە بەرنامە فەلسەفی و تیورە زانستیەکانی و، ئەو چارەسەرە ئایدیالیانەی لە خۆی دەگرێت، تاقە چارەسەری ئەو تەلیسمەی مێژووە. ئێمە لێرەدا ئەو پرسیارە دەکەین کە ئەو تەلیسمەی مێژوو لە کوێی تێڕوانینی مارکسدایە؟

لەبەرئەوەی مێژوو ڕووداوەکانی ڕابووردوون کە زەمان ڕووپۆشی کردوون و، ئەنجامگەلێکن هەندێکیان مایەی تێگەیشتنن و مەحاڵیشە درکی هەمووی بکرێت، بۆیە دید و لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرێت. لەلایەکی دیەوە، لەبەرئەوەی مێژوو لە قۆناغی تێپەڕاندندا بوەو، لە دیدی مرۆڤەوە بوەتە شتێکی نامۆ و بێ مانا، کەواتە ئەمان لەڕێی چەمک گەلێکی هەڵەوە هەوڵی دۆزینەوەی مانایان بۆ داوە، ئەمەیش بوە بە شوێنی ئەو تەلیسم و ناڕۆشنیەی کە چەمکی مێژووی پێ بارگاوی کراوە.

## مارکسیزم و مێژوو:

گرنگترین تایبەتمەندیی چەمکی مێژوو لای کارل مارکس، ئەوەیە کە ئەم چەمکە لەسەر ململانێی چینایەتی نێوان کارگەر و خاوەن کەرەسە بەرهەمهێنەکان دامەزراوە. هەروەها گەشەی مێژوو ملکەچی حەتمیەتی ململانێیە لە پێناوی مانەوەدا. لێرەوە مارکس پێی وابوو مێژوو بریتییە لە ململانێی چینەکان. بەو مانایەی مێژوو لای مارکس لە ڕێگای شۆڕشی پرولیتاریاوە بەدی دێت، هەروەها لە ڕێی زاڵ بوونی مرۆڤ بەسەر سروشتا لە پێناوی خزمەت کردنی خودی مرۆڤدا.

مارکس بڕوای وایە مێژوو کاتێک بەدی دێت و دەگاتە کۆتایی خۆی کە چینایەتی نامێنێت و ئەو دادە کۆمەڵایەتیە دەستەبەر بووبێت کە مارکس وێنەی ئەمیشی لە ڕێبازی کۆمۆنیستیدا کێشاوە، بەمەیش جەخت لەسەر تیوریای کۆتایی مێژوو دەکاتەوە کە ئەویش کۆتایی بیری سەرمایەداریە.

مارکس مێژوو بە پرولیتاریەوە گرێ دەدات و بەمەیش تیوریایەک دێنێتە ئاراوە کە مرۆڤ مێژوو

دروست دەکات و ڕۆڵیشی هەیە لە فۆرمەلەکردنی لایەنە دەروونی و رۆحی و مادیەکانیدا. ئەمە پوختەی وتەزایەکیەتی کە دەڵێت: «مرۆڤ بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت دروستکەری مێژووە» بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا کە مارکس جەخت لەسەر ڕۆڵی مرۆڤ دەکات لە مێژوودا، ئەوەیشی لەبەرچاوە کە هوشیاریی چینایەتیە پرولیتاریا هەڵدەنێت بۆ گۆڕینی مێژوو. ئەم دەست داگرتنەی مارکس لەسەر توانای مرۆڤ لە گۆڕینی مێژوودا، ڕووبەڕووی گەلێک ڕەخنەی کردۆتەوە، چونکە لە ڕوانگەی ئەو رەخنەگرانەوە. ناتوانیت بڵێیت مرۆڤ ئازاد و بەرپرسیارەو هۆکاری گۆڕینی مێژوە. لەسەر ئەم بنەمایە، بەتایبەتی لە سەدەی هەژدەدا، مانای مێژوو لە فەلسەفەی خۆراوادا پێگەیەکی گەشبینانەی لەخۆ گرت: مرۆڤایەتی بەناوی مێژوەوە خەبات بۆ دوو ئامانج دەکات: ئازادی و بەرهەم هێنانی زۆر. ئەم دیدە بە ناوی مەعریفەی زانستی و فەلسەفی مێژوەوە پاڵپشتی لێکرا (ئۆگوست کونت و مارکس و کەسانی دی).

بۆ نموونە مارکس وێنای کۆمەڵگایەک دەکات کە چینایەتی تیا نەبێت. بەو مانایە کە جیاوازی لە نێوان کرێکار و خاوەن کاردا نەمێنێت. پاشان بەپێی ئەم بیرۆکە پێشینەیە دیدە فەلسەفیەکەی بۆ مێژوو تیوریزە کردو، بزاوتی مێژووی بەپێی ئەم قۆناغانە پۆلبەند کرد: کۆمۆنەی سەرەتایی، کۆیلایەتی، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری، سوشیالیستی. هەروەهایش بە نیسبەت «ئۆگۆست کۆنت»ەوە کە لە چوارچێوەی بیرۆکەی پێشینەوە تەماشای رەوتی مێژووی کرد کە بریتییە لە «باڵادەستیی بیری پۆزەتیڤیستی» لای کۆنتیش بزاوتی مێژوو هەر لەوێوە دەست پێ دەکات. بۆیە دەتوانین بڵێین یاسای ئەو سێ قۆناغەی «ئۆ. کۆنت» فۆرمەلەی کردبوو، مێژوو بە ئاراستەیەکی دیاریکراو ناچار دەکات کە نابێت لێی لابدات.

مارکس لەسەر هەمان رێبازی هیگڵ وای دەبینێت کە مێژووی مرۆڤایەتی، وەک یەک مێژوو، نەتەوەو شارستانیەکان تیا بەشداری دەکەن.

ئەم مێژووە چەند شێوازێکی دابەش کردنی کار لەخۆ دەگرێت، مەبەست لەم شێوازە گشتیە وتنی ئەمانەیە:

–بڕوایان وایە کە مێژووی مرۆڤایەتی بەردەوام لە هەڵکشاندایە.

–ئەم بەرەو پێش چوونە پرۆسەیەکی جیهانی سەرتاپاگیرە.

–شێوازی بەرهەمی سەرمایەداری بەری بەرەو پێش چوونی قۆناغەکانی ڕابردووە.

مارکس لە دیدە مێژووییەکەیدا شتێک لە سیمای فەلسەفەی هیگڵی هەیە، بەتایبەتی ئایدیای ئامانجداریەتی لە مێژوودا. وەک ئەوەی مێژوو خود هوشیاریی بەخۆی هەبێت.

لەبارەی ئەو پێنج قۆناغەوە کە بەرودوای یەکترن، زۆر ڕەخنە لە مارکسیەکان گیراوەو بە قەفەزێکی ئاسنین ناودێر کراوە، چونکە زۆر باسکار ڕایان وایە شێوازی کۆیلایەتی کە لە یونان و رۆمادا سەریان هەڵدا، لە وڵاتانی تردا پێنەگەیشتن. شێوازی بەرهەم هێنانی دەرەبەگایەتیش نە لە یۆنان و نە لە ڕۆمادا سەریان هەڵنەدا، بەڵکو لە ناوچە جەرمەنیەکاندا بەدی هاتن (ئەڵمانیای کۆن، فەرەنسا، دوورگەکانی بەریتانیا) سیستمی سەرمایەداری لە بەریتانیادا سەری هەڵدا نەک لە یۆنان.

ئەم شێوازە جۆراو جۆرانەی بەرهەم هێنان (کە لە ڕاستیدا شێوازی کار دابەش کردنن) چ

پەیوەندیەکی هۆکارانە لە نێوان سەرهەڵدانی کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتیدا و، پاشان سەرمایەداری لە یونان و رۆمای کۆندا دادانێت. بۆ نموونە هەندێک ناوەندی شارستانی هەیە کۆیلایەتی بەخۆوە نەدیوە، هەشیانە نازانێت دەرەبەگایەتی چیە، هەیشیانە تا ئێستا لە قۆناغی کۆمونەی سەرەتاییدایە (خێڵە رەسەنەکانی ئوستراليا بەر لە شاڵاوی داگیرکردنیان لەلایەن ئەوروپاییەکانەوە).

دیدی فەلسەفیانەی مارکس بۆ مێژوو جەختە لەسەر بیرۆکەی پێشکەوتن و ناکۆکی. هەروەها جەخت لەسەر خەسڵەتی ماتەریالیانەی بەرەو پێش چوون دەکاتەوە کە پێشتر لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم دیدە نەکراوە.

هەر لەبارەی ئەم بابەتەوە کە پەیوەندیی بە چەمکی بەرەو پێش چوون و شێوازی مەتریالانەی ئەو بەرەو پێش چوونەوە هەیە. مارکس جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە شێوازی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری مێژوو کردەو ئەزەلی نیە. مارکس سوورە لەسەر ئەو رەگەزە جیاوازانەی لەگەڵ پێش خۆیدا هەیەتی. بێگومان گۆڕان و بەرەو پێش چوونەکانی مێژوو چەند شێوازێک لە خۆ دەگرن:

-پێشکەوتنی قۆناغ بە قۆناغ Evolution

-پێشکەوتنی یەکجارەکیی Rupture

-پێشکەوتنی ستوونی (کە بە تاقە ئاراستەیەکدا بەرز دەبێتەوە lineol)

-پێشکەوتنی بازنەیی (پاشەکشە و بەرەو پێش چوون cyclical)

لە مێژوودا دیاردەگەلێک هەن پێشکەوتنیان قۆناغ بە قۆناغە، هەیانە ستوونیە، سێیەم پێشکەوتنێکی بازنەییە، چوارەم پێشکەوتنی یەکجارەکیە و... هتد. بۆ نموونە لای مارکس کۆمۆنیزم وردە وردە بەرەو پێش دەچێت و هێدی هێدی سەرمایەداریی لەناو دەبات، ئەمەیان پێشکەوتنێکی قۆناغ بە قۆناغە. بەڵام پێشکەوتنی یەکجارەکیی ئەوەیە کە لە مێژوودا کتوپڕ روودەدات، جا بەهۆی جەنگەوە بێت یان کارەسات و شتی لەم بابەتانە.

لەسەر بنەماکانی پێشەوە، لەوە دەگەین کە مارکس تیوریە مێژووییەکەی لەسەر بنەمای ماتەری بنیات ناوە، هەوڵیداوە لەم بینا فەلسەفیەدا بۆ مێژوو، گۆڕانە مێژووییەکە گرێ بداتەوە بە گۆڕانی ئابووری کۆمەڵگاوە، ئەو لەرێی ئەم گرێدانەوە شرۆڤەی مێژووی کردووە، لەسەر بنەمای کۆنترۆڵ کردنی ئامرازەکانی وەبەرهێنان، ئەمەیش رێگا بۆ ئەوە خۆش دەکات کە چینێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو ئایدۆلۆژیا و دەستەڵاتی کۆمەڵایەتی خۆی بسەپێنێت. بەرئەنجامی ئەم ململانێ بەردەوامەیش سەرکەوتنی پرۆلیتاریایە کە لای مارکس بە ماتەریالیزمی مێژوویی ناودێر دەکرێت.

**سەرچاوە:**

Alwatan voice

دنیا الرای ١٢/٥/٢٠٠٦

# تێڕامانێك له مێژووی هاوچەرخ

جان لویس گدیس
له فارسییەوە: ڕێبین هەردی

ئەو گروپە لە ئێمە کە بێ پەروا خۆمان بە مێژوونوس ئەزانین، ئەبێت لەپای ئەو گومانەی هەندێکجار سەبارەت بە واقعی دەرەکی ئەو لقەی کاری تیا ئەکەین، چاوپۆشیمان لێبکرێت. لۆژیکیەکان لە وتەنەوەی ئەو خاڵە سەرخۆشن کە دەربڕینی "مێژووی هاوچەرخ" خۆی لەخۆیدا جۆرێک ناکۆکی و دژایەتی تێدایە، چونکە چۆن شتێک ئەتوانێت لەهەمانکاتدا هەم "هاوچەرخ" بێتو هەم "مێژوو" بێت. مێژوونوسانی کلاسیکی بەچاوی گومانەوە تەماشای لێکۆڵینەوە لە رابردوی نزیک ئەکەن، چونکە بڕوایانوایە دەمارگیری و پێشگریمانەگەلێک هەن کە بێگومان کاریگەریان لەسەر ئەم لێکۆڵینەوانە ئەبێت، هەروەها لەبەرئەوەی بڕوایانوایە ئەمجۆرە لێکۆڵینەوانە نابنە خاوەن بەڵگەو سەنەدی ئەرشیفی پێویست. زانایانی زانستە کۆمەڵایەتیەکان، "مێژووی هاوچەرخ" بە پێچەوانەکردن یان وێنەیەکی شێواوو نەگونجاوی سەرمەشقە تیوریەکان ئەزانن کە خۆیان دروستیان کردووە. رۆژنامەنوسان ئەم بوار یان لقە، پڕ لەو مرۆڤانە ئەزانن کە توانای خۆگونجاندنیان لەگەڵ هەلومەرجو سنورداریەکانیدا نیە. تەنانەت لە زانکۆیەکی وەک ئۆکسفۆردیش کە بەبڕوای من بەشێوەیەکی نادروستو هەڵە دەستپێکردنی مێژووی "مۆدێرن" بە "سەردەمی دیو کیلیتان" داناوە، بەهیچ شێوەیەک روون نیە کە جێگەی مێژووی هاوچەرخ تیایدا لە کوێدایە.

کێشەکە لەوەدایە زۆرجار مێژوونوسانی هاوچەرخ بەبێ ئاگاداری لە ئەنجامەکانو

دەرئەنجامەکانی روداوو پێشهاتەکان، دەست بە شیکردنەوەیان ئەکەن. بە وتەی سێر مایکڵ هاوارد کە سەرەتاکانی ئەمساڵ لەکاتی رەخنەو تاوتوێکردنی یەکێک لە کتێبەکانی مندا، بەشێوەیەکی زۆر توندو بریندارکەر رایگەیاند "مێژوونوسانی هاوچەرخ وەک ئەو تەفسیرکارانەن کە هەوڵئەدەن مانای رستەیەکی درێژی ئەڵمانی تێبگەن، لەکاتێکدا تەنها لە کۆتای رستەکەدا تێبینی ئەوە ئەکەن مەبەستی کاری رستەکە چیەو ئەیەوێت چی بڵێت". دەرئەنجامو زیانەکانی ئاگادارنەبوون لەچۆنێتی روداو دەرکەوتنی شتەکانو دیاردەکان، بەتایبەتی لەو حاڵەتە دەگمەنانەدا دەرئەکەون کە بیروڕاو باوەڕەکانی کەسەکە، بە پراکتیک بچنە ناو دەزگاو ئەنجومەنە باڵا دەوڵەتیەکانەوە، خاڵێک کە من لەچەند ساڵ پێشدا و لەچەند حاڵەتێکدا تێبینیم کرد.

سەرەتاکانی ساڵی ١٩٩٠ لەئەنجامی روخانی دیواری بەرلین، بەڵام پێش ئەوەی ئەوە دەرکەوێت ئایا ئەڵمانیا سەرلەنوێ یەکئەگرێتەوە یان ناو ئەگەر بەڵێ بەچ مانایەک، وتارێکم لە نیۆیۆرک تایمزدا بڵاوکردەوەو بەلۆژیکێکی بەڵگەنەویستانەو قابیلی نکوڵی لێنەکردنی مێژوویی سەلماندم کە یەکێتی سۆڤیەت هیچکات بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانە یەک دەوڵەتی ئەڵمانی کە بەشێک بێت لە رێکخراوی باکوری ئەتلانتیک (ناتۆ) بێت، قەبوڵناکات. لەبەرئەوە وەک ئاشتبونەوەو رێگەچارەی مومکین، پێشنیاری ئەندامێتی دوولایەنی ئەڵمانیای یەگرتوم لە پەیمانی ناتۆ و وارشۆدا کرد. لەو رۆژانەدا رەوتی بەسەرهاتو روداوەکان زۆر خێرا بوو، دیارە ئەم بڕوایەش زۆر خێرا خرایە لاوە، لەگەڵیشیدا خودی پەیمانی وارشۆش هەڵوەشایەوە. رەنگە وتارەکەی من پاڵێکی کۆتایی پێوەنابێت.

هەر لەم رۆژانەدا خاتو تاچەر سەمیناره بەناوباگەکەی خۆی لەبارەی مەسەلەی "ئەڵمانیا"وە گرتبوو، لەگەڵیشیدا داوەتی هاوڕێیەکی منی بەناوی گۆردن کریکی مێژوونوسی بەرجەستەی ئەمەریکی بۆ بەشداری لە سەمینارەکە کردبوو. لەکاتی وتاربێژیەکەدا گۆردۆن بەرێزێکی زۆرەوە دەستی خۆی بۆ وتنی تێڕوانینی خۆی بەرزکردبۆوە، "خاتونی سەرەک وەزیران ئەڵبەتە پێشنیارێکیش لەلایەن لاوێکی ئەمەریکیەوە -گدیس-، پێشکەشکراوە کە تیایدا داوای ئەندامێتی دولایەنەی ئەڵمانیای لەهەردوو پەیمانی ناتۆ و وارشۆدا کردووە". پێانگوتم خاتو تاچەر پاش بێدەنگیەکی درێژ و بیرکردنەوە، زۆر بە راشکاوی‌و بەشێوەیەکی بڕواوە گوتبووی " ئەمە کۆمیدیترین تێڕوانینێکە کە تا هەنوکە گوێم لێبووبێت".

هەر ئەم شتانە بەسە تا لانیکەم مێژوونوسی هاوچەرخ بخاتە سەر ئەو بیرکردنەوەیەی، ئایا باشتر نیە سەرجەم بابەتەکە بەیەکجاری واز لێبێنی‌و دەستی لێبشواتو خەریکی شتە دەست لێنەدراو و دڵنیا بەخش‌و بەرێژە "مۆدێرن"ی وەک لێدانی پارە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بێت. بە بیرکەوتنەوەی ئەو راستیەی یەکێک لە بەرجەستەترین ئەو مێژوونوسانەی تا ئێستا لێکۆڵینەوەیان لەبارەی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستەوە کردووە، بەتوندی دژی ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە بوو، کەمێک ئارام ئەبمەوە. مارک بلوکی مێژوونوس‌و پسپۆری گەورەی فەرەنسی لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستدا و یەکێک لە خەباتکارانی بەرەی بەرگریکردن، ماوەیەکی کەم پێش لەسێدارەدانی بەدەستی ئەڵمانیەکان لە جەنگی جیهانی دوهەمدا، خاڵێکی راگەیاند کە من لە ساتەوەختە نائومێدو بێهیوایەکانی کاری خۆمدا پەنای بۆ ئەبەم. مارک بلوخ گوتبووی "ئەو کەسانەی وائەزانن تازەترین بەسەرهاتو روداوەکان تەنها لەبەر تازەبوون‌و هاوچەرخبونیان، بۆ هیچ جۆرە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیەکی بەڕاستی بابەتی

نەگونجاون، تەنها ئەیانەوێت پاکیو پاکژی کلیۆ لە پیسی وتوێژی هەنوکە بپارێزن. ئەمە بە مانای بەکەمگرتنی خۆگرتنی خۆمانە".

بلوخ لەو بەڵگاندنە توندو رەقەی گستاپۆ سەری نەسوڕما، کە مێژووییەکە سەرەڕای ئەوەی بۆ هەرکەسێکی تر رووئەدات، بۆ مێژوونوسانیش رووئەدات. چونکە بلۆخ وەک مێژوونوسێک سەرەڕای تامەزرۆی خۆی بۆ رابردووی دوور، هەرگیز ئەو تێڕوانینەی قەبوڵ نەبوو کە مێژوو لەجێگەیەکدا کە هەنوکەی تیا نیە رائەوەستێت. لەڕاستیدا ژیانی بلۆخ وەک چەند کەسێکی کەمی تر، دەریخست هەندێکجار جیاوازی نێوان رابردوو و ئێستا تا چ رادەیەک ئەتوانێت دروستکراو بێت. بلۆخ دوجار ناچاربوو لێکۆڵینەوەکانی خۆی سەبارەت بە فیودالیزم بخاتە لاوەو بۆ بەرگریکردن لە وڵاتەکەی، دەست بۆ چەک ببات. یەکەمجار لە ساڵی ١٩١٤و جاری دوهەمیش ١٩٣٩. بلۆخ دوابەدوای تەسلیمبونی فەڕەنسا لە ١٩٤٠دا، نوسینی مێژوویی خۆی لەبارەی رابردووە وازلێهێناو دەستیکرد بە نوسینی کتێبی "شکستی سەرسوڕهێنەر"، لەڕاستیدا یەکێک لە باشترین ئەو رونکردنەوانەیە کە تاهەنوکە لەبارەی شکستو دۆڕانی سەرسوڕهێنەری سەربازی فەڕەنساوە نوسراوە. گەرچی ئەم بەرهەمە وەک بلۆخ خۆی دەڵێت لە هەلومەرجی "توڕەییو وروژانی هەستەکاندا" و راستەوخۆ پاش بەسەرهاتەکانی تیایدا رویاندا، نوسراوە.

بلۆخ پاش ماوەیەکی کەم چووە ناو "بەرەی بەرەنگاریەوە"و لەکاتێکدا ژیانی نهێنیانەی گرتبووە بەر، سودی لەم هەلە وەرگرتو زۆر وتارو بابەتی بێئەژماری نوسی کە بەشێکیان لەکاتی مردنیدا ناتەواو مابونەوە، پاشان لەژێر ناونیشانی "پیشەی مێژوونوس"دا چاپکراو بڵاوبونەوە. بلۆخ ئەیویست لەم وتارانەدا وەڵامی پرسیاری یەکێک لە کوڕەکانی باتەوە کە سەردەمێک بە رێکەوت لێی پرسی بوو، "سودی مێژوو چیە؟". بلۆخ هیوادار بوو "وتارە ناوبراوەکان بە یەک ریتمو ئاواز و بەشێوەیەکی یەکسان، هەم لەگەڵ زانایانو هەم لەگەڵ خوێندکارانی قوتابخانەکاندا قسە بکات"، بەڵام وەک چۆن خودی خۆی بەشێوەیەکی خاکیانە و بێفیزەوە ئەیوت "ئەمجۆرە سادەییە رەسەنە، ئیمتیازی ژمارەیەکی کەمی دەستەبژێرەکانە".

کتێبی پیشەی مێژوونوس، بەرگریەکی رەوانە لەو شتەی بلۆخ ناوی ئەنێت "مێژووی جیهانی". مەبەستی بلۆخ لەم دەربڕینە ئەوە بوو، مێژوونوسان دەبێت خەریکی سەرجەم لایەنو رەهەندەکانی مەسەلەکانو کاروبارە مرۆیەکانو ئەو فەزایانە بن کە ئەم شتانەی تیا رووئەدەن: "مێژوونوسی باش وەک دێوی چیرۆکی پەریەکانە، ئەو بە باشی ئەزانێت لەهەر شوێنێک بۆنی گۆشتی مرۆڤ بکات، لاشەکەشی هەر لەوناوەدا کەوتووە". لە باسەکەی بلۆخدا ئەو دەرئەنجامگیریە بەدەستدێت کە مێژوونوسان لەکاتی نوسین لەبارەی مێژووی رابردووەوە، دەبێ لەهەموو جۆرە سەرقاڵیەکی خۆی بە رابەرانی گەورەو روداوە گەورەکانەوە خۆی بەدور بگرێت: "ئەوان دەبێت بەهەمان ئەندازە باسی جوتیارانو شوانەکان بکەن کە باسی سیاسەتمەداران ئەکەن. لەم رێگەیەشەوە جێگەی هەموو رەهەندو روانگەکانی سەرجەم کۆمەڵگا لە بەرهەمەکەی خۆیاندا بکەنەوە، نەک تەنها بەشێکی بچوکی کە بەدەربڕینی بلۆخ دەکرا ئەوانە لە ئەرشفیەکاندا بەتەواو بوو راگەیەنرێت".

دیارە چەمکی "مێژووی جیهانی" بلۆخ مانایەکی تریشی هەبوو، لەڕاستیدا بریتی بوو لە ناڕەزایی دژی ئاراستەی مێژوونوسان لەهەوڵدانیاندا بۆ لێککردنەوەو جیاکردنەوەی رابردوو لە ئێستا. بلۆخ

جەختی لەوە ئەکردەوە کە سنورداركردنی ئاسۆی بینین بۆ قۆناعێکی زەمەنی تایبەت، رێک وەک دەستەبژێری کۆمەڵایەتی یان سیاسی بەشێوەیەکی نەگونجاوی مێژوو ئەژمێرێت. تێگەیشتن لەرابردوو لەرێگەی هەلی زەمەنی هەنوکەوە نەبێت، هەروەها بەبێ بوونی زانیاریەکی زۆر لەبارەی رابردووەوە، کەس ناتوانێت لەئێستا تێبگات. بلۆخ ئەنوسێت: "توێژینەوەی مێژوو هیچ جۆرە ستەمکاریەک پیشان ناداتەوە".

سەرەڕای روونی ئەو خاڵەی کە ژیانی خودی بلۆخ ئاشکراکەری تێکئاڵان یان بەشی هاوبەشی مێژوو و مەسەلە هاوچەرخەکانە، بەڵام سەیر ئەوەیە پەیرەوانی بلۆخ -کە لە ئێستادا بەشێکی زۆری لێکۆڵەرە مێژوویی ئەمەریکیو ئەوروپایەکان ئەگرێتەوە -لەبنەڕەتدا هیچ سەرنجێکی ئەوتۆ لەسەر ئەم جەختکردنەی ئەو ناکەن کە دەبێت ئێمە سود لە رابردوو بۆ رونکردنەوەی ئێستاو بەپێچەوانەوە، وەربگرین. ئەمرۆ مێژوونوسان بەشێوەیەکی یەکسان هەم باسی شوانەکانو هەم سیاسەتمەداران ئەکەن. لەم رێگەیەوە نیوەی بەرژەوەندیەکانو پێداویستیەکانی بلۆخ بۆ "مێژووی جیهانی" ئامادەئەکەن. بەڵام لە پەیوەندیدا بە روداوەکانی سەردەمی خۆیانەوە یان سەبارەت بە پێشبینی بۆ روداوەکانی دوایی، بەمشێوەیە رەفتار ناکەن. لە دەرئەنجامدا ونبونی مێژوونوساندا بواری ئێستاو ئاینده بە رۆژنامەنوسان، زانایانی سیاسەت، ئابوریزانان، دەروندناسان، کۆمەڵناسانو تەنانەت ئەستێرەناسان ئەسپێرن.

بەڵام لە هەمانکاتدا وەک بلۆخ بە باشی ئاگاداربوو، مێژوو تاکە بنەمایەکی پتەوە کە بۆ هەڵسەنگاندنی ئێستاو ئاینده لەبەردەستماندایە. هەمومان بە "وانە" وەرگرتن لە روداوەکانی رویانداوە، سەروکارمان لەگەڵ ئەوەدایە کە هەیەو ئەوەش کە دێت. مێژوو تاکە ئامرازێکە بۆ سەرتر چوون لە ئەزمونە راستەوخۆکانی خودو وەرگرتنی ئەزمونەکانی خەڵکانی دی لە شوێنو کاتی تردا، لەبەردەستماندایە . بەکورتی مێژوو بنەمای سەرەکیو رێسای رێکخستنی سەرەکیە لە زیهنی ئێمەدا، چونکە بەبێ یادەوەری زنجیرەی ژیانی ئێمە جگە لە زنجیرەیەک کاریگەری و کارلێکردنی بێمانا و دیارە ترسناک هیچی تر نابێت، یاخود زۆرتر وەک کاریگەری و کارلێکردنی ئەو مرۆڤانەیە کە زۆر بەخراپی توشی بیرچونەوەو فەرامۆشی دەبن و لەمەش ئازار ئەبینن. ئالیڤەر سەکسی پسپۆری بەرجەستەی ئەعساب، لە کتێبەکەی خۆیدا ئەنوسێت: "بۆ کەسێک کە بەشی زۆری یادەوەری خۆی لەدەستداوەو دوا بەدوای ئەوەش رابردوی خۆی لەبیرکردووەو هیچ لەنگەرێکی جێگیرو ئاسایشی لە زەمەندا نییە، دەکرێت چ ژیانێک -ئەگەر لە بنەڕەتدا ژیانێک هەبێت -کام جیهانو کام گیان یان دەرون بپارێزرێت".

شتێک کە زۆرترین تاکەکان لە خوێندنی مێژوو لە قوتابخانەو زانکۆکاندا لەبیریانە، ئەوەیە ئەوان هیچکاتێک زەمەنی پێویستیان بۆ باسکردنی مێژووی زەمەنی خۆیان نەدۆزیەوە، واتە بۆ ئەو بابەتەی خوێندکارانو خوێندزانان تامەزرۆی بوون. وەک ئەوەی مامۆستایانی مێژوو ملکەچی زەبری جۆرێک کار بن کە ناچاریان ئەکات، بۆ ئەوەی بەشی زۆری کاتی وانەکانی خۆیان بۆ شتگەلێکی وەک "یاسای ریفۆرمی ساڵی ١٨٣٢"، "یان پرسی نرخ لە سەردەمی ئاڵتونی سەوداگەریدا" و.... بکەن. لەکاتێکدا لەبارەی دەرکەوتنی کلتوری رۆک، نەخۆشی ئایدز، یان کۆتایی هاتنی شەڕی سارد، شتێکی کەم ئەڵێن یان لە بنەڕەتدا هیچ شتێک ناڵێن. خودی خۆم کە سەردەمی لاویم لە

تێکساسدا بەسەر ئەبرد، مامۆستای مێژووی قۆناغی ئامادەیم لە قوتابخانەدا قەشەیەک بوو لە گروپی پرسبیتەر کە زۆر بەجدی و فەرمی، هەمومانی قەناعەت پێکردبوو کە مێژوو لەکاتی وتنی هەشت ئامۆژگاریەکەی عیسای مەسیح لەسەر کێوەکەوە دەستی پێکرد "شتێک کە بەیانیانی یەکشەمەش لەبارەیەوە ئامۆژگاری ئەکردین"و بە شەڕی ئیسپانیا-ئەمەریکا کە خۆی بەشداری تیا کردبوو، کۆتایی پێهاتبوو.

بەمشێوەیە دۆزینەوەی مێژوونوسێکی وەک بلۆخ، مایەی سەرسوڕمانێکی دڵگیرو دڵخۆشکەرە، چونکە بلۆخ هۆیەک نابینێت تا "لەبەر کفرئامێزی وتوێژی ئێستا، نەجابەتو ویقاری کلیۆ (خوداوەندی مێژوو) فەرامۆشبکات". کەسێک بوو کە بڕوایوابوو هەوڵدان بۆ جیاکردنەوەی ئێستاو رابردوو، لەڕاستیدا بریتیە لە روتکردنەوەی لقی مێژوو لە هەموو ئەو شتانەی سەرنجڕاکێشو بەسودن بۆی. تەنانەت سەرسوڕهێنەرتر ئەوەیە زوربەی مێژوونوسان سەبارەت بە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە، هاوڕای بلۆخ بوون. ئەوان پێشوازیان لەو ئایدیایە کرد کە مێژوو ئەبێت دەست لە چاوپۆشینو گرنگی پێنەدانی ئێستا هەڵبگرێت.

باشترین نمونەی مێژووی هاوچەرخ کە ئێمە لە هەندێک شکڵێدا لەبەردەستمانە و لەهەمانکاتدا بە کۆنترین مێژووی جدی هاوچەرخ ئەزانرێت، لەبەرچاو بگرن. تۆسیدید بەرهەمی مەزنی خۆی "مێژووی شەڕی پلۆپۆنزی" لە نزیک ٢٤٠٠ ساڵ پ.ز نوسیووە. تۆسیدید پێمان ئەڵێت لەبەرئەوەی قەناعەتی کردووە ئەو روداوانەی بەسەریدا رویشتووە، بە ئەندازەی بەسەرهاتو روداوەکانی رابردوو گرنگبوون، لەبەرئەوەش کە دڵنیا بوو نەوەکانی ئایندە بە هەبوونی زانیاری زۆرترو ناسینی باشتری سەردەمی ئەو، باشتر ئەتوانن لە زەمەنی خۆیان بگەن، لەبەرئەوە "...ئەگەر وشەکانی من بۆ کەسانێک کە ئەیانەوێت بە روونی لە روداوو بەسەرهاتەکانی رابروو بگەن، یان ئەو روداوانەی دەشێت لە ئایندەشدا بەهامنشێوە رووبدەن، بە وشەی سودبەخش دابنرێت،...هەر ئەمە بۆ من بەس ئەبێت".

ئەم تیورەیەی تۆسیدید بۆ مێژوو کە پەیوەندیەکی دانەبڕاوی بە ئێستاوە هەیە، تەنانەت پاش ٢٣ سەدە پاش ئەوەش هەر بە تیورەیەکی بەڵگەنەویستو راست ئەژمێرێت. پلوتارک بە پێشکەشکردنی چەند نمونەیەک لەسەردەمی خۆی دەستیکرد بە نوسینی ژینانامەی ئەرستۆکراتو پیاو ماقوڵانی یۆنانو رۆم. قەشە ئەگۆستین بە سودوەرگرتن لە مێژووی دینیو نادینی، دەستیکرد بە رونکردنەوەی یەکێک لە روداوەکانی سەردەمی خۆی، واتە قەبوڵکردنی دینی مەسیحی لەلایەن ئیمپراتۆری رۆمەوە. نیکۆلا مەکیاڤیلی لە پێشەکی کتێبی میردا (١٥١٣) روو لە لۆلنزۆ دۆ مدیتچی دەنوسێت: "لەنێوان ئەو شتانەدا کە خاوەنی بووم، نەمئەتوانی شتێکی بەنرخترو ئازیزتر لە زانینی خۆم لەبارەی کارەکانی پیاوە مەزنەکانەوە بدۆزمەوە. زانینێک کە بەهۆی ئەزمونی دورودرێژی خۆم لەبارەی شتە تازەو مەسەلە هاوچەرخەکانەوەو بەهۆی خوێندنەوەی بەردەوام لەسەر مەسەلەو شتەکانی سەردەمی دێرین بەدەستمهێناوە". مێژوونوسان لە سەردەمی تودۆر وستیوارت و هانۆڤەر، لەبنەڕتدا هیچ هەوڵێکیان نەدا بۆئەوەی خۆیان لە وەسوەسەی "ئێستاگەری" لە بەرهەمەکانی خۆیاندا بەدوور بگرن. لەڕاستیدا وەک رۆی پۆرتەر ژیاننامەنوسی هاوچەرخ لە ژیاننامەی گیبۆندا ئاماژەی بۆ کردووە: "مێژوونوس رێک لەبەرئەوەی لەرێگەی پێشکەشکردنی خۆی وەک روداوێکی

بەسود کاریگەرو خاوەن توانای فێرکردن لەرێگەی نمونەکان یان رەخساندنی شتە پێویستەکان بۆ وتوێژەکانو گفتوگۆ سیاسیو مەزهەبیەکان کە بەردەوام لەو رۆژانەدا بەبێ راوەستان لەئارادابوو، سەنگەرەکانی خۆی یەک لەدوای یەک پاراست."

باوکانی دامەزرێنەری ویلایەتە یەکگرتوەکان، تێڕوانینە سیاسیە زۆر ئاڵۆزەکانی خۆیان لە هەوڵدانی خودهوشیارانە بۆ بەستنەوەی ئەو شتانەی بە بڕوای ئەوان بە راستیە هەبوەکان ئەژمێرێت، گواستەوە بۆ "وانەکانی" رابردوو. جۆن ئادامز لە ساڵی ١٧٦٥دا ئەنوسێت: "خوێندنەوەی مێژوو سەردەمی دێرین، تێڕامانو قوڵبونەوە لە نمونە گەورەکانی یۆنانو رۆم و لێکۆڵینەوە لە پێشینانی ئینگلیزی ئێمە کە پارێزگاریان لە مافە سروشتیەکانی مرۆڤ لەبەرامبەر ستەمکارانو داگیرکەرانی بێگانەو ناوخۆ ئەکرد، شتێکی پێویستو ناچاریانەیە". پاتریک هێنری ئەم مەسەلەیەی بەشێوەیەکی زۆر کۆو کورت دەربڕی: "من تەنها یەک چرام هەیە کە بەهۆیەوە رێگای پێش خۆم رونئەکەمەوە، ئەو چرایەش ئەزمونە. من هیچ رێگەیەک جگە لەرابردوو بۆ هەڵسەنگاندنی ئایندە ناناسم".

شۆڕشی فەڕەنسی سەردەمی ناسیۆنالیزمی رۆمانتیکی کە شۆڕشی ناوبراو تۆوەکەی چاندبوو، بەدرێژایی سەدەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم، بووە هۆی دروستبونی شەپۆلێکی گەورەی مێژوونوسیو بەرهەمی مێژوویی کە هەم لەژێر کاریگەریی روداوەکانی ئەوکاتەدا بوو، هەم وای لێئەهات کاریگەری لەسەر روداوەکانی ئەو سەردەمە دابنێت. وەک فریتس سترن وتوێتی مێژوونوسانی وەک گیزۆ و میسیلە لە فەرەنسا، مەکالیو کارلایل لە ئینگلترا، تریچکە لە ئەڵمانیاو بنکرافت لە ویلایەتە یەکگرتوەکان "هەموویان بوون بە پێشرەوانو پارێزەرانی ئەم خەباتانەو لەڕاستیشدا بۆئەوەی ببن بە پێشرەو و پارێزەری باشتر، رویانئەکردە مێژوو". مەکالی کاتێک تەنها ٢٨ ساڵەبوو بە بەباوەڕێکی تەواوەوە بەخۆی، بیرکردنەوەی "ئیستاگەریانەی" راگەیاند: "هیچ روداوێکی رابردوو خۆی لەخۆیدا گرنگ نیە. ناسینی رابردوو تەنها لەو روەوە بەهادارە کە رێنماییمان ئەکات بۆ هەڵسەنگاندنی وردو بابەتیانەی ئایندە. مێژوویەک کە بەکەڵکی ئەم ئامانجە نەیەت، هەرچەند پڕ بێت لە خەبات، پەیمانەکان، پەشێویو ئاژاوە، هێندەی بلیتێکی ئۆتۆبان بێ نرخو بەهایە".

لەبەرئەوە ئەو بیرەی کە نوسینو فێربوونی مێژوو رێک ئەبێت پێش ئێستا رابوەستێت، بیرێکی بەڕێژە تازەیەو پێدەچێت، دەرئەنجامی هاوڕێیەتی نائاسایی پسپۆڕیبوونو گواستنەوەی نادروستی تێزەکان بێت. تا پێش سەدەی نۆزدەهەم زانکۆگەلێکی سەربەخۆ، بۆ فێرکردنی مێژوو و ئامادەکاری زەمینەکانی فێربونی تاکەکان لەم لقەدا بوونی نەبوو. پێوست نەبوو تەنانەت ئەو کەسانەی لەم لقانەدا ئەیانخوێند، خاوەن بڕوانامەی بەرزو پسپۆڕیو پلەی زانستی بن. خوێندنەوەی مێژوو یان وەک چالاکیەکی کاتی بێکاری کەسانێک بوو کە کارو کاسبی پڕ دەرامەتیان هەبوو، یان جۆرێک سەرگەرمیو خوشگوزەرانی بۆ چینە خۆشگوزەرانو دەوڵەمەندان بوو کە بەهیچ شێوەیەک پێویستیان بە کارو کاسبی نەبوو. لەناو ئەم هەلومەرجەدا تەواو سروشتی بوو کە مێژوو ببێتە پاشکۆی سیاسەت، لەبەرئەوە کەس چاوەڕێی نەئەکرد مێژوو ببێت بە لقێکی "بابەتی"و ئامانجدار.

بەڵام زانکۆکانی ئەڵمانیا لەو سەردەمەدا دەستیانکرد بە پەروەردەکردنو فێرکاری جۆرێکی تازەی مێژوونوسان: کەسانێک کە دەبوو وەک زانایان کاربکەن و دوور لە هەمووجۆرە هەستێک، دەست بە شیکردنەوەو تاوتوێکردنێکی بەرفراوانی سەرچاوە هەبوەکان بکەن، بەپێی رێسا گشتیە

قەبوڵکراوەکان، دەست بە گشتگیرکردنەکان بکەن. لەو رووەوە کە وا ئەزانرا ئەم زانکۆیانە لە باشترین زانکۆکانی دنیان، لەبەرئەوە لێکۆڵەرەوەو توێژەرانی بێگانە — بەتایبەتی ئەمەریکیەکان– دەستە دەستە هێرشیان بۆ ئەم زانکۆیانە برد. ئەم پیاوانە (چونکە هەموویان پیاو بوون) کاتێک گەیشتنە ئەڵمانیا، روبەروی شتێک بونەوە کە بە نەریتی "رانکەیان" ئەزانی: واتە تاکە روداوێکی گرنگی کاریگەر–لەحاڵەتێکدا بەدروستی دەرک بکرێت– لە نەریتی مێژوونوسیدا تا ئەوکاتە.

لئۆ پلید فۆن رانکە کە بە ١٨٢٥وە تا ١٨٧١ لە زانکۆی بەرلین وانەی ئەوتەوە، بڕوایوابوو پەیامی مێژوونوس بریتی نیە لە "هەڵسەنگاندنی رابردوو و رێنمایکردنی ئێستا بە بەرژەوەندی سەدەکانی ئایندە"، بەڵکو " پیشاندانی ئەو شتانەیە کە بەڕاستیو کردەوە رویانداوە، (لەبنەڕەتدا چۆن بووەو بەچ شێوەیەکیش رویداوە". رستەیەکی رانکە هەیە کە دەربڕی سنورداری ئەم بنەمایەیە "ئەم بنەمایە تەنها بەو مانایەیە کە وەک یەکەم هەنگاو بۆ مێژوونوسی، کەسەکە ئەبێت خۆی لە سەرچاوەکاندا نوقمبکاتو قوڵ بێتەوە تیایاندا، پاش ئەم قۆناغە دەستبکات بە روونکردنەوەی یەکێتیو پێشکەوتنی روداوەکان". مەبەستی رانکە بەدڵنیایەوە ئەوەبوو ئێستا لەرابردوو جیابکاتەوە. رانکە پاشتر نوسی "لەبەرئەوەی مێژوو تەنها بابەتێکی وانەیی زانکۆیی نیە، ئەوا دەبێت زانینی ئێمە لەبارەی مێژووەوە میراتی هاوبەشی مرۆڤایەتی بێتو گرنگتر لە هەمووشیان ئەوەی کە دەبێت لە خزمەتی بەرژەوەندی نەتەوەدا بێت، چونکە بێ ئەوە هەرگیز کاری ئێمە بەدی نەدەهاتو کامڵ نەدەبوو.

بەڵام ئەو ئینگلیزی و ئەمەریکیانەی لە ئەڵمانیە خەریکی لێکۆڵینەوەی مێژوویی بوون–خاڵی جێی سەرنج ئەوەیە هیچیان پەیوەندی راستەوخۆیان بە رانکەوە نەبوو–، تەفسیرێکی گشتیترو فراوانتریان بۆ چەمکی "بەکردەوە وەک چۆن رویداوە" کردووە: بۆ ئەوان ئەم دەربڕینە بەمانای ئەوەبوو کە دەکرێت رابردوو "بەشێوەیەکی بابەتیو هەستپێکراو"، واتە سەربەخۆ لە رووداو و بەسەرهاتەکانی هاوچەرخو سەربەخۆ لە تێگەیشتنو پێدراوە هەستیەکانو پێشگریمانەکانی چاودێران بناسرێت. لەبەرئەوە چۆنایەتی لێکۆڵینەوەی مێژوویی پەیوەندی بە روبەرێکەوە هەبوو کە دەکرا لە تێبینیەکانو وەسوەسەکانی "ئێستاگەری" جیابکرێتەوە. ئیدوارد پی چینی کە لێکۆڵەرەوەیەکی ئەمەریکیە لە ساڵی ١٩٠٧دا نوسی "شێوازی مێژوونوسی مۆدێرن ئەوەبوو کە ئەو بابەتەی لێی ئەکۆڵیتەوە، وەک تاکە چوارچێوەیەکی راستیەکان ئەبینی کە دەبوو لەجێگەی خۆیانداو تەنها لەبەر خۆشیان، بکەویتە بەر لێکۆڵینەوەو توێژینەوە. نەک بە دیدی وانە وەرگرتن لێیان، نەک بە دیدی پیاهەڵدانی ئەمیانو ناشرینکردنی ئەوی تریان، نە بەدیدی هەڵبژاردنو پۆلێنکردنی راستیەکان یان بە مەبەستی کارتێکردنی خوێنەرانو بەخشینی لەزەتی سۆزداریانە پێیان، لەراستیدا دوور لە هەموو جۆرە ئامانجێکی ناگرنگ، بەڵکو تەنها لە شکڵی سەیرکردندا بۆ مێژوو وەک بابەتی لێکۆڵینەوەی خوی، رێک وەک چۆن ئەکرێت لەگەڵ دیاردەکانی تردا هەڵسوکەوت بکرێت".

رەنگە ئەم شێواندنو لادانەی تێڕوانینەکانی رانکە —کە زۆر باو بوو بوو–، بگەڕێنینەوە بۆ ئەو کێشانەی مێژوونوسانی ئینگلیزی زمان لەکاتی فێربوونو زاڵبوون بەسەر زمانی ئەڵمانیدا توشیبوون. بەڵام هەموو مەسەلەکە ئەمە نیە، چونکە دڵەڕاوکێ و سەرقاڵی زیهنی ئەم مێژوونوسانە بە مەسەلەی بابەتیبوون، دەربڕی ئیرادە و سوربونیان بوو لەسەر دروستبوونو سەقامگیری لقەکەی خۆیان وەک لقێکی سەربەخۆی زانکۆیی. ڤیتەر نوییک بڕوایوایە کە لەنێوان پسپۆرگەری

یان برۆفێشنالگەریو بابەتیبوون، جۆرێک پەیوەندی پێکەوە ژیان هەیە. رەوتی پرۆفیشنالبوونو روکردنە پسپۆریکردنی لێکۆلێنەوەکان، زنجیرەیەک پێوەری بایەخداری دروستکرد. بە دروستکردنی پێوەرێکی گشتی بۆ هەڵسەنگاندنی لێکۆلێنەوەو توێژینەوە مێژووییەکان، بەرهەمە ناڕەسەنەکانی لە بەرهەمە رەسەنەکان جیاکردەوە. ئەم پێوەرە هیچ نەبوو جگە لە هەمان مەیلی دەروونیو تامەزرۆی دەرونی بۆ بابەتیبوون. سودوەرگرتن لە بابەتیبوون بۆ دروستکردنی دەسەلات، بە نۆبەی خۆی بووە هۆی سنورداریێتی بواری لێکۆلێنەوەی مێژوویی، بەلام توانای پێشبینیکردنی بردە سەرێ. هەنوکە تاکەکان بۆ هاوتاکانی خۆیان ئەیاننوسی، نەک بۆ وەرگرانێکی گشتی و هەمەڕەنگ کە سەردەمێک مێژوونوسانی وەک کارلایل یان میشیلە لەبەردەستیاندا بوو. ئەگەر ئەمە بەمانای جۆرێک بەلگاندنو مێژوونوسی کەمتر گەرموگوڕ بوایە، ئەوا بوونی ئەو هەموو کارە جیاوازە، قەرەبووکردنەوەیەک بوو بۆ ئەو مێژوونوسانەی سەرقالی بوون.

بەلام پێوەری بابەتیبوون جێگەیەکی کەمی بۆ بابەتە وتوێژئامێزەکان لە مێژوودا بەجێهێشتو ئەمەش بەمانای ئەوەبوو کە مێژوونوسە "بەرپرسیارەکان"، دەستبکەن بە دورکەوتنەوە لە رابردووی نزیک، چونکە بەبڕوای ئەوان رەنگە هەر لەوێدا فەزای هەستو سۆزو هەژانی ئێستا، لە چالاکیو کاریگەریدا بن. بەهێزکردنی ئەم پالنەرە پێشەییو فکریە، بۆ ئەو کەسانەی کە وانەی مێژوویان ئەوتەوە، سودێکی زۆر پراکتیکیانەی هەبوو، کە ئەویش پیانەچونەوە بوو بە بابەتەکانی کتێبەکانو وانەکانو هاوچەرخ نەکردنیان. دەرئەنجامی ئەمە ئەوەبوو کە بەدەستپێکردنی سەدەی نۆزدەهەم، مێژوو بۆ یەکەمجار لە زەمەنی توسیدید بەدواوە، وەک شتێک کە لە رابردوودا رویداوە تەماشاکراوە، لێرە بەدواوە ئەبوو ئێستای ترسناک بۆ خۆی بەجێ بهێلرێت.

بەلام مەسەلەکان بەم سادەیەش نەبوون، بۆ نمونە ئێستا لەچ شوێنێکدا ئەبێت بە رابردوو، لە ئەنجامیشدا ئەبێتە مێژوو؟ لۆژیکیەکان لە وەلامدا ئەلێن هەر ئێستا، چونکە ئێستا خالێکی بێ کۆتایی بچوکە کە رابردوو لە ئێستا جیائەکاتەوە، سەرەتای ئەم رستەیە چەندان ماوە پێش ئەوەی ئێمە (لۆژیکیەکان) بگەینە کۆتاییەکەی، وەک مێژووی لێهاتبوو. بێگومان هیچ دودلیەک لەوەدا نیە کە هەر کەسێک —جگە لەئاوارتنی دەگمەنی کەسانی فەرامۆشکار–خاوەن یادەوەریە، ئەم یادەوەریانەش رێک لە ئێستاوە دەست پێئەکەنو ئەگەرێنەوە بۆ کۆنترین یادەوەریەکان، کاریگەرییەکانو وەرگرتنە هەستیەکانی سەردەمی منالی. رێک لەبەر ئەمجۆرە سەیرکردنە بوو کە کارل بیکەری مێژوونوسی نارانکەیی ئەمەریکی، بەو بەلگاندنەی کە "هەر پیاوێک مێژوونوسی خۆیەتی"، (لە سەردەمێکدا کە مرۆڤ ئەیتوانی بەبێ ترس لە رەخنەگرتنو لۆمەکردن، سود لە سیفەتو ئاوەلناوە نێرەکان وەربگرێت) ناوبانگێکی بۆ خۆی پەیداکرد. کارل بیکەر لە ١٩٣١ دا وتی "مێژوو داهێنانێکی زیهنیو شیکاریە، داراییەکی شەخسیە کە هەر یەک لە ئێمە بەپێی ئەزمونە تایبەتیەکانی خۆمان شکلی پێ ئەبەخشین، لەگەل پێداویستیە پراکتیکیو سۆزداریەکانی خۆماندا ئەیگونجێنین، گونجاو لەگەل چێژی ستاتیکی خۆماندا ئاراستەو زەخرەفەی ئەکەین".

بێگومان خالێک لێردا خۆی حەشارداوە، هەموو مێژوونوسان هێلە گشتیەکانی بابەتەکانی پەیوەندیان بە بەسەرهاتو روداوەکانی رابردووە هەیە، دوبارە ئەکەنەوە، بەلام تەنها بەشێوەیەکی کەموکوڕ. مێژوونوسان وەک بونەوەرەکانی شوێنکاتێکی تایبەتی خۆیان، دەبوو ئەو بەشانەی رابردوو

پۆلێن بکەن کە حەز بە لێکۆڵینەوەی ئەکەن، تەنها لەبەر ئەو هۆیە زۆر باشە کە ناتوانن لەهەموو بەسەرهاتو روداوەکانی رابردوو بکۆڵنەوە: سەرو ئەوەی هەندێک خوێندزان بیری لێئەکەنەوە، مێژوو پێویستی بە شتێکی زیاد لە گسکدانێکی کارەبایی زەبەلاحو هەڵلوشانی بەڵگە مێژووییە هەبوەکانی لە رەوتی تاکەکەسدا. کەس ئەبێت ماناو چەمکی ئەو شتانەی کە بینوێتی تێبگات، ئەو ئامرازەش مێژوونوسان بەهۆیانەوە ئەم ئەرکە جێبەجێ ئەکەن، بەناچار دەربڕو رەنگدانەوەی "ئێستا"یەکی تایبەتی کە تیایدا ئەژین. لەبەرئەوە سەرجەم مێژوو بە مێژووی هاوچەرخ ئەژمێرێت، لەبەرئەوەی ئەو تەرازو و پێوەرانەی ئەبنە هۆی ئەوەی کەسێک بابەتێک هەڵبژێرێتو ئەمەش کاریگەری لەسەر شکڵوەرگرتنی ئەو قسانە هەیە کە لەبارەی ئەو بابەتەوە ئەیانڵێت، ناتوانرێت لەو زەمەنو شوێنە تایبەتە جیابکرێتەوە کە کەسەکە تیایدا کارەکانی خۆی ئەنجام ئەدات. چارلز ئی بێرد کە هاورێو هاوکاری مێژوونوس بیکەرە لە ساڵی ١٩٣٣ لە "ئەنجومەنی مێژووی ئەمەریکا" رایگەیاند، "ئەو وێنایە زۆر بێهودەو پوچە کە هەر مێژوونوسێک ئەتوانێت وەک جەستەیەکی بێ گیان کار بکاتو بە ساردی و بێلایەنیەکی تەواوەوە سەیری مرۆییەکان بکات، رێک وەک هەڵوێستی ئەندازیارێک (ی میکانیکی) لەبەردەم ئوتومبێلدا". رێژەگەری لە فیزیادا جێگەی بۆ مێژوونوسان کردۆتەوەو پیشانیداون، لە ئەنجامدا "تێزەکەی رانکە لەبارەی مێژوەوە بایەخی خۆی لەدەستداوەو نێردراوە بۆ مۆزەخانەی شتە کۆنو دێرینەکان".

روداوەکانی جەنگی جیهانی یەکەمو دەرئەنجامەکانی دواتری، دەورێکی گەورەیان لە شکڵوەرگرتنی "رێژەگەریدا" هەبوو کە بیکەرو بیرد بەهۆیەوە بەناوبانگ بووبوون. لەکاتی ساڵەکانی جەنگدا مێژوونوسە بەناو بابەتیەکان، بوون بە پروپاگەندەچی بۆ وڵاتەکانیان، تەنانەت پاش ئەوەی لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٢٠دا بەڵگەنامەیەکی زۆر لەبارەی سەرچاوەو هۆکارەکانی جەنگەوە ئاشکرابوو، لێکۆڵەرەوەکان لەنێوان خۆیاندا لەبارەی ئەو شتەوە کە پێشانیاندابوو، گەلێک تێڕوانینی جیاوازیان هەبوو. وا دەرئەکەوت کە مێژوو وەک کیمیا نیە، چونکە لە کاتێکدا دوو زانای کیمیایی لەوەسفی پێکهاتەیەکی کیمیایی لە تاقیگەدا، بەگشتی لەسەر سیفەتەکانی ئەو پێکهاتەیە تەباو هاوڕان، ئەوا ئەم مەسەلەیە لەبارەی دوو مێژوونوسەوە راست نیە. واتە ئەگەر هەر دوو مێژوونوسەکە هەمان بەڵگەنامەیان لەبەردەستدا بێت، لەبارەی شێوەی وەرگرتن و تێگەیشتنیانەوە هەمان راو و بۆچونیان نابێت. بەبڕوای بیکەر دوو جۆر مێژوو بوونی هەیە، "زنجیرەیەک روداوی واقعی کە سەردەمێک رویانداوە، لەگەڵ زنجیرەیەک روداوی خوازراو و نمونەیی کە ئێمە ئەیسەلمێنینو لە یادەوەریماندا ئەیانپارێزین. جۆری یەکەم رەهاو نەگۆڕن، واتە هەمان ئەو شتانە یان هەموو ئەو شتانەی ئەنجامی ئەدەین یان قسە لەبارەیانەوە ئەکەین، جۆری دوهەمیش رێژەیین، بەردەوام لە وەڵامدانەوە یان دەرهێنانی زانیندا لە گۆڕانو گۆڕانکاریدان".

بەڵام ئەم تێڕوانینەش زیاد لە سنور سادەو ساکارانە بوو، چونکە ئەگەر بکرێت یادەوەری بەپێی گونجاندن یان پێ بەپێی "زیادکردن یان دەرهێنانی زانین" ئاڵوگۆڕ پێبکەین، لەم حاڵەتدا چ شتێک ئەیتوانی رێگە لە سنورداریێتی یان لادانی زانین بگرێت؟ چ کەسێک ئەیتوانی بەشێوەیەکی دادپەروەرانەو بێلایەنە دەستگەیشتن " بەو شتەی بەراستی رویداوە" زامن بکات، لەکاتێکدا تەفسیرەکانی پەیوەندیان بە روداوەکەوە هەیە، بەردەوام لە ئاڵوگۆڕو پاشو پێشکەوتندان؟. بەهەرحاڵ فاکتەکان

لە مێژوودا کامانەن و چۆن ئەکرێت لە "یادەوەریەکان" جیا بکرێنەوە؟ دەرکەوتنی تۆتالیتاریزم لە ئەڵمانیاو یەکێتی سۆڤیەت و دروستکردنی لادانو لادانی جیاواز لەمێژوودا، بۆ پاساوهێنانەوە بۆ ئەم دیاردەیە لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٣٠دا، ئەم مەسەلانەی کرد بە مەسەلەگەلێکی یەکجار واقعی. بەسەرهاتو روداوەکانی جەنگی جیهانی دووهەم و سەرەتاکانی جەنگی سارد بەشێوەیەکی تەنزئامێز هاوئاهەنگ لەگەڵ ئەو گریمانە سەرەکیەی رێژەگەری کە "ئێستا" کاریگەری لەسەر دیدی کەسەکان بۆ "رابردوو" هەیە، بۆوە هۆی بێ بایەخ بوونی ئەم تێزە، رێک وەک چۆن روداوەکانی جەنگی جیهانی بووبونە هۆی دروستبوونی.

دیکتاتۆری خەیاڵی "برای گەورە" کە لە رۆمانی تانەئامێزو بریندارکەری ١٩٨٤ی جۆرج ئۆرێل —رەنگە وێرانکارانەترین هێرشێک کە بۆ سەر رێژەگەری مێژووی کراوە، رایگەیاندا " ئەو کەسەی کۆنترۆڵی رابردوو ئەکات، کۆنترۆڵی ئایندەی لەدەستدایە: کەسێک کە کۆنترۆڵی ئێستا ئەکات، کۆنترۆڵی رابردووی لەدەستدایە". ئەگەر وەک رێژەگەران بڕوایانوایە وەسوەسەو تێبێنیە ئێستاگەریەکان دیاریکەر یان ئاشکراکەری جۆرو شێوەی بیرکردنەوەی تاک بن لە رابردوو، ئەگەریش وەک هەموان ئەیسەلمێنن رابردوش بەنۆبەتی خۆی شکڵ بەدیدی تاکەکەس بۆ ئێستا بدات، لەم حاڵەتەدا چ شتێک ئەیتوانی رێگری لەوە بکات مێژوونوسیی ببێتە میکانیزمێکی دوبارە هەرسکردنەوەی دێوئاسا کە تیایدا بەردەوام رابردوو بەئاراستەی خزمەتی نەهێشتنی پێداویستیەکانی ئێستا دوبارە بیناو دروست ئەکرێتەوە. وەک هربرت باترفلید ئاگاداری کردوینەتەوە: "هەرچەند مێژوونوس زیاتر لەبیری خۆشحاڵکردنی نەوەی خۆی یان خزمەتی حکومەتو دەوڵەتی خۆی، یان بەدوای ئامانجێکی جیاواز لە هەقیقەتەوە بێت، زۆرتر روو ئەکاتە ئەو ئاراستەیەی کە سەرجەم باوەڕو بیروڕای هاوچەرخەکانی خۆی —هەرچیەک بن— بسەلمێنێ، بەهەمان رێژەش هەڵە باوەکانی سەردەمی خۆشی سەختر ئەکات". یان وەک ئۆرێل وتی تەنها شتێک کە پێویست بێت :"زنجیرەیەک سەرکەوتنی بێ کۆتاییە بەسەر یادەوەری خۆتاندا". بێگومان بێرد زۆر زوو و بەر لەکاتی خۆی رانکەی بۆ مۆزەخانەی بەرهەمە دێرینەکان ناردبوو.

بەڵام رەخنەکانی قۆناغەکانی پاش جەنگ دژی رێژەگەری خۆی توشی ناکۆکی زۆر بوو. بۆ نمونە هەرگیز بەدروستی روون نەبۆوە ئایا بێرد، بیکەرو پەیڕەوەکانیان بە نزیکبونەوەی زیاد لە سنور لە ئێستا یان دورکەوتنەوە لێی توشی گوناه بوو بوون؟ ئایا سودیان لە مێژوو بەشێوەیەکی نادروستو زیانبەخش بۆ پارێزگاریکردن لە رێگەچارە دەسەڵاتاویەکان بۆ کێشە هاوچەرخەکان وەرئەگرت؟. ئایا ئیلتیزامی سادەو ساوێلکانەیان بە چەمکی بێلایەنی مێژوو بووە هۆی لاوازبوونو لەناوچوونی تواناکانیان بۆ دەرخستنی کارەساتو کێشەکان، کە لەبەردەمیاندا رائەوەستا؟ هەروەها هەرگیز بەدروستی روون نەبوو کە نەیارانی رێژەگەری بە سەرنجدان لە بەردەوامی هێرشەکانیان بۆ سەر هەڵوێستە فەرمیەکان لە مەسەلە ناوخۆیو دەرەکیەکاندا، بەدوور بن لە ئاراستە وەرگرتنو "دەمارگیریەکانی" تایبەتی خۆیان. ئایا تاکەکان لەکاتی قسەکردن لەبارەی لیستی لێکۆڵینەوەکان لەبارەی "بەرگریکردن لەدنیای ئازاد"، بەڕاستی بەشێوەیەکی پراکتیکیو ئامانجدار کاریان ئەکرد، وەک چۆن زۆرێک لە مێژوونوسان لەکاتی ساڵەکانی سەرەتای جەنگی ساردا بەو شێوەیە کاریان ئەکرد.

بێگومان سەرکەوتن بەسەر یادەوەریدا، ئەیتوانی لەڕێگەی هەوڵو هەنگاوە ئۆرێلیەکانەوە بۆ نوسینەوەی رابردوو لەژێر سێبەری ئێستادا روبدات، بەڵام دەکرا ئەم سەرکەوتنانە لەڕێگەی بابەتگەری رانکەشەوە بەدەست بێت، لەکاتێکدا دەرئەنجامو کاریگەری تێزی ناوبراو جیاکردنەوەی رابردوو لە ئێستاو دروستکردنی دیوارێکی رێگر لەنێوانیاندا و دوابەدوای ئەوەش سنورداركردنی هەڵەکانو تواناکان، بۆ بەراوردکردنی ئەو دوانەو سنورداركردنی یادەوەری بۆ شتێک بوو کە تاکەکەس لەژیانی خۆیدا ئەزمونی کردبوو. بلۆخ گوتبووی کۆمەڵگایەک کە بەتەواوی بەهۆی رابردوی نزیکەوە قاڵبو شکڵی وەرگرتبێت "ئەبێت بونیادێکی ئەوەندە نەرمی هەبێت کە لەرووی کردەوەوە ناجێگیر بێتو هیچ جۆرە ستونێکی فەقەراتی نەبێت". تێگەیشتن لەو خاڵەش کە چۆن ئەم بارودۆخە ناسەقامگیرە ئەیتوانی بەشێوەیەکی رانکەی ببێتە هۆی گەڕانەوەی "برای گەورە"، شتێکی زۆر زەحمەت نیە.

بەمشێوەیە یەکەم پەیامی مێژوونوسی هاوچەرخ، بریتیە لە رێگرتن لە سەرکەوتن بەسەر "یادەوەریدا"، چ ئەم سەرکەوتنانە لەڕێی ئۆرێلەوە ئەنجامبدرێت یان لەڕێی رانکەوە. جێگیرکردنو سەقامگیرکردنی هەڵوێستی خود لە روبەری فراوان، بەڵام نادیاری سەدەی ناوەڕاست کە بێ ریشەیی رێژەگەری لە بێ جوڵەیی بابەتگەری جیا ئەکاتەوە. وتنی ئەم قسەیە لە ئەنجامدانی ئاسانترە، چونکە وەک چۆن مێژووی بیرکردنەوەی مێژوویی بەدرێژای پێنج سەد ساڵی رابردوو بە ئاشکرا ئەیسەلمێنێت، جێپێ پتەوو دڵنیاکان لەمجۆرە روبەرە خلیسکو تەماویانەدا، بەتەواوی ئەتوانێت گۆمڕاکەر بێت.

یەک رێگا بۆ دروستکردنی جێپێیەکی وا، داننانە بەو خاڵەدا کە وتوێژی ئەبستمۆلۆجی (لەڕاستیدا هەمان تەماویبون) لەنێوان لایەنگرانی رێژەگەریو بابەتگەری، پاش ماوەیەکی زۆر ئەڕوات بۆئەوەی رونبینی زیاتر پێشکەش بکاتو سەرنجی کەسەکان بۆ مەسەلەی زانستی وەسفی پیشەیی ببات. واتە بەوردی هێنانەئارای ئەو پرسیارە کە هۆی ئەوە چیە لەلایەک مێژوونوسان تەواو جیاواز لە رۆژنامەنوسەکانو لەلایەکی تر تەواو جیاواز لە مێژوونوسە کلاسیکیەکان کار ئەکەن؟.

رۆژنامەنوسەکان -راستەوخۆ لێردا ئەتوانین هاوپیشەکانیان لە راگەیاندنە ئەلەکترۆنیەکانیش بهێنیەوە-، لەسوربونیاندا لەسەر نوسینی ئەو رواداوانەی رویانداوەو بۆچی رویانداوە، لەگەڵ مێژوونوساندا هاوڕاو هاودەنگن. هەڵسوڕاوانی هەردوو پیشەکە (رۆژنامەنوسو مێژوو)، بابەتەکانی خۆیان بەپێی ئەوەی ئەزانن گرنگە هەڵئەبژێرن، سەرچاوەکان کۆئەکەنەوەو چاوپێکەوتن سازئەکەنو بۆ پێشکەشکردنی دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەکانیان سود لە نەقڵکردنو ریوایەت وەرئەگرن. هەردوو لقەکە سەرنج لە هۆکان، دەرئەنجامەکانو پێشهاتە شیمانەیەکانی روداو و بەسەرهاتە گەورەکان ئەدەن. تەنانەت رەنگە کارەکانیان لە پەیوەندیدا بەو بابەتانەی لێیئەکۆڵنەوە، تێک بئاڵێن. چونکە روژنامەنوسی وا هەیە زۆر بەشێوەیەکی بەرز مێژوو ئەنوسن، مێژوونوسانێکیش هەن کە بە رۆژنامەنوسی زۆرباشو پسپۆر ئەژمێرێن.

بەڵام زوربەی رۆژنامەنوسەکان ئەیانەوێت رووبەری ئەو بابەتەی ئەیانەوێت رومالّی بکەن، لە سەردەمێکی زەمەنی کورتدا بێت. ئەو فشارەی دەرئەنجامی بوونی هێڵی سورە، بێگومان رێگرە لە لێکۆڵینەوەیەکی جدیو قوڵی بابەتەکە، بە مەبەستی ئاشکراکردنی هۆکارە بنەڕەتیو درێژخایەنەکانی. یان رێگرە لە بیرکردنەوەی زیاتر لە دەرئەنجامە درێژخایەنەکانی روداوەکان. تەنانەت گەرچی رەنگە

ڕۆژنامەنوسەکان لەپەیوەندیدا بە بابەت یان بوارێکی تایبەتەوە، لێهاتوی‌و پسپۆریەکی گەورە پەیدابکەن، لەگەڵ ئەوەشدا ناچارن لەبواری پسپۆری ناوبراودا گشتگیر بن، تەنها لەبەر ئەو هۆ سادەیەی کە بەدەگمەن ئەزانن چ شتێک ڕەنگە لە ئایندەدا ڕوبدات، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا واچاوەڕوان ئەکرێت لێیان کە باسی ئەم شتانە بکەن، جا هەرچیەک بێت.

لە بەرامبەر ئەمەدا مێژوونوسی هاوچەرخ ڕوبەروی هیچ هێڵێکی سوور نابێتەوە (جگە لەوانەی کە لەلایەن پەخشکەرانەوە ئەسەپێنرێت، کە بەگشتی ئاسانگیری لە تێبینیکردنی ئەم جۆرە هێڵە سورانەدا دەکەن). مێژوونوسی هاوچەرخ هیچ جۆرە پابەندی‌و ئیلتزامێکی نیە کە ڕەوتی قابیلی پێشبینی نەکردنی ڕوداو و بەسەرهاتە ڕۆژانەییەکان ڕوماڵبکات. مێژوونوسی هاوچەرخ کەمتر لەوەی ڕۆژنامەنوسە میهنیەکان ئەتوانن ئەنجامی بدەن، ئەتوانێت بچێتە ناو وردەکاری پسپۆریانەی شتەکانەوە. قوڵی شیکردنەوە شتێکی مومکینە، تەنانەت ئەگەر هەموو ئەو بەڵگانەی کەسەکە حەز بە بینین‌و لێکۆڵینەوەیان ئەکات، هێشتا لەبەردەستدا نەبن کە بەگشتیش هەروایە. پەروەردەبوون لەناو مێژوودا ئەو ئەگەرو توانایە بە مێژوونوس ئەبەخشێت کە بەئاسانی بتوانێت ڕوداوەکانی دوایی لە پەیوەندیدا بە ڕوداوگەلێکی دی کە لە کات‌و شوێنی دیدا ڕویانداوە، بخاتە ژێر لێکۆڵینەوەوە، لەم ڕێگەیەشەوە دەستی بە ڕوانگەیەکی پراکتیکی بگات کە بە گشتی ڕۆژنامەنوسەکان ناتوانن پێیبگەن یان دەستیان پێبگات. ئەم گۆشەی بینینە بەنۆبەتی خۆی لانیکەمی ئەگەری هەڵسەنگاندنی سەرەتایی بۆ گرنگی مێژوویی ئەو ڕوداوانەی ڕویانداوە ئامادەئەکات، هەر ئەم خاڵەش جیاوازی بنەڕەتی سنوربەندی سەرەکی نێوان ڕۆژنامەنوسی‌و مێژوونوسی پێکئەهێنێت.

بەڵام هاوکێشەیەکی سادە لەبەردەستدا نیە تا بتوانین دیاریبکەین کە چەند ماوە پێویستە تا دەرئەنجامەکانی ڕوداوێک بەپێی پێویست بۆ مێژوونوس بەڵگەنەویست‌و ئاشکرا بن، تا بتوانێت پێش ڕۆژنامەنووس بکەوێت. دواجار ئەوە وەسوەسەی ئێستایە کە دەریئەخات ئایا ئەوەی ئێمە لەرابردووەوە دەستمان ئەکەوێت گرنگی هەیە یان نا، ئەم شتانە دەکرێت بەشێوەیەکی بەرچاو لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دی بگۆڕێن. کۆتایی هاتنی جەنگی سارد نزیکە نیو سەدە پاش کۆتایهاتنی، دوبارە مێژوونوسانی ناچارکردووە هۆکارەکان‌و سەرەتاکانی تاوتوێبکەن‌و هەڵیسەنگێنن. مێژوونوسانی سۆڤیەت بەیەک دەنگ‌و بەیەک ئارەزوو بۆ ماوەی زیاتر لە شەش دەیە، هەڵسەنگاندنێکی پۆزەتیڤیان —لەڕاستیدا تا ئاستی پەرستن_ بۆ لینین هەبوو کە بەڕاستی کۆدەنگیەکی زۆر درێژخایەنە، بەڵام ئێستا بە گرنگیدان بە ڕوداوو بەسەرهاتەکانی ئەم ساڵانەی دوایی، مەراسیمێکی شایستە بۆ لەگۆڕنانی پیرۆزی پێغەمبەرانەی لینینیستی بەرپاکراوە، تەنانەت قسە لەبارەی بەرپاکردنی مەراسیمێکی لەمچەشنە بۆ خودی لینینیش لەئارادایە. بگرە بەرپاکردنی دووسەد هەمین ساڵیادی شۆڕشی فەڕەنسا لە ساڵی ١٩٨٩دا دوور لە هەراو هوریا نەبوو. پاش ئەوەی سەرەک وەزیرانی ئەوسای ئینگلتەرا (تاچەر) بەروشێکینیە بەناوبانگەکەی خۆیەوە، بەڕاشکاوی گوتی: "تیرۆر لەناو کۆمنیستەکانی ئەمڕۆدا دەنگدانەوەیەکی ئاشنای هەیە"، بە هەراو هوریاو فیکە لێدان بۆ قسەکانی بێدەنگیان کرد.

کەوابوو مەسەلە واقعیەکە تەنها ئەوە نیە چۆن کەسێک مێژووی هاوچەرخ لە ڕۆژنامەگەری جیا ئەکاتەوە، بەڵکو مەسەلەکە بەشێوەیەکی سەرەکی ئەوەیە چۆن ئەم مێژووە لە سەرجەم پەیکەری

خودی مێژوو جیا ئەکاتەوە. پێشتر بینیمان بیرۆکەی مێژووی هاوچەرخ —پێکەوەبەستنی ئێستاو رابردوو پێکەوە—، لەڕاستیدا زۆر کۆنترە لەم دیدە کە ئەبێت مێژوونوسان شێوەی هەڵسوکەوتو تێڕوانینی خۆیان بۆ رابردوو، لە وەسوەسەو تێبینیە ئێستاگەریەکان جیابکەنەوە. بێگومان ئەگەر بڕیارە مێژوونوسی هاوچەرخ دەستی لە دەرهێنانی "وانەکانی" رابردووو ئەنجامدانی بەراوردکردنو لێکچوندا کراوە بێت، ئەوا لەم حاڵەتەدا سنوردارکردنی ئەم کارە تەنها بە قۆناغەکانی پاش ١٩٤٥، یان ١٩١٨، یان ١٩٠١ دوو جار کارێکی زۆر دروستکراو و تەسەنوعی ئەبێت. هەروەها سنوردارکردنی مێژووی هاوچەرخ بۆ ئەو شتانەی کە لە سەردەمی ژیانی کەسەکەدا روئەدات، هیچ هاوکاریەک ناکات. هەر مامۆستایەکی میانساڵ ئەگەر لە پۆلی وانەکەیدا، ئاماژە بۆ ئەو روداوو بەسەرهاتانە بکات "کە هەمووومان لەبیرمانە" وەک وداستاک، یا ویلایەتی کۆنت، یان ریسوایی واترگێت، تەنها بە بینینی سەرسوڕمانو سەیرکردنە ناباوەڕیەکانی خوێندکارەکانی (کە لەکاتی ئەو روداوانەدا هێشتا لەدایک نەبوو بوون)، راستەوخۆ لە نەگونجانو بێکەڵکی ئەم پێناسەیە ئەگات.

جفری باراکلاگی مێژوونوس– کە خۆی لە پێشڕەوەکانی بەرجەستی بواری مێژووی هاوچەرخە–، بەهێنانەئارای ئەم خاڵە سادەیە کە: "مێژوونوسی کلاسیکی بەگشتی کاری خۆی بە پارچەیەکی رابردوو دەست پێئەکاتو روو لە ئێستاو پێشەوە ئەکات، لەکاتێکدا مێژوونوسی هاوچەرخ پێچەوانەی ئەم رەوتە ئەگرێتە بەر، لەئێستاوە دەست پێئەکاتو کار لەسەر رابردوو ئەکات"، گرنگترین جیاوازی نێوان مێژووی هاوچەرخو مێژووەکانی تر جیائەکاتەوە. باراکلاگ ئەو ئەنجامگیریە ئەکات کە هەردوو مێژوونوسی (هاوچەرخو کلاسیکی) "یەک روبەری رابردوو تاوتوێ ئەکەن، بەڵام بەئامانجی جیاوازەوە لەناو زیهنداو پێوەری هەڵسەنگاندنی جیاوازەوە".

بێگومان ماوەیەکی درێژە مێژوونوسان بەتەواوی ئەو بەڵگاندنانەیان نەفیکردووە کە "ئەوەی ئێمە لە رابردوودا بە شایەنی گرنگی پێدانی ئەزانین، لەژێر کاریگەری ئێستادایە": کێشەکە بەئەندازەی پێویست روونو بەدیهیە بەشێوەیەک کە تەنانەت بابەتیگەریترین مێژوونوسانیش رەنگە بیسەلمێنن، بەڵام مێژوونوسانی کلاسیکی لەبارەی ئەو مەسەلە سەرەکیەوە کە ئایا کاری بەستنەوەی رابردوو بەئێستاوە ئەبێت بە یەک ئاراستە بجولێت یان بە دوو ئاراستەی جیاواز، بەردەوام دودڵبوونو ئێستاش هەن. ئایا بابەتی مێژوو تەنها ئەبێت دەستپێکردن بێت لە پارچەیەکی رابردووەوە و جوڵە بەرەو ئایندەو سەلماندنی ئەو خاڵە کە پێگەو جێگەی مێژوونوس لە ئێستادا، تارادەیەک دەستنیشانکەری بابەتی هەڵبژێرراو شێوەو ئامێرەکانی لە لێکۆڵینەوەکاندا بەکاردێنو دەرئەنجامە بەدەستهاتووەکانە؟ ئایا مێژوونوس ئەبێت دان بەوەدا بنێت کە تێبینیو وەسوەسەکانی هاوچەرخ، خاڵی دەستپێکردنی شیکردنەوەی کەسەکەن، ئەوەش کە سودوەرگرتن لە رابردوو بۆ رونکردنەوەی ئێستا، رێک بەئەندازەی رەوتی کلاسیکی تر رونکردنەوە کە بەئاراستەیەکی تردا ئەڕوات، گرنگی هەیە؟.

مێژوونوسانی هاوچەرخ لەبارەی ئەم خاڵەوە دوودڵ نین یان نابێت دوودڵ بن. سەلماندنی راشکاوانەیان لەو پرسە کە مێژوو ئەتوانێت تێگەیشتنو تێڕوانینی ئێمە بۆ ئێستا دەوڵەمەندتر بکات، شتێکە کە لەمێژوونوسانی کلاسیکی تر جیایان ئەکاتەوە، بەیەک رستە مێژوونوسانی هاوچەرخ "ئێستاگەرنو بەمەش ئەنازن".

باشه ئەمە ڕێژەگەریە؟ بەڵێ، ئەڵبەتە تا ئەو جێگەیەی سەرجەم مێژوو "پەیوەندی" بە مێژوونوسێکەوە هەبێت کە ئەینوسێتەوە. بیرۆکەی جیاکردنەوەی مێژوو لە مێژوونوس-شتێک کە بابەتگەری بانگەشەی بۆ ئەکات-شتێکی بەتەواوی نەکردەیە، بەڵام ڕێژەگەری شێوەی بەرپرسیارانەو نابەرپرسیارانەی هەیە، ئەگەری نزیکبونەوە (گەرچی تەنها نزیکبونەوە) لە پێوەرە بابەتگەریەکان لە چوارچێوەی جۆرێک ڕێژەگەریدا هەیە کە واقع بەسەر هەموماندا ئەیسەپێنێت. ڕێگەی ئەنجامدانی ئەم کارە ناسینی جیاوازی لەنێوان سودوەرگرتن لە ئێستاگەری بۆ کردنی پرسیارو پێشکەشکردنی وەڵامەکانە. ڕێگەدان بەوەی وەسوەسەو تێبینیە هاوچەرخەکان ئێملای کۆمەڵێک پرسیار بکەن کە مرۆڤ لە ڕابردووی ئەپرسێت شتێکە -کە شتێکە بەتەواوی قابیلی قەبوڵکردنە- و ئەوەی وەسوەسە تێبینیە ئێستاگەریەکان وەڵامەکان دیاریبکەن، بەتەواوی شتێکی ترە کە لە ڕوانگەی هەر مێژوونوسێکی بەرپرسیارەوە قابیلی قەبوڵکردن نیە.

بەڵام ناسینی ڕابردوو چۆن ئەتوانێت ببێتە هۆی دەوڵەمەندبوونی تێگەیشتنی ئێمە بۆ ئێستا؟ ڕەنگە کەسانێک کە مێژوو ئەنوسن یان وەک وانە ئەڵێنەوە، لەبەرئەوە بێئەندازە ئاگادارن لەو مەترسیانەی دەرئەنجامی بەکارهێنانی مێژووە لە خزمەتی ئامانجو مەبەستەکانی هەنوکەدا، هەروەها ڕەنگە لەبەرئەوەی بەگشتی لە تێبینیە مەنهەجیەکان غافڵن، لەبەرئەوە زۆرجار حەز بە دیاریکردنی هۆکارە پێویستەکانی لێکۆڵینەوەی مێژوو ناکەن. خوێنەری بەرهەمەکانیانو خوێندزانان ئەبێت خۆیان ئەمە بدۆزنەوە. دەیڤید هکیت فیشەری ڕەخنەگر ناوردو مامۆستای پێشووی "هارمزۆرس" کاتێک گلەیی لە هاوکارە مێژوونوسەکانی ئەکات کە "ئەگەر داوایان لێبکەین ماهیەتی مێژوو ڕونبکەنەوە، ئامادەن وەک فەتس ڤالەر (یان ڕەنگە وەک بولا ئەرمسترانگ) وەڵام بەنەوە کە کاتێک لەبارەی مۆسیقای جازەوە پرسیاریان لێکرد، وەڵامی دایەوە: "هێی ئەگەر نازانی ئەوە چیە، کەوابوو واز لە فزوڵی بێنە"، لەبارەی ئەم دۆخەوە زۆر زیادەڕەوی نەکردووە.

هەڵوێستی فەتس ڤالەر/ لوی ئەرمسترانگ، جازبیەتی خۆی هەیە. هەر مێژوونوسێک، ئەبێتە شێوازناسی خۆی کە بێگومان مەسەلەکان سادە ئەکاتەوە، بەڵام تێکئالانی هەستە پڕ سۆزەکان کە بەو شێوە باشە لە مۆسیقای جازدا کار ئەکات، لەمێژوودا ئەتوانێت مرۆڤ توشی هەڵوێستی وابکات کە وەک ئەو هەڵوێستانەی دەرئەنجامی یەقینی ڕەهان مەترسیئامێز بێت. ڕابردوو بە وردەکاریە بێسنورەکانیەوە بۆ پشت سەری ئێمە پاشەکشێ ئەکات، واتە بە یارمەتی تواناو هێزی خەیاڵی مێژوونوس، ئەتوانێت هۆو پاساوی بێسنور بۆ ژمارەیەکی بێسنوری ئەو هەڵوێستانە بێنێتەوە کە پەیوەندیان بە مەسەلەکانی هەنوکەو ئایندەوە هەیە. مرۆڤ ئەتوانێت لەهەر شوێنو بەگشتی لەگەڵ هەر ئەنجامێکیشدا دەست بە پەدیعیسازی بکات، بەبێ دیاریکردنی دروستی ئەوەی کە چاوەڕێی چ کارێک لە خودهوشیاری مێژوویی ئەکەین. ئەمجۆرە ئەزمونو تاقیکردنەوەیە —لەبەرئەوەی بێئامانجە، دواجار ئەگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو و ڕێگە لەوە ئەگرێت کە ئێستا دیاریکەری پرسیارو وەڵامەکان بێت. لەبەرئەوە خاڵی گرنگ بۆ مێژوونوسی هاوچەرخ -لەڕاستیدا بۆ هەر مێژوونوسێکی تر-، ئەوەیە کە تاچ سنورێک ئەتوانرێت دیدێکی ئاشکراو ڕوونی بۆ ئامانج و مەبەستی لێکۆڵینەوەی مێژوو هەبێت.

بابەتەکە بەسادەترین شێوەی مومکین دەرئەبڕم" مێژوو ئەبێتە هۆی فراوانبوونو دەوڵەمەندبوونی

ئەزمون". بێجگە لە شتە تازە لەدایکبوەکان کە بەدەگمەن داوایان لێئەکرێت لە روداوێکدا دەست بە بڕیاردانی کاریگەر بکەن، هیچ یەک لە ئێمە بەبێ ڕێکخستنی ئەزمونەکانی رابردوو، روبەروی ئێستا نابینەوە. هەموو ئێمە پێشتر روبەروی کێشەو گرفت بوینەتەوە، جگە لەو حاڵەتانەی توشی فەراموشی زیاد لەسنور بوین، شتگەلێکیان بۆ شێوەی هەڵسوکەوتکردنی سەرکەوتوانە یان ناسەرکەوتوانەی خۆمان لەبەرامبەر ئەو کێشانەدا بیر ئەکەوێتەوە. وانە لەم ئەزمونو یادەوریانەوە وەرئەگرین و لەئەنجامدا (ئەڵبەتە نەک بێگومان)، عاقڵانەتر لە رابردوو و بە دیدێکی باشترەوە روبەڕوی ئەبینەوە. بەگشتی کەڵەکەبوونی ئەزمون ئەبێتە هۆی زیادبوونی لێهاتویی‌و پیشەییبون لە بوارگەلێکی بۆ نمونە وەک وەرزشدا ئەبێت، ئیدی بۆچی نابێت ئەمە لە بوارە مرۆییەکانیشدا رووبدات؟

بەمشێوەیە پڕ ئاشکرایە کە ئەگەر بمانەوێت دامێنی ئەزمونەکانی خۆمان سەروتر لەوەی وەکو تاک روبەڕوی بوینەتەوە پەرەپێبدەین، ئەگەر بتوانین دەستمان بە ئەزمونی کەسانێکی دی بگات کە لە رابردودا روبەروی هەلومەرجو دۆخی هاوشێوە بونەتەوە، لەم حاڵەتدا شانسی ئێمە بۆ هەڵسوکەوتی عاقڵانە بەشێوەیەکی بەرچاو زیاد ئەکات. ئیدوارد هالکار سەردەمێک ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە رەنگە بەمیراتی وەرگرتنی خەسڵەتە وەرگیراوەکان لە بایەلۆژیادا جێگەیەکی نەبێت، بەڵام خودهوشیاری مێژوویی ئەبێتە هۆی ئەوەی بەمیرات هێشتنەوە ئەزمونە کەڵەکەبوەکان لە ژیانی ئێمەدا دەوری هەبێت (ئەگەرچی کەم)، "مێژوو بریتیە لە پێشکەوتن لەرێگەی گواستنەوەی لێهاتوویە وەرگیراوەکان لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر".

بەڵام لێکۆڵینەوەی مێژوو چۆن ئەتوانێت خزمەتی ئەم پرۆسەی گواستنەوەیە بکات؟ بەبڕوای من سەرەتا لەرێگەی یارمەتیدانی سەرکەوتن بەسەر پێکهاتەی ناهاوڕەنگی نەزانی‌و خود تەوەرەیی کە هەمومان پێوەی لەدایک ئەبین. پەرەسەندنو کامڵبوون تارادەیەکی زۆر دەرچونە لەم دۆخە. ئێمە لە هەستو کارتێکردنە حسیەکاندا غەرق ئەبین، هەرچەندیش بەردەوام بین لەم کارەدا، خۆمان لە ناوەندی جیهان دورتر ئەخەینەوە. دروستکردنی شوناس بەشێوەیەکی ناکۆکیئامێز پێویستی بە داننان بە هیچی‌و بچوکی رێژەیی ئێمە لە شوێن و کاتدایە، خودهوشیاری مێژوویی جێگەیەکی کەم بۆ دودڵی لەمبارەیەوە ئەهێڵێتەوە. ج. ئار. ئاڵتۆن بڕوایوایە "حەزی سروشتی قۆناغی کامڵبوونو لاوێتی بریتیە لە پەیوەستکردنی جیهان بەخودەوە، نەک پەیوەستکردنی خود بە جیهانەوە". مێژوو "وەک دژە ژەهرێکی بەهێز لەبەرامبەر ئەو بڕوایەدا بەتوندی کار ئەکات کە دەکرێت سەرجەم کێشەو گرفتەکان بەهۆی پێشداوەری، دۆگمەکانو گریمانە لەپێشەوە دیاریکراوەکانەوە کە لاوانی تازە هوشیار بوو، بەڕاستی ئەبەدی ئەزانن، چارەسەر بکرێت". مێژوو " چاکسازیەکان، جێبەجێکردنەکانو ئەو دیدانە فێر ئەکات کە یارمەتی لاوان ئەدات بۆئەوەی گەورە بن، ئەمەش بێگومان خزمەتێکی گەورەیە بە پەروەردەکردنی لاوان".

بەڵام تەنها لاوان نین کە کۆیلەی پێنەگەیشتنو ناکامڵبوونن. گەورەکانیش بەباشی ئامادەیی ئەوەیان تێدایە، تەنانەت پاش گەیشتن بە بەرپرسیارێتی‌و پۆستی گرنگو هەستیار، گروپەکان، نەتەوەکانو تەنانەت رێکخراوە نێودەوڵەتیەکان، لەهەر سەردەمێکدا ئەتوانن نەخوێندەواری‌و خود سەنتەریزم تێکئاڵێنن، هاوتەریب بە خێرابوونی ئاهەنگی گۆڕان لەژیانی مۆدێرندا، بەهەمان رێژە

مەیل بۆ خود سەنتەریو رەفتارو حاڵاتی لاوێتی زیاد ئەکات. جۆرج.ئیف.کنان بڕوایوایە "هەر سەردەمە یان هەر نەوەیەک خۆی بە گرنگترین سەردەم یان نەوە ئەزانێت کە تائێستا جیهان بەخۆیەوە بینیوێتی. تەنها خوێندنەوەی مێژوو ئەتوانێت، دەرەقەتی ئەم بەرزەفرینانەو خەیاڵە پوچە پرۆمیسۆسیانە بێت کە لەم مەیلەوە هەڵئەقوڵێن. تەنها ئەوە مێژووە ئەتوانێت ماهیەتی مرۆڤ بەوشێوەیەی لەپێگە سادەو سروشتیەکاندا ئاشکرا ئەبێت نمایشبکات، ئەو پێگانەی کە تیایاندا ئەوەی بە بنەڕەتی ئەژمێررا، کەمتر لەژێر کاریگەری شتە دروستکراوەکاندا شارا بۆوە".

رێگەیەکی دوهەم کە زانستی مێژوو ئەتوانێت ئەزمونە وەرگیراوەکان بگوێزیتەوە، سەروکاری لەگەڵ شتێکدایە کە دەکرێت ناوی بنێین هێزەکانی "جێگۆڕینەوە" لە مەسەلە جیهانیەکاندا. دەبێت ئەو خاڵەمان لەبەرچاو بێت کە دنیای مادی پڕ لەو پرۆسانەیە کە لەدەرەوەی تێگەیشتنی ئاسایی ئێمەوەن. ئەم پرۆسانە رەنگە لە پێوەرێکی زەمەنی جیاواز لەوەی خومان پێوە گرتووە کاربکەن، بەشێوەیەک کە کاریگەریەکانی ئەوەندە خێرا رووئەدەن (فیزیایی کوانتۆم) یان ئەوەندە خاو (وەک هەڵبژاردنی سروشتی) کە تێبینیان ناکەین. ئەم پرۆسانە رەنگە لەجێگەیەگی سەرو سەری ئێمەوە روبدەن (وەک ئەو پرۆسانەی ئالوگۆڕی هەواو گۆڕانەکانی سیستەمی ئاووهەوا دیاری ئەکەن)، یان رێک لەژێر پێماندا روبدەن (وەک ئەو پرۆسانەی دەبنە هۆی جوڵەو جێگۆڕکێی کیشوەرەکان). ئەو سنوردارێتیە شوێنو زەمەنیەی کە لەچوارچێوەیاندا کارئەکەین ، زروبەری جار بۆ پاساوهێنانەوەو هۆکانی هەموو ئەو شتانەی کار لەژیانمان ئەکەن نەگونجاوون. هەر لەبەرئەمە لەبینیی دوبارەو فرەیی رودانی روداوەکان —لانیکەم لەدنیای مادیدا— توشی سەرسوڕمان ئەبین.

دیاردەکان لەدنیای پەیوەنیدار بە مەسەلە مرۆییەکانەوە، هێندە لەیەک جیاواز نین. ئەوان هێزگەلێکن کە بەشێوەیەکی درێژخایەن لەکاردانو دەتوانن بە قووڵی کار لەسەر ژیانی ئێمە بکەن. ئاراستەو روداوەکانی خەڵکناسی، داهێنانە نوێکانی تەکنەلۆژیا، نمونە گۆڕاوەکانی دەزگا کۆمەڵایەتیو سیاسیەکان، گۆڕانو گۆرانکاری لە دۆخی ئاوو هەوادا، تەنانەت سوڕانی خۆپاراستن لەبەردەم نەخۆشیدا. لەگەڵ ئەمەشدا لەبەرئەوەی لە ئاستێکدا رووئەدەن کە هاوشێوەی روداوە رۆژانەیەکانن، لەبەرئەوە دەرئەنجامەکانیان تەنها لە رەوتێکی رابردوگەریانەو بەئاوڕدانەوە لە رابردوو دەرئەکەوێت. کارل مارکس کە شیکەرەوەی مەزنی هێز جێگۆڕکێکان بوو، سەردەمێک رایگەیاند: "مرۆڤەکان مێژووی خۆیان دروستئەکەن، بەڵام نەک بەو شێوەیەی کە ئارەزوی ئەکەن، مرۆڤەکان مێژوو لەو هەلومەرجو بارودۆخانەدا دروستناکەن کە خۆیان هەڵیانبژاردووە، بەڵکو راستەوخۆ لەو هەلومەرجو بارودۆخانەوە کە لە رابردوەوە وەریانگرتووەو پەیدایان کردووەو گواستویانەتەوە." فرناند برۆدێل کە یەکێکە لە بەرجەستەترین قوتابیانی مارک بلۆخ رایگەیاندبوو "ئەو کەسەی تەنها خەریکی لێکۆڵینەوەی رابردووی نزیکە، بەردەوام چاوەکانی لەسەر شەوقی ئەو شتانە رائەوەستێت کە یان خێرا تێئەپەڕن یان باقو بریقەوە ئەدرۆشێنەوە: لە گۆڕانو گۆڕانکاری لەپڕو ناکاو، هەراوهوریای زۆر، یان بەدەرکەوتنی دیار". بەڵام ئایا "تێگەیشتنو حاڵیبوون لەو خاڵە شتێکی زۆر گرنکو حەیاتی نیە کە ئەوەی مرۆڤ شایەتێتی دەرکەوتنی بزوتنەوەیەکی تازەیە، کۆتایهاتنی بزوتنەوەیەکی کۆن، دەنگدانەوەی رابردویەکی زۆر دوور، یان دیاردەیەک کە لەسەر یەک ریتم دوبارە ئەبێتەوە؟" تەنها لەرێگەی خوێندنەوەی روداوە درێژخایەنەکانەوە –روداوگەلێک کە بەتەواوی لە درێژی تەمەنی تاکێک

سەرتر ئەڕۆن-، دەكرێت لە ماناو چەمكی ئەم پرۆسانەو شێوەی كاریگەریان لەئێستاو ئایندە بگەین.

شێوازێكی سێهەم كە مێژوو لەرێگەیەوە ئەزمونە كەڵەكەبوەكان ئەگوێزێتەوە، ئەگەڕێتەوە بۆ ماهیەتی روداوو، ئەگەری رووداو. چونكە سەرەڕای بوونی هێزە جێگۆڕكیەكان، مێژوو تەنها رەوتێكی دەرئەنجامی كاریگەریەكانی ئەم هێزانە نیە، لەمێژوودا بەر ئەو روداوو بەسەرهاتە ناكاوانە -دیارە قابیلی پێشبینی نەكردنیش- ئەكەوێن، هوشیاربوونیش بە بوونی ئەم روداوانە ئەو خەیاڵە راستئەكاتەوە كە تەنها یەك رێگە بۆ چارەسەر هەیە ئەوەش كە شتەكان تەنها بەو شێوەیەی رویانداوە، ئەتوانن روبدەن. هیچ پێكهاتەیەكی هێزە جێگۆڕكێكان ناتوانێت پاساو هۆكار بۆ ئەو راستیە بهێنێتەوە كە لێخوڕی ئوتۆمبیلی ئارشۆدۆك فرانسیس فردیناند، لە مێژووی ٢٨ی تەمموزی ١٩١٤ لە سارایڤۆ بە پێچكردنەوەی هەڵە لە شەقامەكەدا، بووە هۆی ئەوەی ئارشۆدك بكەوێتە بەردەستی بكوژە نائومێدەكەی كە كەمێك پێشتر هەلی تیرۆركردنی لەدەستدابوو، دوا بەدوای ئەوەش زنجیرەیەك روداو رویدا كە دواتر بووە هۆی روداني جەنگی جیهانی یەكەم. یان بە دەربڕینی ئارتۆر شلزینگەر تەنانەت وتەكانی بەرجەستەترین غەیبگۆی برهمایی لە ساڵی ١٩٤٠ كە گوتبووی سێ سەركۆماری داهاتوی ئەمەریكا بریتی ئەبن لەمانە: "سیناتۆرێكی گومناوی ئەنجومەنی یاسادانان لە ویلایەتی میسوری...ئەفسەرێكی دوهەمی نەناسراو لە لەشكری ویلایەتە یەكگرتوەكان...گەنجێك كە هێشتا خوێندزانی كۆلێجە"، هیچ پاساو هۆیەكی لۆژیكی نیە.

كێشەی سەرەكی تیورەسازان ئەوەیە نازانن چۆن هەڵسوكەوت لەگەڵ مەسەلەی روداو یان ئەگەری روداودا بكەن، بەوردی لەبەرئەوەی ئەم مەسەلەیە بەدەگمەن لەگەڵ شیكردنەوە گەورەكاندا دێتەوە. هەرگیز ناتوانرێت بزانرێت روداو یان بەسەرهاتێك یان روداوێكی ناكاو، یان یەكگرتنەوەو هاوكاتی دوو روداوی تەواو بێ پەیوەندی، چ كاتێك دەرئەنجامی چاوەڕواننەكراو دروستئەكات، بەڵام مێژوونوسان ئەزانن ژیان بەو شێوەیەیە. ئێمە لەرێگەی زنجیرەیەك ئەگەرو روداو كە قابیلی روداندن كە هەنوكە جێگیر، بێجوڵەو قابیلی سود لێوەرگرتن نین، بە زەمەنی ئێستا گەیشتوین، بەڵام ئەمە تاكە رێگەیەك نیە كە ئێمە توانیومانە لەرێگەیانەوە بە ئێستا بگەین (گەرچی ئەم ئێستایە رەنگ بوو ئێستایەكی تەواو جیاواز بێت، ئێمەش رەنگ بوو تەواو جیاواز بوینایە). بونی ئەگەرەكانو ئەو روداوانەی ئەشیا رویانبدایە لە زەمەندا، هەمان ئەو شتەیە ئێستا لە ئایندەو رابردوو جیا ئەكاتەوە. كەسێكیش كە ئەم راستیە لەبەرچاو ناگرێت -كەسێك كە هەوڵئەدات لە دەرەوەی مێژووو بێ رەچاوكردنی، تەنها خەریكی نوسینی هەڵەكانو هەلومەرجەكانی دەوروبەرو پێگەكان بێت-، نەك هەر ئەبێتە هۆی تێكەڵكردنو شێوانی ئەو بابەتە، بەڵكو ئەو كەسانەش كە ئەیانەوێت شتێكی لێوە فێربن، لەبەرامبەر یەكێك لە هەڵوێستە سەرەكیەكانی ژیانیاندا لە هەلومەرجێكی زۆر خراپدا دائەنێت و هەموو جۆرە ئامادەییەكی پێویستیان بۆ ئەم كارە لێوەرئەگرێت.

دواجار مێژوو بە پیشاندانی شێوەی تێكەڵبوون، یەكگرتنو هاوكاتی رەفتارو كرداری مرۆڤەكان، هێزە جێگۆڕكێكانو روداني يان ئەگەری رودانیان بەیەكەوە، ئەبێتە هۆی گواستنەوەی ئەزمونەكان. وەك ماركس بە وردی رایگەیاند (پەیڕەوەكانی ماركس هەمیشە بەدوای نمونەكەی ئەودا نەچوون)، تاكەكان مێژووی خۆیان دروستئەكەن. ژیانی ئەوان بەتەواوی لەلایەن هێزە جێگۆڕكێكانەوە، یان

بەهۆی هەلومەرجو دۆخە ناکاوەکانەوەی دیاری ناکرێت. لەبەرئەوە تێگەیشتن لەو خاڵەی کرداری مرۆیی لەکوێدا ئەتوانێت کاریگەر بێتو لە کوێ ناتوانێت، بە جیاکاری لەنێوان ئەوەی مرۆڤ ئەتوانێت بیگۆڕێتو ئەوەی دەبێت قەبوڵیبکات، خاڵێکی یەکجار پێویستە. ناچاریو هەڵبژاردن (جەبرو ئیختیار) لە ناوەڕۆکە یەکجار کۆنەکانن لە مێژوودا. خۆ ئەو راستیەش کە مێژوونوسان بەدەگمەن ناکۆکیەکانی نێوان خۆیان چاکئەکەن، ئەم لقە ئەکات بە واقعیترین رێنمایکەر کە لەبەردەستماندایە. گەرچی وەک هەمیشە زامنکەری شتێک نیە، بەتایبەتی کاتێک ئەبێت لەنێوان هەنگاونان بۆ کردارو وازهێنان لە هەنگاونان بۆ کردار، دەست بە هەڵبژاردن بکەین.

لەم روانگەیەوە وتوێژەکانی سەبارەت بە "رێژەگەری"و "بابەتگەری" کە بەسەر زۆرێک لە بەڵگاندنەکانی لەبارەی مێژووەوە هەیە بالادەستن، بێئەندازە نابەجێ دەرئەکەون. لەو رووەوە کە هەمووەمان بابەتگەرین —یان ئەبێن ببین— کاتێک بەپێی فاکتە مێژووییەکان لەئارادایە، تاڕادەیەک ئەتوانین هەڵیانسەنگێنین. ئێمە بەدەگمەن لەبارەی زەمەنی روداوە گەورەکانەوە، یان لەبارەی ژمارەی ساڵەکانی ژیانی تاکە گەورەکانەوە، جیاوازی بیروبۆچونمان هەیە. ئەبێت قەبوڵیبکەین کە تاعون یان مەرگی رەش نزیک یەک لەسەر سێی سەرژمێری ئەوروپای سەدەی چواردەهەمی لەناوبرد، یان ئەو خاڵەی کە ئاو و هەوا بەدرێژای سەدەی شانزەهەم تا هەژدەهەم چەندانجار ساردتر لە ئەمڕۆ بوو، شۆڕشێکی پیشەسازی مەزن رویدا. ئەمڕۆ رۆیشتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر خێراتر لە رابردوو روئەدات، دواجار ئەوەی کە چەکداری سەربازی کارەساتو وێرانیەکی چەندانجار گەورەتر لەرابردوو بەرهەمدێنێت. هەموو ئەمانە بەهێزی جێگۆڕکێو دیارە زەمەنیو مێژووییەکان ئەژمێرێن. ئەمانە شتگەلێکن کە ئەتوانین بەپێی ئەو پێوەرانەی بەگشتی هەموو قەبوڵمانە، هەڵیانسەنگێنین.

بەڵام کاتێک شتە تایبەتیو وردەکانی مرۆڤەکان لەئارادایە، هەمووەمان "رێژەگەرین"، دیارە ئەگەر لەگەڵ خۆماندا راستگۆ بین. هەر تاکێک بونەوەرێکی تایبەتو ناوازەیە، بەشێوەی جیاواز شوناس بۆخۆی دروستئەکات، بە نەیارێتی و راوەستان لە بەرامبەر پێشبینیە بان زەمەنیەکان، وەڵامی مەسەلەی روداو ئەداتەوە. هیچ پێوەرێکی گشتیو قابیلی قەبوڵکردن لەلایەن هەموانەوە بۆ هەڵسەنگاندنی کەسایەتی، سروشت، رەفتار، شەهامەت، ئازایەتی، یان ترسنۆکی یان تەنانەت هۆشو زیرەکی بوونی نیە. بلۆخ لەمبارەیەوە ئەنوسێت: "کارو کردارە مرۆییەکان دیاردەی زۆر ناسکو هەستیارن، بەشێوەیەک کە زۆرێک لە رەهەندەکانی، حسابە ماتماتیکە وردەکان تێک ئەدات. کاتێکیش حسابکردنی ماتماتک ئاسایانە مومکین نەبێت، لەم حاڵەتەدا ئەبێت یارمەتی لە دەربڕینو ئاماژە شاراوەکان وەربگرین. لەنێوان فاکتە مادیەکانو فاکتە مرۆییەکاندا هەرئەوەندە جیاوازی هەیە کە لەنێوان ئەرکی کەسێک کە بە درێل هەڵکەنن ئەکات، لەگەڵ ئەرکی دروستکەری ئامێرێکی مۆسیقی (دروستکردنی عود) هەیە. هەردوکیان سەروکاریان لەگەڵ وردەکاری تا ئاستی میلی متردا هەیە، بەڵام هەڵکەنن بە ئامرازێکی ورد ئەکات، لەکاتێکدا ئامرازی کار و رێنمایکەری دروستکەری عود هەستیاریەتی لەبەردەم دەنگو لەمسدا. هەڵکەنەر ناتوانێت سود لە شێوازە هەستیو ئەزمونیەکانی دروستکەری عود وەربگرێت، ئەمیش ناتوانێت سود لە شێوەکانی هەڵکەنەر وەربگرێت".

هەم ئەو کەسانەی سەروکاریان لەگەڵ درێڵو ئامێرو ئامرازی وردی هەڵکەندندا هەیەو هەم دروستکەرانو لێدەرانی عود، هەرەیەکەیان بە نۆبەتی خۆیان جێگەیەکیان لە بەکارهێنانی مێژوودا هەیە . ئەگەر بتوانین سەرەڕای داننان بە دروستی هەریەکێکیان لەیەکیان جیابکەینەوە، لەم حاڵەتەدا لە چارەسەری کێشەی بێبەرهەمی نێوان بابەتگەرو رێژەگەرەکاندا پێشکەوتنێکی گەورەمان ئەبێت، هەروەها بەئاراستەی دۆزینەوەی زەمینەیەکی پایەدار و بنەمایەکی دڵنیا کە بەپێی ئەو زەمینەو بنەمایە سود لە رابردوو بۆ رونکردنەوەی ئێستا وەربگرین.

بەمشێوەیە چاوەڕوانیەکانی ئێمە لەمێژووی هاوچەرخ ئەوەیە کە دامێنی ئەزمونەکان، بواری گەڕانو روبەری لێکۆڵینەوەکان بەشێوەیەک پەرەپێبدات، کە ئێمە بتوانین باسکردنی ئێستاو پێشبینیکردنی ئایندەی بخەینە ناوەوە . چاوەڕوانی ئێمە ئەوەیە مێژووی هاوچەرخ لەڕێگەی گواستنەوەی ئەزمونەکانی کەسانی ترەوە لە ڕابردودا، لەکاتی روبەڕوبونەوەو دەستو پەنجە نەرمکردنیان لەگەڵ کێشەکانی وەک شوناس، جێگۆڕکێکان، گۆڕانو گۆڕانکاریەکان، روداوەکانو کرداری دولایەنەیان، ئەم پەیامە ترسناکە بە ئەنجام بگەیەنێت. چاوەڕوانیمان ئەوەیە مێژووی هاوچەرخ ئەم زانیاریانە بەشێوەیەکی وردو رونو شیکاری و بە سەیرکردنی کارەکانیانو سودە پراکتیکیەکانیان، ئامادە بکاتو بیخاتە بەردەستمان. دەبێ هەموو ئەم شتانە بەبێ سازشکردن یان رەچاوکردنی بەرژەوەندی پێشەیی یان لۆژیکی بەئەنجام بگەیەنرێت، دەبێت خۆی لە هەموو جۆرە زیادەڕەوی و لافلێدانێک بەدوور بگرێت، چونکە کاری هەموو مێژوونوسانو بەتایبەتی مێژوونوسانی هاوچەرخ، بەردەوام لەبەردەم پیاچونەوەو رەخنەگرتنو وردبونەوەدایە . ئەکرێت جوانترین دەربڕینی ئەم خاڵە لە وتەکانی بلۆخدا ببینین، کاتێک خۆی نەک وەک فەیلەسوفێک، بەڵکو وەک "پیشەوەرێک وەسفئەکرد کە بەردەوام حەزی ئەکرد لە ئەنجامدانی کاری رۆژانەی خۆیدا، وەک کرێکارێکی پسپۆر بێت کە ماوەیەکی زۆر سەروکاری لەگەڵ راستەهێڵو تەرازوکردندایە، بەبێ ئەوەی خۆی بە ماتماتیکزان بزانێت".

## سەرچاوە:

فلسفه تاریخ

روش شناسی و تاریخ نگاری

ترجمه و تدوین: حسین علی نوزری –تهران، طرحی نو، ١٣٧٩.

# "فێرنان برۆدێل" و قوتابخانەی (مێژووی نوێ)

د. مەسعود ضاهر
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

لە بەراییەکانی سەدەی بیستەمدا، زانستە مرۆڤایەتیەکان لە ئەوروپا، ئەو ڕێنسانسە هەمە لایەنەی تەواو دەکرد کە لە سەدەس نۆزدەهەمەوە دەستی پێکرد و لە ڕێی لێکۆڵینەوەگەلێکی قوڵ و وردەوە کە مرۆڤی کردبووە چەقی خولیاکانی، گەشەی دەکرد و بەرەو پێش دەچوو.

سەرەڕای فرەیی پۆلێنکاری لەم بوارەدا، وەک: (مێژوو، جوگرافیا، کۆمەڵناسی، ئابوری و ...هتد)، بەڵام لێکۆڵیارانی کایەی زانستە مرۆڤایەتیەکان، جەختیان لەسەر پێکەوە گرێدانی تەواوی ئەم زانستانە دەکردەوە، لە چوارچێوەی تاکە زانستێکدا کە ئەویش زانستی مرۆڤ بوو.

نوسین و بەرهەمەکانی جیوگرافیناسی ئەڵەمانی "فردریک ڕاتزل – friedrich Ratzel" و هەردوو زانای فەرەنسی "لوسیان فیڤەر – Lucuien febre" و "مارک بلۆخ"، کاریگەری گەورەیان لەسەر دروستبونی لێکۆڵیارە نوێیەکان هەبوو، یەکێک لەوانەش "فێرنان برۆدێل" بوو. لە تێکڕای ئەو دیدار و چاوپێکەوتنانەی ئەنجامی داون، "برۆدێل" باس لە شوێن دەست و کاریگەری ئەو زانایانە دەکات (بە تایبەتی لوسیان فیڤەر)، لە فۆرمەلەکردنی تیۆریاکەی دەربارەی قوتابخانەی (مێژوی نوێ).

"برۆدێل" هەر بەوەندەشەوە ناوەستێت و پرکێشی زیاتر دەکات، کاتێک باس

لەوە دەکات کە کتێبە سەرەکییەکەی (ناوەڕاست و جیهانی ناوەڕاستی لەسەردەمی حوکمڕانی فیلیپی دووەمدا)، بەڕێنومایی ڕاستەوخۆ و سەرپەرشتی وردی «لوسیان فیڤەر» نوسراوە.

هەریەک لە «لوسیان فیڤەر» و «مارک بلۆخ»، لەسەر بنەمای خستنە ڕووی کێشە مەزنەکان لە چوارچێوەی سەردەمێکی مێژوی ماوە درێژدا، سەیری نوسینی مێژوییان دەکرد، ئەویش وەک هەوڵێک بۆ دەربازکردنی نوســینی مێژوویی لە خەســڵەتی ڕوداوئامێز. لای «مـــارک بلوخ» زەمەنی مێژوویی، بریتیە لەو پلازمایەی کە ڕوداوە کۆمەڵایەتیەکان تێیدا دێن و دەچن، ئەویش زەمەنێکە هەمیشـــە لە گۆڕان و بەردەوامێتیدایە. هەروەها «ئەمیل دۆرکهایم» لەســـەر بنەمای پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵ تێکڕای زانستە مرۆییەکاندا نەک بەجیا لێیان، باسی لە نوسینی مێژوویی دەکرد.

«برۆدێل» لەگەڵ ئەم تێزە و تیورانەدا یەکی دەگرتەوەو ســـەروەختێکیش، لە هەوڵی ئەوەدا بوو نوســـینی مێژوویی لە دیـــدگای تاک ڕەهەندی بۆ ڕوداوە کۆمەڵایەتیەکان دەربهێنێت، بەشـــێوەیەکی زۆر بەهرەمەندانە پراکتیزەی کردن و لەســـەر بنەمای مێژووی ماوە درێژ کەوتە شرۆڤەکردنی ڕوداوە کۆمەڵایەتیەکان.

«برۆدێل» هەر لەســـەرەتاوە دەیزانی زەمەن هەر لـــە خۆیدا و تەنها بۆ خۆی بونی نییە، بەڵکو بونی لـــەو پەیوەندیە دیالەکتیکیەدایە کـــە لەگەڵ ڕووبەری جوگرافیدا هەیەتـــی. یەکەمین ئەرکی مێژونوســـی داهێنەریش ئەوەیە کە لە ڕێی یاســـا و ڕوداوە کۆمەڵایەتیەکانەوە، پەی بەو پەیوەندیە بەرێت. لێرەوە و لە ڕێی نوســـینە ســـەنگینەکانیەوە، «برۆدێل» توانی تیۆریای (شـــوێن — کات) بدۆزێتەوەو لایەنە ســـەرەکیەکانی تاوتوێ بکات، کاتێک زەمەنی مێژوویی دابەشـــکرد بەسەر زەمەنی تاکەکـــەس و زەمەنی گروپ و زەمەنی یۆنیڤێرســـالیدا. زەمەنی تاکەکـــەس ئەو ڕووبەرەیە کە ڕوداوی شەخســـی و فەردی تێـــدا دەردەکەوێت، زەمەنی گروپیش ئەو ڕوبەرە دەســـتەجەمعیەیە کە مێژوی کۆمەڵایەتی تیا بەیاندەکرێت، لەگەڵ زەمەنی جیهان کە ڕوبەری ئاشکرابونی مێژوی جیهانە.

بە مەبەســـتی نوێکردنەوەی مێژوو (وەک چەمک و نوســـین)، «برۆدیـــل» و ئەوانەی لایەنگری تیۆریاکەی بوون، لە هەوڵی ئەوەدا بوون مێژوو لەکۆت و بەندی دیکۆمێنت و گێڕانەوەی ڕووداو ئازاد بکەن و بەرەو ئاسۆکانی زانستی مرۆڤی بەرن. یەکەم سەرکەوتنیشیان لە بەگژاچونەوەی ئەو نوسینە مێژوییە باوانەدا بوو کە لە بەراییەکانی سەدەی بیستەمدا باڵادەست بوون.

تا ئەو کاتە نوسینەوەی باوی مێژوو، لە فەرەنساو وڵاتانی دیکەی ئەوروپادا، کەم تا زۆر بە وەسفی شـــەڕ و باسکردنی هەواڵی پادشاو سەرکردەکانەوە خەریک بوو. لە بەرئەوە نوسینەکانی «برۆدێل» ئاماژەیەکـــی حەقیقی بوو بـــۆ لەدایک بوونی (مێژوی نوێ)، مێژوویەک کە زانســـتە مرۆییەکان لە ناوخۆیاندا هەماهەنگی دەکەن و لەڕێی ئەم هەماهەنگی کردنەشـــەوە، چەندین توێژینەوەی زانستی بەرهەم هات کە کاریگەری قوڵی لەســـەر نوســـینەوەی مێژوو، هەروەها لەسەر زانستە مرۆییەکانی دیکە بەجێهێشـــت. تەنانەت کتێبەکەی (ناوەڕاســـت و جیهانی ناوەڕاستی) بە شێوازێکی تەقلیدی دابەشنەکرد، بە جۆرێک کە کایەی جوگرافی لە کایەی سیاسی و کایەی ئابوری لە کایەی کۆمەڵایەتی و کایەی کلتوری لە کایەی ڕوداو جیا بکاتەوە، بەڵکو جیهانی ناوەڕاســـتی وەک ڕەهەندێکی زەمەنی و پانتاییەکـــی جوگرافی و چەمکێکی مێژوویی و یەکەیەکی ئابوری و ژیارێکی یەکگرتوو وەرگرت، تا بکرێت لەڕێی مێژویەکی ماوە درێژ کە هەمیشـــە لە گۆڕاندا بێت، تاوتوێ بکات. لە دووەم کتێبیدا

(شارستانیەتی مادی، ئابوری و سەرمایەداری) کە لە سێ بەرگی قەوارە گەورەدا چاپکرا، ستایلێکی دیکەی بۆ نوسینەوەی مێژوو هەڵبژارد، ئەویش تێکەڵکردنی مێژوی سیاسی بوو بە مێژوی ئابوری، ئەمەش بۆ ئەو کاتە شتێکی زۆر نوێ بوو لە بواری نوسینەوەی مێژوو لە فەرەنسادا.

«برۆدیل» دوو ڕەهەندی سەرەکی کە بریتی بوون لە ڕەهەندی ئابوری و جوگرافی، سەربارى تیۆریاکەی خست، دەربارەی تیۆریای (شوێن — کات). لە کتێبی (ناوەڕاست)دا تەئکید لە ڕەهەندی جوگرافی و لە کتێبی (ژیاری مادی)یشدا جەخت لە ڕەهەندی ئابوری دەکاتەوە، لە هەردووکیشیاندا لێهاتوانە ئەو کارەی کردووە. بەم پێیە ئەو هەر داهێنەری تیوره نەبووە، بەڵکو لە هەمان کاتیشدا پەرەی پێداوەو گەشەی پێکردووە. واتە دیلی تیۆریا نەبووە، بەڵکو هەمیشە لە هەوڵی بەرەو پێشبردنیدا بووە و سور بووە لەسەر ئەوەی کام تیۆریا زۆر زانستیانەترە، ئەوە بۆ تاوتوێکردنی گەشە و بەرەو پێشچونی کۆمەڵگە هەڵبژێرێت. هاوکات دژی ئەوەش بوو کە مۆدێلێک یان تاکە ستایلێک، بۆ نوسینەوەی مێژوو هەبێت.

دوای نوسینی کتێبی (ناوەڕاست و جیهانی ناوەڕاستی) پێیوابوو لە نوسینەوەی مێژوودا، ڕەهەندی ئابووری لە ڕووی گرنگیەوە هیچی لە ڕەهەندی جوگرافی کەمتر نییە ئەگەر زیاتر نەبێت. ڕەهەندی ئابوری بەهۆی پەیوەندی تۆکمەی نێوان ڕوداوە کۆمەڵایەتیەکان و کاریگەریە ئابوریەکان، ڕاستگۆییەکی کۆمەڵایەتی بە نوسینی مێژویی یان نوسینەوەی مێژوو دەدات.

بە پێی دابەشکاریەکانی «فێرنان برۆدێل»، ڕوداوە کۆمەڵایەتیەکان لە ڕیزی پێشەوەدا دێن، لەبەرئەوەی پەیوەندی بە مێژووی ڕوداو ئامێزەوە هەیە. لە دوای ئەو کاریگەرییە ئابووریەکان دێت و لە خواری خوارەوەش جوگرافیا وەستاوە، لەبەرئەوەی بنەمای نەگۆڕی مێژووە. کارێکی ژیرانە نییە گەر بە دوای ناکۆکی میتۆدا بگەڕێین لای «برۆدیل»، بەو پێیەی لە کتێبی (ناوەڕاست)دا جەخت لەسەر ڕەهەندی جوگرافی دەکات و لە (ژیاری مادی)یشدا ڕەهەندی ئابوری بە هێند دەگرێت، لەبەرئەوەی ئەو لە هەوڵی هێنانە ئارای تیۆریایەکی زانستی ئەوتۆدا بوو کە زانستە مرۆییەکان تێیدا بەشداربن و بە هەموویان یەک زانست دروست بکەن ئەویش زانستی مرۆڤ بێت Interscience، ئەمەش جیای دەکاتەوە لە لێکۆڵینەوەی ئەو کایە مەعریفیانەی لەسەر فرە میتۆدی کاردەکەن Interdisciplinaire.

سەروەختێک لێکۆڵیار سەرکەوتوو دەبێت لە دیاریکردنی بزاوتی واقعی مرۆڤایەتی، ئەو کات بۆ خۆی دەبێتە مێژونوس و جوگرافی ناس و ئابوری ناس و کۆمەڵناسێکی سەرکەوتوو. "ئیڤ لاکۆست — Ives Lacoste" دەرهەق بە "برۆدیل" دەستەواژەیەکی لەمە چاکتری نەدۆزیەوە کە بڵێت: ("برۆدیل مێژوونوسێکی زۆر مەزنە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا جوگرافی ناسێکی گەورەشە، ئەگەر پێشی خۆش نەبێت).

## هەندێک لە خەسڵەتە سەرەکیەکانی میتۆدی "برۆدیل":

"فێرنان برۆدیل" بەڕابەر و پێشەنگی ئەو قوتابخانەیە دادەنرێت کە پێی دەڵێن قوتابخانەی (مێژوی نوێ)، واتە مێژوییەک کە لە چەندین گۆشە نیگای جیاجیاوە دەنوسرێتەوەو تیایدا کایەی (ئابوری و سیاسی و کلتوری و کۆمەڵایەتی و ژیاری و ڕوداو) تێکەڵ بە یەک دەبن، ئەمەش وا

دەکات نوســەرانی ئــەم قوتابخانەیە ببنە خاوەن دیدگایەکی میتۆدی جیــاواز. لەلایەک جیاوازبن لە نوسینەوەی وەسف و پیاهەڵدان و گێڕانەوەی حیکایەت ئامێز، لەلایەکی دیکەشەوە خۆیان لەو ئاقارە مێژوییە مادیە جیابکەنەوە کە باوەڕی بە حەتمیەتی مێژویی و پێداویستی گوزەرکردنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتــی بــە پێنج قۆناغەکەدا هەبوو کــە بریتی بوون لە: (کۆمۆنەی ســەرەتایی، کۆیلایەتی، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری تا دەگاتە سۆسیالیزم).

یەکێــک لە خەســڵەتە دیارەکانی میتۆدی "برۆدیل" ئەوەیە کــە جوگرافیا ڕۆڵێکی دیار و گرنگ دەبینێت لە بەرەوپێشچونی مێژویدا، ئابوریش بەشداری لەو پێشکەوتن و بەرەو پێشچونەدا دەکات و کاریگەری لەســەر مرۆڤ و ژینگەی جوگرافی جێدێڵێت. "برۆدیل" پێیوایە مێژوو خەســڵەتێکی یۆنیڤێرسالیانەی هەیە و ئەرکی مێژونوسیش ئەوەیە کە لەڕێی زەمەن بەندی واقیعەوە (واتە لە ڕێی دابەشکردنی قۆناغە مێژوییەکانەوە)، ئەو یۆنیڤێرسالیبونەی بسەلمێنێ.

"برۆدیل" لەو بڕوایەدایە شتگەلێک هەن لە مێژودا جێگیر و نەگۆڕن، هەروەها شتگەلێکی دیکەش هەن زۆر ســست و لەســەرخۆ دەگۆڕێن، بەڵام هەندێ شــتی دیکەش هەن خێرا و بەپەلە گۆڕانیان بەسەردا دێت. ئەمەش لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە دەگۆڕێت، بەهۆی چەندین هۆکاری جیاجیاوە کە ڕەنگە گرنگترینیان هۆکاری مرۆیی بێت.

تیۆریایەکی سەرەکی کە "برۆدیل" لە تێکڕای نوسینەکانیدا کاری پێدەکات ئەوەیە ئەو دیدگایەکی چونیەک و هاوسەنگی بۆ گەشەو بەرەوپێشچونی مێژووی کۆمەڵگاکان هەیە. بەم پێیە مێژوو تەنها لە ئاســتی ماوە درێژدا جوڵە و بزوتنی بە باشــی دەبینرێت، چونکە دەتوانین سەرنجی ئەوە بدەین کە تەواوی کۆمەڵگاکان بە قۆناغی گۆڕانکاری هەندێ جار خێرا و هەندێ جار ســست و لەســەرخۆدا تێپەڕیون، دیاریکردنی ئەو جوڵەو بزوتنەوەیەش ئاســان نییە، تەنها بە بەراوردکردنی کۆمەڵگاکان نەبێت بەیەکتری لە قۆناغی مێژویی ماوە درێژدا.

بەرەوپێشچونی مێژوویی، بەرهەمێکی سروشتی جموجۆڵ و چالاکی مرۆڤە کە بە وردی ئامادەباشی بۆ دەکرێت و بە ئاشــکرا خۆی بەیان دەکات وەک گوزارشــتێک لەو چالاکیانە، لەبەرئەوەی جەماوەر بریتیــە لە بنەما و ڕێســای مێژوو، ئیتر ئەو جەماوەرە هەژار بێت یــان دەوڵەمەند. بەڵام "برۆدیل" دەڵێت شــتێکی هەڵەیە پێمان وابێت خەڵک مێژوی خۆیان دروست دەکەن، نەخێر بە پێچەوانەوە، ئەوە مێژووە خەڵک دروست دەکات و ئەوان دەبێت بچنە ژێر باری دەرەنجامەکانی و هەوڵی گۆڕینی بدەن. مێژووی ئیرادی تەنها خەیاڵ پڵاوە، لەبەرئەوەی ئیرادەی مرۆڤ لە دروستکردنی مێژوودا جگە لە دڵۆپە ئاوێک لە زەریایەکدا شــتێکی تر نییــە. هەروەها "برۆدیل" بەکارهێنانی زاراوەگەلی وەک: (داوەشــان و دواکەوتن و دراما و خێراکردنی بەرەو پێشــچون و گۆڕانی ڕادیکال) بە هەڵە دەزانێت، لەبەرئــەوەی ئەو پێی وایە ئەم زاراوانە بۆ وەســفکردنی ڕوداوی ڕۆژانە دەســت دەدەن، لەکاتێکدا مێژوونوس دەبێت پشت بە واقیع ببەستێت، ئەویش لەڕێی ئەو دیکۆمێنتانەی ئاماژە بۆ ئەو واقیعە دەکەن و ڕوداوەکانی ناوی دەســەلمێنن. مێژوونوس گەردەیەوێت دەرهێنەرێکی خەیاڵ فراوان بێت، پێویســتە بۆ چرکەیەکیش ئەوەی لەبیر نەچێت کە شــانۆی جێگیر و نەگــۆڕی ئەو کۆمەڵگەیە و ئەکتەرەکانیشــی ڕاستەقینەن نەک وەهمی و دروستکراو بن. هەروەها پێویستە ئەو چوارچێوەیەشی بۆ کارەکتەرەکانی دەکێشــێت، دەرگیری ئەو وەســفە وردانەی ڕوداوە مێژوییەکان بێت کە لەلایەن

پاڵەوانەکانیەوە و لەسەر زەمینی واقیع فۆرمەلە کراون، نەک چنراوی خەیاڵ و فانتازیا بێت.

"برۆدیل" دەیویست شرۆڤەکاری وردو وەسفی ڕوداوەکان پێکەوە کۆبکاتەوە، ئەویش لە ڕێی دیکۆمێنتکردنێکی چاک بۆ تەواوی دیاردەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، لەبەرئەوەی تەنها دیکۆمێنت دەتوانێت سەرلەنوێ وێنای ڕابردوی کۆمەڵگەمان وەکی خۆی بۆ بکاتەوە، بەڵام خۆی لەتاکڕەوانی و بینینی یەکلایەنە بەدور دەگرت لە کاتی تاوتوێکردنی دیکۆمێنت و هەڵسەنگاندنی ناوەڕۆکیدا. زیاد لە جارێک "برۆدیل" باسی لەوە کردووە کە ئەو نە بەیەکجاری دژی مێژوی ڕوداوئامێزە و نە کتومتیش لایەنگری مێژووی ماوەدرێژە، بەڵکو لە هەوڵی ئەوەدا بووە ئەم دوانە پێکەوە کۆ بکاتەوە. ئەو هەمان ڕێچکەی "مارک بلۆخ" و "لوسیان ڤیفەر"ی نەگرتەبەر بۆ ئاوێتەکردنی تەواوی زانستە ئینسانیەکان لەیەک زانستدا کە ئەویش مێژووناسیە، پشت ئەستور بەو قسەیەی دەڵێت: (مرۆڤایەتی تەنها یەک زانستی ناسیوە، ئەویش زانستی مێژوو بووە)، بەڵکو لە لێکۆڵینەوەی مێژودا هەوڵی داوە، سوود لە زانستە مرۆڤایەتیەکانی دیکە وەربگرێت.

"لوسیان ڤیڤەر" کاتێک دەڵێت: (مێژوو بریتیە لە مرۆڤ)، "برۆدیل" لە وەڵامدا دەڵێت: (مێژوو بریتیە لە مرۆڤ و شتەکانی دیکەش کە لە دەرەوەی مرۆڤن). بە ڕای ئەو دەشێت مێژوو ببێتە زانستی مرۆڤ، بە مەرجێک تەواوی زانستە مرۆییەکان بخرێتە پاڵ مێژووناسی. مێژوو یەکێکە لە ئامرازەکانی مەعریفە، نەک تەواوی مەعریفە بێت. وەک چۆن لە ماوەی ڕابردودا مێژووناسی بوژایەوە، ئاوەهاش بە هەمان شێوە زانستە مرۆڤایەتیەکانی دیکەش بوژانەوە. ئەمەش هیچ جۆرە ناکۆکیەکی تێدا نییە، لەبەرئەوەی (مێژوی نوێ)، بەردەوام لە گۆڕان و بەرەوپێشچوندایە و لەگەڵ زانستە مرۆڤایەتیەکانی دیکەدا ناکۆک نیە و ناخوازێت بیانگرێتە خۆی، ئەوەندەی لە هەوڵی ئەوەدایە سودیان لێ ببینێت، بە مەبەستی گەیشتن بە مێژویەکی زانستی قوڵ و تۆکمە کە سەرجەم زانستە مرۆڤایەتیەکان بەشداربن تێیدا.

"برۆدیل" پێیوایە ڕۆچون لە پسپۆڕیدا لە بواری زانستە مرۆڤایەتیەکاندا، لە چارەسەرکردنی قەیرانی زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا دەرەنجامێکی باشی لێنەکەوتەوە، چونکە چارەسەر بەو لێکۆڵینەوانە نابێت کە پشت بە فرەمیتۆدی دەبەستن لە نێوان کایەکانیاندا، بەڵکو بەیەکخستنی زانستەکان دێت لە زانستی مرۆڤدا، بە مەبەستی هێنانەئارای تاکە میتۆدێک کە بەسەر تەواوی زانستە مرۆڤایەتیەکاندا پراکتیزە بکرێت.

ئەو زانستانەی لەسەر فرەیی و جۆراوجۆری کایە مەعریفیەکان دروست بوون، لە هەوڵی ئەوەدان لە لێکۆڵینەوە مرۆییەکاندا دوو میتۆد یان زیاتر تێکەڵ بەیەک بکەن، بەڵام زانستی مرۆڤ دەیەوێت یەک میتۆدی زانستی بە دیدگایەکی یۆنیڤێرسالی بەسەر بەرەو پێشچون و پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا پراکتیزە بکات، ئەویش لە میانەی میتۆدێکی کاری هاوبەشەوە کە بەرهەمی ژمارەیەکی زۆری زانایان بێت کە شارەزاییان لە زانستە مرۆڤایەتیەکاندا هەیە، بەرەنجامی ئەم پرۆسەیەش لێکۆڵینەوەگەلێکی وەک یەکە لەسەر بنەمای یەک بەرنامەو یەک میتۆد.

نوسینەوەی مێژوی هاوچەرخ زۆر بە قووڵی پەرەیسەند و مێژونوسی زانستی لە هەوڵی ئەوەدابوو، ئەم نوسینە تا دوا تخوبەکانی مەعریفەی زانستی بەرێت، لە ڕێی بەکارهێنانی شێوازەکانی جوگرافیای مرۆیی و دەرونناسی کۆمەڵایەتی و ژمارەی ئاماری و پرانسیپەکانی ئابوری ناسی و... هتد، بەڵام

بە وتەی "برۆدیل" ســەرەکیترین کۆسپێک کە لە ماوەی دوایدا هاتۆتە ئارا، ئەوەیە پسپۆڕانی بواری زانســتە مرۆییەکان هەوڵدەدەن بەربەست لە نێوان زانســتێک و زانستێکی دیکەی مرۆیدا دروست بکــەن. هەروەها مێژوویان بــە جۆرێک پۆلێن دەکرد، وەک ئەوەی ڕابردوویەکی بەردەوام بێت. تەنانەت خودی "برۆدیل" خۆشی لەم تێڕوانینە قوتاری نەبوو، هەر بۆیە دەیویست بەم قسەیەی کە دەڵێت: (بەو پێیەی جیاوازی لە نێوان ڕابردوو و ئێســتادا نییە، ئەوا مێژوو بریتیە لە کۆمەڵناسی)، خۆی لەو بۆچونە بەدوور بگرێت.

وەرگۆڕانی مێژووی نوێ بۆ جۆرێک لە کۆمەڵناسی بێلایەن، هانی هەندێ لە توێژەرانی مارکسیزمیدا بەتایبەت "جۆرج گۆرفیچ" و "پییار بۆردیۆ"، تا ڕەخنەی توند ئاڕاستەی تیۆریاکەی "برۆدیل" بکەن و تەئکید لە تیۆریای جێگیر و گۆڕان لە مرۆڤ و لە ڕابردوو و لە ئێستادا پێکەوە بکەنەوە. وەڵامی "برۆدیــل" بۆ ئەمە ئەوە بوو کــە ڕەهەندی مێژوویی ڕوداوە کۆمەڵایەتیەکان دەتوانێت کۆمەڵناســی مرۆیی لە کەوتن قوتار بکات و لەم بارەیەوە دەڵێت: (بەبێ ڕەهەندی مێژوویی، کۆمەڵناســی دەبێتە مەعریفەیەکی کوێر و نابینا).

مشتومڕی هێمنانە و هەندێ جاریش توندوتیژ، بەڵگەی قورسی و گرانی گەیشتنە بەیەک میتۆد کە بەشــێوەیەکی نۆرماڵ بەسەر تێکڕای زانستە مرۆڤایەتیەکاندا پراکتیزە بکرێت. لە ڕاستیدا یەک مرۆڤ و یەک کۆمەڵگە و یەک ڕوداومان نییە کە بشــێت بە شــێوەیەکی یەکگرتوو شرۆڤە بکرێت، بەڵکو هەقیقەتی زانستی جۆراوجۆر هەیە و دەکرێت لەڕێی ئەو دیکۆمێنتانەی پەیوەندیدارن پێیەوە بسەلمێنرێت. ئەو ســەلماندنەش پابەندی ڕۆشنبیریی توێژەرەکەو پێداویستیەکانی سەردەمەکەیە. هەمــوو بەرەو پێشــچون و گۆڕانکاریەکی نوێ، بە دڵنیایی زانســتی نوێ و کێشــەی نوێ لەگەڵ خۆیدا دێنێت، ئەوەی دەمێنێتەوە تەنها باوەڕی نەگۆڕە بە توانســتی مرۆڤ لە هەمبەر گەشــەکردن و ئەفراندنی شــێوازگەلی وا کە لە باریدا بێت زۆر بە قوڵی و هەمەلایەنانە لە گۆڕان و پێشــکەوتنی کۆمەڵایەتی تێبگات.

قوتابخانەی بڵاوکراوەی ســاڵانە (Les Annales) بەڕابەرایەتی "برۆدیل"، بوو بە لابورێکی گرنگ بۆ ئەنجامدانی چەندین باس و لێکۆڵینەوە، دەربارەی چاکترین شــێواز بۆ نوســینی زانســتی کە بەرەو پێشــچونی کۆمەڵایەتی بە وردی و فراوانی نیشــان بدات. لە ڕێی ئەو ئەزمونانەوە کە گۆڤاری (Les Annales) ڕێساکانی داڕشت، قوتابخانەی (مێژووی نوێ) کە "برۆدیل" ڕابەرایەتی دەکرد هاتە ئــارا و بە گۆڕان و قەڵەمبازێکی گەورەش لە بواری زانســتە مرۆییەکانــدا ئەژمار دەکرا کە خاوەن خەسڵەتگەلێکی تایبەتی بوو، لەوانە:

–پراکتیزەکردنی ڕاستەوخۆی ڕێبازی زانستە سروشتیەکان، بەسەر نوسینەوەی مێژودا.

–لێکۆڵینەوەو تاوتوێکردنی پێشــکەوتن و پەرەســەندنی مێژوویی، لــە قۆناغێکی زەمەنی دوور مەودادا.

–بینیــن و بەهەندگرتنی دیاردە جوگرافی و ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان، لە میانەی هەماهەنگی و کارلێکردنی ئینسانیەوە.

نوســینەکانی "برۆدیل" وەک قوتابخانەیەکی زانســتی وا بوو، ژمارەیەکی زۆر لە مێژوونوســان تێیدا پێگەیشــتن، بەشێکیان لەناو قوتابخانەی بڵاوکراوەی ســاڵانەدا دەرکەوتن. لەبەر گرنگی ئەو

قوتابخانەیە، لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پەیمانگایەکی تایبەت بە ناوی "فێرنان برۆدێل"ەوە کرایەوە، بۆ لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری نێوان شارستانیەتەکان. سەرەڕای ئەوەی تیۆریای مێژوی یۆنیڤێرسالی لە زەمەنی ماوە درێژدا هێنایە ئاراو، ئەو تیۆریایەشی لە ڕێی هەردوو کتێبە ناوازەکەیەوە (ناوەڕاست و) و (ژیاری مادی) پراکتیزە کرد، بەڵام دوای ئەوە پاشەکشەیەکی سەیر لای "برۆدیل" دەستی پێکرد، کاتێک لە جیهانی و گەردونگەرابیەوە، بایدایەوە سەر شتە لۆکاڵی و ناوچەییەکان.

لێرەوە دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی مێژوی فەرەنسا، ئەم کارەشی بە شێوەی لێکچەر دەست پێکرد کاتێک کە وانەی بە خوێندکارانی کۆلێژ دی فرانس دەوتەوە لە ساڵی ١٩٧٠. دواتر ئەمە بووە بەرهەمی کارێکی گەورەو لە سێ بەرگدا چاپی کرد. بەم کارەشی دەیویست جەخت لە شوناسی ناوازەو تایبەتی فەرەنسا بکاتەوە. لەمبارەیەوە دەڵێت: (گرنگ بۆ من شوناسی فەرەنسایە)، ئەم کتێبەش وەکی خۆی دەڵێت: (بەشێکی سەرەکی لێی کە بەرگی دووەمیەتی، کتێبێکی تەقلیدیە).

## سەرچاوە:

ئەم نوسینەی لێرەدا دەیخوێنیتەوە لە ئەسڵدا دەقی لێکچەرێکی لێکۆڵیار " د. مەسعود ضاهر"ە کە لە بەرواری ١٩٨٦/٦/٥ لە وڵاتی تونس و لەسەر بانگهێشتی زانکۆی هاوینەی عەرەبی — ئەوروپی، پێشکەش بە خوێندکارەکانی زانکۆی (الحمامات)ی کردووە و دواتریش ساڵی ١٩٨٧ لە گۆڤاری (الفکر العربی المعاصر) لە بەیروت بڵاوکراوەتەوە.

# ئەو کەسایەتیانەی مێژوویان دروستکرد

هاشم سالّح
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

تا ئێســـتا نازانین ئەو کەســـایەتیانە کێن کە دەســـتدەگرن بەسەر سەدەی بیســـتو یەکدا، چونکە ئێمە تازە لە ســـەرەتای ســـەدەکەداین، هەروەها نازانین گرنگترین ئەو گوتارە سیاســـیانە چین کە کۆنترۆڵی ســـەدەکە دەکەنو مۆرکی خۆیانی پێوەدەنێن. بەڵام دوای تێپەڕبونی ســـەدەی بیستەم، دەزانین گرنگترین ئەو کەســـایەتیانە کێ بوون کە کاریگەرییان لەسەر سەدەی بیستەم هەبوو. لەو کەســـایەتییە سیاسیانە دەکرێ ناوی «چەرچڵ، شارل دیگۆڵ، ئێزنهاوەر، مارتن لۆســـەر گینگ، گۆرباتشـــۆف، گاندی، هێلمەت کۆل، لینین، جۆزێف ســـتالین، هێتلەر»...هتد بێنین. لە کەسایەتییە فیکرییەکانیش، زۆرجار ناوی «سیگمۆند فرۆید، کارل گۆســـتاف یۆنگ، مارتن هایدگەر، کلۆد لیڤی شـــتراوس، جان پۆل سارتەر»...هتد دێت. لە کەسایەتییە ئەدەبییەکان یان ڕۆماننوسەکان، سەرنجمان بۆ ئەم ناوانە دەچێت «ئەندرێ بریتۆن، بۆرخێس، ولیام فۆکنەر، جیمس جۆیس، ســـیلین، مارسل برۆســـت، تۆماس مان»...هتد. لە کەســـایەتییە زانستییەکان «ئەنیشتاین، نیلز بۆر، ماکس بلانک»و ئەوانی دیکە.

لە گوتارە سیاســـییە بەناوبانگەکان، باســـی ئەو گوتارە دەکەین کە «مارتن لۆســـەر کینگ» لە ســـاڵی ١٩٦٣ خوێندییەوەو ئەمریکاو جیهانی هێنایە هەژان. گوتارەکە بەم ناونیشانەیە: (خەونێکی گەورەم بۆ ئێوە پێیە! خەون بەوەوەدەبینم سپیو ڕەش یەکسانبن، خەون بەوەوە دەبینم لەمڕۆوە چیتر هەر چوار منداڵەکەم،

لەبەر ڕوخســـار یان ڕەنگی دەموچاویان دادگایـــی نەکرێن...هتد). «بیل کلنتۆن» دەڵێ کاتێ گوێم لەو وتارە بوو گریام، کلنتۆن لەوکاتەدا گەنجێکی تەمەن بیســـت ســـاڵ بووەو دانی پێدادەنێت ئەوە بەهێزترین گوتاری سیاسی بووە لە ژیانیدا بیستبێتی. لەوانەیە گەر ئەو گوتارە نەبوایە، کە یارمەتی ڕەشپێســـتەکانی دا مافە مەدەنییەکانی خۆیان وەربگرن، پێدەچوو ئێستا «ئۆباما» لەسەر عەرشی کۆشکی سپی نەبوایە. لێرەوە نابێت گوتارە سیاسییە گرنگەکان بەهەند وەرنەگرین.

هەرچی «شـــارل دیگـــۆل»ە، ئەوا بەو گوتـــارە ناوبانگی دەرکرد کە لـــە ناوجەرگەی پایتەختی جەزائیردا خوێندییەوە. «دیگۆل» ڕووی لە ئاپۆرەی جەماوەرێکی زۆری موســـڵمانو ئەوروپی کردو وتی: (لێتان تێگەشـــتم!)، لە واقیعدا ئەو لێیان تێنەگەشتبوو، یان بڵێ ئەوان لەم نەگەیشتبوون. دەربڕینەکـــە تاڕادەیەک ئاڵۆزو مەترســـیدار بـــوو. دەربڕینەکە لە رووکەشـــدا وادیارە «دیگۆل» لە هەســـتو سۆزی جالییەی ئەوروپی گەیشتووە کە لەوێ (جەزائیر) باڵادەستبوون. دەربڕینەکەی لە ڕووکەشـــدا ئەوەی دەردەخســـت، «دیگۆل» لایەنگری ئەو تێزەیە کە جەزائیر فەرەنسییەو هەرواش دەمێنێتـــەوە. بـــەڵام «دیگۆل» لە قوڵایی ناخی خۆیدا، بڕیارێکی تـــەواو پێچەوانەی دابوو. بڕیاری پاشەکشـــەکردن لە جەزائیرو ڕازیبوون بەوەی لە فەرەنسا جیابێتەوەو سەربەخۆیی خۆی وەربگرێت. لەبـــەر ئەم هۆیە بوو پارتی کۆلۆنیاڵی ڕەگەزپەرســـت، دوای ئەوەی مەبەســـتو نیازی «دیگۆل»ی بۆ دەرکەوت، زۆر لێ دڵگران بوونو ســـێ جار هەوڵیاندا تیرۆری بکەن، بەڵام ســـەرکردە گەورەکەی فەرەنســـا، لە هەر ســـێ جارەکەدا زۆر سەیر ڕزگاری دەبوو، تۆ بڵێیت میهرەبانی خودا، لەو سەرەوە ئاگاداری بوبێتو پاراستبێتی؟

«جۆن گیرالد کەنەدی» ئەویش گوتاربێژێکی لێزانبوو، بەو گوتارە ناوبانگی دەرکرد کە لە ساڵی ١٩٦٣ لە بەرلینی ڕۆژئاوا خوێندییەوەو بەو وشـــەیە دەســـتی پێکرد کە سەدایەکی زۆری دایەوە: من بەرلینیم!. لە پەرەگرافێکدا کە بووە هۆی هەڵچوونو جۆشـــدانی جەماوەر دەڵێت: (پێش هەزار ساڵ لەمەوبەر، ئەو قسەیەی کە زۆر نەمر بوو، بریتی بوو لە: من هاوڵاتییەکی ڕۆمانیم. بەڵام لەمڕۆداو لە جیهانی ئازاددا، ئەو دەربڕینەی زۆر نەمرترە بریتییە لە: من هاوڵاتییەکی بەرلینیم. هەموو خەڵکانی ئـــازاد، بەدەر لـــەو وڵاتەی کە ئینتیمایان بۆی هەیە، هەموویان هاوڵاتیـــن لە بەرلین. من بەو پێیەی کەســـێکی ئازادم، شـــانازی دەکەم پێتان بڵێم: بۆمن مایەی شـــەرافەتمەندییە ببم بە هاوڵاتییەکی بەرلین).

پاش سی ساڵ لەو گوتارە بەناوبانگە، بەرلین بووە شارێکی ئازادو دیوارەکە ڕوخا.

ئێســـتا سەبارەت بە کەســـایەتییەکانی دیکەی سەدەی بیستەم، دەتوانین بڵێین چی؟ دەتوانین ســـەبارەت بە «گۆرباتشـــۆف» بڵێین چی؟ ئەو رۆڵێکی (کلیلیانەی) لە سەدەی بیستەمدا بینی. کاتێ ساڵی ١٩٨٥ حیزبی شیوعی سۆڤیەتی وەرگرت، لەپێناو ڕزگارکردنی ڕێژمەکەدا، دەستیکرد بە پیادەکردنی پرۆگرامێکی دیموکراســـیو دوو زاراوەی ســـەرکی داهێنا، ئەوانیش بیرۆسترۆیکا (واتە چاکســـازی)و شـــەفافیەت بوو. پاشـــان ئەم دوو زاراوەیە لە تەواوی جیهاندا بڵاوبونەوە. دوای ئەوە «گۆرباتشـــۆف» لە ڕۆژئاوادا ناوبانگێکی گەورەی بەدەســـتهێنا، بەڵام دواتر مەسەلەکان لەدەستی دەردەچـــنو ڕوداوەکان بەشـــیوەیەکی خێراو ســـەیر ڕویاندەدا. یەکێتی ســـۆڤیەت دەســـتیکرد بە

هەڵوەشـــاندنەوە، دیواری بەرلین لە ساڵی ١٩٨٩ ڕوخا. «گۆرباتشۆف» نەیدەویست ڕژێمی یەکێتی سـۆڤیەت بڕوخێنێت، بەڵکو دەیویست تەنها لەناوەوە چاکیبکات، مانای وشەی (پیرۆسترۆکیا)ش هەر ئەوەیە. وەلێ ڕووداوەکان بەجۆرێک هاتن ئەویان تێپەڕاندو ئەو بزوتنەوەیەش کە بەرپایکردبوو، وایلیهـات لەخـۆی گەورەتر بێتو نەتوانێت جڵەوی بکات. ئیدی ئەوەبوو لە سـاڵی ١٩٩١ کودەتای بەسـەردا کراو بە وێرانکردنی میراتی لینین تۆمەتبارکرا. پاشـان یەکێک لە هاوکارەکانی، هێرشـی کردە سـەری‌و توانی شوێنی بگرێتەوە، ئەو کەسە «یەلسـین» بوو. بەم شێوەیە «گۆرباتشۆف» وەک پیاوێکی سیاسـی کۆتایی پێهاتو ڕوسـەکان ڕقیان لێدەبووەوە، چونکە دۆڕا. بەڵام ڕۆژئاوا هەر ڕێـزی لێدەگرێتو یـادی دەکاتەوە. لەوانەیە مەزنی «گۆرباتشـۆف» لەوادابێت کـە دۆڕا! چونکە ئەو دۆڕانەبوو وایکرد کۆتایی بە شـیوعیەت بێنێت کە پێنەدەچوو چاکسـازی تێدابکرێت. ئەمڕۆ پێناچێت «گۆرباتشۆف» پەشیمان بێت لەوەی کردویەتی. ئەو بەم دوایانەو بەبۆنەی تێپەڕبونی ٢٠ سـاڵ بەسەر ڕوخانی دیواری بەرلین‌و هەرەسهێنانی شوعیەت دەڵێ: جیهانمان لە شەڕێکی ئەتۆمی ماڵوێرانکەر ڕزگارکرد.

«ئەنیشتاین ١٨٧٩-١٩٥٥» بۆ سەدەی بیست، وەک «ئیسحاق نیوتن»وایە بۆ سەدەی هەڤدەهەم. واتە ئەو پیاوەی لە مێژوی زانسـتدا، شۆڕشـێکی بەرپاکرد. «ئەنیشـتاین» لەسەرەتاداو لەشاری بێرنی سویسرا، ئەندازیارێکی سادە بوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٠٥ دوای ئەوەی تیۆرەی ڕێژەیی دۆزییەوە، ناوبانگی پەیداکرد. «ئەنیشـتاین» سەلماندی کاتو شوێن، ڕەها نین، بەڵکو ڕێژەیین. بگرە هەموو شتێک لەم جیهانەدا ڕێژەییە. بەم شێوەیە سەبارەت بە گەردون، وێنەیەکی دیکەی پێشکەش کردو لەزۆر مەسـەلەی دیکەدا شوێنی «نیوتن»ی گرتەوە، بەبێ ئەوەی بە تەواوی «نیوتن» ڕەتکاتەوە. پاشان «ئەنیشـتاین» ئەڵمانیای نازی جێدێڵێتو دەڕوات بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. لەوێ ئاگاداری سـەرۆک «ڕۆزفێلت»ی کرد کە پەلە بکات لە دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمی، تا «هیتلەر» لەو دروستکردنەدا پێشینەداتەوە. ئیدی ئەمریکا هەوڵەکانی بۆ دروستکردنی ئەم بۆمبە چڕکردەوەو توانی پێش هەموو وڵاتانی دیکە ئەو بۆمبە دروستبکات. بەوەش جەنگی دووەمی جیهانی بردەوە.

«ئەندرێ بریتۆن ١٨٩٦-١٩٦٦» دامەزرێنەری بزوتنەوەیەکی ئەدبی‌و هونەری بوو کە لە سەدەی بیسـتدا ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو: بزوتنەوەی سـوریالیزم. «بریتۆن» خۆی بە (دوا خەوبین-الحالم النهائی) دادەناو بانگەشـەی ڕزگارکردنی مرۆڤی دەکرد لە هەموو شـتێک. خەو تاکە فریادڕەسە بۆ ڕزگاربـوون لە دۆزەخی واقیع. ئەو هەرچەند کوڕی پۆلیسـێک بوو، واتە باوکی پۆلیس بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشـدا دژ بە هەموو دەسەڵاتەکان‌و کۆتوبەندێک بوو. ئاشکرایە ساڵی ١٩٢٤ (مانیفێستی سوریالیزم)ی بڵاوکردەوە، ئیدی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستدا، بووە یەکێک لەو کەسانەی ژیانی ڕۆشنبیری فەرەنسای دەجوڵاند، بگرە ژیانی ڕۆشنبیری جیهانی دەجوڵاند. هەموان سەرسامبوون پێی‌و ڕێزیان دەگرت، بەڵام سوریالیزمە سەرەڕۆکان، لە چایخانەکانی پاریس‌و ناوەندە ڕۆشنبیرییەکانیدا، زۆرجـار کاری ئاژاوەگێڕی‌و تێکدەرانەو هەڕەشـەکردنیان ئەنجامدەدا. لێرەوە سـوریالیزم بێگومان لایەنێکـی بـاش‌و ئازادیخوازانـەی پۆزەتیڤی هەیە، بـەڵام لایەنێکی تێکدەرانەو ئانارشـیزمیانەی نێگەتیڤیشـی هەیە. دواتر سوریالیزم بە هەموو لایەکی جیهاندا بڵاوبووەوە، تاوایلێهات سوریالیزمی عەرەبی‌و ئەمریکی‌و ئەڵمانی‌و مەکسیکی...هتد هاتەئارا.

نوســـەری ئەمریكی «ئارنست هێمنگوای ١٨٩٩-١٩١٦» ڕۆماننوســـێكی گەورەو ڕۆژنامەنوسێكی نایاب بوو، هەروەها بێ هیچ دوودڵییەک نوســـەرێكی باشـــی كورتە چیرک بوو. ئەو زۆر پەرۆشـــی ئەوەبوو پەرەگرافەكان بە وردی هەڵبژێرێتو وشەی گونجاویش دابنێت، لە وەسفكردندا ڕاستگۆبێتو لە وێنەگرتندا حەقیەتەكان پیشـــانبدات. لەگەڵ ئەو هەموو هەرایەی لە دەوری ناوەكەی پەیدابووە، لەگەڵ ئەو هەموو ناوبانگەی، كەچی لەگەڵ ئەوانەشدا «هێمنگوای» تاڕادەیەكی زۆر وەک نوسەرێكی نادیار دەمێنێتەوە . هەنوكە هیچی ئەوتۆ لەو نوســـەرەدا نابینن، ئەوە نەبێت عیملاقێكە وەحشەكان ڕاودەكات، یان عاشـــقی زۆرانبازێی گایە لەســـەر شـــێوازی ئیســـپانی، یاخود مێبازێكی ژنانە، یان كەســـێكی توندی سەرخۆشە . ئەو قسانەی كە لەبارەیەوە بڵاوبونەتەوە، هێندەی نەمابوو بە تەواوی ئەو نوســـەرە فەرامۆش بكرێت، یاخود باشترین شـــتی فەرامۆش بكرێت، واتە نوسینی ڕۆمانەكانی. خاوەنی (پیرەمێردو زەریا) حەزی لە ئازادی، تەنهایی، تادواســـنور دوورەپەرێزی بوو. زۆر شەیدای مەسەلەی بوونو نەبوونی ئەبەدیتو نەمری بوو. ڕەنگە لەبەر ئەم هۆیە بێت خۆی كوشت.

«جێمس جۆیس ١٨٨٢-١٩٤١» خاوەنی ئەو شۆڕشە ئەدەبییە یان (ڕۆمان)ییە بوو كە لەسەرەتای ســـەدەی بیستەمدا ڕوویدا. كاتێ لە ســـاڵی ١٩٠٤ ڕۆمانی (ئۆلیس)ی بڵاوكردەوە، ئەوە مانای ڕودانی ڕوداوێكی مەزن بوو لە هونەری نوسینی ڕۆماندا. لەم ڕۆمانە قەبەیەدا كە هەناسەیەكی داستانئامێزی هەیە، هەســـت بە ئامادەبونی «هۆمیرۆسو دانتیو رابیلیەو سێرفانتیسو شكسپیر» دەكەین، واتە هەست بە كەڵە نوسەرانی ئەدەبی ڕۆژئاوا دەكەین. ئەم ڕۆمانە ڕێگای لەبەردەم ڕۆماننوسە گەورەكانی دیكـــەدا كردەوە، لەوانە «فێرجینیا وۆڵـــف، ولیام فۆكنەر، تۆماس مان». ئەم ڕۆمانە دوای تێپەڕینی ئەو هەموو ســـاڵە بەســـەر بڵاوبونەوەیدا، كەچی هێشـــتا پڕە لە نهێنیو پەنهانی. تا ئێستاش بەو غەرابەتەیو بەو لادانە دەگمەنەی كە لە نوسینی ڕۆمانی باودا هەیە، سەرساممان دەكات.

«فرانز كافكا ١٨٨٣-١٩٢٤» ئەویش یەكێكە لە ڕۆماننوسە مەزنەكانی سەدەی بیستەم. ژیانێكی پڕ پەشـــێوی ژیـــاوە، ژیانێک تێیدا گومانو دڵەڕاوكێو ئازاری دەرونیـــی، لەناوەوە وێرانیان كردبوو. ئەو شـــتێكی ئـــاوای دەوت: (ئەدەب نەیتوانی لە نەهامەتیەكانـــم ڕزگارم بكات. من بەدرێژایی ژیان مردبووم، ئێستا دەمەوێت بەڕاستی بمرم). ئەم پەرەگرافە لە ساڵی ١٩٢٤ پێش مردنی بە ماوەیەكی كەم نوسیویەتی. دوای دوو ساڵ لەو بەرواره، نەخۆشی سیل كۆتایی بە ژیانی هێناو هێشتا تەمەنی تۆزێک لەســـەرو چل ســـاڵییەوە بوو. لەو كاتوساتەدا كەس پێشبینی ئەوەی نەدەكرد بەرهەمەكانی هەموو جیهان داگیردەكاتو ڕەخنەگران لە ڕیزی «برۆســـت» یان «فۆكنەر» یاخو«جیمس جۆیس» یان «ئارنست هێمنگوای» دادەنێن. لەو كاتەدا پێیان وابوو «كافكا» نوسەرێكی مامناوەندییە یان ئەوپەڕی نوسەرێكی باشە . بەڵام دوای مردنی، ناوبانگی وەک بۆمبێک تەقییەوە .

ئەو هێســـتریا شەخسییەی بە دەستییەوە دەناڵێنین، ئەو كونو كەلەبەرە دەرونییە قوڵانەی كە نە كۆتاییان هەیە یاخود نە ڕێگای هاتنەدەرەوەیان هەیە، هەستكردن بە گوناە بەبێ هۆ یان بە هۆ، ئەو هەستەی هەمیشە بەدوامانەوە، هەر هەموو ئەو شتانە «كافكا» بەشێوەیەكی هونەری نایاب لە ڕۆمانەكانیدا باسیكردون. بەم شێوەیە لایەنە تاریک یان ڕەشەكەی، بوونی مرۆڤی دەرخست. بەوەش بووە شایەنی بەدەستهێنانی ئەبەدیەتو نەمری.

ئێســـتا دەچینە سەر باسکردنی ڕۆماننوســـێکی دیکەی ناودار، ئەویش «مارسێل برۆست ١٨٧١- ١٩٢٢». ئـــەو هەرچەندە لە ســـەدەی نۆزدەهەمـــدا لەدایک بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا یەکێکە لە ڕوماننوسە مەزنەکانی سەدەی بیستەم. کەس ناتوانێت ناونیشانی ڕۆمانە نەمرەکەی (گەڕان بەدوای زەمەنی ونبودا) پشـــتگوێبخات. «ئەلفۆنس دودیە»ی نوســـەر ئیرەیی پێدەبردوو دەیگوت: پرسیارم دەربارەی مارسێل برۆست لێدەکەن؟ ئەو شەیتانە!

«برۆســـت» هەر لە منداڵییەوە خەونـــی بەوەوە دەبینی ڕۆمانێک بنوســـێت لە هیچ ڕۆمانێکی دیکە نەچێت. دوای ئەوەی ڕۆمانە ناودارەکەی تەواوکرد، ئەو خەونەی هاتەدی. ڕۆمانی گەڕان بەدوای زەمەنی ونبودا، گەڕانێکی بێ ئاکامە بەشـــوێن ئەو زەمەنەی کە ڕۆشـــتووەو چیتر ناگەڕێتەوە . واتە زەمەنی منداڵیو ســـەرەتای گەنجیەتی، کە ڕۆچونەتە قوڵایی نەســـتەوەو زۆر بە زەحمەت دەتوانین بیانهێنینەوە بیری خۆمان. «برۆست» شەیدای ڕابردوو بوو، نەک ئێستاو ئاینده .

**سەرچاوە:**

الشرق الاوسط/ ٢٤ کانونی یەکەم/ ٢٠٠٩ ژمارە ١١٣٤٩

* گەڕان بە دوای ئەلقاعیدەدا
لە ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف

* نیتشە و پاش تازەگەری
ئامادەکردنی: سەردەم

* سیمیا لە شانۆدا
ئامادەکردنی: لاس

* جیهانی سۆفیا
ئامادەکردنی: سەردەم

* تیۆدۆر ئادۆرنۆ
ئامادەکردنی: سەردەم

* چەند دروشمێکی خوێندکاران لە ئایاری ١٩٦٨ دا
حەمید زنار
لە عەرەبییەوە: لاس

# گەڕان بە دوای ئەلقاعیدەدا

لە ئینگلیزییەوە:
عەزیز ڕەئووف




گروپی ئەلقاعیدە یەکێکە لەو گروپە توندڕەوە جیهانیانەی کە ئێستا سەرنجی زۆرێک لە نوسەرانی جیهانی بۆخۆی ڕاکێشاوە. ئەم گروپە بەشێوەیەکی زۆر دراماتیکی توانی وەک تارماییەک سنورەکان ببڕێت و لەدوای یازدەی سێپتەمبەرەوە ببێتە گروپێکی جیهانی، بەجۆرێک وەک چۆن وڵاتانی جیهان بۆ نەخۆشیە جیهانیەکان ڕێوشوێنیان دەگرتەبەر، ئاواش سەبارەت بە ڤایرۆسی تیرۆریزم، وڵاتانی جیهان ڕێوشوێنی ئەمنی توندیان گرتەبەر.

(گەڕان بەدوای ئەلقاعیدەدا) کتێبێکی بورس ڕیدیڵە کە لە ١٨٠ لاپەڕەدا دەرکەوتەکانی گروپی ئەلقاعیدە لەدوای یازدەی سێپتەمبەرەوە شیدەکاتەوە. ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبە بەنرخانەی کە لەسەر گروپی ئەلقاعیدە لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا نوسرابێت.

ڕیدڵ کە خۆی سیناتۆرێکی ئەمریکیە پێشتر ڕاوێژکار بووە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و ماوەی سێ سەرۆکی ئەمریکا لەو پۆستەدا لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست کاری کردووە، ئەمەش بووەتە ئەزموونێکی باش بۆئەوەی بتوانێت کتێبێک بەرهەم بێنێت لەسەر شەڕی واشنتۆن لەگەڵ گروپی ئەلقاعیدەدا.

ڕیدڵ لەم کتێبەدا مشتومڕ لەسەر ئەوە دەکات کە بڕیاری جۆرج بوش بۆ «شەڕی دژە تیرۆر» بڕیارێکی هەڵە بوو. زیاتر لەوەش بڕیاری شەڕ دژ بە گروپێکی تارماییئاسای وەک گروپی ئەلقاعیدە. ڕیدڵ هەروەها ڕەخنە لە جۆرج بوش دەگرێت کە بڕیاری

داگیرکردنی عیراقی دا بەرلەوەی تەرکیز بخاتە سەر ئەفغانستان و پاکستان کە پێگەی سەرەکی گروپی ئەلقاعیدە بوون.

پرۆپۆزەڵی سیاسیی لە کتێبەکەی ڕیدڵدا بریتیە لە سێ خاڵ:

یەکەم ئەوەیە کە پێویستە وڵاتە یەکگرتووەکان هەوڵی وەڵامدانەوەی گوتاری ئەلقاعیدە بداتەوە بە هاندان یاخود گەر پێویستیشی کرد یارمەتیدانی ئەو هێزانەی کە لەناو خودی دەوڵەتە ئیسلامیەکاندا هاوپەیمانی ئەمریکان، بەجۆرێک کە ئەمریکا کاری لەسەر بیروڕای جیاواز و خوڵقاندنی دۆخێکی فرە بکردایە لەو وڵاتانەدا. بەمانایەکی تر ئەمریکا دەبێت لەگەڵ هاوپەیمانەکانی لەناو دەوڵەتە ئیسلامیەکاندا بەشداربێت لە یارمەتیدانی ململانێکردن لەگەڵ توندڕەویەتدا.

دووەمین ڕیکۆمێندەیشنی نوسەر لەم کتێبەدا بریتیە لەوەی کە نوسەر پێی وایە دەبێت ئەمریکا تەرکیزی زیاتر بخاتە سەر کێشەی فەلەستین و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە. نوسەر پشتیوانی بۆچونەکەی سەرۆک بوشی دەکرد بۆ دروستبوونی دوو دەوڵەتی ئیسرائیل و فەلەستین لەسەر بنەمای سیاسەتی ئەمریکا لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەڵام ڕەخنە لە ئیدارەی پێشو دەگرێت بەوەی کە ئەم مەسەلەیەی بە بەیاخەوە وەرنەگرت و دەستکەوتێکی کەمی لە فراوانبوونی پەیوەندی نێوان ئیسرائیل و فەلەستین بەدەستهێنا. چونکە بە بۆچوونی نوسەر کێشەی فەلەستین و مانەوەی بەو شێوەیە، بووەتە هۆی دروستبوونی چەندین گروپی توندڕەو لە ناوچەکەدا.

سێیەمین ڕیکۆمێندەیشنی سیاسی نوسەر بریتیە لە بەرەوپێشبردنی ستراتیژی بۆ سەرجەم باشوری ئاسیاوییەکان، ڕیدڵ بڕوای وایە گەر ئەمە نەکرێت ئەوا جیهاد دەچێتە قۆناغێکی ترەوە. نوسەر جەغتی زیاتر دەخاتە سەر پاکستان کە ئەمریکا دەیتوانی سەرکردەگەلێکی دیموکراتخواز لەو هەرێمە پشتیوانی بکات، بەڵام لەمەدا شکستی هێنا، چونکە ئەمریکا پشتیوانی دیکتاتۆرە میلیشیەکانی کرد کە نەیاندەتوانی پشتیوانی جەماوەری بەدەستبێنن بۆ شەڕێکی ئازایانە دژ بە تیرۆریزم.

ئەم کتێبە ساڵی ٢٠٠٨ چاپ و بڵاوکراوەتەوە لەلایەن واشنتۆن دی سییەوە. گەڕان بەدوای ئەلقاعیدەدا لە حەوت بەش پێکهاتووە:

بەشی یەکەم: هێرشی مانهاتن.

بەشی دووەم: بیریارەکە، زەواهیری.

بەشی سێیەم: سوراچاکەکە، ئوسامە.

بەشی چوارەم: خاوەنماڵەکە، مەلا عومەر

بەشی پێنجەم: بێگانەکە، زەرقاوی

بەشە شەشەم: پلانەکانی ئەلقاعیدە

بەشی حەوتەم: چۆن ئەلقاعیدە شکست دێنێت.

لە کۆتایی کتێبەکەدا نوسەر زۆر بە جدی باس لە کەیسێکی بەهێز دەکات ئەویش کێشەی بوونی تیرۆرە لە ئەفغانستان، ئەمەش وەک بنکەی سەرەکی گروپی ئەلقاعیدە وەک ئەجێندایەکی بەهێز بۆ پرۆژەی ئەنتی ئەمریکا لە ناوچەکەدا.

هەرچۆنێک بێت کتێبی «گەڕان بەدوای ئەلقاعیدەدا» گەڕانێکی گرنگە بەدوای ئەو سەرەداوانەی کە دەبێتە هۆی دروستبوونی گروپی تیرۆریستی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، لەسەرووی هەموویانەوە گروپی ئەلقاعیدە و ڕاوکردنی سەربازە شەترەنجئاساکانی ئەم ڕێکخراوە.

**سەرچاوە:**

bookreview.com

# نیتشه و پاش تازەگەری




ئامادەکردنی
سەردەم

ئەگەر هەموو هەوڵدانێک بۆ تێگەیشتن لە فەلسەفەی مۆدێرنە، مەحکوم بێت بە تێگەیشتن لە فەلسەفەی «دیکارت»، ئەوا بێگومان تێگەیشتن لە فەلسەفە پاش تازەگەری و پۆست مۆدێرن، پێویستی بە تێگەیشتن لە فەلسەفەی فەیلەسوفێکی مەزنی وەک «فردریک نیتشە»هەیە .

پرسیاری یەکەمی ئەم کتێبە بەوە دەست پێدەکات، کە بۆچی پێویستە لە «نیتشه» تێبگەین؟

لە ڕاستیدا تێگەیشتن لە «نیتشه» و فەلسەفەکەی، تێگەیشتنە لە دنیای تازەو لەو قۆناغە مێژوییە سامناکەی، لە دوای ئەوەوە دەست پێدەکات. ئەوە شتێکی بەڵگە نەویستە کە لە مێژووی فەلسەفەدا، هەریەکێک لە فەیلەسوفەکان، ڕۆڵی خۆیان لە گەشەکردنی بیرکردنەوەی فەلسەفیدا بینیووە، بەڵام لەو هەمووەدا چەند فەیلەسوفێک توانیویانە سەرەتایەکی تازەو نەریتێکی میتافیزیکی جیاوازتر

بخەنەگەڕ. ئەڵبەتە «فردریک نیتشە»ی فەیلەسوف یەکێکە لەوانە. لەم کتێبەشدا نوسەر ئەوەمان بۆ ڕوندەکاتەوە کە چۆن ئەم بیریارە، سەرەتایەکی نوێ و نەریتێکی میتافیزیکی تازە دێنێتە ئاراوە کە بە (پۆست — مۆدێرنە) یاخود بە پاش — تازەگەری ناودێرکراوە.

سەدەیەکی تەواوە «نیتشە» ژیانی جێهێشتووە، بەڵام بە درێژایی ئەم سەدەیە باس لە ژیان و فەلسەفە و دنیا بینی و تێزە ژێرەو ژورکەرەکانی ئەو دەکرێت. کەم کایەی ڕۆشنبیری لەم دنیایەدا هەیە، چەندین باس و کتێب و لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەو فەیلەسوفە نەبێت. لە بەرامبەر «نیتشە» و فەلسەفەکەیدا کەس ناتوانێت بێلایەن بێت، یان ئەوەتا خۆشت دەوێت و ئاوێتەی دەبیت یان بە نەفرەتی دەکەیت و دەکەویتە سەنگەر لێگرتنی. کتێبەکانی ئەو: (زەرادەشت وەهای وت، مرۆڤانە زێدەمرۆڤانە، ژینالۆژیای مۆراڵ، ئەنتی مەسیح، زانستی شاد، ئاوابونی بتەکان، لەودیو چاکە و خراپە) وە، بۆ دەیان زمانی زیندووی جیهان وەرگێڕدراون و بوونەتە سەرچاوەی فیکری و فەلسەفی، چەندین قوتابخانەی ئەدەبی و هونەری و فیکری و.. هتد.

ئەم هەوڵەی «د. محەمەد کەمال» لەم کتێبەیدا، بۆ ئەوەیە خوێنەری کورد بە زمانی کوردی بە یەکێک لە فەیلەسوفەکانی خۆرئاوا ئاشنا بێت. تەواوی لێکۆڵینەوەکەش لە دوو بەش پێکدێت:

## بەشی یەکەم/

شیکردنەوەی بیرکردنەوەی فەلسەفی «نیتشە»یە، لەسەر تراژیدیا و هەڵوەشاندنەوەی بناغەی میتافیزیکی ڕوناکبین و بەستنەوەی تراژیدیای بوونی مرۆڤ، بەو (هەڵوەشاندنەوەی ە)وە و لەدایکبونی کەڵە — مرۆڤ و گەڕانەوەی هەمیشەیی و داهێنانی بەهاکان و بەکارهێنانی میتافۆر لە شێوازی دەربڕینی فەلسەفیدایە.

## بەشی دووەم/

مامەڵە لەگەڵ فەلسەفەی «نیتشە» و پاش «نیتشە» دەکات و لەسەر بەنازیکردنی بیروباوەڕی «نیتشە» و پاککردنەوەی ناوی «نیتشە»، لەم گەندەڵییە ڕامیارییە، لەلایەن «هایدگەر» و تێگەیشتنی هایدگەر» لە «نیتشە» و کاریگەرێتی «نیتشە» بەسەر بۆچونەکانی پاش — تازەگەری دەدوێت.

# سیمیا لە شانۆدا

ئامادەکردنی
لاس

قەیرانی شانۆی کوردی لە دوای ڕاپەڕین و بەهاری ئازادی، هەر بە تەنها لەسەر ئاستی نمایش و چۆڵ و هۆڵی هۆڵەکانی شانۆ نییە. هەر لەوەدا نییە کە دەقی نۆرماڵ و نواندنی بەپێز و دەرهێنانی ئاست بەرز نابینین، یان تۆرانی بینەرانێکی زۆر بێت لەو هۆڵانەی، ڕۆژانێک جمەیان دەهات و جموجوڵی شانۆیی لەو پەڕیدا بوو، بەڵکو بە دیوێکی تریشدا ئەو قەیرانە لە نەبونی باس و خواسی تیۆری وتارو لێکۆڵینەوەی ڕەخنەییدایە لەسەر شانۆ بە گشتی.

ڕەنگە لە ڕۆشنبیریی کوردیدا هەژاری نوسینی تیۆری و تیۆریزەکردن، هەر لە بواری شانۆدا نەبێت، بەڵکو ئەمە پەتایەکی موزمینی تەواوی کایەکانی دیکەیە، هەر لە شێوەکارییەوە بیگرە تا موزیک و شیعر و بوارەکانی دیکەش. ئەڵبەت لێرەو لەویَ هەوڵی شەخسی و تاکە کەسی هەیە بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە، واتە کەسانێک هەن درک بەو بۆشاییە گەورە دەکەن و جار جارە بە بەرهەمێک چۆڵی و بەتاڵی ئەو کایە پڕ دەکەنەوە، بەڵام بێگومان ئاوەدانی تەواو بەو هەوڵانە دەستەبەر نابێت و ئەو بۆشاییە گەورەیەی لەسەر ئاستی تیۆری و تیۆریزەکردن هەیە، هەوڵێکی دەستەجەمعی گەورەتری دەوێت.

کتێبی (سیمیا لە شانۆدا) کە لە نوسینی «سەلاح جەلال»ە و لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر کۆمەڵە بابەتێکی وەک: (ئارکیۆلۆژیای شانۆی کوردی و سۆسیۆلۆژیای گوتارە جیاکارەکان و فەزای شانۆ و سیمیای شانۆ و دراما و خوێندنەوەی جەستە لە بونیادی شانۆدا)، هەوڵێکە بۆ بەشداریکردن لە دەوڵەمەندکردنی باس و خواسی تیۆری لە بواری شانۆ بە گشتی و شانۆی کوردی بە تایبەتی.

ئەم کتێبە کە بە قەوارەی (١٤٤) لاپەڕەیە و ساڵی ٢٠٠٩ لەلایەن تیپی شانۆی سالارەوە بەچاپ گەیەندراوە، «بورهان قەرەداخی» پێشەکی بۆ نووسیوەو لە بەشێکی ئەو پێشەکیەدا دەڵێت: (نوسەر لەم کتێبەیدا باس لە بەرهەم هێنانی جۆرێک هوشیاری دەکات کە خودێکی ڕۆشنبیر لە پەیوەندیەکانی ئێستاو داهاتویدا، پڕۆژەی گەورە بەرهەم دەهێنێت. دیارە ئەو پڕۆژەیەش شانۆ وەک کەلەپورێکی دۆگما و نەگۆڕ ناهێڵێتەوە، بەڵکو وەک زمان و میتازمان و کەلتور دەیناسێنێت).

# جیهانی سۆفیا




ئامادەکردنی
سەردەم

ئێمە وا ڕاهاتووین مێژووی فەلسەفە، وەک لێکۆڵینەوەو سەردێکی مێژوویی بخوێنینەوە. تەنها بەشێوە ئەکادیمی و زۆر قورس و گرانەکەی ئەم بابەتەمان بەرچاو کەوتووە، کە زۆر جاران حەوسەڵەی تەواوکردنیمان نەبووە، یان توانای تێگەیشتنمان بەو ئاستە نەبووە تا لە جەوهەری بابەتەکە بگەین.

بەڵام هەنووکە ڕێتمی ئەم بابەتە دەگۆڕێت و مێژووی فەلسەفە دەبێتە ڕۆمان و خوێنەرانیش دەتوانن وەک تێکستێکی ئەدەبی ئاوازە، بیخوێننەوەو چێژی لێ ببینن. ئەم کارەش ئەدیبێکی وڵاتی نەرویج دەیکات، بە ناوی «یۆستان گاردەر»ەوە. «گاردەر» مامۆستای فەلسەفە و تیۆلۆژیا و سستەمی بیرە لە زانکۆی ئۆسلۆ. نوسەرێکی ناوداری جیهانەو ڕەنگە لەگەڵ «پاولۆکۆیلۆ»

و نوسەری ڕۆمانی هاری پۆتەردا، کتێبەکانیان پڕ فرۆشترین کتێب بێت. ئەم پیاوە جگە لەم کتێبەی چەندین کتێبی دیکەی بە چاپ گەیاندووە، لەوانە: (مایا، کچەی پرتەقاڵ، نهێنی پشودرێژی و... هتد)، بەڵام هیچ کتێبێکی هێندەی جیهانی سۆفیا نێوبانگی بۆ پەیدا نەکردووە. ئەم کتێبەی کە ڕۆمانێکە سەبارەت بە مێژووی فەلسەفە، بۆ زیاتر لە (٥٥) زمانی زیندووی جیهان وەرگێڕدراوەو خۆشبەختانە زمانی کوردی یەکێکە لەوانە.

بەر لە دەرچونی ئەم کتێبە مێژووی فەلسەفە تەنها ئەوانەی ئەکادیمی بوون و سەروکاریان لەگەڵ فیکر و فەلسەفەدا هەبوو، دەیانتوانی تێی بگەن و بیخوێننەوە، بەڵام دەرچونی ئەم کتێبەی «گاردەر» ئەو ڕێسایە دەشکێنێت و مێژووی فەلسەفە لە موڵکی توێژێکی دیاریکراوەوە، دەکاتە مادەیەک بۆ هەموان.

سەربوردەی ڕۆمانەکەشی وا دەست پێدەکات. «سۆفیا» کچە خوێندکارێکی سەرەتاییە، ڕۆژێک لە خوێندگا دەگەڕێتەوەو سندوقی پۆستەکەی دەکاتەوە، دەبینێت نامەیەکی تێدایەو بۆ خۆی هاتووە، لەسەر زەرفی نامەکە نوسراوە: (سۆفیا ئامۆندنسن). سۆفیا دەرگا لە خۆی دادەخات و نامەکە دەکاتەوە، نامەکە پارچە کاغەزێکی بچکۆلەی تێدایە و هیچی تر. لەسەری نوسراوە تۆ کێیت؟ جیهان چۆن دروست بووە؟

هەر بەڕاستیش ئەو وەڵامی ئەم پرسیارەی لانەبوو.

ئەم دوو پرسیارە کەینونی و میتافیزیکیە، دەبنە سەرەتای دڵەڕاوکێ و پەرۆشیەکی زۆر بۆ سۆفیا و لە وەڵامدانەوەیان دەگەڕێت. ئەمەش دەبێتە دەسپێکی سەفەرێکی دوور و درێژی ئەو لەگەڵ مێژووی فەلسەفەدا، سەفەرێک کە ئێمەی خوێنەریش لەگەڵ خۆیدا دەبات، چونکە لە ڕاستیدا ئەو پرسیارانە تەنها «سۆفیا» بە خۆیانەوە خەریک ناکەن، بەڵکو دوو پرسیاری ئەزەلین و هەموو مرۆڤێکی هۆشیار لە ساتەوەختێکی ژیانیدا، ڕووبەڕویان دەبێتەوە. «سۆفیا» بەرلەوەی گەشت بە مێژووی فەلسەفەدا بکات، بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی، دەیەوێت بزانێت خودی فەلسەفە خۆی چییە، چونکە ئێمە بەر لەوەی لە مێژووی شتێک بزانین، دەبێت شتەکە خۆی بناسین. واتە داخڵ بوون بە مێژووی فەلسەفە، پێویستی بەوەیە بزانین فەلسەفە چییە؟

لێرە بەدواوە ئیتر ئێمە قۆناغ بە قۆناغ لەگەڵ «سۆفیا» و پرسیارەکانیدا دەڕۆین، لە ئەفسانەکانەوە بۆ ئەسینا، لەوێوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست و ڕێنیسانس و سەردەمی ئێستامان. سیحری ئەم کتێبە ئەوەیە کە هەم ئەدەبە و هەم مێژوو، هەم حیکایەتە و هەم فیکر.

# تیۆدۆر ئادۆرنۆ




**ئامادەکردنی**
**سەردەم**

مەزنە فەیلەسوفی ئەڵەمانی «مارتن هایدگەر»، لە شوێنێکدا دەنوسێت: (دوو زمان بۆ فەلسەفاندن هەیە، زمانی یۆنانی و زمانی ئەڵەمانی). «هایدگەر» لەم قسەیەی دەیویست تەعبیر لەوە بکات کە فەلسەفە و کێشە ئاڵۆزەکانی تەنها لەڕێی زمانی ئەڵەمانی و یۆنانیەوە گۆزارشتی لێدەکرێت. ئەو دەیوت لە کۆندا زمانی گریک زمانی فەلسەفە بووەو، لە ئێستاشدا زمانی ئەڵەمانی توانای ڕاپەڕاندنی ئەو ئەرکانەی هەیە. لە ڕاستیدا و بە چاوخشاندنێکی خێرا بەسەر مێژووی فەلسەفەدا، دەبینین ئەو قسەیەی «مارتن هایدگەر» حەقیقەتی زۆری تێدایە، چونکە کاروانی مێژووی فەلسەفەی خۆرئاوا، ڕووبەرێکی گەورە و گرانی فەیلەسوفانی گریک و ئەڵەمانی داگیریان کردووە. هەر لە «هیراکلیت و پارمنیدس و ئەنکسیماندەرس و

سوکرات و ئەرستۆ و ئەفلاتۆن»ەوە، بۆ «کانت و هیگڵ و فیختە و مارکس و نیچە و هایدگەر و ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر و هاپرماس و پیتەر زۆڵتەردایک و.. هتد». «تیۆدۆر ئادۆرنۆ» ناوێکی دیار و سەنگینی کایەی فەلسەفەی ئەڵەمانی و یەکێکە لە بیریارە بەناوبانگەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، ئەو قوتابخانەیەی ساڵی ١٩٢٣ لەلایەن «فلیکس ڤایل»ەوە دامەزرێنراو بە درێژای ئەم هەشتاو پێنج ساڵە خزمەتێکی گەورەی بە کۆمەڵگە مرۆییەکان کردووە.

«ئەدۆرنۆ» ساڵی ١٩٠٣ لە شاری فرانکفۆرتی ئەڵەمانی هاتۆتە دنیاوەو ساڵی ١٩٦٩ بە نەخۆشی دڵ کۆچی دوایکردووە. لە ماوەی ٦٥ ساڵەی تەمەنیدا، باس گەلێکی زۆری لە بوارە جیاجیاکانی فیکر و فەلسەفە و سۆسۆلۆژیا و هونەر و کلتور و موزیکدا نوسیووە. ئەمڕۆ لە سەرتاسەری جیهان و لە تەواوی ئەو بوارانەدا، نوسینەکانی بونەتە ژێدەرێکی گرنگ بۆ تێگەیشتن لە جیهانی مۆدێرن و حاڵی بوون لەو کێشە و قەیرانە زۆرانەی لە ئێستادا بەرۆکی مرۆڤایەتیان گرتووە.

ئەم پیاوە هەر نوسەرێکی ئاسایی نەبووە، بەڵکو ڕەخنەگرێکی سەرسەختی کۆمەڵگەی مۆدێرنیش بووە، ئەو کۆمەڵگایەی بەهۆی گەشەی زۆری ئامێرەکانی تەکنیک و تەکنۆلۆژیاوە، مرۆڤ و زیندەگیان کۆنترۆڵکردووە. لەگەڵ هاتنە سەر کاری نازیەکاندا، وەکی تەواوی ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرت وڵات جێدێڵێت و ڕودەکاتە شاری نیویۆرک لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لەوێ درێژە بە پرۆژە فەلسەفیەکانی دەدا.

«ئەدۆرنۆ» بە حوکمی ئەوەی لە بنەماڵەیەکی مۆسیقیدا گەورە بوو بو، بەشێکی زۆری نوسینەکانی تەرخان بوو بۆ ئەو بوارە، لەوانە: مۆسیقای جاز و پێشەکیەک دەربارەی سۆسیۆلۆژیای مۆسیقا و کتێبی گەڕان بە دووی ڤاگنەر و کتێبی چاپ نەکراوەکان). لە بواری فەلسەفە و سۆسیۆلۆژیاشدا، بەرهەمگەلێکی دیکەی هەیە کە ڕەنگە بەناوبانگترینیان کتێبی (ڕەوشتی بچوک) و (دیالەکتیکی ڕۆشنگەری)، بن کە ئەمەی دواییان بە هاوبەشی لەگەڵ «ماکس هۆرکهایمەر»دا نوسیویەتی.

# چەند دروشمێکی خوێندکاران
# لە ئایاری ١٩٦٨ دا

حەمید زنار
لە عەرەبییەوە: لاس



* یەکێک لە کاریگەرترین چەک و ئامرازەکانی شۆڕش، بوێری و ڕسککردنە.
* ماف لە ژیاندا دەسەنرێ و نادرێت.
* چاخی زێڕین، ئەو چاخانە بوو کە زێڕ تێیدا باڵادەست نەبوو.
* موقەدەس، دوژمنمانە.
* ئەوەی فێری بوون، فەرامۆشی کەن و خەون ببینن.
* لە ناخی هەر مرۆڤێکدا، (حی لاتینی)یەکی نوستوهەیە.
* با دوای کارگەو زانکۆکان، ڕای گشتی پاوانکەین.
* با تەلەفزیۆنەکان بکوژێنینەوە و چاومان بکەینەوە.
* لە کۆمەڵگەیەکدا کە هەموو ڕسک و سەرکێشیەک پەک بخات، چارمان نییە جگە لەوەی ئەو کۆمەڵگەیە خۆی پەک بخەین.

* بونیادێک خۆی فشەڵ و داڕماو بێت، پینەو پەڕۆ کردنی کەڵکی نییە.

* با وا سەیری حەز و ئارەزووەکانمان بکەین، کە شتگەلێکی واقعین.

* سروشت کەسی وەک کۆیلە و خزمەتکار دروست نەکردووە.

* نامەوێت مۆجیاری کەس بکەم و کەسیش فەرمانم پێنەکات.

* دام و دەزگایەکمان دەوێت خزمەت بە مرۆڤ بکات، نەک مرۆڤ ببێتە خزمەتکاری دام و دەزگاکان.

* ئەو بەختەوەریەی پێشبینی دەکرێت سبەینێ بێت، پەستی و بێزاری ئەمڕۆ ناڕەوێنێتەوە.

* با قەدەغە، قەدەغە بکرێت.

* نامەوێت ژیانم لە بەدەست هێنانی بژێوی ڕۆژانەمدا، بەهەدەر بدەم.

* مایەی داخە تەحەمولی دەسەڵاتداران بکەین، گەمژەیشە خۆمان هەڵیانبژێرین و دەنگیدان بدەینێ.

* تۆ ئازادم مەکە، ئەو کارە خۆم دەیکەم.

* هەر فیکرێک کە ڕاوەستاو سەقامگیر بوو، بۆگەن دەکات.

* لە ناخی هەر یەکێکماندا پۆلیسێک نوستووە، پێویستە بیکوژین.

* کاڵاو شمەک، ئەفیونی گەلانن.

* زیادەڕۆیکردن و پرکێشی کردن، دەسپێکی ئەفراندن و داهێنانە.

* مرۆڤ نە ژیرەو نە گەمژە، بەر لە هەر شتێ ئەو بونەوەرێکی ئازادە.

* با دەستبەجێ زانکۆی سۆربۆن، لە مەسیحیەت پاک بکەینەوە.

* ئەم دنیا ڕاگرن، دەمەوێت دابەزمە خوارێ.

* ئایدیای شۆڕشگێڕانە نییە، ئەوەی هەیە تەنها کردەوەی شۆڕشگێڕانەیە.

* با لە ئاست خەون و خۆزگەکانماندا بین.

* تاوانبار و دەست درێژیکەر ئەو کەسە نییە یاخی دەبێت، بەڵکو ئەوەیە ملکەچ و ڕازی دەبێت.

* شۆڕش ئەو کاتە کۆتایی دێت، کە دەبێت قوربانی بۆ بدرێت.

* نامانەوێت ببینە سەگی پاسکردن، نامانەوێت ببینە خزمەتکاری کەپیتالیسم.

* تا چەند سێکس و ئەڤینداری بکەیت، حەز بە شۆڕشکردن دەکەیت. تا چەند شۆڕشیش بکەیت، ئەوەندە ئارەزووی سێکس و ئەڤینداری دەکەیت.

* تا زیاتر بەرخۆری بکەن، کەمتر دەژین.

* پرۆسەی دەنگدان و هەڵبژاردن، تەڵەیەکە بۆ گەمژە و کاڵفامەکان.

* ملکەچی و گوێڕایەڵی لەگەڵ هۆشیاریدا دەست پێدەکات، هۆشیاریش لەگەڵ یاخی بونذا دروست دەبێت.

## سەرچاوە

ماڵپەڕی (اوان)، ٢٠٠٨/٥/٧.



# بڵاوکراوەکانی
## دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند

دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، لەپرۆسەی چاپکردنی کتێبدا، بوارێکی تاڕادەیەک باشی بۆ چاپکردنی کتێبی ئەدەبی ڕەخساندووە، بەتایبەتی ڕۆمان. جێگای خۆشحاڵییە کە دەزگای سەردەم لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی کارکردنیدا، چەندین شاکاری ڕۆمانی جیهانی بە زمانێکی پاراو پوخت، وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، لەوانە جیهانی سۆفیا، زۆربا، فرۆشراو، کەشتی سپی، مەزرای ئاژەڵانو دواهەمینیان پیرەمێردو زەریا. بەمەش هەم کتێبخانەی کوردی پێ دەوڵەمەند بووەو هەم خوێنەری کوردیش ئاشنا بووە بەو ڕۆمانە مەزنانە کە شایەنی خوێندنەوەو تێڕامانە.

### پیرەمێردو زەریا

مرۆڤ تێکدەشکێت بەڵام نابەزێت.

ئەوە ئەو پەندە گەورەو جوانەیە کە لە خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانەوە پێیدەگەین، ئەو بیرۆکە مەزنەیە کە لە پشتی ئەم ڕۆمانەوە دەستمان دەکەوێت. کاتێ لە خوێندنەوەی ڕۆمانەکە تەواوەبین، هەستدەکەین مرۆڤ چ بونەوەرێکی سەرسەختو کۆڵنەدەرەو مانای ماندوبونو شکست نازانێت، تێدەگەین مرۆڤ هەروا بە ئاسانی دەستبەرداری خەونو خولیاو حەزەکانی نابێت، گەرچی لەو پێناوەشدا دەیان ناخۆشیو نەهامەتیو زەلیلی ببینێت. ئەم ڕۆمانە پێمان دەڵێت مرۆڤ خەلقەندەیەکە ئەستەمە لەبەرامبەر کارەساتو دڵڕەقییەکانی سروشتدا چۆکدابدات، مەحاڵە کەسێک ژیانی خۆشبوێتو هاوڕێی دەریاو زەریاو شەپۆلو بایە ئاوییەکان بێت، دۆستی بەلەمو سەوڵو کەشتی چارۆکەداربێت، واز لە کاری ڕاوکردنو جیهانی ناو دەریاکان بێنێت. ئەستەمە ڕۆژانە بە ئاوی دەریاکان تەڕببێتو لەگەڵ هەڵچونی دەریادا ڕاهاتبێت، بەئاسی بەجێیان بێڵێت.

ئەم ڕۆمانە یەکێکە لە شاکارە جوانەکانی ڕۆماننوسی بەناوبانگ «ئارنست هیمنگوای»، تەنانەت «ئارنست هیمنگوای» لەڕێگەی نوسینی ئەم ڕۆمانەوە، خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئەدب لە ساڵی ١٩٥٤ وەرگرتو

خەڵاتی بۆڵستەر، کە بەرزترین خەڵاتی ئەمریکییە بۆ ئەدەب، هەر لەسەر ئەم ڕۆمانەو لە ساڵی ١٩٥٣ وەرگرتووە. کاتێ گۆڤاری (لایف) لە ژمارەی ئەیلولی ساڵی ١٩٥٢ خۆیدا، بۆ یەکەمجار ئەم ڕۆمانەی بڵاوکــردەوە، لەماوەی تەنها دوو ڕۆژدا، زیاد لە پێنج ملیۆن دانەی لێفرۆشرا.




«هیمنگــوای» یەکێــک لە ئارەزووەکانــی بریتــی بــووە لە ڕاوە ماســی بە کەشــتییە چارۆکەدارەکــەی کــە نــاوی (بیــلار) بووە. ماســیگرێکی کوبی خانەنشــینکراو بەناوی «جۆرجیــۆ فۆینتــس» لەلایــەن «هیمنگــوای»ەوە ڕاسپێردراوە بایەخ بە کەشتییە چارۆکەدارەکەی بداتو ئاگاداری بێــت. لە راســتیدا نوســەری ڕۆمانەکە ژیانێکــی تاڕادەیەک ناخۆشو پڕ کارەســات ژیاوە، بەشــداری لە هــەردوو جەنگی جیهانــی یەکــەمو دووەمــدا کردووە. پاشان لە جەنگەڵەکانی ئەفریقــاو لەســەر کەنارەکانی کوبا، بە گۆشەگیری ژیان بەسەر دەبات، وەلێ دواجار بڕیار دەدات خــۆی بکوژێــت، بەداخەوە لە ساڵی ١٩٦١ ئەم نوسەرە مەزنە، بڕیارەکەی خۆی جێبەجێدەکاتو لەڕێگەی فیشــەکی دەمانچەوە کۆتایــی بە ژیانــی دەهێنێت. ئیدی «جۆرجیۆ»ی ماسیگری خانەنشــینکراو، کەشــتییە چارۆکەدارەکەی «هیمنگوای» دەبەخشــێتە حکومەتی کوبا. لێرەوە بەشی زۆری ڕەخنەگران کۆکن لەســەر ئەوەی پاڵەوانی ڕۆمانی پیرەمێردو زەریا، لەسەر هەمان شــێوەی «جۆرجیۆ»ی ماســیگرە، یــان لەوانەیــە چیرۆکەکەی لەوەوە وەرگرتبێت. مەســەلەکە هەرچۆنێکبێــت، گرنــگ نییەو گرنگ ئەوەیە ئەم ڕۆمانە، بەشــێوەیەکی جوانو سەرنجڕاکێش، باسی ململانێو پێداگرتنی ڕاوچییەکی پیرمان بۆ دەکات، کە لەگەڵ سروشتو زەریــاو بونــەوەرە ئاوییەکانی ناوی، لە شەڕێکی بەردەوامدایە. «ســانتیاگۆ» بە تاقی تەنهاو

لەنــاو قوڵایــی دەریایەکی بێ بــنو تــورەدا، بەگــژ هێــزی گەورەو پڕوکێنەری سروشــتو قرشــەکاندا چووەتــەوە. ئەم پاڵەوانە تەنهایە، ئەم ڕاوچییە پیــرە ، لەیەککاتــدا لەگــەڵ چەندیــن هێــزی زەبەلاحی ناو سروشت کەوتووەتە جەنگەوە، لەوانــە ڕەشــەباو تۆفانەکان، شــەپۆلو گێژەنــە ئاوییەکان، زریــانو قرشــە زەبەلاحەکان. بەڵام ئەم مرۆڤە بەســاڵاچووە، بە ئیرادەو بڕوایەکی پۆڵاینەوە، سەرسەختانە بەرگری لە خۆیو بەلەمەکــەیو ئــەو ماســییە دەکات کە دوای چاوەڕوانییەکی زۆر کــە چەندیــن ڕۆژی خایاندووە ڕاویکردووە. شــەڕی «سانتیاگۆ» تەنها لەگەڵ ئەو قرشە گەورانەدا نییە کە هاتون ماســییەکەی لێبســێننەوەو بیبەنەوە بــۆ قوڵایی دەریاکان، بەڵکو لەپاڵ ئەوەشــدا شــەڕ لەگەڵ ئەو گەردەلوولە ئاوییانەدا دەکات کە بێڕەحمانە جەستەی پیری دەتەزێنــن، بێبەزەیانە زەوقەو ســەرماو سۆڵەی خۆیان دەکێشــن بەلاشــە شــەکەتو ماندووەکەیدا. وەلێ ئەو بەهۆی شــارەزاییو ژیانی ناو ئاوەوە، زۆر لەوە خۆڕاگرترە کە تەسلیم بەو هێزانەی سروشت ببێت.

ئەم مرۆڤە تەنهایەی ناو ئەو زەریا هەندێجار شێتو هەندێجار هێمنە، ســوورە لەسەر ئەوەی ئەو ماســییە گەورەیە بباتەوە کە ڕاویکردووە، وەلێ ســەختی کەشوهەواو هاتنی قرشــەکانو تەنهایی خــۆی، کاری بردنەوە ماســییەکە بــۆ کوخەکــەیو پیشــاندانی بــە هــاوڕێ ڕاوچییەکانی دیکەی، ســەخت دەکەن. ماســییەکە خۆینادات بە دەستەوەو بەردەوام لەهەوڵی خۆڕزگارکردندایە، لەبەرامبەردا پیــرەی تەنها بــاڵ چی هێزی خــۆی هەیــە دەخاتــەکار بۆ ئــەوەی ماســی بگەیەنێتــە کەناری ئــارام. لــەم میانەداو بەهۆی زەبرێکی قورســەوە کە «ســانتیاگۆ» دەیوەشــێنێتە ماسییەکە، ماسییەکە بریندار دەبێــتو بەشــێک لــە ئاوی زەریاکــە ســور هەڵدەگەڕێت. بۆنــی خوێــنو ســوربوونی ئاوەکە، بەسە بۆ ئەوەی قرشە دوورەکان، ئەو قرشانەی ڕەحم بــە ماســییەکانی هاوڕەگەزی خۆیان ناکەنو چییان بکەوێتە بەردەم قوتیدەدەن، قوڵاییەکان بەجێبێڵنو لە بەلەمی تەنهای ناو ئاوەکە نزیکببنەوە.

هاتنــی قرشــەکان ئەرکی پیرەی کەنەفت زیاتر ســەختو دژوارتــر دەکات، ئێســتا لەسەریەتی جەنگەکەی فراوانتر بکاتو ئــاگاداری هەر چوارلای بەلەمەکــەی بێت، دەبێ چەکی تــازە دروســت بــکاتو هێزی تازە لەخۆیدا کۆکاتەوە. لێرەوە سەوڵی بەلەمەکە، تێڵاکەی ناو بەلەمەکــە، چەقۆکــەی دەبنە چەکی تــازەو ئەوانیــش دێنە گۆڕەپانی جەنگەکــەوە. وەلێ ئەو کەرەســتە ســەرەتایانەی شــەڕکردن، کــەی دەتوانــن قرشــە گەورەکان بترســێننو دوریانبخەنــەوە! قرشــەکان

خ ڵ ە
ک را
وە کا ن

هەرگیز دەربایسی ئەو گورزانە نەبوون کە بەر جەستەیان دەکەوت، ئەوان نێچیرێکی گەورەیان لەبەردەمدا بوو، نەیاندەویست بەئاسانی دەستبەرداری ببن. بەداخەوە دواجار ئەم جەنگە بێ بەرامبەرە، بەسەرکەوتویی قرشەکانو بە دۆڕاندنی ڕاوچییەکە کۆتایی پێدێت. قرشەکان تەنها ئێسکە پەیکەری ماسییە بۆ «سانتیاگۆ» بەجێدەهێڵنو ئەوەی بەکاری خواردنبێت، هەموویان لێکردۆتەوە. بەڵام ئەم دۆڕاندنە، ئەم شکستە نابێتە هۆی ئەوەی سانتیاگۆ لە زەریا عاجزبێتو واز لەکاری ڕاوکردن بێنێت، نابێتە هۆی ئەوەی چیتر بۆ هەتاهەتایە بەلەمو سەوڵەکانی جێبێڵێتو پشت بکاتە بونەوەرە ئاوییەکان. نەخێر ئەو دوای ئەوەی بە تێکشکاویو شەکەتی دەگەڕێتەوە بۆ کوخە ساردو سڕەکەی، لەسەر شوێنی نوستنەکەی پاڵ دەکەوێتو چاوەڕوانی سپێدە دەکات کە باشترو چاکتر خۆی ئامادەبکات بۆ گەڕێکی دیکەی ڕاوکردن. بەڵام ئەمجارەیان سودی لە هەڵەکانی پێشتری بینیوەو بەشێوەیەکی تۆکمەتر دەچێتەوە ناو زەریاو ئاوە بێ سنورەکەی.

دواجار پێویستە ئەوە بڵێین وەرگێڕانی ئەم شاکارە جوانە لەلایەن شاعیری ناسراو «شێرکۆ بێکەس»ەوە ئەنجامدراوە، ئەو زمانە کوردییەی لەم وەرگێڕانەدا بەکارهاتووە، زمانێکی پوختو زمانێکی تابڵێی شیرینو بێ گرفتە. وەرگێڕ لەبەر ئەوەی خۆی شاعیرێکی گەورەیەو توانایەکی زمانەوانی باشی هەیە، بۆیە لەوەرگێڕانەکەیدا سەرکەوتووبووەو بەرهەمێکی پوختی بە زمانی کوردی خستۆتە کتێبخانەی کوردییەوە.

ئەم ڕۆمانە چاپی سێیەمە، تیراژی ١٠٠٠ دانەیە، نرخی ٢٠٠٠ هەزار دینارە.

## بەرەو کەناری شپرزەیی

ئەم کتێبە وەک لە لاپەڕەی دووەمی ناوەوەیدا نوسراوە (دەقی والا)، دەقێکە کە لەنێوان بیرەوەریو چیرۆکدایە، واتە ئەو تێکستەی لەم کتێبەدا نوسراوە، تێکەڵەیەکە لەو دوو ژانرەی ئەدەب. نوسەری کتێبەکە چونکە خۆی چیرۆکنوسێکی شارەزایەو ساڵانێکی زۆرە سەروکاری لەگەڵ نوسینو خوێندنەوەدایەو لەنزیکەوە ئاشنای ئەدەبی جیهانییە، بۆیە سەرکەوتوانە ئەو دوو ژانرە ئەدەبییەی تێکەڵ بەیەک کردووەو دەقێکی والای لێ دروستکردون.

لە ڕاستیدا سنوری نێوان بیرەوەریو چیرۆک لەم کتێبەدا، سنورێکی زۆر تەسکەو تا ڕادەیەکی زۆر چونبەناویەکداو لێکردنەوەیان زەحمەتە، بەتایبەتی لە بەشی یەکەمو

چوارەمدا. جیاکردنەوەی سنوری نێوان بیرەوەریو چیرۆک لەو دوو بەشەدا ئەستەمە. قورسە لەو دوو بەشەدا، بە ئاسانی بتوانیت دەستنیشانی سنوری بیرەوەریو سنوری چیرۆک بکەیت. چونکە بەشێوەیەکی ئۆرگانی تێکەڵ بەیەکبوونو هیچ مەسافەیەکیان نەهێشتووەتەوە بۆ جیاکردنەوە. خوێنەر بەزەحمەت دەتوانێت لەو دوو بەشەدا، کارەکتەری ڕاستەقینە، واتە ئەو خەڵکانەی کە بە فیعلی نوسەر لە سەفەرەکەیدا بینیونیو قسەیان لەگەڵدا دەکات، لەگەڵ کارەکتەری چیرۆک، واتە ئەو خەڵکو ڕوداوانەی نوسەر خۆی دایهێناوەو بەرگێکی ڕاستەقینەی کردوون بەبەردا، جیابکاتەوە. بێگومان ئەم حاڵەتە لەلایەکەوە تواناو هونەری نوسین لای دانەری کتێبەکە دەردەخات، لە لایەکی دیکەوە خاڵی هەرە جوانی کتێبەکەیە.

«ڕەوف بێگەرد» لەم کتێبەیدا، ئەوەی لەو سەفەرەیدا بینیویەتی، ئەوەی نیگای کەوتووەتە سەریو لە نزیکەوە گوێی بۆ قسەکانی گرتووە، بەجۆرێک تێکەڵی جیهانی چیرۆکی دەکات، بەشێوەیەک دەیخاتە ناو دنیای پڕ خەیاڵی چیرۆکەوە، کە سەرسامت دەکاتو ڕاتدەگرێتو پرسیار لەخۆت دەکەیتو دەڵێیت: تۆ بڵێی ئەمە وابێت! تۆ بڵێیت ڕاستبێت شۆفێری ئەو تەکسییەی «بێگەرد» دەیگەیەنێتە فرۆکەخانە، کەسێکی ئەوەندە خوێندەواربێت، بگرە بڕوانامەی لە فەلسەفەدا هەبێتو کاری شۆفێریش دەکات؟ یاخود تۆبڵێیت چیرۆکی دووکەڕولاڵەکە لە واقیعدا ڕویدابێتو نوسەری کتێبەکە تەنها دەیگێڕێتەوە، کێ دەڵێ ئەو چیرۆکە زادەی خەیاڵی نوسەری کتێبەکە نییەو شتی لەو شێوەیە ڕەنگە هەر ڕوینەدابێت! کێ دەڵێ کاتێ «بێگەرد» بە تەنها لە ژورەکاندا دەمێنێتەوە، خەیاڵی بۆ ئەو بەسەرهاتە جوانە ناچێت



# نێە کراوەکان

کە باس لە عەشقو ئەڤینی نێوان دوو مرۆڤی کەڕولاڵ دەکات، چۆن بێدەنگو دوور لە وشەو ڕستەو پەرەگراف، دوور لە دەنگو هاتوهاوار، بە قووڵی یەکتریان خۆشدەوێتو دواجار پێکەوە کۆتایی بە ژیانی خۆیان دەهێننو خۆیان فڕێدەدەنە ناو ڕووبارێکەوە. لە ڕاستیدا بەسەرهاتی ئەو دوو عاشقەو شێوازی یەکتر خۆشەویستنیانو پاشان چۆنیەتی خۆکوشتنەکەیان، ئەوەندە لە دنیای خەیاڵو چیرۆکو فەنتازیای نوسینی چیرۆکەوە نزیکە، ئەوەندە شاعیریانەو ڕۆمانسیانەیە، نیو ئەوەندە لە واقعەوە نیزک نییە. ئەو ڕوداوە ئەوەندەی پەیوەندی بە جیهانی نوسینو تێڕامانەوە هەیە، نیو ئەوەندە پەیوەندی بە جیهانی ڕاستەقینەی مرۆڤەکانەوە نییە. بە مانایەکیتر زۆر ڕێیتێدەچێت ئەو بەسەرهاتە زیاتر لە ناو خەیاڵدانی نوسەری کتێبەکەوە هاتبێتەدەرەوە، تاکو لە ژیانی ڕاستەقینەدا ڕویدابێت. زیاتر بەرهەمی بیرکردنەوەی «بێگەرد»ە وەک لەوەی بەرهەمێکی ڕاستەقینەی ناو واقیع بێتو ئەم هاتبێت بیگێڕێتەوە.

لێرەوە بە بڕوای من، نوسەر نەهاتووە تەنها ئەو شتانە بگێڕێتەوە کە لە ماوەی سەفەرەکەیدا، بەچاوی ئاسایی خۆی بینیونیو لەگەڵیاندا هەستاوەو دانیشتووە، نەهاتووە تەنها ئەو حاڵەتانە بگێڕێتەوە کە پێی هەستاوە، نەهاتووە تەنها باسی ئەو کەسوماڵو شوێنانە بکات کە بینیونیو سەردانی کردوونو لەگەڵیاندا دانیشتووە، واتە نەهاتووە تەنها بیرەوەری سەفەرێکی چەند هەفتەیی خۆی بگێڕێتەوە، بەڵکو لەپاڵ ئەوەشدا، ڕەگەزێکی گەورەی چیرۆکی بۆ ئەو گێڕانەوانە زیادکردون کە بریتییە لە دروستکردنی ڕوداو یان دروستکردنی بەسەرهات، یاخود دەستکاریکردنێکی گەورەی ڕووداوەکان، بەشێوەیەک کە هیچی ئەوتۆی لە ڕوداوە ڕاستەقینەکە نەهێشتووەتەوەو بەرگێکی چیرۆکئامێزی نایابی کردووە بەبەردا. هەڵبەتە ئەم حاڵەتە سەلیقەییو توانای نوسەر دەردەبڕێت لە کردنی ڕوداو بە چیرۆک، لە گۆڕینی واقیع بۆ ئەدەب، ئەمەش بۆخۆی کارێکی داهێنەرانەیەو دەکرێت تێکستی جوانی لێ بێتە بەرهەم، وەک تێکستی بەرەو کەناری شپرزەیی.

ژمارەی لاپەڕەی ئەم کتێبە ١٦٣ لاپەڕەی بچوکەو تیراژەکەی ١٠٠٠هەزار دانەیە، نرخی ٢٠٠٠ هەزار دینارە.

# گۆڤاری سەردەم بە دوو مانگ جارێک

لە ژمارەی ئایندەوە گۆڤاری سەردەم بە دوو مانگ جارێک دەردەچێت،
تکا لە نووسەرانی دەکەین پابەندی کاتی دەرچوونی بن و
لە ناردنی بەرهەم دوانەکەون.

# فایلی ژمارەی ئایندە

فایلی ژمارەی ئایندە لەسەر نوسەری گەورەی چیک -فرانز کافکا-
دەبێت،
تکا لە نووسەرانی دەکەین هاوکاریی فایلەکە بکەن.

